# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بەوەرگێڕان و کولتوری بیانی

**56**

**پاییزی**

2008

**ســـــاڵی دەیەم**

- سەردەم گۆڤارێکی وەرزییە، تایبەتە بە نوسین و وەرگێڕانی کولتوری بیانی لە بواری فەلسەفە و ڕەخنە و زانستە مرۆییەکان و داهێنانی ئەدەبی و ئیستاتیکیدا.
- داوا لەو بەڕێزانە دەکەین کە بابەت بۆ سەردەم ئامادەدەکەن، هاوپێچ ناوی تەواوی نووسەر، وەرگێڕ، سەرچاوەو زانیارییەکانی تایبەت بە چاپ و بڵاوکردنەوە، لەگەڵ کۆپییەك لەدەقی ئەسڵیی بابەتی وەرگێڕدراو بنێرن.
- ئەو بەڕێزانەی بە نوسین و ئامادەکردن بەشداریدەکەن پێویستە هەموو مەرجە ئەکادیمیەکان، لە بابەتی میتۆد و سەرچاوەو ئەمانەتی نوسینەوە، پێڕەوبکەن.
- باشتروایە بابەتەکان بە کۆمپیوتەر تایپ کرابن، بە فۆنتی سەحیفە بۆلد، هاوپێچ لەگەڵ سی-دی و دەقی چاپکراوی بابەتەکەو ئەدرێس و ناونیشانی ئەلیکترۆنی نوسەر یان وەرگێڕدا.
- ئەو بەڕێزانەی لە ئینتەرنێتەوە بابەت وەردەگێڕن پێویستە هاوپێچ ناونیشانی تەواوی سایت و لینك و ڕۆژی بڵاوکردنەوەی سەرچاوە ئەلیکترۆنیەکە بنێرن.
- بەرهەمەکان گەر بڵاوبکرێنەوە، یان نا، نادرێنەوە بە خاوەنەکانیان.
- پەیوەندییەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە ئەنجام دەدرێن.


**خاوەنی ئیمتیاز:** شێرکۆ بێکەس

**سەرنووسەر:** ڕەووف بێگەرد

**سکرتێری نووسین:** شوان ئەحمەد

**دەستەی نووسین**

ڕێبین هەردی    د. شاهۆ سەعید

**دەرهێنان و کاری کۆمپیوتەری**

تاڤگە فائق

**بەرگ:** نەرمین مستەفا

**هەڵەچنی چاپ:** ساکار ڕەووف



**ناونیشان**

سلێمانی – شەقامی سالم

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن: سەرنووسەر 07480136659

دەزگای سەردەم 3129609

**بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە**

**Tel - Fax: 0044 7543129839**

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە ( ***14665/615* و *14665/616***) تاران

**لە ڕێگەی (ئیمەیل)ەوە:**

*govarysardam@yahoo.com*

*www.serdam.info*

*www.serdam.net*



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

سەردەم

# ناوەرۆکی ژمارە 56



**نرخی ( 1200 ) دینارە**

SARDAM No. 56 2008

# ئاتاجی سزادان:
# دەرەنجامە سیاسیەکانی هاوهەستی لە تەك شەڕەنگێزدا

ئارنۆ گروون

لە ئینگلیزییەوە: عەلی زەڵمی

هەنووکە ئێمە لە جیهانێکدا دەژین کە لە هەموو کات زیاتر هەریەکەمان لەسەر ئەوی دی بەندە، کەچی لە هەمانکاتیشدا تا بێت دژی یەکدی دەوەستینەوە. بۆچی خەڵکی دژایەتی شتێك دەکەن کە بەیەکەوە دەیانبەستێت، وە هەر ئەو شتەشە گشت تیایدا بەشدارن، واتە مرۆڤ بوونیان. میلۆڤان دیجەیلس هاوڕێی تیتو لە شەڕی پارتیزانی لە دژی نازیەکان کە دواتر بوو بە یەکێك لە هەرە رەخنەگرە سەرسەختەکانی، لە ڕاپۆرتی ژیاننامەکەیدا "خاك بەبێ دادپەروەری" بەم شێوەیە وەسفی دڕەندەیی جیهانی پیاو دەکات کە تێیدا مرۆڤایەتیبوون گاڵتەی پێ دەکرێت و وەك بێدەسەلاتبوون ئەژمێردرێت.

جارێك دوای شەڕ کەسێکی مۆنتینگریەن (شاخی ڕەش) واتە یوگۆسلاڤیەك بەناوی سیکولا لە نێوان ڕێگای بیژلۆ پۆلیت بۆ مۆژکیاك تورکێکی موسڵمان دەبینێت و دەبنە هاوڕێی سەفەر. ئەمان هەرگیز یەکتریان نەناسیوە و لە بارەی یەکتریشەوە هیچیان نەبیستوە، ئەو ڕێگایەش ئەوانی پیادەڕۆن بەنێوبانگە بە ترسناکی، ڕێگایەك تەنراوە بە دارستانی چڕوپڕ بە جۆرێك زۆر لە بارە بۆ ڕێپێگرتن. موسڵمانەکە زۆر دڵخۆشە کە لە پەنای کەسێکی مۆنتینگری ڕێدەکات، بە هەمان شێوەش سیکولا هەست بە دڵنیایی دەکات کە لەگەڵ ئەم تورکەیە، هیچ نەبێت پارێزراوە لە پەلاماری گروپە تورکە یاخیبوەکان. لە ڕاستیدا موسڵمانە تورکەکە پیاوێکی ئاشتیخوازو بەتەنگ خێزانەکەوەی بوو. وردە وردە کەوتنە قسە کردن لەگەڵ یەکدی و جگەرەیان پێشکەشی یەکتر دەکرد لە کەشێکی هاوڕێیانەدا. لە میانی سەفەرەکەیاندا بە نێو جەنگەڵان و نشێوەکاندا ئەم دوو پیاوە تا

دەهات پەیوەندیان زیاتر دەبوو. سیکولا پاشتر دانی بەوەدا نا کە هیچ رقێکی لە بەرامبەر ئەو پیاوە نەبوو، سیکولا گوتی گەر هەرچی بوبێت ئەم پیاوە، تورك نەبوایە وەك کەسێکی ئاسایی لێهاتبوو. ئەم بێتواناییەی بۆ هەستی رقلێبونەوە دژی تورکەکە، وای لێکرد هەست بە تاوانباری بکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەو پێی وا بوو تورکیش مرۆڤن بە هەمان شێوەی ئێمە.

ئەو رۆژانە لە رۆژە گەرمەکانی هاوین بوو گەرما تا دەهات پەرەی دەسەند لە هەموو لاوە، بەڵام چونکە هەموو لا بە دارستان دەورە درابوو مرۆۋ هەستی بە فێنکیەك دەکرد کە لە رێگەکەوە هەڵیدەکرد. پاشان هەردوولا بریاریاندا کەمێك بحەسێنەوەو شتێك بخۆن. سیکولا پێی خۆش بوو کە پیشانی هاورێکەی بدات کە چ جۆرە دەمانچەیەکی جوانی هەیە. موسڵمانەکەش سەیرێکی کرد و سەرسامی خۆی بۆ چەکەکەی پیشاندا و لێیشی پرسی کە ئاخۆ لەسەر پێیە یان نا. سیکولاش وەڵامی دایەوە بەڵێ ئامادەیە – لەم ساتەدا سیکۆلا بۆی دەرکەوت بە پەنجە جوڵانێکی سادە دەتوانێ تورکەکە بکوژێت –. سیکولا لولەی دەمانچەکەی ئاراستەی نێوان هەردوو چاوی تورکەکە کرد و وتی: بەڵێ لەسەر پێیە و ئێستە زۆر بە سانایی دەتوانم بتکوژم، هەروەها زوو زوو چاوەکانی ئەتروکان و قاقای لێدەدا. کابرای تورکیش داوای لێکرد کە دەمانچەکە لابدات نەبادا کتوپڕ لە دەستی دەرچێت.

سیکولا لە چاوتروکانێکدا ئەوەی بۆ دەرکەوت کە پێویستە هاورێی سەفەرەکەی بکوژێت. چونکە دواتر ناتوانم هەموو ئەو شەرمەزاریە لە ئەستۆ بگرم هەروەها ئەو هەست بە تاوانباریە بشارمەوە لەوەی رێگە بدەم بەم کابرا تورکە لە دەستم دەرچێت. ئیدی ئەو پەنجەی لە پەلەپیتکە گیرکرد و تەقاندیە نێو چاوانی تورکەکە – ئەگەرچی بە لەدەست دەرچونیش بوو بێت. دواتر کە سیکولا بەسەرهاتەکەی گێراوەتەوە باس لەوە دەکات کە ئەو کاتێك بە گاڵتەوە لولەی دەمانچەکەی ئاراستەی نێو چاوانی موسڵمانەکە گرتبوو بە نیازی ئەوە نەبوو بیکوژێت، دیجەڵس دەنوسێت: "بەڵام دواتر پەنجەی پاڵدەنرێت لەلایەن شتێکەوە لە ناوەوە، شتێك کە لەگەڵیدا گەورە بووە کە هەروا ئاسان نیە دەسبەرداری بێت". ئەشێ ئەو ئانوساتەی کە سیکولا زۆر نزیك بوو لە تورکە موسڵمانەکەوە وایکردبێت کە هەستی بە ئابڕوچون کردبێت. زۆر ناماقوڵییە وەك دەبینرێت، ئەو شتەی کردی بە رقەوە نەبوو بەڵکو کابرای تورکەی لەو کاتەدا خۆش ئەویست. ئەو کابرای "بێگانەی" کوشت چونکە نەیتوانی رقی لێبێت. بۆیە ئەم کارەی وایلێکرد لەلایەك هەست بە شەرمەزاری بکات لەلایەکی تریشەوە هەست بە تاوانباری بکات چونکە هەستی هاورێیەتی و چاکەکاری تیایدا گۆڕا بۆ هەستکردن بە بچوکی و زەبونی. بەڵێ ئەم هەستە بوو وایکرد بۆ ئەوەی بکوژێت، کاتێك ئەو "ئەوانی دی" دەکوژێت بێگومان مرۆڤایەتی خودی خۆی دەکوژێت.

کلاوس باربی جەلادی ناسراو بە "قەسابی شێر" کە ئەشکەنجەی سەختی فەرەنسیە بەرهەڵستکارەکانی داوە تا مردن، لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ نێڵ ئاسکرسن (1983) دەڵێت: "کاتێك من لێپرسینەوەم لە تەك جەین مۆلین دەکرد، وام هەست دەکرد لە تەك خۆمیدا دەکەم. بە مانایەکی دی هەرچی ئەم جەلادە دەیکرد لەگەڵ قوربانیەکانی، بەڕوونی لەگەڵ خودی خۆیدا کردویەتی. ئەوەی من جەغدی لێدەکەمەوە، رقبوونەوە لە نەناس و بێگانەکان هەموو کات جۆرێکە لە رقبونەوە لە خود. گەر

ئێمە بمانەوێت لەوە تێبگەین بۆچی خەڵکی دەیەوێت ئازاری خەڵکی تر بدات و رقی لێیان دەبێتەوە، پێویستە ئێمە یەکەم جار لەوێوە دەست پێبکەین ئاخۆ بۆ ئێمە رقمان لە خۆمانە، ئەو دوژمنەی وا هەست دەکەین لە کەسێکی دیکەدایە یەکەم جار لە ناو خۆمانەوە سەر هەڵدەدات. ئێمە هەموو کات ئەم حاڵەتە بێدەنگ دەکەین بە لەناوبردنی ئەو بێگانەیە، چونکە ئەو لە ئێمە دەچێت وە هەموو جارێکیش ئەو حاڵەتەمان وەبیر دێنێتەوە. هەر ئەمەشە تەنها رێگە کە ئێمە بتوانین خۆمان بە دوور بگرین لەوانەی کە بوون بە بێگانە لێمان. دیسانەوەش هەر ئەمەیە تاکە رێگا بۆ ئەوەی رێز لە خودی خۆمان بگرین و هەست بکەین بە جۆرێك کە ئێمە زۆر سەربەرزین.

یەکێك لە نەخۆشەکانم کە تەمەنی پەنجا ساڵە و جیۆلۆجستە، دەربارەی باوکی پێی وتم کە چۆن نەك تەنها باوکی زۆر دەسەڵاتخواز بووە بەڵکو ئەو زۆر جار لە کوڕەکەی داوە لەسەر شتی زۆر بچوك کە بەلادانی ئاکاری ناسراون. بە هەمان شێوەش پیاوێکی زۆر خراپ و توندڕەو بووە لەگەڵ هاوسەرەکەیشیدا. ئەم دایکە هەرگیز نەیوێراوە بەرگری بکات لەم کوڕە بێدەسەڵاتەی، تەنها جارێك نەبێت ئەم بەرگری کرد لە کوڕەکەی کە ئەو کات حەوت ساڵان بووە لە ترسی ئەوەی نەبادا بیکوژێت. ئەم کوڕە هەردەم گوێڕایەڵ بوو هەموو کاتیش هەوڵی ئەوەی دەدا ئاوا بە گوێڕایەڵی بمێنێتەوە، خۆ ئەگەر جارێکیش هەستێکی نێگەتیڤی بەرامبەر باوکی لا دروست بوایە ئەوا هەر وەك گەورە هەستی بە تاوانباری دەکرد بەرامبەر بە بابی. ئیدی ئەو گەیشتە چارەسەرێکی وەها کە هەرگیز نەتوانێت لەو هەستەی قوتاری بێت کە شتێك هەیە ئەو جیهانەی ئەوی تیادا دەژی ناشیرینی کردووە. هەر بۆیە پاشتر بڕیار دەدات

کە هەرگیز نەهێڵێت منداڵی هەبێت لە ژیانیدا. هەرچی جارێکیش گوێی لە گریانی منداڵێك بوایە زۆر تووڕە دەبوو وە وا لێکیدەدایەوە کە هەر گریانێك ئەم گوێبیستی دەبێت داوای شتێك دەکات لەم. ئەمەش بە شێوەیەك ئازاری دەدا و پەستی دەکرد کە وەخت بوو لە ناکاو منداڵەکە بدات بە دیوارێکدا.

بێگومان ئەو هەرگیز نەیدەویست شتی وا رووبدات. ئەوەی ئێمە لێرەدا سەرنجی دەدەین ئەوەیە کە پیاوێك دەبینین نایەوێت ئەوە دووبارە بکاتەوە کە لەگەڵ خۆیدا کردویانە. لەگەڵ ئەوەشدا هاوتێگەیشتنی لەگەڵ باوکیدا بەشێوەیەکی نائاگایی کاریگەری هەیە لەسەری، ئەو دژە کردارەی ئەم هەیەتی بەرامبەر گریانی منداڵ هەمان دژە کردارە باوکی هەیبووە بەرامبەری لە منداڵی خۆیدا. تووڕەبونەکەی هەمان تووڕە بونەکەی باوکیەتی، ئەو کەسەی کە ڕقەکەی بە شێوازێکی گشتی گواستەوە بۆ خۆی. بەمشێوەیە، خودی پیاوەکەو لەگەڵ سەرزەنشتیکردنی باوکەکە بۆ ئازاری کوڕەکەی دەگۆڕێتە سەر بێگانەیەك، هەتاوەکو سزا بدرێت لەلایەن سنورەکانی دەرەوەی خودی خۆی.

یەکێك لە قوتابیەکانم لە کۆرسی چارەسەری لە کاتی وانە وتنەوەمدا پرسیارێکی لێکردم "من دەمەوێت بزانم بۆچی من کەسێکی رەگەزپەرستم لە کارەکەمدا لەگەڵ پەنابەراندا. رۆژێك پێش ئێستا لەگەڵ گروپێ قوتابی ئەلبانی قسەم دەکرد، کاتێك یەکێك لەوان ووتی: "من دەمەوێت ببمە قوتابیەکی پیشەکار (واتە ئەو کەسانەی بۆ ماوەیەك کار دەکەن لای کەسێکی شارەزا بۆ ئەوەی پیشەکەی لێوە فێربن – وەرگێر)، من نەمتوانی ئەو بیرکردنەوەیەم نەبێت کە ئەوان بێگانەیەکی خۆبەزلزانن، ئێستا سوپاس بۆ ئەم وانەیەت، کە

شتێکی له منداڵیەتی خۆمی وەبیرهێنامەوە: من هەرگیز رێگە نەدراوم کە بڵێم ئەوەم دەوێت، بەڵکو تەنها ئەخوازم ئەوەم هەبێت. لەبەر ئەمە من رقم لەم ئەلبانیانە دەبێتەوە چونکە بە هۆی ئەوانەوە فێری ئەوەبووم کە رقم لە خۆ بێتەوە.

باربەرە ئیهرنیک لە "مەراسیمی خوێندا" (1997) دەڵێت: "جەنگاوەرەکە سەیری دوژمن دەکات دەبینێت پیاوەکانی کێن، لە روویەکی گرنگەوە، رێک وەک خۆی دەیانبینێت. لە کتێبەکەیدا بەناوی "شەرەفی جەنگاوەرەکە" (1998) مایکڵ ئگنەتیف وتوویژی نێوان خۆیو جەنگاوەرێکی سیربی لادێ نشین تۆمار دەکات کە لە رۆژهەلاتی کورواتیا دەژیا: "من هەرگیز ناتوانم بیر لەوە بکەمەوە کە کروات و سرب یەکبن. باشە چیە وا لە تۆ دەکات کە زۆر جیاواز بیت لەوان؟". وەک بڵێت هەست بە کەمی بکات پاکەتێ جگەرەی لە گیرفانی چاکەتە خاکیەکەیدا دەرهێنا، "ئەمە ئەبینی؟" ئەمانە جگەرەی سربین. بەڵام لەولاوە "ئاماژەی کرد بە نێو پەنجەرە کراوەکەدا" ئەوان جگەرەی کرواتی دەکێشن". —بەڵام خۆ هەردووک هەر جگەرەن؟". "بێگانەکان لە هیچ تێناگەن، بە گاڵتە پێکردنێکەوە، دەستی کرد بە پاککردنەوەی دەمانچەکەی". بەڵام ئەو پرسیارەی کە ئەو پێی سەغڵەت بوو کەمێک پێش ئێستا، پاش کەمێک دواتر تفەنگەکەی هێناو خستیە نێوان هەردوکمان ووتی: "سەیرکە لێرە شتەکان ئاوهایە، ئەو کرواتیانە کەوا هەست دەکەن لە ئێمە چاکترن، ئەوان هەوڵدەدەن باشبن لە تەکماندا. ئەوان وا دادەنێن کە لایەنگری ئەورووپیەکان بن. من یەک راستی هەیە دەمەوێت پێت بڵێم "ئێمە هەموومان بەڵکانی نەعلەتین و هیچیتر". یەکەمجار پێی ووتم کە ئەوان و کرواتیەکان هیچ شتێک کۆیانناکاتەوە، تەنانەت جگەرەکانیشیان، دواتر ووتی ئەوان خۆیان لە ئێمە بە چاکتر دەزانن، بەڵام دواجار هاتە سەر ئەوەی کە ئەوان لە ڕاستیدا هەر یەکن.

فرۆید لە نوسینێکی بەنێوی "تابووی پاکیزەیی" (1917)، دەنوسێت: لە راستیدا جیاوازیەکی زۆر کەم هەیە لە نێوان ئەو خەڵکانەدا کە وەک یەک وان لە بنەمای هەستی نامابوون هەروەها دژایەتیکردن لە نێوانیاندا". ئگنەتیف دەپرسێت بۆچی دەبێت جاری وا هەبێت رقی برایەک لە براکەی تری گەورەتر بێت لە رقی کەسانێکی نامۆ و بێگانە؟ هەروەها بۆچی هەردەم پیاوو ژن جەغد دەکەنەوە لەسەر هەبوونی جیاوازی لە نێوانیاندا؟ پیاوان لەگەلێک خاڵی بۆماوەیدا هاوبەشن لە تەک ژناندا، کەمتر لە کرۆمۆسۆمێک یان دوان جیاوازی هەیە نەک جیاوازیەکی گشتی، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەم راستیە هەردەم بە بێدەنگی ماوەتەوە کە چەندین خاڵی گرنگ و لێکچوون لە نێوانیاندا هەیە کە نکوڵیان لیٚ ناکرێت — وەک توانایی ئاوەزیی— کە هەردەم وا پیشان دراوە کە نایەکسانن بەڵام هیچ بەڵگەیەکی زانستی پشتگیریی ئەم بۆچونە ناکات. ئەو پرسیارەی لە پشت ئەمانە هەموویەتی ئەوەیە: بۆچی دەبێت چەند جیاوازیەکی بچوک ببێتە هۆی قەڵس بوونمان و هەڕەشە لەسەرمان؟ بۆچی دەبێت ناکۆکی بێت کاتێک ئێمە لەوانی دی بچین بەتایبەتی بێگانەکان؟ هەتا پەیوەندی نێوان گروپە مرۆییەکان نزیکتر بێت کەچی ئامادەباشی بۆ دژایەتیکردن لە نێوانیاندا زیاتر دەبێت، لە ڕاستیدا مرۆڤەکان لەسەر ئەوە بەشەڕ دێن کە تیایدا هاوبەشن هەتا ئەوەی لێی جیاوازن. کۆمەڵکوژی و ئەشکەنجەدان و هەڵسوکەوتی خراپی رۆژانەی باوک و دایک لەگەڵ منداڵەکانیاندا هەمووی نمونەی توندو تیژی و رقە هەروەها هەمویشی لە خاڵێکدا کۆکن: هەستی دژایەتیکردن بەرامبەر بە

ئەوانی دی، نامۆكان. جەلادەكان لە ڕیزبەندیكردنیاندا خۆیان بە "مرۆڤ" دادەنێن بەڵام ئەم مافە مرۆڤبوونە بە قوربانیەكان ڕەوا نابینن. "ئەوانی دی" لە ئاستێكی خوار مرۆڤەوەن، ئەو مرۆڤانەی هەڵدەستن بە ئازار و ئەشكەنجەی ئەوانی دی ئەم كارە بە پرۆسەی خۆپاككردنەوە دادەنێن لە نەهێشتنی هەر گومانێكی پیسی لە خۆیان. وایدادەنێن كە پێویستە مرۆڤە پاكەكان جیابكرێنەوە لە پیسەكان واتە مرۆڤەكان لە نامرۆڤەكان هەتا ئاستێكی ڕەها. بەشێوەیەك ئەوان وەك تاكێكی ناو مرۆڤەكان سەیر ناكرێن بەڵكو وەك یەكێكی ناو گروپێك. ئیدی هەموو هەست و ئاكار و بەهایەكیان بە هەند ناگیرێت، لەباتی ئەمە هەموو كەسایەتیان دائەبەزێنرێت بۆ تەنها هۆكارێك ئەویش: ئەندامی گروپێك.

ئەم پرۆسەی بەرەهایكردنە وامان لێدەكات كە ڕێیتێنەچێت بتوانین لە دۆخێكی هاوسۆزیدا لە ئەوانی دی تێبگەین. ویژدان كە تاكە سەرمایە و چۆنایەتیە هاوبەشە لە هەموو دروستكراوەكاندا، دەمانپارێزێت لە لەدەستدانی مرۆڤایەتیمان. هەروەها بنەمای سروشتی مرۆڤە لەگەڵ كەسایەتیماندا، بەڵام كاتێك كەسیەتیمان تووشی بێزاری و ڕقلێبونەوە دەبێت ئیدی هاوسۆزیش لێمان جیادەبێتەوە وەك ئەوەی هەرگیز بەشێك نەبووبێت لە ئێمە، سۆز و ویژدانیش ئیدی ناتوانن بە ئازادی گەشە بكەن. توانای هاوخەمیمان بۆ ئەوانی دی هێدی هێدی سیس و لاواز دەبێت. ئەو پرۆسەیەی كە هەریەك لە ئێمە دەبێتە بێگانەیەك لەوی دی و هەروەها ڕێگر دەبێت لەوەی كە گرێبدرێن بەیەكەوە بە شێوازێكی مرۆڤانە و هاوخەم و لە یەكدی گەیشتن. كەچی لە بریدا جۆرێك لە ڕەها بوون خۆی مەڵاس داوە لە پەیوەندیەكانماندا.

ڕەگوڕیشەی نامۆیی ئەكرێت لە منداڵیدا سەرچاوە بگرێت. ئەمە بە باشی ڕووندەبێتەوە لەو كاتەدا هیتلەر وتارێكی پێشكەش بە ڕێكخراوی نەتەوەیی سۆسیالستی ژنان دەكات لە ساڵی 1934 دا، "هەموو منداڵێك جەنگێكە" (چامبرلن 1997). هتلەر ئەمەی دەربڕی وەك لێدانی زەنگێك كە تا هەنووكەش زۆر باوە لە زۆربەی كولتورە ڕۆژئاوایەكاندا وەك ڕاستیەكی حاشا هەڵنەگر: كە ئەویش ڕەگی دژایەتیكردنە لە نێوان كوڕیە و باوانیدا. لە ململانێی باواندا بۆ بە كۆمەڵایەتیكردنی منداڵەكانیان، باوك و دایك هەوڵدەدەن منداڵەكانیان تەسلیمی ئارەزووی باوانیان بنەوە. هەروەها منداڵەكان پێویستە ڕێگریی بكرێن لە هەموو ئاتاج و حەزەكانیان. ئەم ململانێیە حەتمیەو دەبێت بە شێوازێك چارەسەر بكرێت كە چاكەی تیا بێت بۆ منداڵەكە بەڵام بە جەختی باوك و دایك. چامبرلن لە كتێبەكەیدا (ئەدۆلف هیتلەر، دایكە ئەڵمانیەكە و یەكەم منداڵی) بە توندی ڕەخنەی لە سێیەم تیۆریی فەرمی ڕیچ گرتووە و وێنای هەموو كاریگەریە پاسالۆجیەكانی (ناخودگەرایی) كردووە. بەڵام ئەفسوس لە هەمان كاتدا باس لە ئایدیۆلۆجیایەكی باو دەكات لای ئەوانەی بە شارستانێتیە گەورەكان ناودەبرێن – هەرچەندە شاراوەتەوە، بە تایبەتی پەیوەندی نێوان باوان و مندالأن ململانێی دەسەلأتە بەشێوەیەك كە "ناپێگەیوەكە" واتە منداڵەكە نابێت ڕێگە بدرێت سەركەوێت. بێگومان ئەوەی لێرەدا شاراوەیە هەروەها زۆر گرنگ نیە كێشەی "شارستانیبوون" بەڵكو ئەو متمانەیە كە لەلایەن هەژموونی باوانەوەیە.

بە كۆمەڵایەتیكردن بەم شێوەیە دڵنیایی دەداتە ئەو پاڵنەرەی كە دەیەوێت ئەوان بكاتە گوێڕایەڵ لەگەڵ ئەو دەسەلأتەی كە لە دەروونی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە. هەڵبەتە ئەمەش

زۆر کارامەییە، بە هەرحاڵ، بە تەنها لە ڕێگەی سەرکوتکردنی داواکاری و پێداویستیەکان و ویستەکانی منداڵ ئەنجامدەدرێت. تەنانەت فرۆیدیش لەژێر کاریگەری ئەم ئایدۆلۆجیایە دەرنەچووە، لە پاڵ ئەو هەموو ئایدیا شۆڕشگێڕانەی کە وایکرد منداڵ ببێتە سەنتەری بیرکردنەوەمان، کەچی ئەویش هەڵگری ئەو تێگەیشتنە بوو کە ململانێی نێوان باوان و منداڵان ململانێیەکی حەتمیە. ئەو پێی وابوو کە منداڵان لەلایەن چەند حەزێکی گەردونیەوە بەڕێوە دەبرێن و هیچ ئامانجێکی دیکەیان نیە جگە لە تێرکردنی ئەو ئارەزو و حەزانە. لای فرۆید ئەرکی کولتور بۆ ئەوەیە کە ئەو حەزانە مالی و دەستەمۆ بکرێن پێش ئەوەی زیان بە خەڵکی دیکە بگەیەنن.

بێگومان ناکرێت بۆچوونەکانی هیتلەر و فرۆید لەیەک خانەدا ریزبکەین، بەلام هەردووک یەک شت کۆیاندەکاتەوە: گەر منداڵان لێیان گەڕێن بەو ئارەزووە سەرەتاییانەی هەیانە ئەوا دەبنە مەترسی بۆ سەر کۆمەڵگە. کتێبەکەی چامبلرن هەوڵێکی زۆر گرنگە لە بواری توێژینەوە لە سەرکردە نازییەکان و حەز و ئارەزوویان بۆ دەسەلات. ئەم دیاردەیە زۆر نەناسرابوو وەك درێژکراوەیەك تا ئەمرۆ، بیرۆکەکانی "ئەدۆڵف هیتلەر: دایکە ئەڵمانیەکە و یەکەم منداڵەکەی لە لایەن دکتۆرێکی ئەڵمانیەوە بە ناوی (*J.Haarer*) کاری بۆ کرابوو، کە منداڵ و کۆرپەکان لە بنەڕەتدا هەمیشە تێرنابن. ئەوان هەرگیز لاکردنەوە لێیان کۆتایی نایەت، ئەیانەوێت هەموو کات هەڵیانگریت، ئەمەش بێگومان دەبێتە بارێکی قورس بەسەر شانی باوانیەوە. "کۆرپەکان لەلایەن سروشتەوە ئامادەکراون تا بەڕقەوە بگرین و بقیژێنن بۆ ماوەیەکی درێژ، ئیدی بۆ بەسەر بردنی کات بێت یاخود بۆ دەسخستنی داواکانیان. منداڵ و کۆرپەکان نایانەوێت گوێڕایەڵ بن، ئەوەش ناکەن کە بەخێوکەرەکانیان لێیان دەوێن، لەبری ئەمە تاقیان دەکەنەوە، بەرگریان دەکەن هەروەها ژێربارییان دەخەن". بە مانا هەر لە سروشتەوە ئەمان خەڵتەن، ناپاکن هەروەها هەرشتێك بەریان بکەوێت ناشیرینی دەکەن (ئەم دێڕەی دوایی قسەی چامبرلینە).

ئەو خەوش و هەلانەی هەردەم باوان منداڵانی پێ تاوانبار دەکەن: پیسی، خۆپەرستی، دوو فاقی و رقی وێرانکەر. هەروەها منداڵان ئارەزووەکانیان بێسنورە هەموو کات بە شوێن ئەوەدا دەگەڕێن کە ئارەزوەکانیان تێرکەن و لە هەولی چێژەکانیاندان. ئەبێت ئێمە ئەوە بزانین و بە هەند وەریگرین کە هەر ئەو ناوناتۆرە و وەسفانەیە دەوترێن و دەوترێنەوە لە دژی بێگانەکاندا، ئیدی هەرچیبن: جولەکە، قەرەج، کاسۆلیك، کروات، سیرب، چیچان، کۆمۆنیست.. هتد.

هەردەم بێگانە ئەو کەسە پیسەیە کە ئێمەش ناشیرین دەکات. هەر بۆیە هیتلەر پێیوابوو کە جوەکان بێگانەن و هاتوون میللەتەکەی پیس بکەن، بە هەمان شێوە لەناوبردنی نەخۆشی "سۆفلیس"ی وەك یەکێك لە ئامانجە نەتەوەییە هەرە گرنگەکان حیساب دەکرد. بەو هۆیەوە ئەو باوەڕی وابوو کە پالفتەکردنی ئەو کەسانەی هەڵگری ئەم پەتایەن پێویستیەکی گرنگە وەك "جیاکردنەوەیەکی بێڕەحمانەی ئەو کەسانەی کە نەخۆشی بێچارەسەریان هەیە" (هیتلەر: 1942).

دوژمنی ناوەکی هەردەم یەکسانکراوە بە کەسی بێگانە، ئایا ئەمە بەشێکە لەو منداڵەی کە لەدەستچووە بەهۆی ئەوەی یەکێك لە باوك و دایکی نکولی لێدەکەن، هەروەها سزای دەدەن و

سەرکوتی دەکەن بەشێوەیەك نەتوانێت لەسەر پێی خۆی بوەستێت و دەربڕی تێڕوانینە راستەقینەکانی خۆی بێت. من کە دەڵێم "راستەقینە" لەبەرئەوەی تێڕوانینی سەرەتایی منداڵان ئەزمونێکی هاوسۆزییە، لەبەر ئەمە دەکرێت تەنها راستبن. بێگومان هیتلەریش هەمان ئەزمونی رەتکردنەوەی هەبووە سەبارەت بە هەستە لەخۆوەیەکانی لەبەر ئەمەیە خۆی قوتار دەکات لە خودی ناوەکی خۆی وەك بێگانەیەك هەتا بتوانێت پەیوەندی خۆی لە تەك باوانیدا بپارێزێت.

هاریرە پێمان دەڵێت کە چۆن باوك و دایك ویستەکانیان ئەسەپێنن، ئەو منداڵی چواندووە بە کەسێك ئارەزوی خۆزاڵکردنی هەبێت، بەشێوەیەك تەحەدای دایکی دەکات کە بیخاتە بەردەم ئەرکێکی گەورەوە و بە جوانی رۆڵی خۆی ببینێت. "کاتێك منداڵ دەگریەت و سەرپێچی دەکات دەبێت ئەوەی دایکەکە بە پێویستی دەزانێت دەبێ ئەوە بکرێت، خۆ ئەگەر هەر بەردەوام بوو لەسەر هەڵسوکەوتەکەی ئەوا وێڵ دەکرێت و گرنگی پێنادرێت، بۆ نمونە، دەکرێتە ژوورێکەوە بە تەنها و هیچ گرنگییەکی پێنادرێت هەتا هەڵسوکەوتەکەی چاك دەکات. (چامبرلن لە هاریرە وەریگرتوە). بێگومان ئەمانە هەمووی بۆ خاتری منداڵەکە دەکرێت و هەروەها وەك خۆشەویستێك بۆ منداڵەکە سەیر دەکرێت. ململانێی دایکەکە لە دژی منداڵەکەی رەنگدانەوەی ویستەکانی باوکە، هەروەك چۆن زۆربەی دایکان راهاتون لەگەڵی لەبەرئەوەی ئەوان دیلی ئەفسانە و هێز و سەروەری نێر بوون. لەم رێگایەوە توخمی بێگانە لە باوکەکەوە ئەگوازرێتەوە بۆ منداڵەکانی. ئەو منداڵانەی کە رقیان لە خودی خۆیانە تەنها کاتێك ئەتوانن رێزی خۆیان بگرن کە رقەکەیان ئاراستەی دەرەوە بکەن. گەر ئەوان خۆیان دورگرن لە تاکیەتی و کەسیەتی خۆیان وەك شتێکی بێگانە، ئیدی ئەوان بە ناچاری دوژمن بۆ خۆیان دروست دەکەن هەتا پارێزگاری لە بونیادی کەسایەتیان بکەن وەك دروست بووە.

ئەمەش دەرئەنجامێکی زۆر خراپیشی لێدەکەوێتەوە: ئەوان نەك هەر ئەوەی کەسانێکن ناتوانن ئەوە ببینن و ئەو کێشەیە بناسنەوە کە پێوەی دەناڵێنن خۆیان قوربانیەکەین، بەڵکو ئەوان تەنانەت دانیشی پیانانێن کە قوربانی بن. بە هۆی بەقوربانیکردنی خەڵکانی دیکەوە ئەوان درێژە دەدەنە پرۆسیسەکە. هەر بۆیە دەبێت ئەوان نکوڵی لە قوربانیبوونی خۆیان بکەن ئەگینا ئەزمونە سەرەتایەکانی تیرۆر سەرهەڵدەدەنەوە. هیچ منداڵێك بەوانەوەش کە جێگای مەترسین بۆ سەر ئێمە، ناتوانن بەرگری ئەم تیرۆرە بکەن.

وەك منداڵ ئێمە هەردەم بێتوانابووین و لە ژێر بەزەیی باوك و دایکدا بووین. مانەوەی ئێمە بەند بووە بە چۆنیەتی گوێڕایەڵیمان بۆیان. تیرۆری ناوەکی کە هاوڕێیە لەتەك بەقوربانیبوون ئیدی تا رادەیەکی زۆر بوونگەرایە. هەر ئەمەیە کاتێك دەترسین کە کارەکەمان لە دەست بدەین یاخود پێگە کۆمەڵایەتیەکەمان یان هەر رۆڵێکمان هەبێت لە کۆمەڵگەدا دەبێتە هۆی لەرزاندن و جێڵەقبونی خودی دەزگاکانی بوونی ئێمە. کاتێك کە رێزگرتنی خۆمان بە شێوەیەکی سەرەکی بەستراوە بە سەرکەوتن، جێگا و رێگای شیاو، هەروەها دەسکەوتی ماددی، ئیدی لەدەستدانی هەریەك لەمانە دەبێتە هۆی هەرەشەیەك لە بوونمان چونکە هەستی کۆنی تۆقاندن وەك بێتوانایی لە ئاست بەزەیی ئەواندا هەروەها شەرمەزاری – تیاماندا رادەچڵەکێتەوە.

ئەریك فرۆم ئەوەی روونكردوەتەوە كە چۆن ئەوانەی گیانی دەسەلاٌتخوازیان (سلطوی) هەیە، هەرگیز ڕێگە نادەن بە گەشەكردنی ئازادیەكانی كۆمەڵ، هەر ئەمەشە ڕێگە خۆش دەكات بۆ ناسەقامگیریی و فەوزا (فرۆم: 1941). بەم شێوەیە هەموو كەرتەكانی دانیشتوان بۆی هەیە تواناكانیان ئاراستە بكەن بۆ گێڕانەوەی بونیادە كۆمەلاٌیەتیە دەسەلاٌتخوازیەكان.

جونەسان سكاڵ باس لە شۆڕشی كۆمەلاٌیەتی وولاٌتە یەكگرتوەكان دەكات لە سی چل ساڵی رابردوودا: كە چۆن شەرعیەتی دایە كۆتایهێنان بە سیاسەتی چەوساندنەوەی ڕەشپێستەكان لەو ولاٌتە، هاوڕێ لەگەڵ بزوتنەوەكانی مافە مەدەنیەكان (*Civil Rights Movements*) هەروەها شۆڕشی سێكشواڵی بووە هۆی شكاندن و دژایەتیكردنی تابۆیی سێكس پێش هاوسەرگیریی، هەروەها بزوتنەوەكانی ژنان (فێمینست) بوە هۆی گۆڕانی سروشتی پەیمانی هاوسەرگیریی و دەرگاكردنەوە بە ڕووی ژناندا بۆ كار و هەروەها لە هەموو بوارەكانی ژیاندا، وە ئێستاش بزوتنەوەكانی ئازادی بۆ هۆمۆ سیكشواڵ (گەیو لەسبین- وەرگێڕ).

"هەریەك لەمانە ڕێگە خۆشكەر بووە بۆ پانتاییەكی فراوانتر لە مافەكانی مرۆڤ هەروەها ئازادییەكانی مرۆڤ لە ژیاندا، دیسانەوە هەریەك لەمانە شكاندنێك بووە لە میكانیزمی كۆنترۆڵكردنی كۆمەڵگا كە پێشتر بەو ڕێژەیە نەتوانراوە دژایەتی بكرێت. (سكاڵ: 1999). سكاڵ تێبینی ئەوەی كردوە كە چۆن لەگەڵ ئەم گۆڕانكاریانەدا لەم ساڵانەی دواییدا بە شێوازێكی بەرچاو سیاسەت لەلایەن تەوژمی پارێزگارەكانەوە دەستی بەسەردا گیراوە.

گەر من لێرەدا بمەوێت خاڵێك بخەمەسەر تێبینیەكەی سكاڵ، ئەوەیە كە چۆن تا ئاستێكی زۆر ڕەزامەندی كوشتن و لە باربردنی مندالاٌن زۆری كردوەو وەك لە ویماری ئەڵمانیادا، بەلاٌم بە ناووشێوازی جیاوە، توندوتیژی دژی ئەم داهێنانە كۆمەلاٌیەتیە ئاشكرا بوو.

گەر بێتو ناسنامەی كەسەكان بەسترابێتەوە بە هاوسۆزی لەگەڵ دەسەلاٌتخوازیدا (گروون: 1968) ئەوا ئازادی دەبێتە جۆرێك لە نیگەرانی. هەر بۆیە ئەوان دێن بە قوربانی بوونی خۆیان ڕەتدەكەنەوە لە جێیدا تۆوی توندوتیژی دەچێنن دژ بە ئەوانی دی. هەریەك لە سەختی و ئاسانی باری ئابوری دەتوانێت هۆكاری قوربانی بوون كارا بكات. ئیتر هەستی خەڵكیش بەرامبەر ڕێزی خود دەكەوێتە مەترسییەوە، هەروەها گیانی دروستكردنی دوژمن گەشە دەكات لایان. خەڵكی لەگەڵ ئەم جۆرە لە چارەسەر دا ڕێگەدەدەنە دەسەلاٌت بۆ بنیاتنانەوەی كۆمەڵگا بە ئارەزووی خۆی.

مێژونوسی ئەمەریكی جۆن باشنیڵ (1985) باس لە سالاٌنی 1905 و 1906 ی روسیا دەكات كە چۆن سوپا لەو ولاٌتەدا هەستاوە بە بێدەنگ كردن و لەناوبردنی ڕاپەڕیوەكان. كەچی هەمان ئەو سەربازانە بە دوو شێوازی زۆر جیاواز هەڵسوكەوتیان كردووە لەسەركەوتنە خێراكاندا، تەنها لە نێوان دە مانگدا دوو ڕۆڵی زۆر لێكجیاوازیان بینیوە، لەلایەك وەك ڕاپەڕیوەكان و لەلایەكیتریش وەك تازەكردنەوەی هەستی نیشتمان پەروەریان. سەربازەكان كە هەستان بە سەركوتكردنی ڕاپەڕیوەكان لە مانگی جانیوەری تا ئۆكتۆبەر ساڵی 1905، كەچی هەڵگەڕانەوە لە مانگی ئۆكتۆبەر هەتا دیسەمبەر، دیسانەوە لە كۆتایی هەمان مانگی دوانزەدا تەقەیان كردەوە لە

هاولاّتیان، بەشداریان لە ڕاپەڕینێکی تردا کرد لە مانگی پێنج و شەشی ساڵی 1906 دا کەچی لە کۆتایی مانگی حەوتدا دووبارە سەرکوتی ڕاپەڕیوەکانیان کردەوە. باشنێڵ ئاماژە بەوە دەکات کە هەموو ئەو هەڵگەڕان و داگەڕانەی سەربازەکان هیچ پەیوەندیەکی بە گۆڕانی ئایدیۆلۆجی و تێڕوانینی سیاسی سەربازەکانەوە نەبوە. بەڵکو ئەوەی سەربازەکان بەلایانەوە گرنگ بووە کە چۆن بتوانن ئیدراکی ڕژێمی دەسەلاّتدار بکەن – کە بەتەنها هەیمەنەی کردبوە سەر ئاستی سەقامگیری و هەستەکانیان. هەر بۆیە کاتێك ئەوان وایان زانیوە کە ڕژێمەکەیان بەرەو کۆتایی دەڕوات ئەمان هەڵگەڕاونەتەوە، خۆ ئەگەر زانیبێتیان هەر دەسەلاّتدارە ئیدی بەگژ هاولاّتیاندا چونەتەوە. وەك دەبینین ئەمە هەڵوەشاندنەوە نییە لە بونیادی دەرەوەی کۆمەڵگادا کە ڕاپەڕیوەکان بەرهەم بهێنێت، بەڵکو هەر چۆنێك بێت دەسەلاّتێك هەیە ئەمە پێشکەش دەکات. ئەوە وا دەردەکەوێت کە شاراوەیە، ئەو کەسایەتیەی کە دروست بووە لەگەڵ هاوسۆزی ئەو دەسەلاّتەدا کە هەڵوەشاوەتەوە. ئیتر ئالێرەوەیە گیانی مەیلداری و وەلا دروستدەبێت، لەم بارەشدا بێگومان مەیلدارێکی خێرا. هەر بۆیە بەرزبونەوەی گیانی توندوتیژی لەلایەن ئەم جۆرە کەسانەوە ئەگۆڕێت دژ بەو کەسانەی کە پێشتر باش بوون. بۆ زیاتر دڵنیابوون، ئەم ڕەفتارە هەروەها دەکرێت ڕاڤەش بکرێت بە فڕێدانی خویەکی پێشووی کەسێك بۆ شتێکی خراپتر (هاوسۆزی لەگەڵ شەڕەنگێزدا)، ئەوەی کە پێشتر بە چاك دانرابوو، واتە ڕژێمی پێشوو. بەلاّم کەسی نا سەربەست ناتوانێت ڕاپەڕێت لەبەرئەوەی ئەو لکێندراوە بە کۆمەڵێك گۆڕانکاری بنەڕەتیەوە، کە بە سانایی ئامانجی ئەو توندوتیژیەی هەیەتی دەیگۆڕێت.

شۆڕشەکان جاری وا هەیە دەتوانن شێوازی بەندایەتی بگۆڕن، بەلاّم هەرگیز ناتوانن کاریگەربن لەسەر خودی بەندایەتی هەتا خەڵکی بەردەوام بن لەسەر خۆ پێشکەشکردن بە دەسەلاّت. ئەوان بەردەوام بەرگری دەکەن لە خراپە کە پێیان وایە چاکە، لەم بارەشدا هەرگیز ئازادی راستەقینە جێپێی خۆی ناکاتەوە. ئازادی ناوەکی و هەڵهاتن لە هەستی کۆنی تیرۆر ئەکرێت ببێتە شتێکی زۆر گرنگ بۆ بەخشینی وزەی زیاتر لە دوورکەوتنەوە لەوان. ئەمەش لە ڕێگەی گەڕان و دژایەتیکردنی بێگانەکانەوە دەبێت "ئەوانی دی" کە پەلەپیتکەی تیرۆرە. بەشێوەیەکی ئاسایی ئێمە بە زۆری سروشتی ناوەکی خۆمان لەو کەسانەدا دەدۆزینەوە کە لە خۆمانەوە نزیکن واتە لە خۆمان دەچن. ئێستە ئێمە دەتوانین لەو راستیە تاڵەی کە کلاوس باربەرس پێی ووتین تێبگەین: "کاتێك لێپێچینەوەم دەکرد لە جەین موڵین، وام هەست دەکرد کە ئەو خۆمە".

دەرکەوتنی کەسی بێگانە هەروەها بە دەرەکی کردنی ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە ئاستی نزمی پەیوەندی ئەو شتەی کە زۆر کەسی و تایبەتە کە ئەویش: ناسنامەی کەسەکەیە. بەلاّم چۆن پەرەسەندنی ناوەکیی سەرهەڵدەدات لای منداڵان گەر هەموو شتێك کە کەسایەتی ئەمانی دروستکردوە ڕەتبکرێتەوەو بکرێتە بێگانە؟ لێرەوە ناسنامە کورتدەکرێتەوە بۆ هەڵکردن لەگەڵ ئەو بارو زروفە دەرەکیانەی کە مانەوەی فیزیکی منداڵێك مسۆگەر دەکەن. منداڵان هەموو شتێك دەکەن تا ببنە جێگای متمانەی باوك و دایکیان، وە ئەو ڕێگایەی ئەوان بەکاری دەهێنن هاوسۆزییە لەگەڵ باوانیاندا، ئیدی کەسایەتی منداڵەکە لەلایەن هۆکارێکی بێگانەوە

جێگای پێ چۆڵدەکرێت. هەر لەبەر ئەمەیە شاعیری چاخی هەژدەهەمی ئینگلیزی ئیدوارد یەنگ دەنوسێ: "ئێمە بە رەسەنی (ئەسڵی) لەدایك بووین و بە کۆپی دەمرین".

کاتێك ناسنامەیەك بەمشێوەیە گەشە دەکات خولیا و سەرگەرمی ئاتاجەکانی خۆی نییە ئەوەندە خەریکی رازیکردنی دەسەڵاتێکە. بێگومان ئەمەش دەرەنجامی سەختی ئەبێت چ بۆ تاك و چ بۆ کۆمەڵگاش بە گشتی، هەر بۆیە مارتی سیرالا لە مێژە ئاماژەی کردوە، نەبوونی شیزۆفرینیا لە نێو زۆرینەی خەڵکیدا مانای بوونی بارێکی تەندروستی باشتر نادات لە نێوان تاکەکاندا لەوانەی کە بەڕاستی کەوتون لە نەخۆشخانەکاندا بەهۆی ئەو نەخۆشیەوە، بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاستە".

گەر ناسنامە دەستەیەکی بنەڕەتی تایبەتمەندیەکانی کەسایەتی بێت، ئیدی سەرنجەکانی من ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە زۆرێك لە خەڵکی هەڵگری لەم جۆرە لە ناسنامە نین. عەقڵیەتی نازی خەڵکی سەرقاڵ کردبوو بەوەوە کە ناسنامەکانیان دەدزرێت. ترس و بیمی گرتوخانە سەربازیەکان تەنها قڕکردن و جینۆسایدی جەستەیی نەبوو، بەڵکو ئامانجی سەرەکی تیایدا لای ئەو کەسانەی سەرپەرشتیان دەکرد روخاندنی رێز و بەهای مرۆڤانە و خودی کەسایەتی بوو. ئەو خەڵکانەی کە خاوەنی ناسنامەی راستەقینەی خۆیان نەبون، بەڵێ ئەوانەی کە هەستان بە زەوتکردنی ئەوەی خەڵکی دی هەیەتی ئەمان نیانە. لە دەرەوەی تۆڵە سەندنەوە ئەوان هەستان بە کوشتنی نامۆ لە خودی خۆیاندا، ئەوەی کە ئەیتوانی ئەمان بەرێت بۆ دەستخستنی ناسنامەیەکی تۆکمەی خۆیان.

پۆڵ کلین جوان نیشانی داوە کە چۆن ئەو کەسانەی توشی نائومێدی بوون لە ژێر رەحمەتی توندوتیژییەکی لەم جۆرەدا بوون. "چیدی کەسی تر نیە بەبێ زەوی و قوڕ بمانشێلێت، ئیدی کەسی تر قسە لە تۆز و غوباری ئێمە ناکات، ئێمە هیچ نەبووین.. گوڵێك نەبووین" (1965). کەسانی وەکو ئەم ناکرێت بتوێنەوەو ناشکرێت بونیادی ناوەکی و جەوهەریان تیا بچێت. پۆڵ کلین ئەوەی وەبیر هێناینەوە کە چیدی کەسی تر گوڵ نیە بۆ هەتاهەتایی. هەروەها شاعیری سوریالستی فەرەنسی رۆبێرت دیسنۆس لە کاتی ژیان بەسەربردنی لە یەکێك لە گرتوخانە سەربازیەکاندا دەنوسێ: "من زۆر بە شانازییەوە ژیام گەرچی هەردەم بە شوێنمەوە بوون، لە نێوان کۆیلە ماسکدارەکاندا، کەچی هەر ئازاد بووم، چی، مرۆڤەکان، کردیان لەگەڵ ئەم گەنجینانە؟ هیچ مەترسە، لەوەی من دەمرم، هیچ شتێك نابێتە مایەی هەڕەشە بۆ سەر تۆ". لێرەدا، بە شێوەیەکی گونجاو مارتی سریلاس بە قوڵی باری مرۆڤی هەڵسەنگاندووە لەم جیهانەدا کە بەشێوەیەکی نادروست و نەخۆش ئاراستە دەکرێت: "بە هەر رێگایەك، توشی نەخۆشی شیزۆفرینا ببی مانای وانیە کە بە جۆرێك لە جۆرەکان توشی لاوازی هاتووی، بەڵکو بە دەستخستنی ئەو توانا تایبەتیە کە بەرەنگاری هەموو ئاکارە بەرزەکانی ژیانی مرۆڤ ببیتەوە، هەروەها تا جۆرێك لە نامەیەکی پڕ لە ئامارژە پیشان بدەیت". گومان لەوەدا نیە کە زۆرینەی خەڵك بەبێ شوناسێکی ناوەکیی پتەو دەژین. لە چەندین ساڵانی رابردودا چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی بێبەشبوونی هەستی پیشاندابوو کە ئەو کەسانەی کەنارگیرن لە کۆنتێکستی کۆمەڵایەتی و کولتوریان دەگۆڕێنە سەر کەسێکی سایکۆتیك (خەیاڵی). بە هەر حاڵ، ئەو کات دیاری نەکرابوو، کە دەرئەنجامەکە

پەیوەستە بە ئاستی پتەویی و گرێدراوی ناوەکی کەسەکەیە.

ڕاپۆرتەکەی فەرماندە بایرد دەربارەی یاداشتەکانی لە ماوەی چەند مانگێکدا کە بە تەنها بەسەری بردبوو لە ناوچەکانی جەمسەری باکور پیشانی دەدات کە چۆن چالاکی ناوەکی کەسەکان وا دەکات لە یەکێك زۆر ئازاد و پشت بەخۆ بەستو بێت لە بەرامبەر هەستە دەرەکیەکاندا (*E.Byrd, 1983*). د. ئیڤلیان بۆن (1957) زیاد لە حەوت ساڵی بەسەر برد لە زیندانێکی ئینفرادیدا لە یەکێك لە زیندانەکانی هەنگاریادا، بەڵام دەوڵەمەندی و چالاکی ناوەکی و رۆحی تا دەهات گەشەی دەکرد و ئەزمونی هزریی فراوانتر دەبوو. هەڵبەتە ئەمە ناوەکی و رۆحی تا دەهات گەشەی دەکرد و ئەزمونی هزریی فراوانتر دەبوو. هەڵبەتە ئەمە لە کەسێکدا دەرناکەوێت کە ژیانی ناوەکی گۆڕابێتە سەر شتێکی نامۆ. هەر ئەمەشە بێگومان هۆکاری ئەوەی کە چەندین بابەتی لێکۆڵینەوە سەبارەت بێبەشبوون شکستی سایکۆتیکیان هەیە.

ئەو کەسانەی توانای ئەوەیان هەیە کە گەشە بکەن لە ڕووی پەیوەندی ناوەکی و ڕۆحیەکانیانەوە هەروەها ئاراستەی هەستی ناسنامەیان بکەن ئەوان هەرگیز ئارامی کەسیەتییان نادۆڕێنن گەرچی لە ژێر هەر بارودۆخێکی دژواردا بژین یاخود لە ڕووی هەر بێبەشبونێکدا بناڵێنن وا ناکات باوەڕ بەخۆبوون لەدەست بدەن. جۆرێك لە ناسنامە لە کولتوری ئێمەدا باوە کە بەندە لەسەر هاندانی ترس لە دەسەڵات، لەلایەکی تریشەوە، بەشێوەیەکی بەردەوام لە ترسی لەنێوچووندان. ئەم جۆرە کەسانە هەوڵدەدەن خۆیان بەهێز بکەن تەنها لە ڕێگەی دروستکردنی دوژمنی خەیاڵی یاخود لە ڕێگەی جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی هەیە و باوە لەو چوارچێوە کۆمەڵایەتیەی تیایدا دەژین. باری دووەمیان تەواو دەچەسپێت بەسەر هەوادارانی هیتلەردا، ئەوانەی کە هەر زوو ئەو پرانسیپە دیمۆکراتیە نوێیانەیان وەرگرت کە لەلایەن سەرکەوتوەکانەوە داهێنران لە دوای روخانی ڕیچی سێیەم. نمونەی ئێجگار زۆرمان هەیە لەو کەسانەی لە هەمان سەدەدا کە لەگەڵ ئەوەی لە ژێر بارێکی سەخت و ناهەمواردا ژیاون لە بەندیخانە سەربازیەکاندا کەچی هەر پارێزگاریان کردووە لە ناسنامەی خۆیان. سەربازە ئەمریکیەکان کە ئەوەیان رەتکردبویەوە بەشداری بکەن لە ئەشکەنجە و سزادانی زیندانیەکان لە کاتی شەڕی دژ بە ڤێتنام هەمان دیاردە پیشان دەدەن ( *Herman, 1994, Eng, 1998, Werner, 1989*).

دەمەوێت زیاتر جەخت لەوە بکەمەوە کە "بێگانە" لای ئێمە لەو کلتورەوە سەرچاوە دەگرێت کە توانای قبوڵکردنی تەعبیری خۆڕسکیانەی منداڵانەیان نییە وەك زیندویەتی و گورجوگۆڵی. ئەم جۆرە لە کلتور یارمەتیدەرە بۆ زۆربونی ئاکاری توندوتیژی هەروەها بەرپرسیاریشە لە گەشەکردنی ناسنامەی دژ بەیەك. ئەو کەسایەتیانەی کە ڕەنگڕێژکراون بە پرۆسەی بەرهەمهێنانی بێگانەی ناوەکی هەرگیز لە توانایاندا نییە گەشە بدەنە متمانە وەك پێکهاتەیەکی نێو کەسیەتیان. بەڵکو لە جیاتیدا هەڵگری "ناسنامەیەکی ساختە" دەبن کە وایان لێدەکات کە باوەڕ بەو بیرۆکەیە بهێنن کە دەسەڵات نوێنەرایەتیان دەکات بەو هیوایەی قوتاریان بێت لەو کەسانەی ئازاریان دەدەن. لە ژێر ئەم بارو حاڵەدا ناتوانرێت ئەو ژیانە ناوەکییە دروست ببێت کە بمانپارێزێت لەو" ئەبستراکتی ڕووت"ەی بوونی مرۆڤ کە هانا ئارێندێت

(1973) قسەی لەسەر کردووە. ئەم ڕووتی و والأبوونە کاتێك دەردەکەوێت کە ڕێگە دەگیرێت لە شوناسی ڕاستەقینە گەشە بکات وە هەروەها شوناسێکی ساختە جێی دەگرێتەوە کە لەسەر وەدەستهێنانی دەرەکی دامەزراوە، شوناسێك کە دابەش و لەت لەت دەبێت کاتێك کە کۆنتێکستی کۆمەلأیەتی شکست دێنێت بۆ وەدەست هێنانی ئەو ئامانجە. لەلایەکی تریشەوە، مانەوەو رزگاربوون لە مەرگ لە بەندیخانە سەربازیەکاندا تەنها بۆ ئەو کەسانە بوو کە خاوەنی شوناسێکی وەها بوون کە لەسەر پرۆسەی ناوەکی بونیادنرابوو نەك دەرەکی. ئەمەش هەمان دەرەنجامی دیس پریس (1976) بوو لە لێکۆلینەوەکەی دەربارەی مانەوە. گەر بێت و شوناس تەنها لەسەر "پێوەری دەرەکی" بنیات نرابێت ئەوا دەبێت باوەڕ بهێنین کە فەیلەسوفە نازیەکان ڕاست بوون.

دێس پریس دەنوسێت: "بەبیٚ ڕابردوو ئێمە هیچ شتێکمان نیە لەسەری بوەستین، هەروەها هیچ کۆنتیکستێکی وەها کە وزە و تواناکان ڕێکبخات لە ڕووی تێڕوانینی مۆراڵیەوە. بەلأم بەم پێیە بێت هەر کەس ئەزمونێکی هەبێت لە ڕابردووی ڕەسەن ئیتر تاکێکی نامۆ وەبەرهەم ناهێنێت؟ هەروەها نادیسزا مانیدلٚ (1970) دەڵێت: "مرۆڤ بە هاوارەکانی جەخت دەکاتەوە لەسەر ماف بۆ ژیان، پەیامی خۆی دەنێرێت بۆ جیهانی دەرەکی و داوای یارمەتی دەکات و بانگەشە دەکات بۆ بەرەنگاربوونەوە. "ئەوانەی کە دەبێت نکوڵی لە ئازارەکانیان بکەن تەنها کاتێك دەتوانن هاوار بکەن کە بڕوایان وا بێت ئازارەکانیان بەهۆی "بێگانەکانەوە"یە، لێرەدا دەکرێت ئەو نهێنیەی لە پشت سەرکەوتنەکانی هیتلەرەوە بدۆزینەوە، ئەو کە توانی سەرکەوتوبێت لە گواستنەوەی هەستی خۆبەکەمزانیی کەسیەتی خۆی بۆ هەموو نەتەوەی ئەڵمان. بە ملیۆنەها خەڵك هۆگری ئەم پڕۆژەی نەخۆشیەی هیتلەر بوون چونکە ئەوان نەیان ئەتوانی دان بەو قوربانی بوونەیان بنێن کە خۆی حەشارداوە لەناو کەسایەتیاندا.

ئەم پێکهاتە و دیاردە ترسناکەیە تا ئەمڕۆش بەرچاو دەکەوێت، لای هەندێك لە دەروونناسەکان ئەم میکانیزمە لەوێوە بەکاردەبرێت کاتێك کە سیاسیەکان بۆ بەکارهێنانی ئامانجە تایبەتیەکانیان خەڵکی هاندەدەن بەوەی کە ئەمان قوربانین. چەندە ئەمان نەتوانن هاوار بکەن بۆ ئازارەکانی خۆیان ئیدی ئەوەندە لەبار و ئامادە دەبن بۆ ئەوەی ببن بە هیتلەرێکی تر. بێدەنگکردن بەلای ماندێلەوە "تاوانێکە دژ بە مرۆڤایەتی".

پریمۆ لیڤی (1980) دەنوسێت: "زەریای ئازار، چ لە ڕابردوو و ئێستادا دەورەی داوین، وە ئاستەکەشی تا بێت لە بەرزبونەوەدایە ساڵ لە دوای ساڵ هەتا خەریکە وا نقوم ئەبین. ئیدی بێهودەیە چاوێکت داخەیت یاخود چاوێکت لەدوای بێت چونکە لە هەموو جێگایەکدایە، وە هەروەها لە هەموو لایەکەوەیە لە هەموو ڕێگایەکدا بەرەو ئاسۆ. تەنها لەناو ئێمەدا چەند کەسانێك هەن نە زۆر و نە کەم لەهەر جڤات و گروپێکی دی، ویژدانیان ئازاریان دەدا و هەست بە شەرمەزاری دەکەن و ئازار دەچێژن بۆ ئەو کارە ناڕەوایانەی ئەنجامدراون کە ئەوانی دی پێی هەستاون نەك ئەمان. ئەوەی وادەکات هەست بەم تێوەگلانە بکەن چونکە ئەمان وا هەست دەکەن ئەوەی ڕوویداوە لە دەوروپشتیاندا ئیدی کارێکی مەحاڵە و هەرگیز ناکرێت جارێکی تر پاکبکرێتەوە. وەك جەین ئامیری (1966)، کە ئەویش یەکێك بووە لەو کەسانەی سزادراوە لە جیستاپۆ، دەڵێت: "گەر کەسێك سزا بدرێت ئەوا ئەو سزایە هەر

دەمێنێتەوە بۆ هەتا هەتا، کەسێك تێپەڕیبێت بەو سزادانەدا هەرگیز لەم جیهانەدا هەست بە ئاسودەیی ناکات تەنانەت لە ماڵەکەی خۆشیدا. ئەو شەرمەی لە دوای ئیهانەکردنێکی وەها خراپەوە پەیدا دەبێت هەرگیز لە نێو ناچێت. یەکێك کە هەست بە متمانە دەکات لەم جیهانەدا، متمانەیەك کە بەیەکەم قامچی لێدان لە کاتی سزادانداا دەلەرزێت و دەڕوخێت، ئیتر هەرگیز ناکرێت ئەو متمانەیە بگەڕێتەوە".

لەبەرئەوەی بەهاو ڕێزی ناوەکی لای ئەو کەسانەی ڕزگاربوون زۆر سەرنج ڕاکێش نەبووە، یەکینەگرتۆتەوە لەگەڵ چاوەڕوانیەکانی ئێمە بۆ پاڵەوان و دەستکەوتی بالاّ. هەڵسوکەوتی رزگاربوەکان لە هەڵسوکەوتی ئەوانە دەچوو کە پێیان دەوترێت نەخۆشی ئەقڵیان هەیە: هەردووك بەوە دەناسرێنەوە کە هەڵگری دوالیزمەن، ملکەچی دەرەوەن و یەکانگیر و پەیوەستن بە تێڕوانینی تایبەتی خۆیان لە ناوەوە. نوسەری ئەفریکای باشوریی، کۆیتزی (1996) زۆر چاك لەوە تێگەیشتبوو کاتێك باس لە دوالیزمەی بەرەنگاریەکەی ئۆسیپ ماندەلستامی دەکات دژ بە ستالین. ئەم شاعیرە کە ستالین برسی کردبوو لە یەکێك لە زیندانەکانی چاوەڕوانی لە سێدارەداندا لە سۆڤیەتدا، بەشان و باڵی دیکتاتۆردا هەڵیدابوو لە شیعرێکدا بەلاّم تەنها بە ڕواڵەت، وەك کۆیتزی دەنوسێ، "ئەو لاشەی چامەیەکی دروست کردبوو بەلاّم بەبێ ئەوەی تیایدا بژیت".

دەبێت ئێمە هەموان بەردەوام بین لەسەر ئەو گریمانەی کە هەموو ئەوانەی لە کولتوری ئێمەدا گەورە دەبن ئەزمونی ئاستێك لە جۆری نامۆیی دەکەن لە خودی خۆیاندا. هەروەها ئەوەش دەگونجێت بچەسپێت بەسەر هەمووماندا کە هەندێجار ئێمە هەڵگری خودی خۆمان نین. ئەم پرۆسەیە زۆر جار دووبارە ئەزمون دەکرێتەوە لە چارەسەری دەرونیدا. یەکێك لە نەخۆشەکانم دایکێکی هەبوو کە ڕەفتاری چاوەڕواننەکراوی هەبوو، جارێکیان دایکی شوێنی دەکەوێت بە چەقۆیەکەوە پاشتر چەقۆکەی تێدەگرێت. لە کاتی دانیشتنەکانم لەگەڵ ئەم نەخۆشەمدا چەندین بەسەرهاتی لەم چەشنەی بۆ گێڕامەوە کە بەسەری هاتبوون. دواجار کە چاوم پێی کەوت بەم شێوازە دوا: "کاتێك جاری پێشو لای تۆم بەجێهێشت، هەستم بە تامەزرۆیەکی زۆر دەکرد بۆ بینینی دایکم. لە هەمان کاتیشدا هەستم بە بۆشاییەکی زۆر دەکرد. شانەکانم گرژبوبون، لە پڕێکدا دەستم کرد بە گریان بۆ دایکم. هەستم بە وزەیەکی تاریك دەکرد، وام هەستدەکرد لە ژیان دەرمدەهێنە دەرەوە، بێگومان ئەم هەستانەشم بەڕوونی پەیوەندی بە دایکمەوە هەبوو. بەڵێ، ئەو هەستەشم لا دروستبو بوو کە گەر من چەندە لەگەڵ دایکم بمێنمەوە توشی هیچ نابم. هەڵبەتە دوای ئەو دانیشتنەم لەگەڵ تۆ هەروەها گریانەکەم بۆ دایکم هەستم بەو تاریکایە کرد ئیدی ئەوە بویە پەناگەیەك بۆ من.

لێرەدا دەکرێت ئێمە سەرنجی ئەوە بدەین کە چۆن بە ئەزمونکردنەوەی ئەو ساتانەی کە ترس و تۆقاندن دەگۆڕێتە سەر هەستکردن بە ئارامی. هەروەکو ئەوەی کاتێك ترس لای منداڵێك چیدی بەرگە ناگرێت لەبەر ئەوەی بێ توانایە و لەژێر بەزەیی کەسێکی تردایە، ترسەکە دەگۆڕێتە سەر پێچەوانەکەی، واتە هەست بە ئارامی کردن. گەورەکانیش دەتوانن بە هەمان شێوە ئەم ئەزمونە بکەن لە کاتێکدا کە ژیان لە زیندانەکاندا بەسەر دەبەن یاخود لە ژێر سزادانداan، هەروەك جاکوب تیمەرمان (1982) باسدەکات کاتێك کە سزادراوە لە سەردەمی دیکتاتۆریەتی ئەرجەنتینەدا، هەروەها لای وۆل

سۆینکا (1972) کە خەلاتی نۆبلی پێدرا، کاتێك کە زیندانی بووە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی دیکتاتۆری نایجیریا جەنراڵ گوان. شێوازی زۆری دیکە پیشان دراوە لەم چەشنە ئەزمونانە لە دوا لێکۆڵینەوەی سپێنسدا (1996) دەربارەی زیندانە سیاسیەکانی وڵاتی چین، ئەو زیندانیانەی قەناعەتیان پێکردبوون، کە خەتای جەلادەکانیان نییە کە لە برسان دەمرن بەڵکوو خەتای خۆیانە.

لە ڕاستیدا بێگانە قوربانی ڕاستەقینەیە لە ناو ئێمەدا. خود لە ڕێگەی گوێڕایەڵیەوە تێکشکاوە، کەوای لێکردووە هەردەم لە توانایدا نەبێت بزانێت چی ڕوودەدات. گوێڕایەڵ، ئەکرێت بڵێن هەردەم خۆی دەخاتە ریزی کەسانی چەوسێنەرەوە بەلام لە هەمانکاتدا خۆی دەدزێتەوە لەو کارانەی دەیکات. بە دەربڕینێکی تر کەسی گوێڕایەڵ پشتگیری دەسەلات دەکات، بە جۆرێك کە ئەستەم بێت رقی پەنگخواردووی خەڵکی چەوساوە دژ بە خەڵکانی بەر پرس ئاڕاستە بکرێت. بەلام رق و تووڕە بوونەکە لەوێدایە، هەروەك چۆن ڕق لە قوربانی لە خۆماندایە، دواتر کەسەکە ڕەتدەکرێتەوەو وەکو بێگانەیەك ئەژمێردرێت تا ئەوان چاکتر لەسەر دەسەلات بمێننەوە.

لە میانی کارکردنمدا لەگەڵ نەخۆشەکانمداو هەروەها لە ڕێگەی تێگەیشتنمەوە بۆ پەرەسەندنە مێژووییەکان، سەرمەشقیان کردووم تا بگەمە ئەو باوەڕەی کە هەموو کولتورە "بالا"کان بە هێز و توندوتیژی بنیاتنراون هەروەها ئاراستەکراون لە ڕێگەی میکانزمێکی دەروونیەوە کە ئاکارەکانی مرۆڤ دەستنیشان دەکەن. لە ژێر ئەم کلتورە "بالا"ەی ئێمەدا جۆرێك لە حەزی دەست بەسەراگرتنی جیهان خۆی مەلاسداوە، تا ببینە خاوەنی و زاڵبین بەسەریدا هەروەها بە شێوەیەکی رەمەکی تا میکانزمێك دروست بکەین کە رێگەمان پێبدات ئەو حەز و خولیای داگیرکاریەمان بشارینەوە و نکوڵی لێبکەین. ئەم پرۆسەیەش لە ڕێگەی ئەو گوێلەمستیەوە پەرەی پێدەدرێت کە زاڵبونی باوان لە ئێمەدا چاندوویەتی — من بۆیە سزای تۆ دەدەم بۆ قازانجی خۆت–. ئەو هەوڵانەی کە هەن بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم بنەمایانە بەو مانایە هەموو تیورە پێشکەوتووەکانی منداڵ پێگەیاندن دەبێت سەرکەوتو نەبن چونکە ئەوان ناتوانن کرۆکی ئەو نامۆ بوونەی ناخی منداڵ ببینن کە لەگەڵ لەدایکبوونی (یان پێشتر) سەرهەڵدەدات. ئێمە وابەستە و گرێدراوی ئەم بارەین، نەخۆشەکان لە چارەسەری دەروونیدا لەگەڕاندان، بەلام بە کوێرانە، بۆ ڕێگا چارە و دەربازبوون. ئەوان بۆیە نەخۆش کەوتون چونکە لە ململانێدان لەگەڵ نامۆبوونی دەرونی خۆیان، کەچی ناشزانن و ناهوشیارن بەو کارەی دەیکەن. ئەو بارە هەڵگەڕاوەی ناو ناخیان وایکردووە کە بەشێوەیەکی بێکۆتایی نەگونجێن، لە ئەنجامیشدا ئەوان خۆیان بە کەسی نامۆو بێگانە دەبینن، تەنانەت هێلانە و نیشنگای خۆشیان ناشیرین کردووە هەروەها ساختە و ناپاکی لە تەك بەهاکانی کۆمەڵدا دەکەن.

ئەوان بۆیە دێنە چارەسەرگا چونکە دەگەڕێن بۆ یارمەتی هەتاوەکو دوورکەونەوە لە ریزبەندی "نەخۆش". ئەوان دەیانەوێت وەك ئەوانە بن کە ئەتوانن بە "ڕێکوپێکی" هەڵسوکەوت بکەن و ببن بە "ئازاد" هەروەها "ئازادبوون لە خەفەتباری" ئازادبوون لە بێزاری " هەروەها قوتاربوون لە "نیگەرانی" بێگومان ئەمانەش هەموو نیشانەکانی نامۆین.

ئێستا پێم خۆشە سەرنجەکانم وەرگێڕم بەلای ئەوانەدا کە باش گونجاون، ئەوانەی کە

ئێمە لە خانەی ساغەکان ئەژمێرمان کردوون، بەڵێ ئەوانەی کە بەسەرکەوتویی لە ململانێدان، کە بە توانان، هەبوون و دەوڵەمەندن هەروەها سەرکەوتون، بە مانایەکی دی ئەوانەی کەوا دەردەکەون کە قوتاریان بووە لە پەستی و نیگەرانی و هەروەها تلانەوە.

هەوڵدان بۆ دابەشکردنی خەڵکی بەسەر خانەی نەخۆش و ناساغدا بە ڕوونی دیارە کە سەرکەوتو نەبوە، چونکە نەیتوانیوە نەخۆشیە راستەقینەکە بەهەند وەرگرێت کە بوەتە هۆی بەرهەمهێنانی قوربانی. گەر ئەم بەشە گرنگەی بەرەو پێشچونی ئێمە لەبیر بکرێت، ئیدی تێگەیشتنی ئێمەی بۆ مێژوو هەر بە ناتەواوی دەمێنێتەوە. حەزی ئێمە بۆ تێگەیشتن لە مێژووی مرۆڤایەتی زۆر بێئاکام دەبێت هەتا ئێمە لە تواناماندا نەبێت ئەوە دیاری بکەین بە شێوازێکی گشتگیر کە بێگانە لەگەڵماندایە، نەتوانینی ئەمەش لەوێوە دێت کە ئێمە زۆرمان لێدەکرێ کە ئەوە رەتبکەینەوە کە تیرۆر و ئازار هەردوو ئێمە خۆمان بەرهەمی دەهێنین. ئەمەش رێگەمان لێدەگرێت کە بتوانین قوربانی بوونی خۆمان هەست پێبکەین و دەستنیشانی سەرچاوەکەی بکەین، لە ئەنجامی ئەمەشدا گوێڕایەڵی هەر بە بەردەوامی دەمێنێتەوە چونکە هەستێکی هەڵەی وا بەرهەمدەهێنێت وا دەزانین کە ئێمە لە ئاسایشداین. خۆ ئەگەر ئێمە جارێك سەرپێچیمان کرد ئەوا نقوم دەبین لە هەستی خۆ بە تاوانبار زانیندا.

هەموو ژیان و گوزەرانێك پێویستی بە گوڕ و جوڵە هەیە بۆ هاتنە بوون. لە رۆحی ئادەمیزادا بۆ مانەوە، دیسانەوە گوڕ و تین پێویستە لە نێوان پەیوەندی تاکەکاندا. تەنهایی نەك هەر هۆشیاری دەرەکی کەمدەکاتەوە، بەڵکو سەردەکێشێ بۆ شێتیش. هەریەك لە کالوس و کانیل (1970) ئەوەیان پیشانداوە کە ئەو هاوهەستی و گۆڕینەوەی نیگا لە نێوان دایك و کۆرپەی تازە لەدایکبوو وزە و تینێکی زۆر دەبەخشێت بە منالەکە. گەربێتو منداڵەکە وەڵامی دەستنەکەوێ لەم "سەمای چاوانە"دا ئەوە بۆ خۆی هێندەی هەڕەشەیەکی فیزیکی ترس خولقێنە.

هەر بۆیە پیاوکوژی بە تەنها کردەیەکی جەستەیی نییە بەڵکو ڕۆحیشە. کاتێك منداڵان توشی ئەم شێوازە لە توندوتیژی ناوەکی دەبنەوە ئیدی هەموو رێگایەك دەگرنە بەر بۆ مانەوە و قوتاربوون. هەر ئەمەبوو وایکرد لە فرەنسیزی (1984) کە لە ساڵی 1932 دا ئەمە ناوبنێ گواستنەوەی نیگەرانی و توندوتیژی بۆ هەستکردن بە ئاسایش. ئەم پرۆسەیەش لە کەشوهەوایەکی کۆمەڵایەتیدا گەشە دەکات کە رێگە دەداتە گەورەکان کە منداڵەکان بەکار بهێنن هەتا هەستەکانی خۆیان سودمەند ببێت واتە دەوڵەمەندکردنی – خود، هەروەها منداڵەکان پەلکێشی ئەوە بکەن کە بە خێرایی هەستە خۆرسکەکانی خۆیان و تێڕوانینەکانیان ڕەتبکەنەوە هەتا ئەو چاودێریکردن و ئاگاییەی گەورەکان ئەیکەن بۆیان بیهێڵنەوە و لەدەستی نەدەن. منداڵ کاتێك ئەمە دەکات کە بە تەواوی ملکەچی چاوەڕوانی و فەرمانەکانی گەورەکان بووە. فرەنسیزی بەمشێوەیە باسیکردووە: "منداڵان لە ڕووی جەستەیی و ئاکارییەوە بێتوانان، کەسایەتی ئەوان بەو شێوەیە کارا نییە تا بەهێزیان بکات بۆ ئەوەی بتوانن پارێزگاری تەنانەت لە بیرو بۆچوونەکانیشیان بکەن. دەسەڵات و هێزی سەختی گەورەکان وایکردووە ئەوان هەردەم بێدەنگ بن، هەمیشە گەورەکان هەستەکانیان دەدزن. بەڵێ، ترسی منداڵەکان کاتێك بە خێرایی گەیشتە ترۆپك، راستەوخۆ ئەوان ناچار دەکرێن کە ملکەچی ئارەزووەکانی شەرانگێز بن، بۆ ئەوەی

گوێڕایەڵی ئارەزووەکانی بن، هەتا بە تەواوی خۆیان لەبیر بکەن، هەروەها هەتا بە تەواوی هاوسۆز بن لەتەك كەسی شەڕانگێزدا".

له ئاوها هاوسۆزی و یەكبونێكدا نەك تەنها دەبێتە مایەی هاوپەیمان و پشتگیریان بۆ كەسی جەلاد بەڵكو دەیشیكەنە نمونەی باڵا. له چاوانی کەسی قوربانیدا، جەلاد وا دەردەکەوێت کە ئەو سەرچاوەی ئاسایشە. لە هەمانكاتیشدا قوربانیەكە وا هەست دەكات كە ئازارەکانی بە هۆی لاوازییەوەتی، چونكە جەلادەکە ئەم هەستانەی یاساخکردووە. گەر بێتو ئەم بە ئاگابێتەوە لە ئازاری قوربانیەکەی، ئیدی هەست بە تاوانباری خۆی دەکات. ئالێرەوەیە كە جەلاد دەبێت هەردەم لەمە خۆی بەدور بگرێت ئەویش لە ڕێگەی دابەزاندنی توندوتیژی زیاتر و زیاتر. لەگەڵ ئەمەشدا ئازارو هۆکاری تۆڵە لە قوربانیدا دەمێننەوە، تەنها كاتێك ئەم تۆڵەیە ڕووبەڕووی خود دەبێتەوە کە ئەزمونی بوونە بێگانە دەکات. ئەمەش بەشێکە لە پرۆسەی ڕاهاتن بۆ ئاراستەكردنی تۆڵە دژی بێگانەی دەرەکی. بێگومان گشتگیربوونی ئەم دیاردەیەش هەدەم مێژووی مرۆڤایەتی دیاری و یەكلاكردوەتەوە.

نووسین و خوێندنی مێژوو هەمووی لە دەوری فەرمانڕەواکان، ڕزگارکەران و هەروەها سەرکردە سەربازیە بەهێزەکان کۆبوەتەوە. زۆربەی ئاراستەکانی بیرکردنەوەی کۆمەڵناسی و مێژوویی ئەو تایبەتمەندیەی تیایە کە هەڵسوکەوتی ئەم کەسایەتیانەی لەخۆگرتوە هەروەها دەسکەوتەکانیان و سەرکەوتنەکانیان. من بڕوام وایە پێچەوانەکەی دەبێت بەهەند وەرگرین. مێژووی ئێمە قورسای خستوەتە سەر ئەو کەسانەی کە وا ئەژمێرکراون کە چاك و گونجاون، واتە ئەوانەی ئاراستەی تۆڵەو رقەکانیان ڕووەو بەردەست و کۆیلەکانیان کردوەو لە خۆیان لایان داوە پاشان ئەوانیشیان وەرگێڕاوەتە سەر دوژمنکار دژ بە بێگانەکان. لە ڕاستیدا، سەرکردە سەربازیە گەورەکان هەوڵیانداوە لە ڕێگەی ڕاکردن لە ئازارەکانی خودی خۆیان ئەوانەی بە دوژمن ژمێردراون تەفر و تونایان بکەن.

لە کتێبی "سایکۆلۆجیای قووڵو ئاکاری نوێ" (1969) ئیرك نیومان دەپرسێت، "ئایا كێشەی ئەخلاق لە سەردەمێكدا كە سەمای مەرگ تیایدا زاڵە لە ئارادایە؟ ئەو سەردەمەی كە سۆسیالیزمی ناسیۆنالیستیی لە ئەڵمانیادا جگە لە سەرەتایەك هیچی دیكە نەبوو؟ وەڵامەکەی ئەو بەڵێیە، چونكە هۆشیاریی مێژوویی لە توانایدا هەیە بە دوای بەرەو پێشچونی مرۆڤ بكەوێت وەك گشتێك، بەوە دەزانێت كە هەوڵە باڵاكانی نەوەی بەشەریی هەمیشە بۆ دروستكردنی تاك تەرخانكراوەو.. تەنها لە ڕووكارەوە سایكۆلۆژیا، كە تەنها لەم كاتەدا دان بەوەدا دەنێت كە تاكێتیی كێشەی بنەڕەتیی كۆمیونێتیە، پێدەچێت خەریكە شەڕەكە دەدۆڕێنێت. دووبارە و چەند بارە، ئەم دۆڕاندنانە لە ململانێکاندا وایلێدێت کە بگۆڕێتە سەر ئەو خاڵە گرنگانەی کە تیایدا گەشەسەندنی حەتمی لەنێو نەوەی مرۆڤدا سەرهەڵدەدەن." ڕەخنەگرەكان پێیان باشە ئەمە ناوبنێن بە سایكۆلۆجیكردن. پاڵنەرێكی شێوێنەر لە پشت ئەم ناڕەزایەتیەوە هەیە، بۆ ئەوەی مرۆڤ بێبەش بكرێت لە بەرپرسیاریەتی خۆی بۆ ئەوەی خۆ یان بە دوور بگرن لە هەستی خۆ بە تاوانبار زانین – بوونی هەستی بەرپرسیارێتیی.

زانستی سایکۆلۆجیا پێویستە خۆی خەریك بكات بە هەموو لایەنەکانی بوونەوەر، هەر ئەمەش ئەرکی سایکۆلۆجیا كە لە توانایدا بێت خزمەتی تاکیش بکات. دەرەنجام، چەقی ئەو

کێشەیەی کە گەرەکە ڕووبەڕووی بینەوە ئەوەیە، ئێمەی مرۆڤ چ بەشێکی خۆمانمان لەدەست داوە؟ پاشان چۆن و بۆچی ئەمە ڕوویداوە، هەروەها چ باشە بکرێت بۆ قەرەبووکردنەوەی؟ (بڕوانە: وتووێژی مێژوو 1979). لە ڕاستیدا گرفتی نامۆبوون لە ڕووی سیاسی و کۆمەلأیەتیەوە، کە سەر دەکێشێ بۆ کۆیلایەتی خۆبەخشانە، لە مێژە باسکراوە لەلایەن (ئیستایننە دی لا بۆتی) لە سەرەتای ساڵانی 1550.

ئامانجی ڕۆحی من لەم باس و خواسەدا ئەوەیە کە بتوانم ئەوە ئاشکرا کەم چۆن توانراوە ڕێژەیەکی زۆری خەڵك، لە شارۆچکەکان، شارەکان و نەتەوەکان ڕێگە دەدەنە تەنها پیاوێك تا بیانچەوسێنێتەوە، پیاوێك کە هیچ هێزێکی نیە جگە لە هێزی ئەوان نەبێت کە خۆیان پێیان داوە، هەروەها ئەو ئەکرێت ئازاریان نەدات گە بێتو ئەوان خۆیان ئارەزویان نەبێت لە ئازار خواردن، هەروەها پیاوێك کە ئەشێ هەرگیز خراپ نەبێت بۆیان گەر بێتو ئەوان خۆیان ئامادەی بەرگەگرتنی ئەو خراپەکاریە نەگرن و بوەستنەوە لە دژی ئەو ڕێگەی ئەو. بێگومان زۆر کێشەیەکی ئازاراویە- هەرچەندە زۆر باوە کە هەردەم ئازارەکانمان گەورەترن لە شتە کتوپڕ و خۆڕسکەکان – کە ببینیت هەزاران پیاو لە بارێکی کۆیلایەتی دژواردابن، گەردن کەچی ڕێشمە و هەوسار بن، ئەوان لەم بارەدان نەك لەبەر ئەوەی تەسلیمی هێزێکی گەورە بوون، بەڵکو وا دەردەکەوێت چونکە ئەوان جادویان لێکراوە بە تەنها لە لایەن پیاوێکەوە، پیاوێك کە ئەوان پێویستە نە بترسن لێی (چونکە تەنها پیاوێکە) و نە خۆشیشیان بوێت (لەبەرئەوەی ئەو نامرۆڤانە و بەربەریانە مامەڵەیان لەتەك دەکات).

هەر بۆیە (بۆییتی) سیاسەتی گوێڕایەڵی وەسف دەکات بە دەرەنجامە سیاسیەکانی هاوهەستی لە تەك شەڕانگێزدا – واتە پرۆسەیەك فرینکزی (مەبەست تێڕوانینەکانی سیندۆر فینکزی گەورە دەرونشیکاری هەنگاریە – وەرگێڕی کوردی) زۆر بە ڕوونیی دەیگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری منداڵی:

"ئەوانەی کە لە دەوروپشتی ستەمکارن هەردەم خەریکی خۆبردنە پێشەوەن لێوەی هەروەها لێدەپاڕێنەوە کە چاك بێت بۆیان، ستەمکارەکەش ئەمە دەبینێت، داوایان لێدەکات کە نەك هەر ئەو کارانە بکەن کە ئەم پێیان دەڵێت بەڵکو بەو ئاقارەشدا بڕۆن کە ئەم دەیەوێت، هەروەها زۆر جار، ئارەزووەکانیشی بۆ پێشبینی بکەن. هەڵبەتە بە تەنها ئەوە بەس نییە کە خەڵکی گوێڕایەڵی بکەن، بەڵکو گەرەکە ئەوان ڕازیکەر بن بە چەندین ڕێگای جیاواز جیاواز، هەروەها گەرەکە نارەحتی زۆر بچێژن، ئەشکەنجەی خۆیان بەن و ڕێگەی قەبر بگرنە بەر بۆ ئەوەی کارەکانی ئەو سەربگرن، وە دەبێت هەردەم ئارەزوو و خۆشیەکانی ئەو بە خۆشیەکانی خۆیان بزانن، چێژەکانی جێگای چێژەکانیان بگرێتەوە، ئەوان دەبێت هەڵکەوتەی سروشتی خۆیان لە دەست بەن و بیگۆڕن، گەرەکە دەستبگرن بە هەر ووشەیەکەوە لە زاری دێتە دەر، بگرە تۆن و ئاوازی قسەکردنیشی، ئاماژەکانی، دەربڕینەکانی، دەبێت گشت ئەندامەکانیان ئامادەباشبێت بۆ پێشوازیکردن لە خۆزگەکانی و ئاگاداربوون لە بۆچونەکانی".

لەگەڵ ئەمجۆرە لە وەسفکردنی ئەرکە سیاسیەکانی هاوهەستی لە تەك ستەمکاردا، ڕێگە دەداتە ئێمە کە نەك هەر بگەڕێینەوە بۆ ڕەگوڕیشەی کێشەی نامۆبوون بەڵکو بۆ ئەو ئازارە ڕۆحیە قوڵەی مرۆڤایەتی پێوەی ئەتلێتەوە لەم پرۆسەیەدا. بەلأم ئەم زامە

سەختانە ناکرێت بە سانایی دانیان پیا بنرێت چونکە ئەوە وا دەکات سوکایەتی بکرێت بەو سەرکردەیەی دەبێ گوێڕایەڵیی بکرێت. هەروەها بە ئایدۆلۆژیکردنی دەسەڵاتیش ئەمەی دەوێت بۆ دڵنیابوونی خۆی و بەردەوامی بوونی. ئیدی یەکێك دێت و قوربانیبوونەکەی خۆی دەگوازێتەوە بۆ یەکێکی تر لە ڕێگەی سزادانی "بێگانە" لە دەرەوەدا و دروستکردنی بێگانە، واتە ئەو کەسەی وا دەبینرێت کە هەموو شتێکی تێدا بێت لەوەی کە ئێمە ڕقمان لێیبێت. ئەنجامەکەشی ئەو ڕێگایانەی کە کاراکتەر و هەڵسوکەوتی کەسێکی ئاسایی پێدەناسینەوە لە کولتووری ئێمەدا: بێگومان دەکرێت وەسفی بکەین بە ئەو هەوڵە درێژخایەنەیە بۆ کۆنترۆڵکردنی پارچەیەکی ئازاراویی لە سروشتی خودی خۆمان– بەڵێ ئەو بەشەی لە خۆمان کە ونمانکردووە و وامانلێدەکات هەردەم هەست بە کەمی و بێدەسەلاتی بکەین – لە ریگەی بە قوربانیکردنی "ئەوانی دی" هەتا سزایان بدەین لە پێناوی کپ کردنی ئەو ئازارەی کە نابێ بیچێژین و ئەو قوربانیەی ناخمان کە نابێ ئێمە بین.

## پەراوێز:

ئارنۆ گروون، بیریار و دەرونشیکاری ئەڵمانیە، لە ساڵی 1923 لە بەرلین لەدایك بووە و هەر بە مێرد منداڵی لە ساڵی 1936 دا هەڵدێت بۆ ئەمەریکا و لەوێ دەرونشیکاری دەخوێنێ. گروون خاوەنی دەیان کتێبی بەنرخ و تێزی بەنێوبانگە لە بواری دەروونناسی و دەرونشیکاری و پەروەردەی سیاسی و زانستی ئاکاردا کە بەداخەوە خوێنەری کورد بە هیچیان ئاشنا نییە، لەوانە کتێبی خیانەت لە خۆکردن و شێتی وەك بارێکی ئاسایی و بێگانە لە خۆماندایە.. هتد، ئەم وەرگێڕانە هەوڵێکی کەمە بۆ ناساندنی تێزەکانی گروون. (وەرگێڕ).

## سەرچاوە:


*Arno Gruen, The Need to Punish: The Political Consequences of Identifying with the Aggressor, The stranger within us (2001) published by Klett-Cotta (Stuttgart) & The Journal of Psychohistory, Vol 27, No. 2, Fall 1999.*

# پرۆژەی تێگەیشتن و راڤەکردنی ئاین ( سۆسیۆلۆژیا و ئاین )

دانیال هیرڤیۆلێژی و ژان پۆل ویلیەم

لە فەرەنسییەوە: عادل باخەوان

## بەشی پێنجەم

### ئێمیل دۆرکایم
(1917-1858)

#### 1-دۆرکایمی گەورە:

دۆرکایم زیاتر لە هەموو سۆسیۆلۆگەکانی دیکە، شایەنی ئەوەیە کە کارەکتەری "دامەزرێنەر"ی سۆسیۆلۆژیای پێببەخشرێت. ئەو دامەزرێنەربوو چونکە ناوەرۆکی پرۆژەکەی بریتیبوو لە: دامەزراندنی سۆسیۆلۆژیا وەك زانستی پۆزەتیڤ و سەربەخۆ لە سایکۆلۆژیا و فەلسەفەی مێژوو.

پرۆفیسۆری گەورەی سۆسیۆلۆژیا لە زانکۆی سۆربۆن، دامەزرێنەری گۆڤاری *Lannee sociologique* لە سالی 1897، دۆرکایم بوو بە گەورەترین قوتابخانە بۆ توێژینەوەو بەرهەمهێنانی زانست. لە گروپەکەی دۆرکایمدا ئەم ناوە گەورانە بەرچاومان دەکەون: مارسێل موس (برازای دۆرکایم)، مۆریس ئەلڤاکس، سێلیستین بوگلێ، هنری ئیوبێر، رۆنی ئێرتز، پۆل فۆکنێ، پۆل لاپی، جۆرج داڤی.

دۆرکایم تەنها هەر لە فەرەنسادا وەك دامەزرێنەر نەناسراوە، بەڵکو لە هەموو جیهاندا ناسراوە و لە زانکۆکاندا دەگوترێتەوەو بووە بە سەرچاوەی فراوانی هەزاران رۆشنبیر و توێژەری جیهانی. لە هەر وڵاتێکی جیهاندا سەدان بابەت و کۆنفرانس و کتێب لەسەر فیکری ئەو بەرهەم هێنراوە. بێگومان لە نێو ئەم تەوژمەدا، چەند دۆرکایم وەك خۆی ناسێنراوە، ئەوەندەش شێوێنراوە. لە زۆر جێگای جیهاندا بەشێوەیەکی ئایدۆلۆژیانە کار لەگەڵ دۆرکایمدا کراوەو لە هەندێك جێگای جیهانیشدا هێندە سادەکراوەتەوە کە ئێمە نەیناسینەوە[1].

لە چەند جێگایەکی دیکەدا دۆرکایم کورتکراوەتەوە لە یەکێك لە بنەما

سۆسیۆلۆژیەکانیدا کە بریتییە لە: بینین و کارکردن لەسەر فاکتە کۆمەڵایەتییەکان وەك شت. واتە وەك چۆن شتێکی فیزیکی (ئۆتۆمۆبیل، کورسی، کامێرا، هتد) کۆمەڵێك یاسا دەیبەن بەڕێوە، ئاواش هەر فاکتێکی کۆمەڵایەتی چەند یاسایەك دەیبات بەڕێوە. ئەمە یەکێکە لە شێواندنەکانی سۆسیۆلۆژیایەکی گەورەی دۆرکایمی گەورە.

لە هەندێك جێگای دیکەی جیهاندا و لەسەر ئاستی ئایدۆلۆژیا، زۆر بە توندی تیری رەخنە ئاراستەی دۆرکایمی پۆزەتیڤیست و دۆرکایمی فۆنکسیۆنالیست و دۆرکایمی مۆرالیست کراوەو تێزەکانی خەڵتانی خوێنکراون. لەم بوارەدا، هۆلیسمی[2] دۆرکایم وەك فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی ترسناك خراوەتە سەر شانۆ.

بەڵام لە هەمانکاتدا و لەسەر ئاستی جیهان، سەدان بیریاری گەورە کاریانکردووە لەسەر خستنە سەر شانۆی دۆرکایم وەك خۆی. ئەم زانایانە توانیویانە قووڵببنەوە لە ئاڵۆزیەکانی کارگە سۆسیۆلۆژیەکەی دۆرکایمێك کە:

-لەسەر ئاستی زانست توانیویەتی تیۆریەکی تاقانە بەرهەم بێنێت.

-لەسەر ئاستی پرسیاری کۆمەڵگەش پیاوێکی پابەندبووەو هەندێکجار ئەم پابەندیەشی لە ناخەوە دڕاندویەتی.

ڕاستە لە ئێستادا پرسیارەکانی کۆمەڵگە هەمان ئەو پرسیارانە نین کە لە سەردەمی دۆرکایمدا هەموو لایەکیان هەراسان کردبوو. ڕاستە وەڵامەکانی دۆرکایم لەسەر ئەو پرسیارانە ڕەنگە لە ئێستادا جێگای مشتومڕبن. بەڵام ئەوەش ڕاستە کە گرەوەکانی تیۆریە سۆسیۆلۆژی و سیاسی و ئەخلاقیەکەی دۆرکایم و بنەما زانستیەکانی کارگە فیکریەکەی تا ئێستاش بەوپەڕی هێزەوە لە ناومانـدا کاردەکەن و کارایی خۆیان بەسەر ڕوداوەکانی ئێستا و ئێرەوە دادەنێن. چونکە ئەو بنەما و گرەوانە لکاون بە سروشتی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و داهاتوویان لە نێو کۆمەڵگەی تاکەکاندا. واتە لە نێو ئەو کۆمەڵگایانەدا کە لەسەر بنەمای تاکگەرایی خۆیان دادەمەزرێنن و درێژە بە ژیانی خۆیان دەدەن. بە درێژایی بەردەوامبوونی مێژووی پەیوەندی کۆمەڵایەتی، بنەما و گرەوەکانی دۆرکایمیش درێژ دەبنەوە و لە نێوماندا دەمێننەوەو دەبن بە مەیدانی بیرکردنەوەو ڕامان و کەڵك لێوەرگرتن.

## 2-مۆراڵێکی سارد ژیانی کۆلێکتیڤمان دەبات بەڕێوە

ساڵی 1858 لە شاری ئێپینال دۆرکایم لەدایکدەبێت. پاش کۆچی دوایی باوکی ناچار دەبێت هەر بە لاوی ئەرکی ژیانی خانەوادەکەی بگرێتە ئەستۆ. لە قوتابخانەی نۆرماڵی باڵا، کە هەر لەوێ بێرگسۆن و ژۆرێس دەناسێت، دۆرکایم وەك کەسێکی پابەندو وریا و زیرەك و تاقانە بەرهەستی هەموو لایەك دەکەوێت.

کوری حاخامێکی جولەکە، پاش گەورەبوونی لە نێو زانستدا، دۆرکایم دەست لە ئاین بەردەدات و لەوپەڕی ئاینەوە بەرەو ئەوپەڕی ئیلحاد دەڕوات! و پاشان دەبێت بە گەورەترین هیومانیستی جمهوریەتی سێیەمی فەرەنسی. بەشێکی زۆر لە توێژەران، لە نێو مێژووی کۆمەڵایەتی خودی دۆرکایمدا دەگەڕێن بۆ سەرچاوەکانی بایەخدانی دۆرکایم بە فاکتە ئاینیەکان و تەماشاکردنیان وەك فاکتی کۆمەڵایەتی.

دۆرکایمی جولەکە، مولحید، لایك، هیومانیست، لایەنگری جمهوریەت، لە نێو هەلومەرجێکی تەواو تایبەتدا گەورە بوو. بە

بەرچاوی ئەوەوە هەموو ئەم روداوانە تێپەڕین: شکستی سالّی 1870، سەرکوتکردنی توندو تیژانەی کۆمۆنۆی پاریس[3] ( la commune de paris)، گەشەکردنی تەوژمی ناسیۆنالیستی مەترسیدار لە فەرەنسادا.

هەموو ئەمانە وا لە دۆرکایم دەکەن کە بە درێژایی تەمەنی سەرقالّی بیرکردنەوە بێت لەوەی کە: چۆن جمهوریەت دەتوانێت هەلومەرجێك دروستبكات کە تیایدا هاولاّتیان پێکەوە ببن بە خاوەنی چەند بەهایەکی هاوبەش و ژیانی کۆمەلاّیەتیانی لەسەر ڕێکبخەن. لێرەوە پەنا دەبات بۆ چەمکی لایسیتیّ و تەنانەت دەبێت بە ئەندامی فێدێراسیۆنی لاوانی لایك و پەیوەندیەکی بەهێز لەگەلّ ژۆرێس دا دادەمەزرێنێت و پشگیری پرۆژە سۆسیالیسمی هیومانیست دەکات کە خودی ژۆرێس پالّەوانی یەکەمی بوو. بەلاّم لەگەلّ هەموو ئەمانەشدا، دۆرکایم هەرگیز بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ تێکەلّ بە سیاسەت نەبووەو پێش هەموو شتێك پیاوی زانست بووە.

بۆ کارکردن لەسەر هەموو ئەو پرسە گرنگانە، دۆرکایم هۆلّی زانکۆکان و سەکۆ زانستیەکان هەلّدەبژێرێت و لەم سەرشارانەوە ماکینەی توێژینەوەکانی دەخاتە کار، بەلاّم هەمیشە بە گیانی پێغەمبەرێکەوە کە دەیەوێت شتەکان بگۆڕێت چالاکیەکانی بەرهەمدەهێنا.

سالّی 1882 دەبێت بە مامۆستای فەلسەفەو لە یەکێك لە ئامادەییەکانی فەرەنسادا وانە دەلّێتەوە. سالّی 1886 دەبێت بە مامۆستای پەروەردە لە زانکۆی بۆردۆ. یانزە سالّ لەم زانکۆیەدا دەمێنێتەوە. هەر لێرەش نامەی دوکتۆراکەی لەسەر دابەشبوونی کاری کۆمەلاّیەتی تەواو دەکات و سالّی 1893 بلاّوی دەکاتەوە. لەم یانزە سالّەدا دۆرکایم بنەما سەرەتاییە گرنگەکانی تیۆریە سۆسیۆلۆژیەکەشی بینادەکات کە دەکرێت وەك دەرەنجامی وانەکانی تەماشای بکەین. لەم یانزە سالّەدا وانەی لەسەر ئەم بابەتانە لە زانکۆی بۆردۆدا وتوەتەوە:

–هاریکاری کۆمەلاّیەتی

–خێزان و پەیوەندی خێزانی.

–خودکوژی

–فیسیۆلۆژیای ماف و ئەخلاق

–فاکتی ئاینی

–نامۆبوون

–کار

پرسیاری ناوەندی لای دۆرکایم بریتی بوو لە چۆنیەتی بیناکردنی جیهانێکی کۆمەلاّیەتی کە دادپەروەری تیایدا سەروەر بێت. لە نامەی دکتۆراکەیدا ئەم پرسیارە بە شێوەیەکی زەق سەر ئاو دەکەوێت. تەنانەت بۆنی تێگەیشتنە گەشبینە پۆزەتیڤیستیەکەی ئۆگیست کۆنت یشی لێوە دەهات. دۆرکایم لە خۆی دەپرسی:

–ئەو میکانیسمە کامەیە کە بەقەدەر ئەوەندەی مرۆڤ دەخاتە نێو گەردونی ئۆتۆنۆمیەوە، ملکەچیشی دەکات بە دروستکردنی پەیوەندی لەگەلّ کۆمەلّگەدا؟

–کامەیە ئەو مێکانیسمەی کە پەیوەندیە کۆمەلاّیەتیەکان لە نێوان تاکەکاندا دادەمەزرێنێت؟

–چۆن دەتوانین پارێزگاری بکەین لەو پەیوەندیە کۆمەلاّیەتیەی کە لە ژێر زەبری کۆمەلّگە مۆدێرنەکاندا و رۆژ لە دوای رۆژ هەلّدەوەشێتەوە؟

دۆرکایم هەر لە سەرەتاوە کلیك دەکات لەسەر بێدەسەلاّتی کۆنترای ئارەزومەندانەی کۆمەلاّیەتی جان جاك رۆسۆ و پێیوایە کە تەواو

سنوردارەو ناتوانێت ببیٚ بە بنەمای پەیوەندی کۆمەڵایەتی. هەروەها تیۆریەکەی سپنسەریش پەراوێز دەخات و پێیوایە بوونی بەرژەوەندی هاوبەشی تاکەکان بۆ ئەوەی هاریکاری یەکتری بکەن تێزێکی لاوازەو ناکرێت ببێتە منالٚدان بۆ لەدایکبوونی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و بەردەوامبوونی.

دۆرکایم لە ڕێگای کێشانی هێڵێکی گەورەوە سنورەکانی دوو جۆر لە هاریکاری لە یەکتری جیادەکاتەوە:

هاریکاری میکانیك کە مۆرکی کۆمەڵگەی ترادیسیۆنێلە. کۆمەڵگەیەك کە لە ڕێگای یەکڕەنگی و یەکدەنگی و "ئینسیجامەوە" خۆی دەخاتە سەر شانۆ. ئەم کۆمەڵگەیە هەموو ئەندامەکانی باردەکات لە وشیاریەکی کۆلێکتیڤ[4] و چوارچێوەکانی گوتار و ڕەفتارەکانیان دیاری دەکات و خۆی دەسەپێنێت بەسەریانداو ڕایاندەکێشێتە نێو دێتێرمینیسمەوە[5].

هاریکاری ئۆرگانیك کە مۆرکی کۆمەڵگەی مۆدێرنە. کۆمەڵگەیەك کە لە ڕێگای یەکترتەواوکردنی تاکەکان و گروپەکانیەوە خۆی دەخاتە سەر شانۆ. لەم کۆمەڵگەیەدا لاوازبوونی وشیاریی کۆلێکتیڤ خۆی وردەگێڕێتە سەر دامەزراندنی کۆمەڵگەی ماف و کەمتر کلیك دەکات لەسەر سزادان و زیاتر گرنگی دەدات بە چاککردنەوەی ئەو شتانەی کە لە ڕێگای کردەیەکی خراپەکاریەوە تێکدەچن.

دۆرکایم هەر لە سەرەتای کارەکانیەوە، هێڵێکی ڕاستەوخۆ دروستدەکات لە نێوان پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ستراکتۆرە مۆراڵیەکاندا و پێیوایە ئەم ستراکتۆرانە لە نێو مێژووە کۆمەڵایەتیەکەی هەر کۆمەڵگەیەدا دروستبوون و دەتوانن چوارچێوەکانی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان دەستنیشان بکەن.

واتە ئەوەی کە پەیوەندی کۆمەڵایەتیەکانی ئێمە دەستنیشان دەکات، ئێمە خۆمان نین، بەڵکو ئەو ستراکتۆرە مۆراڵیانەیە کە لە مێژووی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکانماندا دروستبوون و پێش لەدایکبوونی ئێمە لێرەن و دوای مردنی ئێمەش درێژە بە تەمەنی خۆیان دەدەن. ئەوە ژیانی تاکانەی ئێمە نیە کە ژیانی کۆلێکتیڤ دروستدەکات، بەڵکو ئەوە ژیانی کۆلێکتیڤە کە ژیانی تاکانەی هەریەکێك لە ئێمە دروستدەکات.

لە سەرەتای کتێبی بنەماکانی میتۆدی سۆسیۆلۆژی دا، دۆرکایم دەنووسێت:

"کاتێك من ئەرکی برا، مێرد، یان هاوڵاتی ئەنجامدەدەم، دەبم بە جێبەجێکاری ئەو فەرمانانەی کە لە دەرەوەی منەوە دێن و خۆیان فەرز دەکەن بەسەرمدا (...)

من دروستکاری هیچ یەکێك لەم ئەرکانە نیم. بەڵکو هەموویانم لە ڕێگای پەروەردەوە پێگەشتووە (...)

باوەڕداران پراکتیکردنی ژیانی ئاینیان هەر لە لەدایکبوونەوە بەسەردا فەرزدەکرێت. ئەم پراکتیکانە پێش لەدایکبوونی ئەو و دوای مردنیشی لێرەن و لێرە دەمێننەوە. کەواتە لە دەرەوەی ئەوەوە بوونیان هەیە و بوونیان نەلکاوە بە بوونی ئەوەوە (...)

لێرەوە، چۆنیەتی کارکردن و بیرکردنەوەو هەستکردن وەك ستراکتۆر و لە دەرەوەی وشیاری تاکگەرا ئامادەن".

کاتێك ئەم پەرەگرافە دەخوێنینەوە، ڕاستەوخۆ بیرکردنەوەمان خۆی دەباتەوە سەر ئەو کەسانەی کە دۆرکایم تەنها وەك زانایەکی دێتێرمینیستی ستراکتۆریالیست دەبینن. بەلاٚم لە ڕاستیدا تیۆریەکی دۆرکایم زۆر لەوە قوڵترو ئاڵۆزترە تا وا بە ئاسانی بخرێتە نێو چوارچێوەیەکەوە.

ئێمە نابێت هەرگیز لەبیرمان بچێت کە

پەیوەندی نێوان وشیاری کۆلێکتیڤ و توانایی ئەخلاقی تاك لە تیۆری دۆرکایمدا خۆی لەسەر جۆرێکی تایبەت لە تەوەتور دادەمەزرێنێت. واتە ڕاستە کە دۆرکایم پلەی یەك دەبەخشێت بە ستراکتۆرە کۆمەلأیەتیەکانی کۆمەڵگە، بەلأم ئەوەش ڕاستە کە تواناییەکی بەهێزی ئەخلاقی لە تاکەکاندا دەبینێتەوە. تواناییەك کە یارمەتیان دەدات بۆ ئەوەی بە هارمۆنی لەگەڵ ستراکتۆرە کۆمەلأیەتیەکاندا بژین و هاوکاریان دەکات بۆ ئەوەی بتوانن لەگەڵ ئەوانی دیکەدا پێکەوە هەڵبکەن.

تەنانەت لە لاپەڕە سەرەتاییەکانی نامەی دوکتۆراکەیدا ئاماژە بەوە دەدات کە بەرزبوونەوەی ئاستی زبری ستراکتۆرە کۆمەلأیەتیەکان هەڕەشەیەکی زیندوون بەسەر ئۆتۆنۆمی تاکەکانەوە. واتە دۆرکایم باس لە هەڕەشە دەکات! لە چەندین جێگای دیکەشدا داوا دەکات سنور بۆ دەسەلأتی دەوڵەت دابنرێت بۆ ئەوەی نەتوانێت دەستوەر بداتە ژیانی تایبەتی و مافە ڕەواکانی کەسی تاکەوە.

لە بیرمان نەچێت کە خودی دۆرکایم منالی ئەو کۆمەڵگە مۆدێرنەیە کە لە دەرەنجامی پێشکەوتن و گۆڕانکاریە ناوەکیەکانیەوە، فۆرمەکانی ژیانی تاکگەرای بەرهەمهێناوەو لە نێو دیتێرمینیسمە کۆمەلأیەتیەکانیدا فۆرمەکانی ئۆتۆنۆمی تاکەکانی دروستکردوە. ئێمە دەبێت دۆرکایم لە نێو ئەم کۆنتێکستەدا بخوێنینەوە.

ساڵی 1902 دۆرکایم بۆ یەکەمجار دەگاتە سۆربۆن و دەبێت بە پرۆفیسۆر لە بواری زانستی پەروەردەدا. ساڵی 1912 کتێبە بەناوبانگەکەی بەناوی فۆرمە سەرەکیەکانی ژیانی ئاینی بلأودەکاتەوە. ساڵی 1913 لە سۆربۆن دەبێت بە پرۆفیسۆر لە بواری سۆسیۆلۆژیادا. ساڵی 1916 لە ژێر زەبری نەخۆشیدا واز لە چالاکیەکانی دەهێنێت. هەر لەم ماوەیەدا تەرمی ئەندرێی کوڕی لە بەرەکانی جەنگەوە خۆی دەکات بە ماڵدا و دۆرکایمی نەخۆش ناچار دەکات کە لەسەر گۆڕەکەی بگری. زۆری پێناچێت و لە 15 ی نۆڤەمبەری 1917 دۆرکایمیش کۆچی دوایی دەکات و ژیان بەجێدەهێڵێت.

## 3-گەڕان بەدوای پێناسەی ئایندا

بە درێژایی مێژووی زانستی دۆرکایم، دوو ڕەگەزی سەرەکی پانتاییەکانی بیرکردنەوەو ڕامانی داگیر دەکەن:

–سروشتی پەیوەندی کۆمەلأیەتی

–هەلومەرجی یەکێتی کۆمەلأیەتی

ئیشکالیەتی سۆسیۆلۆژیای دۆرکایم بەم دوو ڕەگەزە دروستکراوە. لە دەرگایەکی گەورەی واوە ئاین دێتە ژورەوە. لە چرکەی پشکنینی ئیشکالیەتەکەیدا، دۆرکایم هەست بەوە دەکات کە ئاین کلیلی پەیوەندی کۆمەلأیەتیە. دەرەنجامی بایەخدانی فراوانی بە ئامادەیی ئاین لە نێو جومگەکانی پەیوەندیە کۆمەلأیەتیەکاندا، بەشێك لە هاوڕێ هەرە نزیکەکانی تووڕە دەکات. ئەمە زۆر بە ڕوونی لەو نامەیەدا دەردەکەوێت کە جۆرج لاپی لە 7مێی 1897 دا بۆ بوگلێی هاوڕێی دەنوسێت:

"دۆرکایم ئێستا هەموو شتەکان بە ئاین ڕاڤە دەکات. هەموو شتەکان. قەدەغەکردنی ژنخوازی لە نێوان خانەوادەیەکدا، تەنانەت خەمۆکیش دەباتەوە سەر ئاین (...)"

ئەمە تەواو ڕاستە، چونکە دۆرکایم پێیوایە: ئێمە تەنها لە ئایندا فۆرمی یەکەمی گیانی هاوبەش و یەکێتی کۆمەلأیەتی و پێکەوە ژیان دەدۆزینەوە. ئاخر کۆمەڵگە بریتی نیە لە

کەڵەکـــەبوونی تاکـــەکان لـــە پانتاییـــە جوگرافیەکاندا، بەڵکو بریتیە لە:

"کۆمایەك لە بیرکردنەوەو بۆچوون و باوەڕو هـەموو جۆرەکـانی هەسـتکردن کـە لەلایـەن تاکەکانـەوە خۆیـان بەدیـدەهێنن. لـە سـەرەتای هـەموو ئەمانەشـەوە ئـەو شـتە دەردەکـەوێت کـە نـاوی دەنـێین مـۆراڵی ئیـدیال، کـە هۆکـاری سەرەکی ژیان و بوونی هەر یەکێك لە تاکەکانی کۆمەڵگەیە[6]"

کارکردن لەسەر ئاین کارکردنە لەسەر ئەو هەلومەرجـەی کـە مـۆراڵی ئیـدیالی تیـادا بینـاکراوە. هـەروەها پرسـیارکردنە لەسـەر داهـاتووی کۆمەڵگـە مۆدێرنـەکان کـە تیایانـدا مۆراڵی ئیدیال لـە ڕێگـای ئاینـەوە گوزارشـت لـە خۆی ناکات:

"دەبێت ڕیشەکانی ئەو هێزە بدۆزینەوە کە تا ئێستاش وا لە مرۆڤەکان دەکات کە لە ڕێگای فـۆرمی ئاینیـەوە گوزارشـت لـە مـۆراڵی ئیـدیال بکەن. پێویستە ئێمە ئەم مۆراڵە لە سامبۆلەکان روتبکەینـەوەو بەشـێوەیەکی عـەقلانی بیخەینـە سەر شانۆ[7]"

لێکۆڵینـەوە لـە ئـاین، لێکۆڵینەوەشـە لـە سەرچـاوەکانی پەیوەنـدی کۆمەلایـەتی، بـۆ ئەوەی تێبگەین لە بیناکردنەوەی ئەو پەیوەندیە لە کۆمەڵگەیەکی لایسیزەکراودا.

ساڵی 1899، دۆرکایم لە گۆڤاری ***Annee sociologique***دا بابـــەتێك بـــە نـــاوی "پێناسـەکردنی فـاکتی ئـاینی" بلاۆدەکاتـەوە. بـەپێی ئـەو بنـەما میتۆدۆلۆژیانـەی کـە خـۆی پێشنیاری کردووە، پێش هەموو شتێك دەبێت پێناسـەی ئـەو بابەتـە بکـات کـە کـاری لەسـەر دەکات. هـەر بۆیـە لێرەدا هەوڵدەدات پێناسـەی ئاین بکات.

بێگومـان دۆرکـایم نایـەوێت بەشـێوەیەکی ڕوتوقـوت بـاس لـە ئـاین بکـات، بـەڵکو ئـەو دەیـەوێت ڕاوی ئـەو کۆمەڵـە فینۆمێنـە بکـات کـە پێکـەوە دەبـن بـە مەیـدانی دەرکـەوتنی فاکتـە ئاینیەکان و خاوەنی کاراکتەری هاوبەشن. واتە دۆرکـایم خـۆی دوردەخاتـەوە لـە پێناسـەکردنی جەوهەری شتەکان، هەر لـە ڕاستیدا ئەمە کاری سۆسیۆلۆگیش نیە، ئەوەی بەلای ئەوەوە گرنگە دەرکەوتنی ئاینە لە فاکتەکاندا.

بەمـــشێوەیە توێژینـــەوەی دۆرکـــایم کارکردنە بۆ:

"ســنوردارکردنی بازنـــەی فاکتـــەکان و دەستنیـشانکردنی ئـەو مەشـخەڵانەی کـە لـە ڕێگایانـــەوە دەناســـرێنەوەو فاکتێـــك لـــە فاکتێکی دیکە جیا دەکەنەوە و نایەڵن تێکەڵ بە یەکتری بن[8]".

دۆرکـایم بـە تونـدی رەخنـە دەگرێـت لـەو بۆچـوونانەی کـە ئـاین لـە چوارچـێوەی غەیبـدا پێناسـە دەکـەن. ئـەو پێیوایـە: ئێمـە چـەندین ئاینمـان هەیـە کـە ناچـنە نێـو چوارچـێوە غـــەیبی و ناسروشـــتیەکانەوە. لـــەم ســـەرە شـارەوە کلیـك دەکـات لەسـەر جیابوونـەوەی بیرۆکـەی خـوا لـە هـەردوو بیرۆکـەی موقـەدەس و دونیایی.

-موقـــەدەس هـــەموو ئـــەو شـــتانەیە کـــە کۆمەڵگـــە چـــوار چـــێوەکانی دەرکـــەوتنیان دەستنیشان دەکات.

-دونیـایش هـەموو ئـەو شـتانەیە کـە هـەر یـەکێك لـە ئێمـە لـە ڕێگـای مانـا تایبەتەکانیـەوە چوارچـــێوەکانی دەرکـــەوتنیان دەستنیـــشان دەکەین.

بێگومان دۆرکایم نایـەوێت فاکتە ئاینیەکان لـــە ڕێگـــای پراکتیکـــی ڕێـــژەیی شـــتە موقەدەســـەکانەوە لێکبداتـــەوە، چـــونکە ئـــەم کردەیە هیچ نیە جگە لە گۆڕینی وشەی ئاین بە موقـــەدەس و دۆرکـــایمیش بـــەردەوام خـــۆی دوردەگرێت لە توێژینەوەی کاریکاتێری.

کەواتە چۆن ئێمە دەتوانین دەستنیشانی فاکتی ئاینی وەك چەند فینۆمێنێکی کورتنەکراوە لەوانی دیکەدا بکەین؟

یەکەم وەلامی دۆرکایم بریتییە لە گلۆپ داگیرساندن لەسەر ئامادەیی باوەڕی پێویست کە لە دەرەوەی هەموو کاتیگۆریەکانی گوماندا کاردەکات و هەستی ڕێزێکی ڕەها لای باوەڕداران دروستدەکات. ئەم باوەڕە پێویستانە لە نێو چەند فۆرمێکی ئەفسانەیی و دۆگماتیکداو لە ڕێگای ئاهەنگ و ریتیوێلەوە خۆیان دروستدەکەن.

لەسەر ئاستی سۆسیۆلۆژیا، ئەوەی لە هەموو شتەکان گرنگترە، کارکردنە لەسەر ڕەگە کۆمەلایەتیەکانی ئەوەی کە دۆرکایم ناوی دەنێت ڕێزی ڕەها. ئەم ڕێزە لە کوێوە سەرهەلدەدات و چۆن دروست دەبێت؟ بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە، دۆرکایم هێزی لێکۆلینەوەی لەسەر چەمکی موقەدەس بە هەموو لایەکدا بلاودەکاتەوە:

"ئەو هێزانەی کە تاکەکان باوەڕیان پێیانەو ملکەچن لەبەردەمیاندا، تەنها هێزی سادەی وزەی فیزیکی نین، وەك ئەوەی لە مانا و خەیالداندا دەردەکەون، بەلکو هێزی واقیعیی کۆمەلایەتین. ئەوان بەرهەمی ڕاستەوخۆی هەستی کۆلێکتیڤەکانن و دواتر بەرگی ماددی لەبەر دەکەن. کامانەن ئەو هۆکارە کۆمەلایەتیانەی کە ئەو هێزانەیان بەخەبەر هێناوەو وایانلێکردوون کە لە ڕێگای فۆرمە جیاوازەکانەوە گوزارشت لە خۆیان بکەن؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کە دەبێت زانستی ئاینەکان وەلامی بداتەوە[9]"

جێگای خۆیەتی ئاماژە بەوە بدەین کە بیرکردنەوەی دۆرکایم لەسەر چەمکی موقەدەس لەنێوان نووسینی "پێناسەی فاکتە ئاینیەکان و فۆرمی بنەما سەرەکیەکانی ژیانی ئاینی"دا گۆڕانێکی گرنگی بەسەردا هاتووە، وەك دواتر باسی دەکەین. ئەم گۆڕانەش لای بەشێك لە سۆسیۆلۆگەکان وەك بەردەوامبوون و بزاڤی قوتابخانە تیۆریەکەی دۆرکایم تەماشا دەکرێت. واتە تەماشاکردنی دۆرکایم وەك فیکرێك لە بزاڤدا نەك وەك گۆمێکی مەنگ.

## 4- چەمکی موقەدەس و بەشداری خوێندکارەکانی دۆرکایم

پێناسەکردن و داڕشتنی چوارچێوەکانی موقەدەس لە کارگە تیۆریەکەی دۆرکایمدا کارایی چەندین لایەنی بەسەرەوەیە. بەلام هەرە دیارترینیان، وەك خۆی دانی پیادا دەنێت، قوتابخانەی ئەنترۆپۆلۆژیای ئینگلیزی بە گشتی و رۆبێرتسۆن سمیس بەتایبەتیە.

سمیس لە ساتی کارکردنی لەسەر ئاینە سامیەکاندا، ڕوانینێکی گرنگ لەسەر چۆنیەتی کارکردنی موقەدەس بەرهەمدەهێنێت. ئیشکالیەتی ئەو بریتیبوو لە گەڕان بەدوای پەیوەندی دروستکراوی نێوان کردەی تەقدیسکردنی شت و کەسەکان وەك شت و کەسی ئاسمانی (مەبەست هەموو ئەو شتانەیە کە پەیوەندیان بە خواوە هەیە. هەموو ئەو پرۆسێسانەی کە شتێك یان کەسێك دەکەن بە خوا) لە لایەك و هەمان ئەو شت و کەسانە وەك شت و کەسی دونیایی لەلایەکی دیکەوە. کارەکتەری موقەدەسکراو لە کردەی تەقدیسەوە سەرچاوە دەگرێت، کردەیەك کە بەرزیان دەکاتەوە تا ئاستی بوون بە خوا. ئەم ڕوانینە سمیسیانە کارایی ڕاستەوخۆ دادەنێت بەسەر دۆرکایمەوە.

هەروەها دەکرێت باس لە کارایی گرووپی گۆڤاری *Lannee sociologique* بکەین کە دۆرکایم خۆی دروستی کرد. گفتوگۆ

نەبڕاوەکانی ئەندامانی ئەم گرووپەش بەشداری زیندویان کرد لە داڕشتنی چوارچێوەی چەمکی موقەدەس لای دۆرکایم.

لە نێو ئەم گرووپەدا دوو سۆسیۆلۆگی بەناوبانگ، لە بیناکردنی چوارچێوەی چەمکی موقەدەسدا، هاوکاری بەرچاوی دۆرکایم دەکەن. ئیوبێر *Hubert* و مۆس *Mauss*. لە ڕێگای ئەم دوو بابەتەوە:

–(هەوڵدان بۆ تێگەشتن لە سروشت و کار کردنی موقەدەس) گۆڤاری *IAnnee sociologique* ساڵی 1899.

–(وێنە کێشانی تیۆریەکی گشتی لەسەر سیحر) گۆڤاری *IAnnee sociologique* ساڵی 1904.

کارایی بەسەر مامۆستاکەیانەوە دادەنێن. گومانی تێدا نییە کە دۆرکایم سوودی وەرگرتووە لەم دوو خوێندکارەی کە لە دەوری گۆڤارەکەی کۆببوونەوە، بەڵام گومانیشی تێدا نییە کە دۆرکایم بەوپەڕی هێزەوە توانیویەتی سنورەکانی ئیوبێر و مۆس تێپەڕێنێت و مانا و مەدلولی تایبەت بەخۆی پێببەخشێت.

لە بابەتی (هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە سروشت و کارکردنی موقەدەس)دا هوبێر و مۆس دەگەڕێنەوە سەر ڕۆبرتسۆن سمیس و پاش داننان بە گەورەیی تیۆریکەیدا، دێن و دەیکەن بە یەکێك لە سەرچاوە گرنگەکانی بابەتەکەی. ئەوان سەرلەنوێ ڕوناکی دەخەنەوە سەر ئیشکالیەتی پەیوەندی نێوان ئەو شت و کەسانەی کە لە کاتێکدا شت و کەسی دونیایین، لە ڕێگای کردەی تەقدیسەوە، بەرزکراونەتەوە تا ئاستی ئولوهیەت. پەیوەندی گرتن بەم شت و کەسانەوە لە یەککاتدا شتێکی جوان و ترسناکیشە. بۆ دروستکردنی ئەم پەیوەندیە مرۆڤ دەبێت بە تاقیگەیەکی خۆپاکردنەوەدا تێپەڕێت.

ئیوبێر و مۆس کلیك دەکەن لەسەر هەموو ئەو دەرەنجامانەی کە لە پەیوەندی ریتیۆلانەی مرۆڤ بەم شت و کەسانەوە لە هەردوو چرکەی تەقدیسکراوو ناتەقدیسکراودا بەرهەمدێن. واتە لەو ساتانەدا کە دونیاین و لەو ساتانەشدا کە بەرزدەکرێنەوە بۆ ئاستی خوا.

قوربانیدان، وەك مۆس دەڵێت، ئەو کەرەسەیەیە کە لە ڕێگایەوە کەسێکی دونیایی پەیوەندی دروستدەکات لەگەڵ موقەدەسدا. ئەم کەرەسەیە دەبێت بە پردی هاتووچۆی بەردەوامی نێوان جیهانی دونیایی مرۆڤەکان و جیهانی موقەدەسی شت و کەسە تەقدیسکراوەکان[10].

قوربانیدان لە یەکاتدا گەرەنتی دەداتە دەست تەقدیسکار کە پرۆسێسی تەقدیسکردنی تەقدیسکراو بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ئەنجامدەدرێت و ڕێگای پێدەدات کە بەبێ مەترسی بڕواتە نێو جیهانی موقەدەسەوە. هەروەها گەرەنتی پاککردنەوە دەداتە دەست تەقدیسکار بۆ دروستکردنی پەیوەندیەکی پاککراوە لەگەڵ تەقدیسکراودا. ئەم تێگەیشتنە دینامیك و دیالیکتیکەی چەمکی قوربانیدان، وەك سیستەمی چونەژورەوەو هاتنە دەرەوە لە جیهانی موقەدەس خۆیمان پێدەناسێنێت. هەر بۆیە دەتوانین وەك پانتاییەکی سامبۆلیك دەستنیشانی بکەین.

–بەڵام ئێمە چۆن سروشتی موقەدەس بناسینەوە؟

–لەسەر چ بنەمایەك جیاکردنەوەی جیهانی دونیای و جیهانی موقەدەس دروست دەبێت؟

مۆس و ئیوبێر، بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەگەڕێنەوە سەر ئەو پەیوەندیەی کە لە نێوان موقەدەس و هێزی نائاسایی شت و مرۆڤەکاندا هەیە. ئەم هێزە نائاساییە ناودەنێن *Mana* کە بریتیە لە هێزی باڵای شت و

کەسەکان. لە ڕێگای ئەم هێزە باڵایەوە شتەکان و کەسەکان بەرزدەبنەوە بۆ ئاسمانی موقەدەس و هەموو شت و کەسێکیش ئەم هێزەی هەیە و ئەوەی لێرەدا گرنگە داننانە پێیداو سەلماندنیەتی.

لەم پانتاییەدا موقەدەس و *Mana* بەیەك دەگەن. هەموو ئەو شت و کەسانەی کە داننراوە بە هێزە باڵا نائاساییەکەیاندا جیهانی دونیایی بەجێدەهێڵن و پێدەنێنە جیهانی موقەدەسەوە. ئەمە بۆ ساحیرێکیش ڕاستە.

داننانیش بەم هێزە باڵا نائاساییەی شتێك یان کەسێکدا دەرەنجامی پێویستی و چاوەڕوانی و خواست و ئارەزووەکانی گروپێکی کۆمەڵایەتیەو بڕیارێکی کۆلێکتیڤە، بە شێوەیەکی ناعەقڵانی. واتە ئەم بڕیارە لە کردەیەکی عەقڵانیەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو هەڵقوڵاوی پاڵەپەستۆی عاتیفی و ئیمانی کۆلێکتیڤی کۆمەڵگە و پێویستی و چاوەڕوانیەکانیەتی.

ئەمە چەند پەراگرافێك بوو لەسەر چۆنیەتی بیرکردنەوەی دوو خوێندکاری دۆرکایم لەسەر چەمکی موقەدەس. بەڵام دەبێت بزانین کارایی خودی دۆرکایم بەسەرهەموو خوێندکارەکانیەوە بە گشتی و ئەم دوانەوە بە تایبەتی، زۆر زیاتر و بەهێزتر و بەرچاوترە، بەتایبەتی لە بواری سۆسیۆلۆژیای ئایندا. دۆرکایم ئەو سۆسیۆلۆگەیە کە سۆسیۆلۆژیای ئاینی تا دوا بنی قولاییەکانی زانست برد، بەشێوەیەك کە ئێمەی سەدەی بیست و یەك ناچار بە گەڕانەوە بۆ سەر تێگەشتنەکانی بکات.

## 5- چەمکی موقەدەس و فۆرمە سەرەکیەکانی ژیانی ئاینی

لە کتێبی فۆرمە سەرەکیەکانی ژیانی ئاینیدا دۆرکایم تیۆریەکی تێرو تەسەلی زانستی لەسەر ئاین بەرهەمدەهێنێت. پێش هەر ڕاڤەکردنێك ئێمە دەبێت ڕوناکی بخەینە سەر ئەو پرانسیپانەی کە چۆنیەتی کارکردنی ئەومان بۆ دەستنیشان دەکەن.

لە قۆناغی یەکەمدا دۆرکایم بابەتی توێژینەوەکەی دەستنیشان دەکات و بنەما میتۆدۆلۆژیەکانی دەخاتە ڕوو. ئەم قۆناغە بەشی یەکەم و دووەم و سێیەمی کتێبەکەی داگیر دەکات.

دۆرکایم، لەم سەرەتایەدا، ڕەخنەکانی ئاراستەی هەموو ئەو بۆچوونانە دەکات کە لە ڕێگای ناسروشتیەوە پێناسەی ئاین دەکەن. ئەو نموونە بە سپەنسەر دێنێتەوە کە:

"ئاین و نهێنی و ناتێگەشتن و ناسروشتی و شاراوە بەیەکەوە گرێدەدات"

لە کۆمەڵگە تراديسيۆنێلەکاندا، ناساندنی ئاین وەك دیاردەی نهێنیەکان بێ مانایە، چونکە ئەو کۆمەڵگانە لە نێو سیستەمێك لە بەڵگەنەویستدا دەژین و ژیانی ڕۆژانەیان لەسەر ئەو سیستەمە ڕێکخستووە نەك لەسەر کۆمەڵێك نهێنی. لە لاپەڕە 39 دا دۆرکایم دەنووسێت:

"چەمکە ئاینیەکان پێش هەموو شتێك بۆ ئەوە دروست نەبوون کە شتە ناوازەو تاقانەکانمان بۆ لێکبدەنەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی شتە نۆرماڵ و ڕۆژانەو ئاساییەکانمان بۆ ڕاڤە بکەن"

ئەم تێبینیە بایەخێکی زانستی گەورەی هەیە، چونکە نیشانەی پرسیار دەخاتە سەر هەموو ئەو توێژەرانەی کە کۆی ئەو چەمك و کاتیگۆریانەی کە لە چرکەی توێژینەوەیاندا تێبینیان کردووەو زیاتر وەك دیاردەی نهێنی بەرچاویان کەوتوە، فرێدەدەنە نێو جیهانی ئاینەوەو دەیانەوێت لەسەر ئاینی ساغبکەنەوە. واتە ئەوەی کە توێژەران خۆیان

ناتوانن لێیتێبگەن و لێکیبدەنەوە، دەیخەنە گەردنی ئاین.

دۆرکایم پێیوایە کە، لە پێناوی بەرهەمهێنانی تێگەیشتنێکی دروستدا، دەبێت ئێمە بگەڕێینەوە سەر ئەو مانایانەی کە باوەڕدارەکانی ئاینێك لە ئاینەکان، بە فاکتە ئاینیەکانیان بەخشیوە. لێرەدا دۆرکایم ڕەخنە لە تایلۆر و رێڤایل و فرازەر دەگرێت کە هەمیشە ئاین و فیکرەی خوا بەیەکەوە گرێدەدەن. ئەو پێیوایە کە ئێمە چەندین ئاینی گەورەمان هەیە، بۆ نموونە بودایسم و ژاپانیسم، کە لە دەرەوەی فیکرەی خوادا کاردەکەن و خوا هیچ ئامادەبوونێکی لە ستراکتۆرەبوونیاندا نیە.

بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی دروست لەگەڵ پێناسەی ئایندا، پێویستە پێش هەموو شتێك خۆمان دوور بخەینەوە لە وێناکردنی سروشتی ئاین وەك یەکەیەك. بێگومان ئاین یەکەیەکە، بەڵام هەڵگری کاراکتەری نەبینراو نیە، بەڵکو پێکهاتەیەکە لە کۆمەڵێك ئەفسانە و دۆگم و ریت و ئاهەنگ. ئێمە لە پێناوی تێگەشتنێکی دروستدا دەبێت ئەم پێکهاتەیە هەڵبوەشێنینەوەو هەموو ئەو بەشانە لەیەك جیابکەینەوە کە پێکەوە ئاینیان وەك یەکەیەك دروستکردووەو هەربەشەو بەجیا بخەینە ژێر چاودێر و پشکنینەوە. ئەمە تەنها رێگایەکە بۆ مامەڵەکردنێکی زانستیانە لەگەڵ ئایندا.

لەم سەرشارە میتۆدۆلۆژیەوە، دیاردە ئاینیەکان، لە سۆسیۆلۆژیای دۆرکایمدا، دابەشدەکرێن بەسەر دوو کاتیگۆریدا: ئیمانەکان و ریتەکان.

ئیمانەکان بریتین لە هەموو ئەو دەرکەوتنانەی کە گوزارشت لە سروشتی شتە موقەدەسەکان دەکەن: بەهاکانیان، مێژوویان پەیوەندیەکانیان بە ناوەوەو دەرەوەو هتد.

ریتەکانیش بریتین لە هەموو ئەو رێکخەرانەی کە سلوکی مرۆڤ رێکدەخەن و پێیدەڵێن چۆن لەگەڵ شتە موقەدەسەکاندا مامەڵە بکات.

لێرەوە جیاکردنەوەی موقەدەس و دونیایی دەبێت بە بابەتی سەنتراڵی هەموو ئاینەکان. دۆرکایم پێیوایە کە ئەم جیاکاریە لە نێوان گەردوونی شتە موقەدەسەکان و گەردوونی شتە دونیاییەکاندا مەشخەڵی ناسینەوەی هەموو ئاینەکانە. هەروەها پێیوایە کە لە نێو هەر ئاینێکدا بازنەکانی موقەدەس لەسەر چەند ئاستێکی جیاواز دەردەکەون. واتە هەموو شتە موقەدەسەکان یەك ئاستیان نیە و کاتێك کارەکتەری موقەدەسیان پێدەبەخشین ئەمە مانای ئەوە نییە کە هەموو ئەو شتانە یەك بەهایان هەیە، بەڵکو چەندین بەهای جیاوازیان هەیە و هەریەکەیان لە پلەیەکی ئەو پەیژەیەدان کە ناوی موقەدەسە.

هەندێکجار مرۆڤ بە ئاسانی پشت دەکاتە شتێکی موقەدەس کە لەگەڵ ئارەزووەکانیدا ناگونجێت و باوەشدەکاتەوە بۆ شتێکی دیکەی موقەدەس کە نەرمترەو لەگەڵ ئارەزووەکانیدا دەگونجێت. واتە موقەدەس لای مرۆڤ، مەرج نیە جەوهەرێکی نەگۆڕی هەیمەنەداری هەمیشەیی بێت. (لاپەڕە 25).

دۆرکایم هێڵێکی پانی دیکە لە نێوان ئاین و سیحردا دەکێشێت. هەرچەندە پێیوایە کە ئاین و سیحر جۆرێك لە خزمایەتیان هەیە، بەڵام بەهیچ شێوەیەك تێکەڵیان ناکات:

ئیمانی ئاینی هەمیشە لەسەر ئاستی کۆلێکتیڤیتیێ دەردەکەوێت و ئەو کەسانەی کە لە نێو ئەم کۆلێکتیڤیتێدان بەیەکەوە گرێدراون و پێکەوە سیستەمێك لە ڕیت پراکتیك دەکەن. ئیمانی سیحری ئەم ڕەهەندە کۆلێکتیڤەی نیە و باوەڕدارەکانی پێکەوە

گرێنـــەدراون و پەیوەنـــدی ســـاحیریش بـــە زەبونەکانیەوە بەردەوام نیە.

بێگوومـان ئێمـە دەتـوانین، لـە کۆمەڵگـەکانی ئێستا و ئێرەمانـدا، نیـشانەی پرسـیار بخەینـە سـەر ئـەم تێـزەی دۆرکـایم. لـەم کۆمەڵگایانـەدا، مرۆڤـەکان لەسـەر ئاسـتی تـاك و دوور لـە هـەر ڕەهەنـــدێکی کـــۆلێکتیڤ ئاینـــداری خۆیـــان دەکەن‌و مومارەسەی ریتەکان دەکەن. بەڵام ئەم نیـــشانەی پرســـیارە، هـــیچ لـــە بایـــەخی بیرکردنـەوەی دۆرکـایم کـەم ناکاتـەوە، چـونکە ئەوەی گرنگە بۆ ئەو کلیکردنە لەسەر ڕەهەندی کۆمەڵایـەتی و کۆمینـۆتێر و کۆلێکتیڤی ئیمانی ئاینی کە واقیعێکی هەستپێکراوەو تا ئێستاش تێبینی دەکەین. بە کورتی دۆرکایم بەم شێوەیە پێناسەی ئاین دەکات:

"ئـاین بریتیـە لـە سیـستەمێکی بـەهێزی ئیمـــانیی ڕێـــژەیی بەشـــتە موقەدەســـەکان" (لاپەڕە65).

لێـــــرەوە دۆرکـــــایم کـــــۆی کارگـــــە سۆسـیۆلۆژیەکەی ڕوبـەڕوو دەکاتـەوە لەگـەڵ چـۆنیەتی دروسـتبوونی ئـاین و ڕەگوڕیـشە و سەرچـــــاوەکانیدا. پـــــاش لێکۆڵینـــــەوەی هـــەموو ئـــەو لێکدانەوانـــەی کـــە لەســـەردەمی ئـــەودا ئامـــادەبوون، دۆرکـــایم دیوارێـــك لـــە نێـــوان خـــۆی و ئەوانـــدا دروســـتدەکات بـــۆ ئـــەوەی لـــە بیرکردنـــەوە زانـــستیەکانیەوەو سـەر لـە نـوێ لێکدانەوەیـەکی دیکـە بـە ئـاین ببەخشێت.

دورکەوتنەوەی دۆرکایم لە سپنسەر و تیلۆر لە هەموو دوورکەوتنەوەکانی دیکە بەرچاوترە. ئـەو دووانـە، کـە دۆرکـایم بـە ئەنیمیـست ناویانـــدەبات، ئـــاین کورتدەکەنـــەوە لـــە گوزارشتکردن لە ڕاوەکـردن و وەهـم و خـەیاڵ و وڕێنـەکردنێك کـە هـیچ بنەمایـەکی بابـەتی نیـە. هـــەروەها کـــورتی دەکەنـــەوە لـــە پەرســـتنی قیامەتێکـــدا کـــە بـــوونی نیـــە و لـــە سیستەماتیزەکردنی ژیاودا.

تەواو بە پێچەوانەوە، دۆرکایم فاکتی ئاینی زۆر بــە هەنــد وەردەگرێــت و بایــەخێکی لــە ڕادەبەدەری پێدەبەخشێت و پێیوایە کە:

"فـاکتی ئـاینی سەرچـاوەی هـەموو ئـەو وزانەیە کە مرۆڤەکانی هەر زەمەنێك بۆ ئەوەی بتـوانن درێـژە بـە ژیانیـان بـدەن پێویـستیان پێیەتی"

لەســـەر هـــەمان ڕێگـــا دۆرکـــایم تیۆریـــە ناتیوریـستەکەی مـاکس مولـەریش بـە کـورتبین دەناسـێنێت و پێیوایـە گـەڕان بـۆ ئـاین لـە نێـو هەسـتکردن بـە ڕودانـی شـتە کوتوپڕەکـان و ترس‌و نادیاردا کە دەرنجامی ئەزموونی مرۆڤن لەگـــەڵ سروشـــتدا، گـــەڕانێکی بێهودەیـــە و ناتوانێـت باوەڕمـان پێبێنێـت بـە تێزەکـانی. دۆرکـایم پێیوایـە کـە لـەم جـۆرە لێکدانەوانـەدا ئێمـــە نـــاتوانین دەســـتمان گیرببێـــت لـــە جیاکردنـەوەی جیهـانی موقـەدەس و جیهـانی دونیاییـدا کـە بناغـەی دروسـتبوونی هـەموو ئاینەکانن.

لێکدانـــــــــەوە "ئەنیمیـــــــــست" و "ناتیوریـست"ەکـان ڕەگوڕیـشەی گوزارشـت و نوێنەرایـەتی و دەرکـەوتنی فاکتـە ئاینیـەکان دەبەنـەوە سـەر دوو سەرچـاوە: بـۆ یەکـەمیان مـرۆڤو بـۆ دووەمیـشیان گـەردوون. دۆرکـایم پێیوایـــە بۆشـــایی هـــەرە بەرچـــاو لـــەم دوو بیرکردنەوەیـــەدا بریتیـــە لـــە پشتگوێخـــستنی پەیوەنـــدی فـــاکتی ئـــاینی بـــە واقیعـــی کۆمەڵایەتیەوە. هەر تەنها ئەم پەیوەندیەشە کە ڕێگامـان پێدەدات بـۆ ئـەوەی بتـوانین جیاوازی نێـوان جیهـانی موقـەدەس و جیهـانی دونیـایی شتەکان ببینین.

بـۆ تێگەشـتن لـە فـاکتی ئـاینی، پێویـستە دانبنـێین بـە هـەموو ئـەو فینۆمێنانـەدا کـە

بەشـداری زینـدو دەکـەن لـە دروسـتکردنی چوارچـێوەکانی ژیـانی کۆمەڵایـەتی و چوارچـێوەکانی ئەخلاقـدا. مەبەسـت لـەو چوارچـێوانەیە کـە ئاڕاسـتەکانی ڕەفتـاری مرۆڤـەکان دیـاری دەکـەن. دۆرکـایم ڕونـاکی دەخاتە سەر ئەو بەردەوامیە سەرەکیەی کە لە نێـوان ئیمانـە ئاینیـەکانی کۆمەڵگـە ترادیـسیۆنیلەکان و ئیمانـە کۆلێکتیڤـەکانی کۆمەڵگـە مۆدێرنەکانـدا هەیـە و پێیوایـە کـە جێگـای داخـە کاتێـك ئێمـە بـەناوی زانـست و ڕاسیۆنالیتێوە ئەم واقیعە نابینین.

لـە ڕێگـای ئەزمونـە کۆنکرێتـەکانی ژیـانی کۆمەڵایەتیـەوەو لـە ڕێگـای مـۆبیلیزەکردنی سەرچاوەکانەوە، هەر گروپێکی کۆمەڵایەتی کار لەسـەر دروسـتکردنی گریمانەیـەك دەکـات کـە تاکـەکانی گـروپ دەیکـەن بـە سەرچـاوەی لێکدانـەوەو ڕاڤەکردنی شتەکان و لە ڕێگایـەوە مانـا بـە دۆخـەکانیان دەبەخـشن و مەدلولـەکان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دابەشدەکەن. تەنانەت لە کۆمەڵگە هەرە مۆدێرنەکانیشدا، کە بڕیار وایە بـە تـەنها لێکدانـەوە ڕاسـیۆنێل و زانـستی و ئەزمونیـەکان کـارابن و کاریـان پێبکرێـت، تـا ئێـستاش مرۆڤـەکان مـۆبیلیزەی لێکدانـەوە ناڕاسیۆنێلەکان دەکەن بۆ تێگەشتن لەوەی کە هەن و لەوەش کە دەیکەن (چۆنیەتی بوونیان و چۆنیەتی کارکردنیان).

بۆ تێگەشتن لە ئیمانە کۆلێکتیڤە پریمتیڤ یان مۆدێرنەکان، ئێمە دەبێت حساب بکەین بۆ ئـەو لۆژیکـە ناوەکیـەی کـە دروسـتکەری حەقیقەتەکانیانە، بەبێ ئەوەی گرنگی بدەین بە ناوەڕۆکەکانیان. واتە ناوەڕۆکەکانیان هەرچیبن، ئێمـە دەبێـت دەسـت لـە لۆژیکـە کـارا ناوەکیـەکانیان گیربکـەین. بـۆ ئەنجامـدانی ئـەم کـارەش، دۆرکـایم پێیوایـە کـە کەسـەی توێـژەر دەبێت خۆی بخاتە شوێنی ئەو بـاوەڕدارەی کە ئینتیمـای بـۆ ئاینێـك لـە ئاینـەکان هەیـە، بـۆ ئـەوەی بڕواتـە نێـو ئـەزموونی ژیـاوی ئـەو بـاوەڕدارەوەو لـەوێوە تێبگـات لـەوەی کـە ڕوودەدات. ئەمـەش بـە هـیچ شـێوەیەك مانـای ئەوە نیە کە توێژەر دەبێت ببێت بە باوەڕدار بۆ ئەوەی لە پرسیاری باوەڕ تێبگات. بەڵکو بریتیە لـە چـونە نێـو ئـەزمونی باوەڕدارێکـەوە بـۆ تێگەشـتن لـە تێگەشـتنی ئـەو تـا بتوانێـت تێگەشتن بەرهـەمبێنێت. دۆرکایم پێیوایە: ئەو توێـژەرەی کـە ئـەم جـۆرە لـە کـارکردن ڕەد دەکاتـەوە، وەك ئـەو کـوێرە وایـە کـە بـاس لـە ڕەنگەکان دەکات.

توێژینـەوەی ئـاین، دۆرکـایم ڕادەکێـشێتە سـەر ڕامـان لـە چـەمك و دیـاردەی تەوتـەم. لـە میتۆدۆلۆژیـای ئـەودا، شتەکان هەمیشە لەسـەر ئاستی فرەو جیاواز دەردەکەون. ئەم شتە فرەو جیاوازانـە هـەر وەك دەکرێـت بـبن بـە بابـەتی تەقدیسکراو، ئاواش دەکرێت ببن بە پەرستنی تەوتـەمی. دۆرکـایم کلیـل لەسـەر کارەکتـەری فرەیـی و جیـاوازی دەکـات و پێیوایـە هێنـدە بـەهێزن کـە ئێمـە نـەتوانین بـە ئاسـانی پەیوەندیـەکی هاوبەش لە نێوانیـان بدۆزینـەوە. بـەڵام ئـەو هاوبەشـەی کـە بـە ئاسـانی تێبـینی دەکرێت لە نێوانیاندا بریتیە لەو هەستەی کە بەخەبـەری دێـنن لـە وشـیاری باوەڕدارەکانـدا. هـەر ئـەم هەستەشـە کـە سروشـتی تەقدیـسکراویان دەخاتـە سـەر شـانۆ. لێـرەوە تەوتەمیسم دەبێت بە:

"ئـاینی هێزێکـی بـێ شووناسـی ناکەسـی و خـۆی فرێدەداتـە نێـو بـوونی هـەر یـەکێك لـە باوەڕدارەکـانی، بـەبێ ئـەوەی تێکـەڵ بـە هـیچ کامیـان ببێـت. هـیچ کەسـێك لـە باوەڕدارەکـان ناتوانێت بە تەواوی دەستی لێگیر بکات، چونکە هەمیـشە بـە شـێوەیەکی سـەربەخۆ لـە هـەموو لایەك خۆی دەردەخات.هەر باوەڕدارێك پێیوایە

کـە خاوەنیـەتی، بـەبێ ئـەوەی هـیچ کەسـێك خـاوەنی سـەد لـە سـەدی بێت. لێرەوە تەوتـەم دەبێت بەخوا، بەڵام خوایەکی ناکەس و بێ ناوو بێ مێژوو" (لاپەڕەی 269)

ئەم پرانسیپە تەوتەمیە هێزێکە، هێز بە مانا فیزیکیەکەی. ئەو کەسەی کە باوەڕی پێدێنێتو پەیوەنـدی لەگەڵـدا دروسـتدەکات، دەتوانێـت کەڵکی لێوەربگرێت و خۆی پێ بەهێز بکات، بە تایبـەتی لەسـەر ئاسـتی مـۆراڵ. ئـەم مۆراڵـە لـە پانتاییـەکی کۆمەڵایەتیـدا، تاکـەکان بەیەکـەوە گرێـــدەدات و چوارچـــێوەی ســـلوکیان بـــۆ دەستنیشان دەکات.

ئەم لێکدانەوەیەش دۆرکایم دەباتە سەر ئەم کورتکردنەوەیە:

"ئێستا ئێمە بە باشی تێدەگەین کە بۆچی نـــەدەبوو ئـــاین وەك بۆچـــونی کەســـایەتیەکی سیحری، فرەخـوایی یـان رۆحـی بناسـێنین (...) ئێمە پێمانوایە سەرچاوەی فیکری ئاینی بریتی نیە لەو کەس و شتانەی کە خۆیان لـە خۆیاندا موقەدەسـن ، بـەڵکو بریتیـە لـە دەسـەڵاتی بـێ کۆتـــایی، هێـــزی ئـــەنۆنیم، کـــە ســـنوری چـەندایەتیان پەیوەنـدی بـە سروشـتی هـەر کۆمەڵگەیەکـەوە هەیـەو هەنـدێکجار کـار لەسـەر پەرتەوازەکان یەکدەخەن(...)"

لـە فیکـری دۆرکایمـدا تەوتـەم بریتیـە لـە گوزارشـــتکردن لـــە *Mana* و ســـامبۆڵی ئـــەو خێڵەیـە کـە دەیکـات بـە شووناسـی خـۆی. دۆرکـایم دەیـەوێت بڵێـت: ئـەو خوایـەی کـە مرۆڤەکان دەیپەرستن هیچ نیە جگە لـە خودی کۆمەڵگـە خـۆی نـەبێت. هـەموو ئاینـەکان کـار لەسەر بنیاکردنی هەستی هاوبەش و یـەکێتی و یـەکگرتن لای باوەڕدارەکانیـان دەکـەن. هـەروەها هـــەموو کۆمەڵگەیـــەکیش کـــار دەکـــات لەســـەر بنیـاکردنی هەسـتی یـەکگرتن و پێکـەوە ژیـان و یەکێتی و یەکڕەنگی ئەندامەکانی:

"کۆمەڵگـە خـاوەنی هـەموو ئـەو شتانەیە کـە هەسـتی ئولوهیـەت لـە گیـانی ئەندامەکانیـدا دروست دەکات و دەتوانێت هـەموو ئـەو شتانە بـــە ئەندامـــەکانی ببەخـــشێت کـــە خـــوا بـــە باوەڕدارەکانی دەبەخشێت.

خوا، پێش هەموو شتێك، بریتیـە لـە بوونێك کـە مـرۆڤ وەك بـاڵا تەماشـای دەکـات، باڵایـەکی گوێبـۆگیراو (...) کۆمەڵگـەش، بریتیـە لـە بونێك کـە مـرۆڤ وەك بـاڵا تەماشـای دەکـات، باڵایـەکی گوێبۆگیراو.

باڵایەك کە ناچارمان دەکات بە وازهێنـان لـە بەرژەوەندیـە تایبەتـەکانی خۆمـان، بـە وازهێنـان لە خۆپەرستی بۆ ئەوەی بتوانین لەگـەڵ ئەوانی دیکەدا بژین.

بەڵام خوا بە تـەنها دەسـەڵاتێك نیـە کـە ئێمـە ناچار بە شوێنکەوتن بکات، بەڵکو هێزێکیشە کە هێـز لـە گیـانی ئێمـەدا دروسـتدەکات".. (لا. 295).

لە باسکردنی هێزی ئاینیدا دۆرکایم دەڵێت:

"هـێزی ئایـنی بریتیـە لـەو هەسـتـەی کـە کـۆلێکتیڤی لـە گیـانی ئەندامەکانـدا دروسـتی دەکـات. ئـەم هەسـتە لـە دەرەوەی وشـیاری و بابـەتیبوونی ئـەو ئەندامانـەدا کاردەکـات. ئـەم هەستە، بۆ ئەوەی خۆی بخاتە نێو پرۆسێسی بابەتانـدنی – خـودەوە، چەقدەبەسـتێت لەسـەر بابـەتێك کـە دواتـر دەبێـت بـە موقـەدەس" (لا. 307)

## 6-لـە ئـەزموونی موقەدەسـەوە بـۆ ئـاینی دەزگایی

چـۆن ئـەزموونی موقـەدەس لەگـەڵ ئاینـدا پەیوەندی دروستدەکات، ئاین بە هـەموو ئیمانە رێکخراوەییەکانیـەوە، بـە فەرزەکانیـەوە، بـە پراکتیکـە ریتیوڵەکانیـەوە؟ چـۆن پەیوەنـدی

نێــوان موقەدەســی دەزگــایی و موقەدەســی عاتیفی دروستدەبێت؟

لــە بەشــی ســێیەمی فۆرمــە ســەرەکیەکانی ژیـانی ئاینیـدا، دۆرکـایم روونـاکی دەخاتـە سـەر ئــەو لۆژیکــە کۆمەڵایەتیانــەی کــە بنــەما ســــەرەکیەکانی ژیــــانی ریتیــــۆلی گروپــــە کۆمەڵایەتیـەکان دروسـتدەکەن و بـەردەوام کـار لەســەر بەهەنوکــەیکردنی (ئــەکتیوالیزەکردنی) ئەو دەرکەوتنە کۆلێکتیڤانە دەکەن کە خۆیان بە موقەدەسەوە دەبەستنەوە.

دۆرکایم پێیوایە ئیمانی هاوبەش، لە ڕێگای پەرەسـتگاو گومـانکردنی مرۆڤـەکان لـە خـواوە، سـەر لـە نـوێ لـە دایکدەبێتـەوە. بـۆ ئـەوەی لـە کۆمەڵگەکاندا بژین و بوونیان هەبێت، مرۆڤەکان پێویستیان بە ئامادەبوونی خواکان هەیە. بەبێ خوا ژیانی کۆمەڵایەتی ئەستەمە. بەڵام لە هەمان کاتــدا دۆرکــایم پێیوایــە بــوونی خواکــان پەیوەندیــــەکی ڕاســــتەوخۆی بــــە خــــودی بەرژەوەندی مرۆڤەکانەوە هەیە. واتە خوا لە نێو کۆنتێکستە مرۆییەکاندا دروستدەبێت.

ئەرکی سەرەکی پراکتیکە ئاینیەکان بریتیە لــە ســەرلەنوێ چــالاکردنەوەی ئــەو شــتەی کــە دۆرکـایم ناویـدەنێت موقەدەسـی عـاتیفی. ئـەم پراکتیکــــە ئاینیانــــە بــــە ســــەرلەنوێ چـالاککردنەوەی مـۆراڵی تاکـە دونیاییـەکان، دینامیکـەکانی ژیـانی کـۆلێکتیڤیش سـەرلەنوێ چـالاکدەکەنەوە. هــەر لێرەوەیــە کــە دۆرکــایم جەژنـە ئاینیـەکان بـە هەناسـەدانی کۆمەڵگـەکان تەماشا دەکات. بێگومان ئەو بە ئەنقەست کلیك دەکــات لەســەر وشــەی "ســەر لــە نــوێ چالاککردنەوەوە" و دەیەوێت جیای بکاتەوە لە وشــەی "دووبــارە کردنــەوە". ســەرلەنوێ چــالاککردنەوە بــە هــیچ شــێوەیەك مانــای فۆتۆکۆپیکردنی ئەزموونی یەکەمی موقەدەسی عـاتیفی نیـە، بـەڵکو بیناکردنەوەیـەکی دیکـە و چوارچـێوە بـۆ دروسـتکردنێکی دیکەیـە. واتـە ئەزموونێکی دیکەی جیاوازە.

زۆربــەی جەژنــە ئاینیــەکان و پراکتیکــە کولتوریــەکان بەشــێوەیەکی نــاڕێکخراوەیی پەیوەنــدیان بــەو سەرچــاوانەوە هەیــە کــە یەکــەمجار و لــە ڕێگایانــەوە ئــەو جــەژن و پراکتیکانــــە خراونەتــــە نێــــو پرۆسێــــسی بەسامبۆلیککردنەوە. ئەم مەودایەی کە لە نێوان ئەزموونی هەنوکەی و ئەزموونی یەکەمدا هەیە، هــەڵگری مەترســی زەبروزەنگێکــی فیزیکــی و سامبۆلیکیشە لەلایەن یەکەمەوە دژی دووەم.

دۆرکایم دوو پێکهاتەی ئەزموونی فینـۆمێنی ئاینی لەیەك جیادەکاتەوە:

ئەزمونێك کە لە نێو پەیوەنـدی عـاتیفی مرۆڤ بـە خـواوە دروسـتدەبێت. ئـەزموونێکی دیکـەش کـە تیایـدا ئـەزمونی یەکـەم خـۆی سۆسـیالیزەو ڕاسـیۆنالیزە[11] دەکـات. ئـەم ئەزموونـە خـۆی جیادەکاتــەوە لــە ئیمــان و پەرەســتن و ڕیتــە جیاوازەکان. ئیمانەکان، پەرەستنەکان، ڕیتەکان دەیانــەوێت ئــاین وەك ئــەزموونێکی قــورس و ســەخت ئاســان بکــەن و ژیــانی پێبەخــشن و درێــژە بــە تەمــەنی بــدەن و ڕێگانــەدەن لــە بــیر بچێتەوە.

دۆرکـــایم ئـــەم کردەیـــە ناودەنێـــت بـــە دەزگـایکردنی ئـاین و پێیوایـە ئـەرکی یەکـەمی بریتیـە لـە مـاڵیکردنی ئـەزموونی عاتیفیـە بـە خواوە. ماڵیکردن لە هەردوو چرکەکەدا:

–چرکەی سەرەتاو دامەزرێنەر.

–چــرکەی ســەر لــەنوێ چــالاککردنەوەو بیناکردنەوە.

پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە:

تــا چ ئاســتێك کــردەی مــاڵیکردن چوارچـێوەکانی ئـەزمونی یەکـەم دەپارێزێـت و تـا چ ئاسـتێکیش لـە نێـو چـرکەی دووەمـدا ئـەزموونی یەکـەم سـەر لـەنوێ بینادەکاتـەوە؟

واتــه تــا چ ئاســتێك ئــەزموونی یەكــەم لــە نێــو قوولاییــەكانی ناوشــیاری كۆلیكتیڤــدا فۆرمویلــە دەكاتــەوەو بــە دەرەوەی خــۆی دەبەخشێتەوە؟

مـاڵیكردنی حـەیوانێكی كێـوی بریتیـە لـە ڕاهێنانی بۆ ئەوەی بتوانێت لە ماڵەوە و بەبێ مەترسی لەگەڵ مرۆڤەكاندا بژی. گوزەریش لە ئــەزمونی عــاتیفی بــە خــواوە بــەرەو ئــاینی دەزگایی كارەكتەری مەترسیداری پەیوەندی بە موقەدەســی وەحــشیەوە كەمدەكاتــەوە. ئــەم گــوزەرە دێــت و ئــەزمونی ئــاینی، كــە لــە سەرچاوەوە ئەزمونێكی نا ئاسایی و ناڕۆژانە و نـا ڕۆتینـە، وەردەگێڕێتـە سـەر ئـەزمونێكی ڕۆتینی و ڕۆژانە و ئاسایی.

لــە هەلومــەرجێكی ئــاوادا، ئیمانــەكان و ڕیتــەكان پێكــەوە دەبــن بــە گــەرەنتی پەیوەندییـەكی (وەزیفـی) لـە نێـوان گـەردونی مەدلولـە سامبۆلیكەكان لـە لایـەك و گـەردوونی شــت و فۆرمــەكانی ژیــانی ڕۆژانــە لەلایــەكی دیكـەوە. بـەم شـێوەیە لەسـەر ئاسـتی تـاك و لەسـەر ئاسـتی كـۆلێكتیڤیش جەدەلیـەتێك لـە نێوان عاتیفە و ئیماندا، لە نێوان عاتیفە و ڕێت دا دروســتدەبێت. جەدەلیــەتێك كــە دواتــر داندەنێت بە ژیانی ڕۆژانەی ئەزمونی ئاینیدا.

بیركردنــەوە و ڕامــانی دۆركــایم لــەو دوو پێكهاتەیـەی ئـاین بـە تـەنها سەرچـاوەی ئـەو گۆشـە نیگایـە نیـە كـە گوزارشـتە ئاینیـەكان بـە دەركەوتنــە ڕیزپــەڕەكان (مانیفێــستاسیۆنە مونحەریفەكان) دەزانێت، بەڵكو سەرچاوەی ئـەو گۆشـە نیگایەشـە كـە گوزارشـتە ئاینیـەكان وەك ئەزموونی ئاینی تەماشا دەكات. ئەزموونێك كە تــەماهی دەكــات لەگــەڵ ئــەزموونی عــاتیفی موقەدەسدا.

جیاكردنەوەی هەردوو چەمكی گوزارشت و ئــەزموون لــە یــەكتری مێژوویــەكی درێــژی لــە سۆســیۆلۆژیای ئاینــدا هەیــە. ژۆهــاكیم واچ یەكێكـە لەوانـەی كـە بـە وردی كـاری لەسـەر كردووە. هۆنری بێرگستۆن ئاینی كراوەو ئاینی داخراو لەیەك جیادەكاتەوە. ڕۆژیە باستید باس لـە ئـاینی ژیـاوو ئـاینی خـەزنكراو دەكـات. هــەروەها ئــەم جیاكردنەوەیــە لای ولیــەم جەیمسیش ئامادەیە.

بەشــێوەیەكی گــشتی لــە هــەموو ئــەم بیركردنەوانەدا سەرچاوەی فاكتی ئاینی بریتیە لـە ئـەزمونی عاتیفیانـەی موقـەدەس كـە لـە ڕێگایــەوە دەركەوتنــە دەزگاییــەكانی ئــاین دروســتدەبن. هــەروەها لــەم بیركردنەوانــەدا ئیمــان و پراكتیــە ئاینیــەكان هەمیــشە وەك كۆنترۆڵكراوێك لەلایـەن ئەزمونی یەكەمـەوە وێنا كراون.

دۆركـایم بـە ڕونـی گوزارشـتی لـەم چـەمكە نـەكردوە، چـونكە ئـەو زیـاتر ڕونـاكی دەخـستە سـەر بـەها كۆمەلایەتیـەكانی ئـەزمونی یەكـەم و دامەزرێنــەری ئــاینی. بــەلاّم خوێنــدكارەكانی دواتــر دێــن و پەیوەندیــە ئاڵۆزەكــانی نێــوان ئـەزمونی یەكـەم و ئیمـان و پراكتیكـە ئاینیـە هەنوكەییـەكان دەخەنـە سەر شانۆ. بە تایبـەتی گـەورە خوێنـدكاری دۆركایم كە نـاوی هیوبێرە. ئەم پیاوە لە كتێبی مێژووی ئاینەكاندا دەڵێت: ئاین بریتیە لـە بەڕێوەبەرایـەتی موقەدەس. واتە وەك چــۆن هــەر وەزارەتێــك لــە چــەند بەڕێوەبەرایەتیــەك پێكهــاتووە، ئــاواش ئــاین بەڕێوەبەرایەتی موقەدەسە!

چــەمكی "بەڕێوەبەرایــەتی موقەدەســەوە" ڕێگا دەدات بە كۆمەڵگە مۆدێرنـەكان تا هـەنگاو بنێن نزیكببنەوە لە بە دەزگایكردنی ئاینیانـەی هەســتە قوڵــەكان. واتــە دوور خــستنەوەی موقــەدەس لــە كۆمەڵگــە مۆدێرنــەكان. ئــەو سۆسـیۆلۆگانەی كـە بەمـشێوەیە بیردەكەنـەوە، پێیانوایە كە دەربەندێكی بەیەكگەشتن هەیە لە

نێوان دوو لایەنی جیاوازدا کە لەسەر ئاین قسەیان کردووە. لایەنێك کە پێیوایە ئەزموونی ئاینی سەرەتایی و کورتنەکراوە بەدرێژایی سەداکان و لە چەند فۆرمێکی جیاوازدا لەگەڵ کۆمەڵگەکاندا ماوەتەوەو دەمێنێتەوەو لکاوە بە ژیانی هەموو رۆژێکمانەوە. لایەنێکی دیکە پێیوایە کە، بە درێژایی بەرەو پێشچوونی کۆمەڵگەکان چەمکە ئاینیەکان بەگدادەنێن و لە ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکان دەکشێنەوە. ئەو سۆسیۆلۆگانەی کە ئاماژەمان پێدان، پێیانوایە کاتێك ئاین دەبێت بە بەرێوەبەرایەتی موقەدەس و کاتێك دەبێت بە ئەزمونی بەدەزگایکراو، ئیتر لێرەیە و لێرەش نیە. واتە نە کۆتایی پێهاتووەو نە کۆنترۆڵی فاکتە کۆمەڵایەتیەکانیش دەکات. ئەمە ئەو دەربەندەیە کە ئەو دوو لایەنە دژ بەیەکە تیایدا بەیەکدەگەن.

ئێمە دەتوانین ئەم بیرکردنەوەیە قوڵتر بکەینەوە. یاخود لە قوڵاییەکانی ئەم بیرکردنەوەیەدا چوارچێوەیەکی دیکەی کۆنسێپتیۆێل دروستبکەین بۆ تێگەشتن لەو بزوتنەوە ئاینیانەش کە لە ئێستا و ئێرەدا کاردەکەن بۆ رەفزکردنی ئەزموونی ئاینی بە دەزگاییکراوو بۆ رەگەزکردنی جیاکردنەوەی فاکتی کۆمەڵایەتی لە فاکتی ئاینی و دەیانەوێت ببن بە ئەکتەری سەرەکی گۆڕانێکی گەورە کە دەکرێت ناویبنێین: هەنگاو لە کۆمەڵگەی ساردەوە بەرەو کۆمەڵگەی گەرم. ئەم بزووتنەوانە کلیك دەکەن لەسەر پێویستی کۆمەڵگەکان بە خۆبیناکردنەوەی بەردەوام لەسەر بەها ئاینیەکان، گەرنا ئەستەمە بتوانن درێژە بە ژیانی کۆمەڵایەتیان بدەن.

کۆی ئەو تێبینیانەی سەرەوە بۆمان دەردەخەن تا چ ئاستێك دۆرکایم و قووتابخانەکەی لە ناوەوەی بەریەککەوتنە کۆمەڵایەتیەکاندا دەژین و تا چ ئاستێك بوون بە بارهەڵگری گرفتە جیاوازە کۆمەڵایەتیەکان. دۆرکایم و قوتابخانەکەی کار لەسەر ئەو کۆمەڵگە مۆدێرنانە دەکەن کە لەلایەن راسیونالیتێی زانستیەوە دەبرێن بەرێوەو لکاون بە چەمکی لایسیتێوە. لەم کۆمەڵگایانەدا وردە وردە ئاین پاشەکشە دەکات.

سێکیولاریزاسیۆن دەبێت بە رێگای رزگاری مرۆڤەکان لە ئاین. دۆرکایم لە کتێبی "دابەشبوونی کاری کۆمەڵایەتی"دا دەنووسێت:

"گومان لەوەدا نیە کە لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا، ئاین زۆر کەمتر بەشداری دەکات لە دەستنیشانکردنی ژیانی کۆمەڵایەتیدا. لە بیرمان نەچێت کە ئاین لە سەرەتاوە کۆنترۆڵی هەموو شتە کۆمەڵایەتیەکانی کردبوو. هەموو شتە کۆمەڵایەتیەکان شتی ئاینی بوون و هەردوو وشەی ئاینی و کۆمەڵایەتی مورادیفی یەکتر بوون. پاشان وردە وردە، چۆنیەتی کارکردنی سیاسەت و ئابوری و زانستی خۆیان لە چۆنیەتی کارکردنی ئاینی جیاکردەوە. لە سەرەتادا، خوا ئامادەبوونێکی بەردەوامی هەبوو لە نێو هەموو پەیوەندیە مرۆییەکاندا. بەڵام دواتر وردە وردە لەو پەیوەندیانە هاتە دەرەوەو جیهانی بۆ مرۆڤەکان بەجێهێشت"

بەڵام لە هەمان کاتدا لە بیرمان نەچێت کە دۆرکایم هاتنە دەرەوەی خوا لە پەیوەندیە مرۆییەکان نالکێنێت بە کۆمەڵگە مۆدێرنەکانەوە، بەڵکو پێیوایە کە پرۆسێسێکەو بە قوڵایی مێژووی مرۆڤایەتیدا چووەتە خوارەوە. لە هەمان کتێبدا دەنووسێت:

"ئاندیڤیدیوالیسم/ تاکگەرایی و بیرکردنەوەی ئازاد، ناگەرێتەوە بۆ 1789، یان بۆ سەردەمی ریفۆرم و سکۆلاستیك، ناگەرێتەوە بۆ شکستی فرە خوایی گریکۆ-

لاتــین، یــان تێکراســی ڕۆژهــەلاتی. بــەڵکو فینۆمێنێکــە و لەگــەڵ مێــژووی مرۆڤایەتیــدا بەردەوامە"

لێرەدا پرسیاری گرنگ بۆ دۆرکایم شتێکی دیکــەی تــەواو گرنگــە. کاتێــك خواکــان لــە پەیوەندییــە مرۆییــەکان دێنــە دەرەوە، چــۆن کۆمەڵگــەکان دەتــوانن چوارچــێوەکانی ژیــانی کــۆلێکتیڤ دروســتبکەنەوەو چــۆن دەتــوانن ئیدیالی هاوبەش بینابکەن؟ وەلامی دۆرکایم بەم شێوەیەیە.

پــاش کـشانەوەی خواکـان، دەبێـت کۆمەڵگـە چـەند کـەس و شـت و فیکرێـك تەقـدیس بکـات. دەبێــت ســەر لــە نــوێ ئیمــانی هاوبــەش دروسـتبکات، ئیمانێـك کـە دەسـت بـۆ بردنـی حـەرامبکرێت و کـەس نـەتوانێت نـەفیبکات یـان ڕەخنــەی لێبگرێــت. لــەم تێگەشــتنەدا ئــاین باشـترین سەرچـاوەیە بـۆ بەگرخـستنی کـردەی تەقـدیس و هـیچ کۆمەڵگەیـەك ناتوانێـت بـازی بەسـەردا بـدات. لـە بابەتێکدا بە نـاوی گەڕانەوە بـۆ دۆرکـایم کـە لـە ئەرشـیفی سۆسـیۆلۆژیای ئاینیـدا بڵاوبووەتـەوەو زۆر نەناسـراوە، هنـری دێرۆش دەنووسێت:

"بــە درێــژایی مێــژوو ئــاین مــۆرکی هــەموو کۆمەڵگەکانە. ئێمە کۆمەڵگەیـەکی بـێ ئیمانمـان دەسـتناکەوێت. کۆمەڵگــەی بــێ ئــاین هــەرگیز دروست نابێت".

پاش دورخستنەوەی کۆنترۆڵ کردنی ژیانی کۆمەڵایەتی لەلایەن ئاینی دەزگاییەوە، کۆمەڵگە مۆدێرنــەکان دەبێــت، بێگومــان لــە فیکــری دۆرکایمـدا، دەبێـت پارێزگـاری لـە دینـامیکی ئاینی بکرێت، چونکە دینامیکی دروستکردن و ســـــەرلەنوێ دروســـــتکردنەوەی شـــــتە کۆمەڵایەتیەکانە. دۆرکایم پێیوایە کە سەردەمە گەورەکانی نوێکردنەوەی کۆمەڵایەتی، لە هەمان کاتـدا سـەردەمی گـەورەی داهێنـانی ئاینیـشن.

لێـرەدا دۆرکـایم نموونـە بـە شۆڕشـی فەرەنـسی دەهێنێتەوە:

"لــە ســەرەتاکانی شۆڕشــی فەرەنــسیدا کۆمەڵگـە هەوڵـدەدات چـەند خوایـەك دروسـت بکات. لەو ساتانەدا و لە ژێر کارایی حەماسەتی جــەماوەردا، شــتە لایکــەکان بــە شــێوەیەکی ئاینیانە تەقدیس دەکران. حیزب، ئازادی، عەقڵ وەك شتە ئاینیەکان تەقدیس دەکران بەڕادەیەك کە بوون بە ئاین، ئاینێك بە کۆمەڵێك دۆگم و ســامبۆل و جــەژن و ئاهــەنگی تایبــەت بــە خۆیەوە"

دۆرکـــایم یـــەکێك بـــوو لـــەو زانایانـــەی کـــە بانگەشـــەی دەکـــرد بـــۆ دروســـتکردنی کۆمەڵگـــــەی هاولاتیـــــان، کۆمەڵگەیـــــەکی بینـاکراو لەسـەر مـۆراڵی زانـستی کـە تـوانی وەلامدانـــــەوەی پێویـــــستی هاولاتیـــــە کۆمەلایەتیەکانی هەبێت.

## 7-بیبلۆگرافی


—*Emile Durkheim, De la division du travail social (1893), Paris, PUF, 1990.*

—*Emile Durkheim, Les règles élémentaires de la méthode sociologique (1895) Paris, PUF, 1973.*

—*Emile Durkheim, Le suicide (1897), Paris, PUF, 1979.*

—*Emile Durkheim, Les formes élémentaires de la vie religieuse (1912), Paris, PUF, 1968.*


## پەراوێزەکان:

1-لــە کوردســتاندا دۆرکــایم لــە ڕێگــای ئــەو مامۆستایانەوە بڵاوبووەتەوە کە دوو ڕستەی بەکەڵکیان لەسەر سۆسیۆلۆژیا بەرهەمنەهێناوە. ئەوان دۆرکایمیان

**بەڕادەیەك شێواندووە كە بێزاربین لە خوێندنەوەی. خۆشبەختانە، بەم دواییانە، ئەوەندەی من ئاگام لێبێت، كاك ڕێبوار سیوەیلی و كاك موسلێح ئیروانی چەند كارێكی باشیان لەم بوارەدا كردووە و ئومێد دەكەم بەردەوامبن.**

2–**بۆ تێگەشتن لە هۆلیسم كە چەمكێكی زۆر گرنگو سەرەكیە لە زانستە كۆمەڵایەتیەكاندا، خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە سەر فەرهەنگی كۆنسێپتەكان.**

3–**من نازانم چۆن و كەی و بۆچی بە كوردی ناونراوە: كۆمۆنۆی پاریس! بە فەرەنسیەكەی بەم شێوەیەیە:**

**لا كۆمیون دو پاریس.**

4–**بگەڕێرەوە بۆ فەرهەنگی كۆنسێپتەكان.**

5–**بگەڕێرەوە بۆ فەرهەنگی كۆنسێپتەكان.**

***6-Sociologie et philosophie (ed. C. Bougle), paris, Alcan, 1924; PUF, 1967, p.79.***

***7-Leducation morale (ed. P. Fauconnet), Paris, Alcan, 1925; PUF, 1974/1990, p.76.***

***8-"De la definition des faits religieux", LAnne sociologique, II, 1897-1898 (1899), 1-28.***

***9-"De la definition des faits religieux", LAnne sociologique, II, 1897-1898 (1899), p. 25.***

***10-M. Mauss, Essai sur la nature et la fonction du sacrifice (1899), in euvre, (ed. V. Karady), 1. les fonctions socials du sacre, Paris, ed. De Minuit, 1968, p. 16.***

11–**بۆ تێگەشتن لەم دوو چەمكە، بگەڕێرەوە بۆ فەرهەنگی كۆنسێپتەكان.**

SARDAM No. 56 2008

# ڕۆڵی لاوان لە بەشداریکردنی سیاسیدا

د. سەیدە عەلیوە و مونا محەمەد

لە عەرەبییەوە: کنێر عەبدوڵلا

گومان لەوەدا نییە کە مەسەلەی لاوان لەم قۆناغەدا بە هەموو قورساییەکی خۆیەوە بەسەر کاری نیشتمانیدا خۆی دەسەپێنیٚ، ئەوەش لەبەر چەند هۆیەك کە پەیوەندیان بە خەمەکانی خودی لاوانەوە هەیە، هەروەها لەبەر ئەو هۆیانەی پەیوەندیان بە گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگەو ئاراستە تازەکانیو دەرهاویشتە ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسیو زانستییەکانی کۆمەڵگەوە هەیە. ئەوەی تاوتوێکردنی مەسەلەی لاوانیش سەخت دەکات ئەوەیە کە لاوان وەك کەرتەکانی دیکەی کۆمەڵگە کەرتێکی شاقوڵی نییە تا بتوانرێت بە ئاسانی خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی هەمەجۆری بۆ بکرێت، چونکە لاوان کەرتێکی ئاسۆییںو خۆ دەخزێننە ناو سەرجەم ئەو کەرتانەی دیکەوە کە بونیادی دانیشتوانیان لیٚ پێکدێت. بەوپێیەی لاوان بەرهەمی کۆمەڵگەن بە سەرکەوتنو شکستخواردنەکانیەوە، هۆکار، کاریگەری، ئەزموونو میراتە شارستانییەکانیەوە. لاوان نیوەی ئێستاو سەرجەمی داهاتوون. جا لەبەر ئەوەی لاوان لای ئێمە 60٪ ی ژمارەی دانیشتوان پێکدەهێنن، بۆیە بە توخمێکی کاراو بڕیاردەری پەرەپیدان دادەنرێن، چونکە پەرەپێدان پێویستە بە لاوان دەستپێبکات، لەبەرئەوەی هەڵگری تواناو وزەی بەخشینن. ئێمە خاوەن سامانێکی مرۆیی وەهاین کە توانای کارو بەرهەمهێنانی هەیە. جا ئەگەر هەندێك ئەو توانا مرۆییە بە بارگرانیەك یان کێشەك بزانێت، ئەوا هەندێکی دیکە وەك چارەسەر بۆ گشت کێشەکانی کۆمەڵگە تەماشای دەکەن.

ئەگەر ئیجتیهادی زۆر هەبن بۆ خەملاندنی چوارچێوەیەکی دیاریکراو سەبارەت بە چەمکی لاوان، ئەوا لانی کەم دەشێت جیاوازیی لەنێوان دوو ئاڕاستەی سەرەکیی ئەم بوارەدا بکرێت. یەکێکیان پێیوایە لاوان تەنها قۆناغیکی دیاریکراوی تەمەنەو دووەمیان لاوان بە دۆخێکی دەروونی دادەنێت کە مرۆۋ پیایدا

تیدەپەڕیو بە زیندویتی، توانای فێربوونو نەرمونیانی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانی جیاکارە دەکرێت. بەپێی ئاراستەی یەکەم، مەبەست لە لاوان قۆناغی تەمەنی دوای منداڵیو پێش کامڵبوونە، واتە لەنێوان تەمەنی (15–25) ساڵیدا (هەندێ جاریش 35ساڵی لەخۆدەگرێت). ئەمەش قۆناغێکە پڕە لە هێز، چالاکی، توانای بەدەستهێنانی زانیاریی نوێو زانینو شارەزاییو گرتنەئەستۆی بەرپرسیارێتی، لە پاڵ نەرمونیانیو ڕەق هەڵنەهاتنی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان. زانایانی دەروونناسیش جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە قۆناغی لاوان قۆناغی گەشەکردنو گواستنەوەیە لە منداڵییەوە بۆ کامڵبوون، بەراورد بە قۆناغەکانی پێشو پاش خۆی، خاوەن خەسڵەتگەلی جیاکارەیەو دەشێت بەهۆی فشارەکانی خێزان، خوێندنگەو کۆمەڵگەوە پشێویو گرفتی هەمەڕەنگ لەخۆبگرێت، بەوپێیەی قۆناغی خۆدروستکردن، گەشەکردنو زاخاودانی کەسایەتیە. ئەمە جگە لەوەی خاڵێکی لاوازو کەلێنێکە لاوان بۆ تێپەڕاندنیو گەیشتنە قۆناغی کامڵی بە ئارامیو سەلامەتی پێویستیان بە دەستگرتنو یارمەتیدان هەیە.

دەشێت لە ڕێی ئەم خاڵانەوە ڕۆشنایی بخەینە سەر رۆڵی لاوان لە بەشداریکردندا:

**یەکەم: خەسڵەتەکانی قۆناغی لاوێتی:**

قۆناغی لاوێتی بە گرنگترین قۆناغەکانی ژیان دادەنرێت، چونکە لە ڕێیەوە تاکەکان تواناو شارەزاییە مرۆییە جەستەیی، ئەقڵی، دروونییو کۆمەڵایەتییە پێویستەکان بەدەستدەهێنن بۆ ڕاییکردنی کاروبارەکانی ژیانو ڕێکخستنی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کەسانی دیکەدا.

**1–ئامادەیی بۆ گۆڕان:**

لەبەر ئەوەی، بەپێی سروشت، لاوان قۆناغی گۆڕانی بایەلۆجی، دەروونیو کۆمەڵایەتیە، بۆیە دەشێت یەکانگیربێت لەگەڵ گۆڕانکارییەکان لە کولتووری ماددیو رۆحیو هەروەها شێوازو ڕێگەکانی ژیاندا. ئەو گۆرانکاریانەی جێی بایەخو ئامانجی پەرەپێدانن. بەوپێیەش پەرەپێدان، وەك گۆڕانێك، بەپیتترینو دەوڵەمەندترین دەرفەت بەدەستدێنێت بۆ سەرکەوتن لەناو ژینگەی لاواندا کە بە سروشتی خۆی لە گۆڕاندایە. ئەمەش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە تاك لە قۆناغی لاوێتیدا لە دۆخی وەرگرتنو بەدەستهێنانی دابونەریتو بەها کۆمەڵایەتیەکاندایە کە هێشتا لەناخیدا نەچەسپیوونو نەبوونەتە بەشێکی جێگیری پێکهاتەی بەهاخوازیو کولتووریی ئەو. ئەمەش وادەکات قبوڵکردنی ئەو بۆ ئەو بەها تازانەی پەرەپێدان دەیانهێنێتە ئاراوە ئاسانترو سوکتربێت، ئەگەر بەراوردبکرێت بەو تەمەن گەورە پێگەیشتوانەی بەهاو کولتووری باو بۆتە بەشێك لەجیابوونەوە نەهاتووی خەسڵەتە خۆییەکانیانو دەستپێشکەرن بۆ داکۆکی لێ کردنیانو بەرەنگاربوونەوەی هەوڵەکانی گۆڕینیان. بەو جۆرەش لاوان بەرەنگاری کۆششەکانی پەرەپێدان نابنەوەو ڕەتیان ناکەنەوە.

**2–خواستو ڕوانینە داهاتوو:**

قۆناغی لاوێتی بەوە جیاکارە دەکرێت کە قۆناغی چاوبڕینە داهاتووە، بە گشت خواستە فراوانەکانیەوە لە چوارچێوەیەکی ئایدیالیستانەدا. چونکە لاوێتی ئەو قۆناغەیە کە بەڕادەیەکی قووڵ نموونە بەرزەکانی ژیان دەبینرێنەوە و ڕوانینە داهاتوویەکی گەش ڕوون دەبێت، پێش ئەوەی قۆناغەکانی تری

تەمەن بێن و بەهۆی پێوەنالاَندنەکانی ژیانەوە ڕاچڵەکێن و بە ململانێکانی وردوخاشبن و لەڕێگەی دەستبەرداربوونی زۆرێك لە خەون و خواست و نموونە بەرزەکانی قۆناغی لاوێتییەوە سازانیان بەسەردا بسەپێنرێت. ئەمەش وادەکات سروشتی بێت لاوان زیاترین توێژی کۆمەڵگە بن کە پشتیوانی پەرەپێدان بکات و ئەو سوپا ڕاستەقینەیەی پەرەپێدان بن کە توانای گرتنەئەستۆی بەرپرسیارێتی قوربانیدانەکانی هەبێت، ئەمەش لە ڕوانگەی ئارەزووی حاشاهەڵنەگرو خواستیان بۆ بنیادی داهاتوویان لە ڕێی پەرەپێدانەوە.

3-ڕاڕایی و دوودڵی:

ئەگەرچی لاوان سەرچاوەی وزەی زیندون لە هەر کۆمەڵگەیەکدا، بەڵام کۆمەڵێك ناکۆکی لەخۆدەگرن کە پێویست بە تێگەیشتن و قبوڵکردنیان دەکات. چونکە تاك لەم قۆناغەی تەمەندا دووچاری کۆمەڵێك هەستی هەڵبەزودابەز دەبێت کە کاردانەوەی لە ڕەفتاریدا دەبێت و دەشێت ئەو ڕۆژێك دڵخۆش بێت و ڕۆژێکی تر مرومۆچ و تورە بێت، جارێك ئەقڵانی بێت و جارێکیش نائەقڵانی بێت، ساتێك گوێڕایەڵ بێت بۆ ڕینمایی و ئامۆژگاری و ساتێکی تریش ڕەتیان بکاتەوە. ئەو ڕاڕاییە لە بیرکردنەوەو هەست و ڕەوشت لە ماوەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە، ڕەنگدانەوەی ئەو ململانێیەیە کە لەناو لاواندا لە ڕووی جەستە، ئەقڵ و هەڵچوونەوە ڕوودەدات، چونکە ئەوان لەنێوان بەرزخوازییە بێکۆتاییەکان و تواناکانی هاتنەدیی ئەو بەرزخوازییانەدا دۆشداماوە.

4-توانای بەدەستهێنانی زانیارییەکان:

سەردەمی نوێ، بە گۆڕانکارییە جۆربەجۆرەکانی و شۆڕشی کۆمۆنیکاشیۆن و پێشکەوتنی زۆر لە ئامرازو تەکنیکەکانیدا بووە هۆی ئاسانکردنی بەدەستهێنانی بڕێکی زۆری زانیارییەکان لەلایەن لاوانەوە، ئەمەش لەهەر بوارێکی زانیندا بێت. چونکە ژینگەی دەوروبەری لاوان زانیارییەکان لە ڕێی ئامرازە جیاوازەکانی کۆمۆنیکاشیۆنەوە دەگەیەنێت بە لاوان، ئەمە وێڕای ئەوەی لاوان- بە پلەیەکی زیاتر لە لاوانی نەوەی پێشوو- بەر تێڕوانینی جۆربەجۆرو بیروڕای جیاوازی گشت بوارو کایەکانی ژیان دەکەون، وەك ئایین، کۆمەڵناسی، ئابووری، سیاسەت و ئەخلاق. بێگومان ئەو بەرفراوانییە کراوەیەی زانیارییەکان و تێڕوانینە بەردەستەکان لە بەرژەوەندیی نەوەی ئێستای لاواندایە، بەڵام ئەمە هاوشانی نەبوونی ڕێگەکانی ڕێنماییە بۆ ڕوونکردنەوەی ساختەو ڕاست لەناو ئەو قەرەباڵغییەی زانیاری و تێڕوانینە هێرشبەرەکاندا. ئەمەش بە سەرچاوەیەکی سەرەکیی زۆرێك لە کێشەکانی لاوانی نەوەی ئێستا دادەنرێت. ئەمە سەرەڕای ئەوەی ڕێژەیەکی زۆری لاوانی نەوەی ئێستا دەرفەتی بەدەستهێنانی خوێندنێکی سستماتیکی بۆ ڕەخساوە کە لە ڕووی ئاست و درێژیی ماوەوە باشترە لە نەوەکانی پێشوتر، کە یاریدەدەربووە بۆ چاککردنی ئاستی کامڵبوونی ئەقڵیی هەڵچوونی لاوانی ئیمڕۆ، ئەگەر بەراوردکرێت بە هاوتەمەنەکانیان لە نەوەکانی پێشوودا. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی لاوانی هاوچەرخ کۆمەڵێکی ڕووناکبیر پێك بهێنن و شارەزاییان هەبێت لە مەسەلە جۆراوجۆرەکاندا، بە پلەیەك کە بۆ هاوشێوەکانی خۆیان لە ماوەکانی پێشوودا دەستەبەرنەبووە. ئەوەش بۆتە هۆی خوڵقاندنی کێشەی نامۆبوون لە کۆمەڵگەدا، بەهۆی لەخۆنەگرتنی توانا نوێکان لەلایەن کۆمەڵگەوە، کە بۆتە هۆی ڕەخنەگرتنی ڕاشکاوانەی ئەوان لە

بیروڕاکـــانو شـــێوازی ژیـــانی گـــەورەکانو ڕەتکردنەوەیان.

**دووەم: پێداویستییەکانی لاوان**

زۆرجار پێداویستییەکانی لاوان لەم خاڵانەدا چڕدەکرێتەوە:

1–گرفتە تاکە کەسییەکان.

2–خوێنـــــدن، کــــارو هێنانـــــەدیی سەربەخۆبوونی دارایی لە خێزان.

3–ئامادەکردن بۆ هاوسەرگیریو پێکهێنانی خێزان.

4–خۆچەســـــپاندنو بەدەســـــتهێنانی پێگەیەکی کۆمەڵایەتی جیاکارە.

5–دۆزینـــەوەی فەلـــسەفەو بیروبـــاوەڕێکی ئارام بۆ ژیان.

6–بەشـــداریکردن لـــە ژیـــانی کۆمەڵایـــەتیی گشتیدا.

7–پـــەرەدان بـــە هەســـتکردن بـــە ڕێزگـــرتنو نرخاندنی دوولایەنە لەگەڵ کەسانی دیکەدا.

لەســـەر بنـــچینەی ئـــەم پێداویـــستیانە، پێویستە بەرنامەکانی گەنجان لە چوارچێوەی پلانێکی پەرەپێدانـدا بنیـادبنرێ کـە تێرکردنـی ئـەو پێداویـستیانە مـسۆگەربێت، بـۆ ئـەوەی لەلایـــــەن گەنجانـــــەوە بـــــەرزترین ڕادەی پەسـەندکردنو بەپیرەوەچـوون بەدەسـتبێنێت، هـــەتاکو کاریگەرانـــە لـــە چـــالاکیەکانیاندا بەشداربن.

**ســـێیەم: کۆڵەکـــەکانی بەشـــداریکردنی کاریگەریانەی لاوان**

پێشتر هێمامان بۆ ئەوە کردوە کە قۆناغی لاوان خـاوەن چـەند خەسـڵەتێکی تایبەتیـەو بـۆ ئـــەوەی چـــاك ســـوود لـــەو وزەو تواناکانیـــە وەربگیرێت، پێویستە دەوڵەت لە ڕێی دامەزراوە جۆربەجۆرەکانیـــەوە کەشـــێکی گونجـــاوو ژینگەیـەکی گونجاو بخوڵقێنێـت، چـونکە ئـەوە دەرفـەتی هەنگاوهـەڵهێنانو تەقاندنـەوەی وزە داهێنـەرەکانی لاوان دەڕەخسێنێت، بـۆ ئـەوەی بەشداری بکەن لە گشت چالاکیو کۆششەکانی تێکڕای بوارەکـانی ژیانـدا. ئەمـەش لـە ڕێگـەی دەســـتەبەرکردنی ئـــەو کۆڵەکانـــەی خـــوارەوە مەیسەردەبێت.

**1–ئامـــادەکردنی بنکەیـــەکی ئامـــاری سەرەتایی دەربارەی لاوان:**

زانیـاری کۆڵەکـەی پلانـدانانی دروسـتە، چـــونکە هـــیچ پلاندانـــەرێك ناتوانێـــت لـــە ئامـــادەکردنی سیاســـەتگەلی ســـەرکەوتوودا سەرکەوتووبێت، بەبێ دابینکردنی لانی کەمی ماقوڵی زانیاریی و داتا دروستەکان. بۆ ئەوەی کۆمەڵگەش بەچاکی سوود لە هێزە سیاسیەکان وەربگرێـتو بتوانێـت لـەپێناو خزمـەتکردنی مەســـەلەکانی کۆمەڵگـــەو پێداویـــستیەکانیدا بیانخاتەگـەڕ، گەرەکـە بنکەیـەکی ئامـار لەسـەر لاوان ئامادەبکرێت کە ئەم لایەنانە لەخۆبگرێت:

–ئەژمارکردنی لاوان لە کۆمەڵگەی میسردا.

–دابەشکردنیان بەسەر توێژە جیاوازەکان لە ڕووی تەمەنەوە.

–دابەشبوونی جوگرافی لەنێوان شارو لادێدا.

–ئاستەکانی خوێندن.

–دابەشبوونیان لە ڕووی ڕەگەزەوە.

–بارودۆخی ئابووری.

–باری کۆمەڵایەتی.

–ئینتمابوون و بڕواخوازییەکان.

–پەیوەنـــدیی لاوان بـــە ئامڕازەکـــانی ڕاگەیاندنەوە.

–مەسەلەو کێشەکانی لاوان.

جـا لەبـەر ئـەوەی لاوان توێـژێکی گـەورەی جەماوەری میسر پێکدەهێنن، بۆیە دەشێت لە ڕوانگـەی کێشانی نەخشەیەکی ئامـاریی وردی سیماو خەسـڵەتەکانی لاوانـی میسرەوە جـۆرە

پلان و سیاسەتێك ئامادەبکریت کە گرتنەباوەشیان لە چوارچێوەی کۆمەڵگەییدا مسۆگەربێت.

**2-لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەو ڕێکخراوانەی لە بواری خزمەتگوزاریی لاواندا کاردەکەن:**

لاوان لە قۆناغەکانی تەمەنیاندا ڕوودەکەنە گەلێك دامەزراو، وەك خوێندنگەکان، زانکۆکان، یانە وەرزشییەکان، دامەزراوەکانی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن و شوێنەکانی خواپەرستی...هتد. ئەم دامەزراوانە ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە بواری پێگەیاندنی لاوان و ئامادەکردنیاندا بۆ خزمەتکردنی گشتی. بۆ چاکتر سوودوەرگرتنیش لە تواناکانی ئەو دامەزراوانە، بایەخدان بەم لایەنانە گرنگە:

-ڕادەی مامەڵەکردنی لاوان لەگەڵ ئەو دامەزراوانەدا.

-ڕادەی سەرکەوتنی ئەو دامەزراوانە لە بەپیرەوەچوونی پێداویستیەکانی گەنجاندا.

-رادەی پابەندبوونی دامەزراوەکان بە شێوازی دیموکراتیانەی مامەڵەکردن لەگەڵ لاواندا.

-رۆڵی دامەزراوەکان لە چەسپاندنی هەستی دڵسۆزی و ئینتما لەناو لاواندا.

-ئەو گرفت و کۆسپانەی ڕێگرن لەبەردەمی بەجێهێنانی پەیامی ئەو دامەزراوانەداو چۆنێتی زاڵبوون بەسەریاندا.

-جۆری پەیوەندیی نێوان ئەو دامەزراوانەو ڕادەی سازان و ناکۆکی لەگەڵ ئەو ناوەرۆکانەی پێشکەشی دەکەن.

-رادەی باوەڕبوونی سەرکردەکانی ئەو دامەزراوانە بە ڕۆڵی لاوان لە پەرەپێداندا.

لە ڕێگەی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەوە ڕێگە خۆشدەبێت بۆ هەڵوەستەکردن لەئاست لایەنەکانی بەهێزی و لاوازیی کارکردنی ئەو دامەزراوانەداو خەملاندنی ئاڕاستەیەکی هۆشمەندانەی گۆڕاو بۆ سودوەرگرتن لە تواناکانی ئەو دامەزراوانە بۆ بینینی ڕۆڵی کاریگەرانە لە ئامادەکردنی لاوانداو بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریان و سازکردنیان بۆ بەشداریکردن لە مەسەلەکانی کۆمەڵگەکەیاندا.

**3-چارەسەرکردنی کێشەکانی لاوان و بەپیرەوەچوونی پێداویستیەکانیان:**

کێشەکانی لاوان لە میسر بەرهەمی ژینگەی کۆمەڵایەتیە کە خاوەن خەسڵەت و سیفاتگەلی دیاریکراوە، یان دەرئەنجامی کۆمەڵێك هەلومەرج و بارودۆخە کە ژینگەی کۆمەڵایەتی دەریهاویشتوون.

کاتێك پێداویستیگەلی بنچینەیی و گرنگ لای لاوان بوونیان دەبێت و ناتوانێت لە ماوەیەکی شیاودا بەشێوەیەکی ماقوڵ تێریان بکات، ئەوا چاوەڕوانی ئەوە ناکرێت لاوان بەشداربوونێکی کاریگەرانەیان هەبێت لە مەسەلەکانی کۆمەڵگەکەیاندا. کاتێکیش خزمەتگوزارییەکان وەك پێویست لەئارادا نابن و پێداویستیەکان تێرناکرێن، ئەوا چاوەڕوانی ئەوە ناکرێت لاوان پۆزەتیڤ بن. چونکە لاوان پێویستیان بە ئاسایش هەیەو دەیانەوێ لە داهاتووی خۆیان دڵنیابن و دەیانەوێ لە ماوەیەکی گونجاودا خێزانێکی خنجیلانە پێکبهێنن و چارەسەرێکی جێگیر بدۆزنەوە کە بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانیان جۆریك لە پشت بەخۆ بەستنیان بۆ زامن بکات. هەروەها لاوان پێویستیان بەوەیە کەسانێك هەبن هەستی ئینتمابوونیان بدەنێ و نرخیان بۆ دابنێن و ڕێزیان لێ بگرن و ستایشی سەرکەوتن و دەستکەوتەکانیان بکەن.

بێگومان بایەخدانی دەوڵەت- بە دامەزراوە جۆربەجۆرەکانیەوە- بە چارەسەرکردنی گرفتەکانی لاوان و بەپیرەوەچوونی

پێداویستیەکانیان ڕەنگدانەوەی باشی دەبێت لەسەر بەشداریکردنی چالاکانەی لاوان لە گشت ئەو شتانەی لە گۆڕەپانی میسردا ڕوودەدەن. ئەوکاتەش دەبینین ئەوان لێرە شتێك دەچێنن‌و لەوێ شتێك دروستدەکەن، دەکەونە ناو کاری حزبی‌و سەندیکاییەوە، لافتەیەکی هەڵبژاردن بەرزدەکەنەوە بۆ پشتگیریکردنی ئەم یان ئەو کاندیدکراو، سەردانی لیژنەیەکی هەڵبژاردن دەکەن‌و مافی دەنگدان بۆ کەسێك بەکاردەهێنن بۆ هەڵبژاردنی کەسێك بە شایستەی دەزانن بۆ نوێنەرایەتیکردنیان. بە فرەبەشداریکردن بەرهەمهێنان زیاددەکات، کارپێکردنی دیموکراسی پەرەدەستێنێ‌و هێدی هێدی خراپییەکان لەناودەچن‌و دیوزمەی خەمساردی بەرەو نەمان دەچێت.

**4-پەرەپێدانی هۆشمەندیی لاوان دەربارەی مەسەلەکانی کۆمەڵگەکەیان:**

مرۆڤ ناچێتە ناو بابەتێکەوە کە لە ڕەهەندەکانی نەگات. زۆرجار لاوان لە بەشداریکردن لە مەسەلەکانی کۆمەڵگەکەیان دووردەکەونەوە، کاتێك زانیارییەکان کەمدەبن یان لەئارادانابن، هەروەها کاتێك مەسەلەکانی دەوروبەری نادیارو ئاڵۆز دەبن. پێویستە دامەزراوەکانی پەروەردەکردن‌و جڵەوکارانی گشت ئەو مەسەلەو شتانەی خۆیان بەسەر کۆمەڵگەدا دەسەپێنن بە زمانێکی ئاسان‌و سادەی دوور لە ئاڵۆزی‌و ڕووتی بخەنە بەردەم لاوان‌و خۆیان لە بەکارهێنانی ئامرازەکانی وتاربێژیی زایەڵەدارو زاراوە زانستییە تایبەتکارەکان بەدووربگرن‌و ئەو زاراوە تازانەی لە گوێماندا دەزرنگێنەوە شیبکەنەوە، وەك خەسخەسەکردن، جیهانگیری، ململانێی شارستانی‌و سیستەمی نوێی جیهانی. پێویستە فۆرمی قبوڵکراو بدۆزرێنەوە کە ڕێگەدەدەن بە گوێزانەوەی ماناکان لە ڕۆشنبیرییەکانی دیکەوەو ڕەنگدانەوەی کولتوورەکان لەسەرمان ڕوونبکرێتەوە. هەروەها گرنگە ڕایەکی گشتی وەها بخوڵقێنرێت کە باوەڕی بە مەسەلە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگە هەبێت‌و بیان بەستێتەوە بە بەرژەوەندییە ڕاستەوخۆکانی لاوانەوە، چونکە یەکێك لە خەسڵەتە جیاکارەکانی ڕای گشتی بایەخدانە بە بەرژەوەندییە خۆییەکان. بۆ نموونە کاتێك مەسەلەیەکی وەك خەسخەسە دەخەینەڕوو، پێویستە تاودانەوە باشەکانی لەسەر بەرژەوەندییە ڕاستەوخۆکانی لاوان ڕوونبکەینەوە، ئەوەش لە ڕێی ڕەخساندنی دەرفەتی کاری نوێوە لەبەردەم سوپای بێکاراندا کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە زیادبووندایە.

لە بواری چەسپاندنی بەها دیموکراسییەکانیش لە ویژدانی لاوانداو گفتوگۆکردن دەربارەی ڕەهەندەکانی ئەم مەسەلەیە، دەشێت لاوان باش ئامادەبکرێن‌و بەهاکانی هاریکاریکردن‌و بەشداریکردنیان پێ ببەخشرێت‌و رابهێنرێن لەسەر ئەوەی هەر مافێك ڕووبەڕوویان دەبێتەوە ئەرکەو جێگیرکردنی بەهای هاوولاتیبوون لەلایان لە ڕێگەی درککردنەوە بە ئەرك‌و مافەکانەکانیان‌و ئاگادارکردنەوەیان سەبارەت بە گرنگی‌و قازانج‌و کاریگەریی بەشداریکردنی‌و گرێدانەوەی دیموکراسی بە توخمی بەرژەوەندییەوە.. چونکە کاتێك ڕێزی ڕای کەسانی دیکە دەگرن، ئەوانیش ڕێز لە بیروڕای ئەو دەگرن، کاتێك بە بیروڕایەك بەشداری دەکەن لە مەسەلەکانی نیشتمانەکەیدا، ئەوا بەشداریدەکات لە دروستکردنی سیاسەتی گشتیی نیشتمانەکەیدا. هەروەها ڕادەربڕین بە دەروازەیەك دادەنرێت بۆ بەپیرەوەچوونی پێداویستییەکان، چونکە بڕیارساز چۆن

دەزانێت پێداویستیەکانم چین، ئەگەر بیروڕای خۆم دەرنەبڕم.

5-گوزارشتکردن لە بەشداریکردن وەك ئەرکێکی ئاینی:

خوێندنەوەی میسر لە رووی مێژووییەوەو لە سەردەمە جیاوازەکانیدا ڕاستییەك ڕادەگەیەنن پوختەکەی ئەوەیە کە ژیانی کۆنی میسر هەزاران ساڵە لەسەر بنەمای ئاینی دامەزراوە، چونکە هەر لە کۆنەوە میسرییەکان بە بەهێزیی ئایندارى ناسراون. هەر بۆیە (هیرۆدۆت) کە بە باوکی مێژوو ناسراوە وتویەتی: میسرییەکان ئاینداترین مرۆڤن و هیچ میللەتێك ئاستی ئیمانداریی نەگەیشتۆتە پلەی ئەوان. هەروەها ئایین دەسەڵاتێکی دەستڕۆیشتوی بەسەر ئەقڵیی میسرییەکانەوە هەیەو بانگهێشتیان دەکات بۆ ئایندارى، خواناسی، چاکەکاری بەرامبەر بەوانی دیکەو کاری باش. ئایین بە گرنگترین هۆکار دادەنرێت کە تێڕوانینی کۆمەڵگە بەرامبەر بە گۆڕانکارییەکانی سەردەم کۆنترۆڵ دەکات و کۆمەڵگە بەپێی ئەو هەڵوێستی دیاریکراو، بەچاك یان خراپ، لە مەسەلەو کێشەکان وەردەگرێت. ئەگەرچی دیمەنی لادان لەنێو لاوانی جیهاندا بەشێوەیەکی گشتی بەدیدەکرێت و دەبینرێت باڵی خۆی کێشاوە بەسەر لاوانی میسردا، بەڵام دەشێت بوترێ کە بنکەی لاوان لە میسر بەگشتی و خۆرسکانە پابەندو دەروەست و ئایندارەو کەمینەیەکی ڕیزپەڕ ڕێساکە ناگۆڕێ و بێدەسەڵاتە.

ئەگەر هاتوو لاوان لە ڕێی دامەزراوە جۆربەجۆرەکانی پەروەردەکردنەوە لە هەڵوێستی ئیسلام دەربارەی بەشداریکردن گەیشتن، ئەوا ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکە ئایینیە لەلایەن لاوانەوە بەخێرایی ڕوودەدات و کاریگەرتریش دەبێت. زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئان چەندین یاساو بنەمایان لەخۆگرتووە کە جەخت لەسەر گرنگیی بەشداربوونی جەماوەر دەکەنەوە لە گشت بوارە سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتیەکاندا، بۆ هێنانەدی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی کامڵ... هەروەها بانگهێشت بۆ بەشداریکردن ئاڕاستەی هاووڵاتیانی مەسیحیش دەکرێت، بۆ بەهێزکردنی یەکێتی نیشتیمانی، بەوپێیەی ئایین بۆ خودایەو نیشتیمان بۆ هەمووانە.

6-پێڕەویکردنی تیۆری هاندان:

هاندان بەیەکێك لە بزوێنەرەکانی ڕەوشت دادەنرێت. زانایانی دەروونناسی پێیانوایە هەموو ئەو کارانەی مرۆڤ ئەنجامیان دەدات دەشێت بە هەوڵی مرۆڤ دابنرێت بۆ تێرکردنی داخوازییەکی سەرەکی یان پێداویستییەکی پێویست. جا ئەگەر پەیوەندییەك یان ڕایەڵەیەك دۆزرایەوە لەنێوان بەشداریکردن و ئەوەی زانایانی دەروونناسی بە پاداشتکردن ناوی دەبەن، ئەوا ئەوە دەبێتە هۆی کاراکردن و چالاککردنی بەشداریکردن. جا لەبەرئەوەی پێویستبوونی ڕێزلێنان لە ڕووی ماددی و ڕۆحییەوە پێداویستییەکی کۆمەڵایەتی مرۆڤە، بۆیە تێرکردنی لەو ڕووانەوە دەبێتە هۆی بەخشندەیی زیاتر. بۆیە کاتێك لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە خەڵاتی ئەو کەسە دەکرێت کە بەشدار دەبێت لە نەهێشتنی نەخوێندەواریی کۆمەڵێك هاووڵاتیدا یان چاککردنی پارچەیەك زەویی بیاباندا یاخود بەشداری دەکات لە پاککردنەوەی ژینگەو چاندنی درەخت لە ناوچەکەیدا، دوو کاریگەریی دەکەونەوە:

-بەرزکردنەوەی ورەی بەشداربوو بەشێوەیەك کە وای لێ بێت هەوڵی زیاتر بدات.

-پێشکەشکردنی نموونەیەك کە دەشێت کەسانی دیکە چاوی لێ بکەن.

پشتئەستوور بەوەی سەرەوە، پێویستە لەسەر ئەو دەستانەی پەیوەندییان بە کاروباری لاوان و ئەو دامەزراوانەوە هەیە کە لاوان رووپیان تێ دەکەن سیاسەتی پێڕەویی هاندانی لاوان بکەن لەرێی پاداشت و هاندانەوە، تەنانەت ئەگەر پاداشت و هاندەرەکەش رێژەیی بن.

7-بڕوابوونی سەرکردایەتی بە گرنگیی رۆڵی لاوان:

بڕوابوونی سەرکردایەتی، لە هەر ئاستێك و گشت هەڵوێستێکدا، بە فەلسەفەیەك کە ناوەڕۆکەکەی ئەوەیە لاوان بەشێکی گرنگی بونیادی کۆمەڵگەیە و لەدەستدانی بەشداریکردنی ئەو بەشەو پەراوێزکردنیان زیان بەسەرجەم کۆمەڵگە دەگەیەنێت گرنگە. چونکە بڕوابوون بە رۆڵی لاوان کاریگەریی باشی دەبێت لەسەر رەخساندنی هەلومەرجی گونجاو بۆ تێکەڵبوونی لاوان بە چالاکییەکانی کۆمەڵگەو بەشداربوونی لە رۆڵە دەربڕاوەکاندا. لێرەشدا دەشێت چەند میکانیزمێك دەستنیشان بکرێت کە ئەو بڕوابوونە دەگۆڕێت بۆ واقعێکی هەستپێکراو:

-دەرفەت رەخساندن بۆ لاوان هەتا تەعبیر لە راو بۆچوونەکانیان بکەن دەربارەی مەسەلەکانی کۆمەڵگەکەیان و چۆنیەتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ کێشەکانی کۆمەڵگە، بەبێ ترس لە سزادان یان لێپرسینەوەو لەسایەی کەشوهەوایەکی دڵنیادا کە رەچاوی ئازادییەکان دەکرێت و پشتیوانی لە دیموکراسی دەکرێت.

-دەستەبەرکردنی کەناڵ و سەکۆی جۆربەجۆر هەتا لاوان بتوانن کێشەو تێڕوانینەکانیان دەربارەی چۆنیەتی چارەسەرکردن و تەعبیرکردن لە خواست و تێڕوانینەکانیان بخەنەڕوو.

-پێویستە دەستە پەیوەندیدارەکان بە مەسەلەکانی گەنجان هەندێ لەو توخمە لاوانە لەخۆبگرن کە دەتوانن بەشێوەیەکی باش گوزارشت لە خەم و مەسەلەکانیان بکەن، چونکە ماقوڵ نییە ئەوانە گوزارشت لە مەسەلەکانی لاوان بکەن کە دوورن لە توێژی لاوانەوە، لەبەرئەوەی لاوان باشتر دەتوانن گوزارشت لە خۆیان بکەن.

-بایەخدان بە کاری راپرسیکردنی بەردەوام سەبارەت بە تێڕوانینەکانی گەنجان دەربارەی خەم و مەسەلەکانی کۆمەڵگە.

-گەشەدان بە رۆڵی پارت و دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بۆ گرتنەخۆی لاوان و راهێنانیان لەسەر مامەڵەکردن لەگەڵ مەسەلە سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتیەکاندا.

-پاراستنی هەندێك رۆڵی سەرکردایەتی لەناو رێکخراوو دامەزراوەکانی کۆمەڵگەدا بۆ ئەوەی بە لاوانی سەرکەوتوو پڕبکرێنەوە، بەبێ پابەندبوون بە ئاستەنگە بیرۆکراتیەکان. ئەمەش بەپێی ئەو پرنسیپەی پێویستە کەسی شیاو لە شوێنی شیاو دابنرێ، بەبێ ئاوڕدانەوە لە مەرجەکانی تایبەت بەتەمەن و بایەخدان تەنیا بە پێوانەی تواناو لێهاتوویی کەسەکە بۆ ئەو رۆڵەی پێی دەدرێت.

شایانی باسە، سەرکردایەتی سیاسی لە میسر کێشەو خەمەکانی لاوان لەبەرچاو دەگرێت و هەوڵدەدات چارەسەری گونجاویان بۆ بدۆزێتەوە، ئەمەش لە روانگەی باوەڕبوونیەوە بە توانا داهێنەرە کاریگەرەکانی لاوان کە پاڵنەرن بۆ مەسەلەکانی پەرەپێدان. باشترین بەڵگەش بۆ ئەو تێڕوانینە رستەیەکی سەرۆکی میسر (حوسنی موبارەك)ە کە تیایدا داوای لەخۆگرتنی لاوان و تێکەڵکردنیان بە کۆمەڵگە دەکات و دەڵێت: " هەمان هەستی هەر باوکێکی میسریم هەیە، کاتێك دەبینم هەزارەها لاوی

بەتوانا دەستەوەستانن لەئاست دۆزینەوەی کارێکدا کە دەرفەت بۆ هەریەکەیان دەرەخسێنێ گوزارشت لە تواناو هێزی خۆی بکات، بوونی خۆی بسەلمێنێ و داهاتووی بخاتەڕوو. لەوەش ناخۆشتر نییە بیر لەوە بکەمەوە چۆن ئەو توێژانەی لاوانی میسر بەدەست دڵشکاوییەوە دەناڵێنن و کۆمەڵگە بێبەشبووە لە وزەی ئەو لاوانەی توانای بنیاتنان و کارکردنیان هەیە".

**8-بوونی نموونەو پێشەنگ:**

لاوان لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەنیاندا مامەڵە لەگەڵ گەلێك دامەزراو دەکەن کە سەرکردایەتی جیاواز سەرپەرشتیان دەکەن. مرۆڤیش هەروەك چۆن خوێندن و رۆشنبیریی خۆی لە ڕێگەی بەشداری و خوێندنەوەو فێربوونەوە وەردەگرێت، ئاوهاش بەشێکی زۆری شارەزایی و زانینەکانی ئەنجامی تێکەڵبوونی بەوانەی لە هەڵوێستە جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەریاندەکەوێت. بۆ نموونە، منداڵ لە کاتی پرۆسەی گەشەکردنیداو دەرئەنجامی تێکەڵبوونی بە تاکەکانی خێزان یان کۆمەڵگەی خوێندن یاخود یانەو شتەکانی دیکە کۆمەڵێك ئاکار بەدەستدێنێت و لە گشت قۆناغەکانی ژیانیدا پێویستی بە ئاڕاستەکەرێك هەیە کە دەشێت هەندێ جار دایك و باوك بێت، هەندێ جاری دیکەش مامۆستا یان هەرکەسێکی تر بێت کە مرۆڤ بە خاوەن توانای ڕێنماییکردن و ئاڕاستەکەرو ڕێنیشاندەری ئاکاری بزانێت. لێرەشدا هەڵەیە بڕوابکەین مرۆڤ دەتوانێت دەستبەرداری چاوپۆشی پێشەنگ بێت، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییەو کاریگەریی کۆمەڵگەی لەسەرە. هەروەها هەڵەیەکی ئاشکرایە بڕوامان وابێت ئەخلاقی باش و ڕەفتاری ڕاستی تاك و کۆمەڵ تەنها بە یاساو سزادان دێتەدی، لەبەرئەوەی ویڕای ئەوانە نموونەی چاك و پێشەنگ لە گشت بوارە کۆمەڵایەتیەکانی ژیاندا پێویستە. بۆیە دەبێت سەرکردەکان سووربن لەسەرئەوەی نموونەی باش بن بۆ پاراستنی کات، پابەندبوون بە کارەوە، ڕاستگۆیی لە قسەکردنداو پاراستنی دارایی گشتی. چونکە ئەخلاقی باش بانگەشەیەکی بێدەنگە، بەڵام ئەگەر سەرکردایەتی خاوەن خەسڵەتی خەڵەتاندن، فریودان و ناهاوسەنگیی نێوان قسەکردن و کردار بوو، ئەوا ئەوە دەبێتە هۆی خستنەوەی کەشوهەوای دڵشکاوی لای لاوان، ئەمەش ڕێگردەبێت لەبەردەم گەشەکردنی هەستکردنی لاوان بە دڵسۆزی و ئینتمابوون بۆ کۆمەڵگە.

**چوارەم: ئاسۆ نوێکانی بەشداریکردنی لاوان لە مەسەلەکانی نیشتماندا:**

لەگەڵ سەرەتای سەدەی نوێدا، فێرکردنی مەدەنیانە بە یەکێك لە مەسەلە هەرە گرنگەکان ئەژماردەکرێت، ئەمەش لەبەر زۆر هۆی ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتووری و مەبەست لێی فێرکردنی سیاسییە، واتە پێکهێنانی ڕۆشنبیریی بەمەبەستی دروستکردنی هاوولاتیی بەشدار لە سیستەمی حوکمڕانیی چاکداو بە گشت مەرج و کۆڵەکەکانییەوە. گرنگیی ئەوەش هەڵقوڵاوی گەلێك دیاردەیە کە جیهانگیری بە گشت ئەو دەرفەت و مەترسیانەی دەریدەبڕێت و کەشی قەیرانە تێکرژاوەکان و پێویستیی بەڕێوەبردنی گۆڕانکاری لە ڕیزی پێشەوەی هەموویانەوەیە. ئەو مەسەلەیەی جەختکردنەوە لەسەر بنیاتنان و پەرەپێدانی تواناکانی ئەو مرۆڤە دەکەنەوە کە دەتوانێت زیرەکانەو توانادارانە مامەڵە لەگەڵ هەموو ئەو بەرەنگاربوونەوانەدا بکات.

هەروەك چۆن بانگەشە دەکەین بۆ وەبەرهێنانی شۆڕشی زانستیی تەکنەلۆجیانەو خێراکردنی تێکڕای پەرەپێدانی هەمەلایەن و

بـــەردەوامو دۆزینـــەوەی چـــینێکی نـــوێی بەرهەمهێنـــەری تـــازەو خاوەنکـــاری گـــەنج، پێویستە ئاوەهـاش کـوڕان‌و کـچانمان ڕابهێـنین لەسـەر بەشـداریکردنی هۆشمەندانـەو ئاکـاری هوشـــیارانە، وەك هاووڵاتیـــەك كـــە مـــاف بەشداربوونیان هەبێت لە هەڵبژاردنەکان‌و ژیانی گـشتی‌و هەڵبـژاردنی حوکمڕانەکانـداو بتـوانن سیاســەتە پێــشنیارکراوەکان هەڵــسەنگێنن‌و باشــەکەیان لـــە خراپەکـــەیان جیابکەنـــەوە. هـــەروەها هـــەوڵێکی بـــەکردەوە بـــدەن بـــۆ ئەنجامـدانی پەرەپێـدانی خـۆیی‌و بووژانـەوەی نیـشتمانی، چـونکە پەرەپێـدان‌و وەبـەرهێنان‌و چـــاككردنی بەرهـــەمهێنان‌و بـــەروبومی پێشکەوتن، بەبێ بوونی سیستەمێکی سیاسیی دیموکراتیانـــەی زامنکـــەری فراوانکردنـــی بەشـــداریکردن لـــە بڕیارســـازی‌و ئـــازادیی هەڵبژاردنی نەتەوەییدا، هەرەشەلێکراودەبێت.

فێرکردنـی سیاسـی، بەواتا هاوچەرخەکەی، ئامـانجی پەرەپێـدانی کۆمەڵگـەی مەدەنیـەو فێرکردنێکی حزبیانە نییە، بەڵکو پشتبەستووە بـــە پلـــورالیزمی کولتـــووری‌و ئـــاییینی‌و کۆمەڵایـەتی‌و بانگەشـەکردنێکی کراوەیـە بـۆ بەشداریکردن لە کاروبـاری گشتیدا، ئەوەش لە ڕووی بیروڕاو قسەکردن‌و کردەوەو بە مەبەستی زامنکردنی یەکێتیی نیشتمانی.

لـە واقیعـدا لـە کۆمەڵگـە هاوچـەرخەکاندا سیستەمی خوێندن ڕۆڵێکی ناوەندی دەگێـڕێ لـــە ئامـــادەکردنی دەســـتەبژێری سیاســـی‌و ڕاهێنـــــانی حوکمڕانـــــەکانی داهـــــاتووداو ڕەهەنـــدەکانی ئـــەم ڕۆڵـــەش لـــە قۆناغـــە جیاوازەکان‌و بەدرێژایی ساڵەکانی خوێندن، لە منداڵییـــەوە تـــا لاوێتـــی، گرێـــدراوی ئامـــانجی بەکردەوەی خوێندنە لە چوارچێوەی فەلسەفەی سیـــستەمی سیاســـیدا. دەشـــێت ئامانجەکـــە بەرهـەمهێنانی فەرمانبـەران‌و تـەکنیکاران بێـت‌و دەشێت فراوان بێت بۆ ئامادەکردنی هاووڵاتیی هوشـیارو مرۆڤـی بـاش. هـەموو ئەوانـەش لـە ڕوانگەی ئەوەوە کە ئەو خوێندنەی مەبەستمانە زۆر فراوانترە لە چەمکی خوێندن لـە قوتابخانـەو زانکۆکانداو هەریەکە لە ڕۆشنبیری، ڕاگەیانـدن، ڕاهێنـان، تەندروستی، چاودێری کردن‌و گشت دیمەنـەکانی پەرەپێـدانی مرۆیـی دەگرێتـەوە، بـــەڵکو پەرەپێـــدانی سیاســـیش دەگرێتـــەوە هـەروەها کـە بریتییـە لـە دەسەڵاتگرتنەدەسـت، کارپێکردنـــــــە دەســـــــتوورییەکان، ڕادەی بەشداریکردنی دیموکراتیانەو بەشداریکردن لـە پەرەپێدانـدا.

شـایانی باسـە، فێرکردنـی شارسـتانی یـان فێرکردنـــــی سیاســـــیانەی لاوان تـــــەنیا بەرپرســـــیاریی دامـــــەزراوەکانی پـــــەروەردەو فێرکـردن نییـە، وەك خوێندنگـەکان، زانکـۆکان‌و سـەنتەرەکانی لاوان، بـەڵکو درێژدەبێتـەوە بـۆ گـــشت ئـــەو ڕێکخراوانـــەی بەشـــدارن لـــە پەروەردەکردنی سیاسیانەی هاووڵاتیانـدا، وەك خێـــزان، یانـــە، پەرسـتگەکان‌و خزمـــەتکردنی سەربازی، ئەمە وێڕای ئامڕازەکانی ڕاگەیاندن‌و ڕێکخـراوە خۆبەخـشە ئەهلییـەکان. لەلایـەکی دیکـەوە، ئاسـۆکانی فێرکردنـی سیاسـی، کـە ئامانجی پەرەپێدانی چالاکیەکانی ئەو کۆمەڵگە مەدەنیە نوێیەیە کە دەمانەوێ دایمەزرێنین، لـە بری کۆمەڵگەی سەربازیی بەمیرات بۆمـاوە بـاوی میراتگـــەر، زۆرێـــك بایـــەخ‌و بەرپرســـیارێتی دەگرێتـــەوە کـــە پێویـــستە لاوانـــی کـــوڕو کـــچ بایـەخیان پـێ بـدەن، ئەمـەش بـە ڕەچـاوکردنی فراوانکردنـــی چـــەمکی کـــاری سیاســـی و بەشـــداریکردنی میللـــی هـــەتا لـــە بـــارودۆخی وڵاتانی تازەپێگەیشتوودا ڕۆحی خزمـەتکردنی گـشتی‌و کـاری خۆبـەخش لای لاوان بگرێتـەوە. بـــەم جـــۆرە لیـــستی ئەرکـــەکانی فێرکردنـــی مەدەنیانـەو کـاری کۆمەڵایـەتی چەندین چالاکی

لەخۆدەگریت وەك: نەهێشتنی نەخوێندەواری، هۆشیارکردنەوەی بەرخۆر، پاراستنی ژینگە، تۆمارکردنی هاوولاتیان لە خشتەی هەڵبژاردنەکانو پەرەپێدانی ناوچەییو هاورێیانی گەشتیارانو هەڵمەتەکانی پاکوخاوێنیدا. هەروەها چەندین مەسەلەی دیکەش هەن، وەك کاروانەکانی چارەسەرکردن کە خزمەتی ناوچە دوورەدەستەکانو لادێکان دەکەنو راهێنان لەسەر شارەزاییەکانی سەردەمو رێکخستنی گەشتەکانی کاتی دەستبەتاڵی لە رێگەی "ولاتەکەی خۆت بناسە". هەروەها کاری خۆبەخشو گشتی جۆشدەدرێت بە چەندین چالاکیی دیکە، وەك لادێی بەرهەمهێن، هاوکاریکردن لەگەڵ لیژنە ناوچەییەکانو خێوەتگە گەرۆکەکان. هەروەها پرۆژەکانی رزگاربوون لە خۆڵو خاشاك، وشككردنەوەی گۆلەکان، پاككردنەوەی جۆگەلەکان، قەلاچۆکردنی مێش، چاندنی درەخت لەسەر شەقامەکانو پرۆژەکانی پەرەپێدانی ناوچەیی بەرامبەر بە کرێیەکی کەم هێما کە خاوەنکارەکان بەدەستیاندەهێنن.

فێرکردنی شارستانی دەرگایەکی کراوەیە لەبەردەم لاوانماندا بۆ ئامادەکردنیان بۆ سەدەی نوێو ئامادەکردنی کۆمەڵگەکەمان بۆ رێنسانسی نیشتمانی. لەم چوارچێوەیەشدا جەخت دەکەینەوە لەسەر گرنگیی گوێزانەوەی فێرکردن، لە قۆناغی تەلقینداندانەوە بۆ قۆناغی کارپێکردن. ئەزمونێکی تایبەتیم بیرە لە ماوەی وانەوتنەوەی زانستە سیاسیەکان لە کۆلیژە جۆربەجۆرەکانداو بۆم دەرکەوت تەلقینداندانو پێ لەبەرکردنی وانەی پێشوەخت بریاردراو سەبارەت بە هەڵبژاردنەکان، بەشداریکردن، مافو ئازادییە سیاسییەکان، بەبێ کارپێکردنی پیادەکردنی رۆژانەو راهێنان بێسوودە. بۆیە وەك بەشێك لە ئەرکە ئەکادمییەکان خوێندکارانم رادەسپارد کاتێك دەبنە هەژدە ساڵ ناوی خۆیان لە خشتەی هەڵبژاردنەکاندا تۆماربکەن. هەروەها سەردانی مەیدانیان دەکرد بۆ ئەنجومەنی میللی ناوچەییو پەیوەندیی تایبەتیان دەکرد بە ئەندامانی پەرلەمانەوەو راپرسیی سادەیان دەکرد بۆ تێگەیشتن لە ئاقارەکانی رای گشتی بەرامبەر بە مەسەلە جیاوازەکان. لە وەڵامی خوێندکارەکانو ئەزمونە کەسێتییەکانیانەوە ئەوە سەلما کە بەربەستە کارگێرییەکانو پێوەندە بیروکراتییەکانو هەڵوێستەکانی فەرمانبەرانی تۆمارگەی شارستانی ئاستەنگن لەبەردەم بەشداریکردنی دیموکراتیانەدا. بۆیە پێویستیان بە چاکسازیی خێرا هەیە. لە هەمووی گرنگتر، بوونی ورەی بەرزە لای لاوان کە هانیان دەدات بۆ خۆهاویشتنە ناو نوێوەو گرتنەدەستی دەستپێشکەریی لە کاری سیاسیدا.

لێرەدا پرسیارێکی بنچینەیی دەوروژێت:

بۆ ئەوەی بەشداریکردنی لاوان بە بیر، ئەقڵو ئارەقی ناوچەوانی خۆی بێت، ئەو بوارانە چین کە دەتوانن بچنە ناویانەوە؟

بەوجۆرە کۆڵەکەکانی بەشداریکردنی سەرکەوتوانە لەبەردەم لاواندا رەخسا:

– بنکەیەکی داتای سەرەتایی دابین بوو کە یارمەتیدەرە بۆ روونکردنەوەی چۆنیتی مامەڵەکردن لەگەڵیان.

– لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەو رێکخراوو دامەزراوانە کرا کە لە بواری لاواندا کاردەکەنو لایەنە باشو خراپەکانیان خرایەروو.

– لاوانمان بە مەسەلەکانی کۆمەڵگەیان ئاشناکرد.

– هەوڵمان دا بەپیر پێداویستییەکانیانەوە بچینو چارەسەری کێشەکانیان بکەین.

- پـشتمان بەسـت بـە شـێوازی هانـدانی مـادیو مەعنـەوی، بـۆ هاندانیانو خستنەگەڕی وزەکانیان.

- نموونـەی پێـشەنگمان دۆزییـەوە کـە گەنجان بتوانن چاویان لێ بکەن.

لـە روانگـەی هـەموو ئەوانـەوە لاوان دەتـوانن چـی بکـەن؟ ئـەو بوارانـە چین کـە لاوان دەتـوانن بەشداربن تیایاندا؟

ئەمـە ئەوەیـە کـە لـە ڕێـی ئـەم خاڵانـەی خوارەوە روون دەکەینەوە:

**1-پڕۆژەی نەتەوەیی بۆ لاوان:**

پێویستە وزەی ئەوانە بخرێتەکار کە بەم یـان بەو هۆ ناچنە خزمەتکردنی سەربازی. پـڕۆژەی نەتـەوەیی بـۆ لاوان ئـەو لاوانـە لـە ژێـر ئـاڵای وەزارەتـی لاوانو وەرزشـدا کۆدەکاتـەوەو ئاڕاستەیان دەکـات بـۆ کـارکردن لـە پڕۆژەکـانی خزمەتکردنی نیشتماندا. بەوجۆرە ناوەندەکانی لاوان لـە شـارو لادێکانـدا دەبنـە شانەی هـەنگو لاوان بـەپێی پێداویـستییەکانی شـارو لادێو گەڕەکەکان دابەش دەبن بەسەر کۆمەڵەو گروپی جۆربەجۆردا کە هەریەکەیان کارێکی دیـاریکراو لەئەسـتۆدەگرێت: هەنـدێکیان ناوچـەیەك پاکدەکەنـەوە، هەنـدێکی دیکـەیان ڕێگەیـەك درەختڕێـژ دەکـەن، هەنـدێکی دیکـەیان زەوی چـاکدەکەنو چوارەمیـشیان نەخوێنـدەواری قەلاچـۆدەکەن. پێویـستە لـە کۆتاییـدا هەڵسەنگاندنێك بکرێـت بـۆ ئـەو کۆشـشانەی کـراونو پاداشـتی مـاددیو مەعنـەوی سـەرکەوتوەکان بکرێـت. هـەروەها دەشـێت ڕۆشـنبیریی سیاسـی پێـشکەش بـەو لاوانـە بکرێـت کـە لـە خزمـەتی نیـشتماندا کاردەکـەن (ڕۆشـنبیرییەکی واقعبینانـەی پـشتبەستوو بـە کارپێکردن).

**2-گروپـەکانی کـارکردن لـە بـوارە پسپۆڕییەکاندا:**

زانکۆکانمـان لاوانمـان ئامادەدەکـەن بـۆ گێڕانی ڕۆڵـی دیاریکراوو خۆزگە خزمـەتکردنی نیـشتمانیو خۆبـەخش یـەکێك بوایـە لـە پڕۆژەکـانی تـەواوکردنی خوێنـدن، بەشێوەیەك کە ئەو لاوانە هەستانایە بە کارێك کـە دەکەوێتـە چوارچـێوەی نـاوەڕۆکی پـسپۆڕیانەوە. ئـەوەتا گرووپەکانی تەندروستی خوێندکارانی کۆلیـژی پزیـشکی لـەژێر چـاودێریی مامۆسـتاکانیاندا هەنگاودەنێن بەرەو پێشخستنی نیشتمانەکەیان لـە ڕێـی چارەسـەرکردنی کـەم دەرامەتـەکان لـە شـارو نەخۆشـخانەکاندا. ئـەوە گرووپـەکانی پـەروەردەو فێرکـردنن لـە خوێندکارانی کۆلیـژی پەروەردە خەریکی نەهێشتنی نەخوێندەوارینو شیکردنەوەو لێکدانەوە پێشکەش بەوانە دەکەن کـە ئـەو توانایـەیان نییـە. ئـەوە گرووپـی ئاوەدانکردنەوەیـە لـە خوێنـدکارانی ئەنـدازیاریو هونـەرە جوانـەکان کـە ڕێگەیـەك دروسـتدەکەن یـان بەشـداریدەکەن لـە دروسـتکردنی خوێندنگەیەکـدا. دەشـێت ئـەو گـرووپ یـان خێوەتگانـە خزمـەتی خۆبـەخشو چـالاکی کـاتی دەسـتبەتاڵی پێـشکەش بکـەنو هاوکـاتیش ڕۆشـنبیریی سیاسـیی واقعبینانـە پێـشکەش بکـەن لـە ڕێگـەی نموونـەکانی بەشداریکردنەوە.

**3-بوارەکانی بەشداریکردن لەسەر ئاستی دامەزراوە جۆربەجۆرەکان:**

پێویـستە لاوان هانبـدرێنو سـەرنجیان ڕابکێشرێت بۆ ئەوەی بەشداریکردن ڕەخساوەو بـەپێی ئـەو دامەزراوانـەی پیایانـدا تێدەپـەڕن هەمەجۆرەو ئەم دامەزراوانە دەگرێتەوە:

**لە قوتابخانە:**

-بەشـداری دەکـات لـە پاکوخـاوێنکردنی قوتابخانەکەیدا، ئەوەش بە کۆکردنەوەی خۆڵو ئامۆژگاری کردنی ئەو خوێندکارانەی بەپەرۆش نین بۆ پاکوخاوێنی قوتابخانەکەیان.

-دیمەنێك یان وێنەیەك دەنەخشێنێ بۆ ڕازاندنەوەی ڕووی قوتابخانەکەی.

-لەگەڵ کەسانی دیکەدا بەشداری دەکات بۆ هێنانە ئارای ڕۆژێکی خوێندنی سەرکەوتووانە.

-پەخشنامەی بەیانیان بۆ هاوڕێکانی دەخوێنێتەوە.

-بەشداری دەکات لەگەڵ گرووپی ڕۆژنامەگەری یان وتاربێژی یاخود گرووپی شانۆدا.

**لە زانکۆکاندا:**

-ڕێکخستنی کۆڕی ڕۆشنبیری و ڕێنیشاندەر بۆ خوێندکاران بەشێوەیەکی بەردەوام.

-گفتوگۆکردنی خوێندکاران لەگەڵ مامۆستاو هاوڕێکانیانداو فێربوونی دەربڕینی ڕا لە چوارچێوەی نەبوونی دەمارگیریدا (فێربوونی گفتوگۆی بنیاتنەرو پەرلەمانی لاوان).

-بەشداریدەکات لە هەڵبژاردنی ئەو کەسەی لە یەکێتیەکانی خوێندکاراندا نوێنەرایەتی دەکات.

-خۆپالاوتن ئەگەر تواناو لێهاتوویی لەخۆیدا بەدیکرد.

-بەرنامەی هەڵبژاردنی خۆی بخاتە بەردەم کەسانی دیکە.

-ئامرازەکانی کۆمۆنیکاشێۆنی دابینکراو لە سنوری تواناو هەلومەرجەکانی خۆیدا بەکاربێنێ.

-پەیوەندی دەکات بەو خێزانە خوێندکارییانەی جۆرەها چالاکی پێشکەش دەکەن کە سودمەندن بۆ خۆی و کەسانی دیکەو لە ڕێی ئەوەوە فێری سەرکردایەتیکردن، دەستپێشکەری، گرتنەئەستۆی بەرپرسیاریێتی و هاریکاریکردنی ئەوانی دیکە دەبێت.

-خۆی بێبەش ناکات لە بەشداریکردن لە خێوەتگەکانی لاوان و خوێندکاراندا کە خوێندکاران ڕادەهێنن لەسەر کاری بەکۆمەڵ و یارمەتیدان و فێری دەکەن چۆن چالاکیەکانی خۆی بخاتە خزمەتی کۆمەڵگەوە.

**لە کارکردندا:**

لاو لە بەڕێوەبەرایەتیەکی حکومیدا کاربکات یان دامەزراوەیەکی گشتی تایبەتیدا، دەتوانێت لە دەرگای ئەم بوارانەی بەشداریکردن بدات:

-بە دەربڕینی ڕای خۆی دەربارەی کێشەکان یان پێشنیارکردنی ڕێگەیەك بۆ گەشەپێدانی کار یان بەرهەم بەشداری بکات.

-پاکوخاوێنی ئۆفیسەکەی و شوێنی کارکردنی خۆی بپارێزێ.

-بەشداربێت لە دامەزراندنی سندوقێك بۆ زەمالە.

-ببێتە ئەندامێکی چالاك لە سەندیکایەك، یەکێتیەك یان گرووپێکداو خۆی بپاڵێوێ بۆ سەرکردایەتیکردنی یان ڕاپەڕاندنی یەکێك لە کارە سەرەکییەکانی.

-بەشداریی هاوڕێکانی بکات لە بۆنە تایبەتیەکاندا یان بەشداریی دامەزراوەکانی بکات لە بۆنە تایبەتیەکانی خۆیدا (یادی دامەزراندن یان تێپەڕبوونی 25 ساڵ بەسەر دامەزراندندا، کردنەوەی بەشێکی نوێ و ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی ڕێزنان لە کەسایەتیەکی دیاریکراو).

**4-ژینگەپارێزی و پاراستنی ژینگە لە پیسبوون:**

ژینگە بریتییە لە هەموو شتێکی دەرەوەی خودی مرۆڤ کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەوری دەدەن، گشت ئەو چالاکی و ئاماژانەی بەرەوپیریان دەڕوات و لەڕێی ئامرازە جۆربەجۆرەکانی کۆمۆنیکاشێۆنەوە دەرکیان پێ دەکات. ئەوەش کەلەپوری ڕابردوو، وەك دابونەریت، دەگرێتەوەو داهێنانەکانی ئێستاش لەخۆدەگریت. مرۆڤ سودمەندی یەکەمە لە

ژینگەی پاکوخاوێنو ئەویش دۆڕاوی یەکەمە ئەگەر ژینگەکەی پیس بێت. لێرەوە پێویستە لاوان بەشداربن لەو پرۆژانەدا کە تایبەتن بە ژینگەو گرنگە فێری پاراستنی ژینگەکەی بێت، بەوەی پاکوخاوێن بێتو بە فڕێدانی خۆڵو خاشاك لەو شوێنانەی تایبەت نەکراون بە خۆڵ ڕشتن پیسی نەکات. هەروەها دەبێت بە شێوەیەکی شارستانیانە مامەڵە لەگەڵ ئاوی ڕووبارەکاندا بکاتو پیسی ئاژەڵەکانی فڕێ نەداتە ناویانو دەوروبەرەکەی بە پاشماوەکانی خۆراكو پیسی... هتد پڕنەکات، بەڵکو پێویستە هاوکاربێت لە هەوڵەکانی پاککردنەوەی شوێنە پیسەکانو ناخۆشەکاندا، بۆ ئەوەی ببنە باخچەی گشتی یان سەیرانگە.

**5-بەشداریکردن لە پرۆژەی نەهێشتنی نەخوێندەواریدا:**

ئەگەر ڕێژەی نەخوێندەواری لە میسر نزیکەی 60٪ بێت، ئەوا ئەو کێشەیە پێویستی بە یەکخستنی تواناکان هەیە بۆ چارەسەرکردنی. جا لەبەر ئەوەی لاوان تا ئێستا بەشێکی گرنگیی خۆیان هەیە، بۆیە ناکرێت بەبێ ئەو و بەشدارییەکانی ڕووبەڕووی ئەو کێشەیە ببینەوە. بەشداریکردنی لاوانیش لە چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەدا لە دوو کونجەوە دەبێت:

ا-ئەنجامدانی کاری نەهێشتنی نەخوێندەواری کەسانی دیکە ئەگەر خۆی خوێندەوار بوو.

ب-چوونە پاڵ کاروانی پرۆژەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواری، وەك خوێندکارێك، ئەگەر خۆی نەخوێندەوار بوو.

**6-بەرەنگاربوونەوەی هەندێك بەهای ڕێگر لە پەرەپێدان:**

دەتوانین توانای گەنجانی زانکۆ دەرچووەکانیان کۆبکەینەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەندێ لەو ڕەفتارانەی ئاستەنگ بۆ کۆششەکانی پەرەپێدان دروستدەکەن. بۆ ئەمەش دەشێت بەشداریان پێ بکەین لە خولەکانی ڕاهێناندا بۆ زیادکردنی هۆشمەندیان لەبارەی هەندێك مەسەلەوە، ئینجا کاروانەکانیان بکەوێتە ڕێ بەرەو شارو ناوچەکان بۆ بلاوکردنەوەی هوشیاریو مەعریفە. دەتوانین نموونەیەك لەسەر ئەو مەسەلەیە بخەینەڕوو، ئەویش دەربارەی دەستبلاویو بەفیڕۆدانی سامانەکانەو بانگەواز بۆ چاککردنی ڕەفتاری باو لە ئاهەنگو تەعزییەکانو بۆنە ئایینیەکاندا بکرێت کە دەستبلاویو بەفیڕۆدانی زۆریان تێدایە. بۆ سەرخستنی ئەم هەڵمەتانەش دەتوانرێت پەنابرێتە بەر بەها ئاینییەکانو بەچاکی بیانخەینەگەڕ...

**7-کارکردن بە ماڤی دەنگدان:**

ئازادیی بیروڕا خەڵاتی یاسا مرۆڤکردەکان نییەو بەخشینی هیچ کەسێك نییەو لەناخی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێ... لەم ڕوانگەیەوە داوا لە گشت لاوان دەکرێت پابەندبن بە خشتەی هەڵبژاردنەکانو هەرکات بواری دەربڕینی ڕاوبۆچوونەکانیان هەبوو دوودڵو ڕاڕا نەبن بۆ چوونە شوێن یان لیژنەکانی هەڵبژاردن بۆ دەنگدانو هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار یان ئەندامەکانی پەرلەمان یاخود ئەنجومەنی ناوچەییو سەندیکایی...هتد. هەروەها چاوەڕوان دەکرێت لاوان ماڤی ئەندامێتی پارتەکان بەدەستبێننو لە هەڵبژاردنەکاندا خۆیان کاندید بکەن.

**8-بەشداربوون لە چالاکیەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی قەیرانەکاندا:**

لە دنیای هاوچەرخدا قەیرانەکان ڕۆژانە ڕوودەدەنو بوونەتە بەشێك لە ژیانی هەر کۆمەڵگە یان ڕێکخراوێك. قەیرانەکان بەوە

پێناسەدەکرین کە ڕووداوگەلی کتوپڕن لە کاتی سەرهەڵدانیاندا دەبنە هۆی خستنەوەی زیانی مرۆیی یان ماددی لای کۆمەڵێك خەڵك، ئەمەش دەبێتە سەرهەڵدانی شڵەژان لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی ئەو کۆمەڵەدا، بەوپێیەی قەیران سێگۆشەیەکە پێکهاتووە لە هەڕەشەی کتوپڕ، کەم کاتی و کەمیی زانیارییەکان.

ئەگەر هاتوو قەیران لە ڕواڵەتیدا پێویستی بە چارەسەرێکی خێرا هەبێت کە بەشێوەی کارڕایی و دەستێوەردانی کتوپڕو کاری گرووپی و یەکخستنی کۆششەکان بەخێرایی و نەرمونیانی ئەنجامبدرێت، ئەوا ناکرێت بەبێ کۆششەکانی لاوان و بەشداریکردنیان جێبەجێبکرێت. بۆیە پێویستە ڕابهێنرێن لەسەر هاوکاریکردنی ئەوانی دیکەو بەشداریکردن لەگەڵیان بۆ گەمارۆدانی ئاسەوارەکانی ئەو کارەسات و قەیرانانەی لە کۆمەڵگەدا دەکەونەوە، وەك بومەلەرزە، ئاگرکەوتنەوە، ڕەشەبا، لافاو و کارەساتە دڵتەزێنەکان.

**9-چەند بوارێکی دیکە بۆ بەشداریکردن:**

-بەپێی فەلسەفەی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی کە باوە لە زۆرێك لە کۆمەڵگە پیشکەوتوەکاندا، پێویستە لەسەر تاك و ڕێکخراوی بەتوانا دەستی یارمەتی و هاوکاری درێژبکات بۆ کۆمەڵگە، ئەمەش لەڕێی بەخشینی پارەوە بۆ دروستکردنی قوتابخانە، دروستکردنی شۆستەی شەقامێك، بنیاتنانی نەخۆشخانەیەك، کڕینی ئامێرێکی پزیشکی. لێرەشدا مەرج نییە پشتیوانیەکە تەنیا بەپارە بێت، بەڵکو دەشێت لە ڕێی کارو کۆششکردنیشەوە بێت.

-پێویستە لاوان ئاڕاستەبکرێن بۆ بەشداریکردن و هاریکاریکردنی هەندێك کەرت و دامودەزگا بۆ هێنانەدیی هەندێك ئامانجی چاك، وەك هاوڕێیانی هاتوچۆ، هاوڕێیانی ڕاگەیاندن و خوێن بەخشین.

-بەشداریکردنی لاوان لە پێشبڕکێ وەرزشەوانی و ڕۆشنبیرییەکاندا کە لە قوتابخانە، زانکۆ، یانە، کۆمپانیاو دامەزراوەکاندا ئەنجامدەدرێن. هەروەها پێویستە لاوان فێری یارمەتیدان و سوودوەرگرتن بن لە پڕۆژەی موبارەك بۆ دەرچوەکان، یان پڕۆژەی بەخشینی زەوی بە لاوان، یاخود سودمەندبن لە سندوقی کۆمەڵایەتی.

**سەرچاوە:**

سایتی (مرکز الدراسات السیاسیة والاستراتیجیة)
. *www.ahram.org.eg*

# پرەنسیپی هەڵبژاردنی ئازاد

د. گرییەر ستیفێنسۆن

لەفارسییەوە: کارزان محەمەد

"ئامانجی هەر سیستەمنامەیەکی سیاسی ئەوەیە کە... لە پلەی یەکەمدا ئەو پیاوانە بۆ فەرمانڕەوایی ئامادە بکات کە لە جیاکردنەوەو دەستنیشانکردندا خاوەنی بالاترین ئاستی ئەقڵ بن و لە بەدیهێنانی ئامانجە گشتییەکانی کۆمەڵدا زۆرترین فەزیلەتیان هەبێت".

**جیمز مدیسۆن**

**زنجیرە وتارەکانی فیدرالیست**
**ژمارە (57)**

جاڕنامەی سەربەخۆیی ئەمریکا لە (1776) گرنگترین وشەی لە تیۆری ئازادیدا خستەڕوو، کاتێك کە بەم چەشنە ئاماژەی بۆ کرد:" دەوڵەتان.. هێزی دادپەروەرانەی خۆیان لە ڕەزامەندی هاولاتیانی خۆیانەوە وەردەگرن" هەشتاو دوو ساڵ دواتر، کاتێك کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوای پرۆتستۆی یانزدە ویلایەت لە قبوڵ کردنی دەرەنجامەکانی هەڵبژاردنی (1860) لەگەڵ یەکتردا لەساتی جەنگدا بوون، پریزدێنت (ئەبراهام لینکۆڵن) سەرلەنوێ جەختی لەسەر پرەنسیپی ئەم ڕەزامەندییە بە ڕاگەیاندنی :"دەوڵەتی خەڵك، لەلایەن خەڵك و لەپێناو خەڵکدا) کردەوە. ئەم ڕەگەزە بنچینەییە، بەهەرشێوەیەك کە بخرێتەڕوو، پابەندە بە سیستەمێکی هەڵبژاردنەوە واتا (وابەستەبوون بە خەڵك) کە جیمز مدیسۆن لە ساڵی (1788) لە بلاوکراوەی (فیدرالیست)ی ژمارە (51) لەژێرناوی (کۆنترۆڵی بەرایی و سەرەکی بەسەر دەوڵەتدا) ناوی دەبرد.

بەهەڵبژاردن دەستنیشانکردنی ئاشتیخوازانەی ئەوانەی کە حکومڕانی دەکەن و بە ڕەوایەتی بەخشین بەو بڕیارانەی کە ئەوان دەیگرنەبەر، وەلامێکە بۆ مەسەلە بنەڕەتییەکانی بەردەم هەر سیستەمێکی سیاسی. کاتێك تایبەتمەندییەکانی سیستەمێکی هەڵبژاردن دەبنە مایەی هاندان و پەرەپێدانی ئەو هۆشیارییە سەرتاپاگیرەی کە هەڵبژاردن هەم

ئازادو هەم دادپەروەرانەیە، ئەوا بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەش زۆر بەئاسانتر دێتەدی. ئەو فاکتەرانەی کە ئەم هۆشیارییە بەهێزو دەوڵەمەند دەکەن، بریتییە لە مافی هەڵبژاردن و دەستڕاگەیشتن بەو سندوقانەی دەنگدان کە پتر سەرتاپاگیر بن نەک مۆنۆپۆڵ، هەروەها یەکسانی لە دەنگداندا تا ئەو ئاستەی کە هیچ دەنگێک بە زۆرتر لە ئەویتر هەژمار نەکرێت، و دەرەنجامی هەڵبژاردن کە لەلایەن یاسا و ڕێسا پێشتر دەستنیشانکراوەکانەوە دیاری دەکرێت، کەمترین فێڵ و تەزویر لە بەدەستهێنان و ژمێرەکردنی دەنگەکاندا هەبێت. ئەم ستانداردانە لەپێناو هەڵبژاردنێکی ئازادو دادپەروەرانەدا بەدرێژایی مێژووی ئەمریکا، هەمیشە یەکسان نەبووە. کامڵبوونیان بەپێی ئەزموونەکانی هەر نەوەیەک لە گیرۆدەبوونیان بە سروشتی کۆمەڵگای سیاسی، ئازادی کاری ئۆپۆزسیۆنی سیاسی، نوێنەرایەتی و ستراکتورو بەڕێوەبردنی هەڵبژاردن لە شێوازی هەڵبژاردنیاندا ڕەنگ دەداتەوە.

## کێ دەتوانێ دەنگ بدات؟

بەپێی ماددەی (1)ی بەشی (2)ی دەستور ئەو کەسانە شیاوی هەلومەرجی دەنگدان بوون بۆ ئەنجومەنی نوێنەرانی ویلایەتە یەکگرتووەکان کە دەیانتوانی دەنگ بۆ زۆرترین ژمارەی لقەکانی دەسەڵاتی یاسادانان لە ویلایەتەکانیشدا بدەن، جگە لە دانانی هەندێ هەلومەرج بۆ هەڵبژاردنی بەرپرسە میللییەکان، دەستور پێناسی ئەو دەسەڵاتەی بەهەر ویلایەتێک سپارد. لە پراکتیکدا هۆی بوونی یاساگەلێک لە چەند ویلایەتێکدا، بەم مانایە بوو کە لە سەرەتادا دەنگدان سنوردار بوو بۆ پیاوانی سپی پێست و ئەو تەمەن پێگەیشتوانەی کە خاوەنی بڕە دارایییەک بوون یاخود بڕێکی دیاریکراو باجیان دەدا. تا ساڵی (1830) هەموو هەلومەرجە پێویستە ئابوورییەکان لابراو هەڵبژاردنی گشتی بۆ کەسانی تەمەن پێگەیشتووی سپی پێست شێوەیەکی یاساییانەی بەخۆوەگرت.

بەر لە جەنگی ناوخۆیی، ڕەشپێستەکان بەگشتی مافی دەنگدانیان نەبوو، تەنانەت لەو ویلایەتانەشدا کە کۆیلایەتی قەدەغە بوو. کاتێک کە لە ساڵی (1856) جەنگ کۆتایی هات، زیادکردنی دوو چاکسازی بۆ دەستور، هەواڵی گۆڕانکارییە سەرەکییەکانی لە چەمکی کۆمەڵگەی سیاسی ئەمریکادا ڕاگەیاندو ئەوەش پەیوەندی بەو کەسانەوە هەبوو کە دەیانتوانی هەڵببژێرن و هەڵببژێردرێن. سیانزدەهەمین چاکسازی (ساڵی 1865) کۆیلایەتی لەناوبرد. چاکسازی چواردەهەم (ساڵی 1868) ڕایگەیاند: "هەموو کەسانی لەدایکبووی یاخود هاوڵاتیانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و وابەستە بە ناوەندێکی دادوەریی، بە هاوڵاتیانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئەو ویلایەتە هەژمار دەکرێن کە تیایدا نیشتەجێن" بەمپێیە بۆ یەکەمینجار بەپێی دەستور، هاوڵاتێتی میللی و ویلایەتی پێناس کرا. هەروەها ئەم چاکسازییە ڕایگەیاند: "هیچ ویلایەتێک.. لەناو ناوەندی دادوەریی خۆیدا هیچ تاکێک لە پاراستنی یەکسانی لەهەمبەر یاسادا بێبەش ناکات". چاکسازی پانزدەیەم (ساڵی 1870) مەرجی نەژادی بۆ دەنگدان لابرد بەڵام تا چەندین دەیە دوای ئەوە ئەم یاسایە پراکتیزە نەکرا.

لە ڕاستیدا هەندێ لە ویلایەتەکان کۆمەڵە هەموارکردنێکیان خستەکار تا بەلای دەستورەوە تێبپەڕن. یەکێکیان (مەرجی باوکەمەزن) بوو کە تا ساڵی (1915) لەلایەن

دادگای باڵای ولایەتە یەکگرتووەکانەوە لەکار نەکەوتبوو. ئەم یاسایە بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەو کەسانەی کە لە یەکەمی کانونی دووەمی (1866) دەنگیان دابوو، هەروەها منداڵ و نەوەکانیان بۆ هەڵبژاردنی دواتر، لە تاقیکردنەوەی خوێندەواریی بۆ دەنگدان دەبەخشران. ئەو ساڵە سەردەمێك بوو کە بە کردەوە ئەرکی سەرشانی هەموو ڕەشپێستەکان بوو تاقیکردنەوەیەکی ناوچەیی ئەنجام بدەن. تەنانەت لە مەرجی باوکەمەزن پتەوتر، هەڵبژاردنی بەراییانەی سپیپێستەکان بوو. هەڵبژاردنە بەراییەکان (واتا ئەو هەڵبژاردنەی لە ناوخۆی حیزبێکی سیاسی بۆ هەڵبژاردنی کاندیدەکانی ئەو حیزبە ئەنجام دەدرا) لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا لە زۆرینەی ناوچەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان ئامرازێك بوو بۆ دیموکراتیزەکردنی حیزبەکان لەڕێگەی گواستنەوەی هەڵبژاردنی کاندیدەکان لە سەرکردە حیزبیەکانەوە بۆ لیژنەکانی هەڵبژاردن. لە ویلایەتێکدا کە حیزبێك دەسەڵاتدار بێت، وەك حیزبی دیموکرات لە ویلایەتەکانی باشور، هەڵبژاردنە بەراییەکان بەکردەوە جێگەی هەڵبژاردنی سەرەکی گرتبۆوە، چونکە لە هەڵبژاردنی گشتیدا کۆماریخوازان بەکردەوە یا دەیانتوانی ئۆپۆزسیۆنێکی ڕواڵەتیانە بهێننەئارا یا هەر لە بنەڕەتەوە ئۆپۆزسیۆنیش نەبن. لەسەر ئەم بنەمایە تەنانەت کاتێك کە ڕەشپێستەکان دەیانتوانی لە هەڵبژاردنی گشتیدا دەنگ بدەن، لە هەندێ ویلایەتدا یاسا لە دەنگدانی هەڵبژاردنی بەراییدا ڕەشپێستەکانی بێبەش دەکرد، لەسەر ئەم بنەمایە ڕۆڵیان لە هەڵبژاردنە ناوچەیی و ویلایەتییەکاندا بێ کاریگەر دەکرد.

تەنها لە ساڵی (1944)دا بوو کە دادگای باڵا بەڕاشکاوییەوە ڕایگەیاند مافی دەنگدان کە لەلایەن ڕیفۆرمی ماددەی پانزدەهەمەوە دابینکراوە، هەم هەڵبژاردنە بەراییەکان دەگرێتەوەو هەم هەڵبژاردنی گشتی. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك هەڵبژاردنی (1960) دەستی پێکرد، لە هەر چوار کەسێکی ڕەشپێست بەپێی هەلومەرجی ویلایەتەکانی باشور، تەنها یەك کەس ناوی بۆ دەنگدان تۆمار کرابوو، ئەنجامە ڕاستەقینەکەی هەڵبژاردنەکەش بەشێوەیەکی بەرچاو لەو کەمتر بوو.

هەنگاونان لەهەردوو بەرەکە لەماوەی دەیەیەکدا، بووەمایەی گۆڕانکارییەکی بەرچاو ڕێگەی بەوە نەدا کە ڕێژەی دەنگی ڕەشپێستەکان لەگەڵ دەنگی سپیپێستەکاندا وەکیەك بێت. سەرەتا چانسی هەڵمەتی سەرکەتووانە بۆسەر گومرگی باج و خەراجی دەنگدان بوو کە هەژاران بەتایبەت ڕەشپێستەکانی لە دەنگدان بێبەش دەکرد.

ڕیفۆرمی بیست و چوارەم (1964) وەرگرتنی باج لە هەڵبژاردنی فیدراڵدا قەدەغە کرد، دوو ساڵ دواتر دادگای باڵا وەرگرتنی باجی وەك مەرجێك لە هەڵبژاردنی ویلایەتەکاندا لەکارخست. دووەم یاسای مافی دەنگدان کە لە ساڵی (1965)دا بڕیاری لەسەردرا (گرنگترین ماددەی یاسای هەڵبژاردنە کە تا ئێستا لەلایەن کۆنگریسی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە بڕیاری لەسەردراوە) بەشێوازێکی کاریگەرتر جەختی لەسەر چاککردنی ئەو ڕێبازانە کردەوە کە ڕەشپێستەکانی لە دەنگدان بێبەش دەکرد. لە ئەنجامی کۆمەڵە هەنگاوێك وەك چاودێریی وردی دەوڵەتی فیدراڵ بەسەر هەڵبژاردن و پرۆتستۆکردنی تاقیکردنەوەی خوێندەواریی، بەشداریی ڕەشپێستەکان لە هەڵبژاردندا لە ساڵی (1967) لە جۆرجیا بووە دوو هێندەو لە ئەلاباما بووە نزیکەی سێ هێندەو لە میسیسپی

تا ڕێژەی (800٪) زیادی کرد. بەپێچەوانەوە بزاڤی بەشداریی ژنان لە هەڵبژاردندا کە پێشینەکەی بۆ ساڵانی دەیەی (1840) دەگەڕایەوە، ماوەیەکی زۆرتر درێژەی کێشا تا بگاتە ئەنجام، بەڵام کاتێك کە ئەم مافە دابین کرا، چیتر پێویستی بە پارێزگاریەکی پتری یاسایی نەبوو. لە ساڵی (1869) ناوچەی (وایۆمینگ) یەکەمین یەکەی سیاسی بوو لە ویلایەتە یەکگرتووەکان کە مافی دەنگدانی بە ژنان بەخشی، بەڵام ناوچەکانی تر لە گرتنەبەری ئەم ڕێگایەدا، سست بوون. بەتایبەتی دوای ئەوەی کە دادگای باڵا لە ساڵی (1875) دەنگی بەوە دا کە ویلایەتەکان دەتوانن ڕێگە لە بەشداریی ژنان لە هەڵبژاردندا بگرن بەبێ ئەوەی لە چاکسازی چواردەهەمی ڕیفۆرمکراو لابدەن. لە کۆتایی سەدەکەشدا سێ ویلایەتی تریش مافی دەنگدانیان بە ژنان بەخشی. ماددەی نۆزدەهەمی ڕیفۆرمکراو لەکاتی هەڵبژاردنی ساڵی (1920)دا ئەم مافەی لەسەر ئاستی میللی بەرفراوان کرد.

### کێ دەکرێ هەڵبژێردرێت؟

یاساکانی پەیوەندیدار بە ڕووی دووەمی کۆمەڵگای سیاسی (مافی هەڵبژێردران بۆ کاروبارە گشتییەکان) هاوسەنگی لەنێوان دوو دەستەی بەهاکاندا کە لەگەڵ یەکتردا لە ململانێدان، دروست دەکەن. لەلایەکەوە سنورداریێتی ئەندامەکانیان پێباشترە، بەو مانایەی کاتێك کەسێك مەرجەکانی تەمەن، شوێنی نیشتەجێبوون و هاوڵاتێتی هەبێت، ئەو کەسە مافی ئەوەی هەیە هەوڵ بدات ناوەکەی لە کارتی خۆپاڵاوتندا هەبێت، ڕەنگە دەنگدەران دەنگی پێببەخشن. دەستور هەمیشە تاقیکردنەوەی ئایینی بۆ کاروبارە میللییەکان قەدەغە کردووەو دادگای باڵاش لە ساڵی (1961)دا بڕیاری دا کە ویلایەتەکانیش مافی ئەو مەسەلەیەیان نییە.

لەلایەکی تریشەوە زۆرینەی ویلایەتەکانیش هەوڵیان داوە کاتێك کە ژمارەی کاندیدەکان و حیزبەکان لە دەرەوەی سنوردایە، چاوپۆشیان لێبکەن. لەبەرئەوەی بەرژەوەندییە تایبەتییەکان حیزبە سیاسییەکانی کۆکردۆتەوەو هاریکاریان دەکات، نەریتی سیاسی ئەمریکا زۆرینەیەکی فەرمانڕەوای پێباشە کە لەلایەن هاوپەیمانێتی ناوخۆی حیزبێکەوە هاتبێتەئارا، نەك زۆرینەیەك کە وابەستەی هاوپەیمانێتی نێوان حیزبەکان بێت. ئەم پێباشبوونە لەپێناو ئەو سیستەمەدا بووە کە ئەم ئەگەرە زیاد بکات ئەو کەسەی لە هەڵبژاردندا دەیباتەوە بەپێی زۆرینەی دەنگ یاخود بەلایەنی کەمەوە بەپشتیوانی ژمارەیەکی زۆری حیزبەکان هەڵبژێردرابێت، لەگەڵ بوونی ژمارەیەکی زۆری کاندیدەکان و حیزبەکاندا ئەگەری گەیشتنە ئامانجەکان کەمتر دەبێتەوە.

ئەم ئامانجانە بەگشتی بەمشێوەیە دەستەبەر دەکرێن کە ئەو کەسەی دەچێتە حیزبێکەوە، دەبێ ژمارەیەکی دیاریکراو ئیمزا لەگەڵ داواکارییەکی خۆیدا بهێنێت (بەهەمانشێوەش بەدانی بڕە پارەیەك بۆ تۆمارکردنی ناو)، کاتێك هەڵبژاردن لەسەر ئاستی ویلایەتەکە لەئارادا بێت پێویستی بە بڕێکی زیاتری ئیمزاو پارە هەیە و لە ململانێی ناوچەییەکاندا ئەم دوو شتە بەشێوەیەکی بەرچاو کەم دەبێتەوە. بەهەمانشێوەش بۆ ئەوەی ناوی کاندیدەکانی حیزبێك لەسەر کارتی دەنگدان بنوسرێت، لەوانەیە واپێویست بکات ئەو حیزبە کەمێ لەو پشتیوانیانەی پێشووی چ لەڕێگەی ئیمزاکان لەسەر داواکارینامەیەك یاخود لەڕێگەی

ژمـارەی دەنگــەکانی هەڵبــژاردنی پێــشووەوە پێشکەش دەکات.

یاسـاکانی دەستڕاگەیـشتن بـە هەڵبــژاردنی ویلایەتـەکان بـۆ هەرکەسـێك کـە وەك کاندیـدی حیزبێکـی سـێیەم (واتـا هـەر حیزبێك سـەرەڕای هـــەردوو حیزبـــە ســـەرەکییەکەی تـــر واتـــا کۆمـاریخوازو دیمـوکرات) داوای خۆپـاڵاوتن بـۆ سـەرۆکایەتی کۆمـار بکـات، کۆمەڵــە مــەرج و بەرپرســـــیارێتییەکی تایبەتیانـــــەی لـــــێ داوادەکرێـــت. کاندیـــدەکانی کاروبارەکـــانی فیـدراڵ و هـەروا ویلایـەتی و ناوچـەیی لـە هـەر ویلایەتێکـــدا دەبـــێ خـــاوەنی مەرجـــەکانی بەدەستهێنانی دەنگ بن تـا بتـوانن لە مەیـدانی هەڵبژاردنی ویلایەتدا بێنەئارا. ئەم کارە بۆ دوو حیزبـە سـەرەکییەکە کـارێکی ئاسـانە، بـەڵام دەکـرێ بـۆ حیزبێکـی سـێیەم تێکۆشـانێکی پڕوکێنـــەر بێـــت. هەرچـــەندە ســـەرکەوتن و ئامـادەگی یـەکێك لـە حیزبـە مەزنـەکان یـاخود حیزبێکی تر لە زۆرینەی مەیدانە مێژووییەکانی ئـــەمریکادا، مەیـــدانی کـــارو هەڵبـــژاردنی دەنگدەرانی بەو چەشنە سنوردار نەکردووە کە لــە ســـەرەتاوە پێــشبینی بــۆ دەکرێــت. ئــەم مەسـەلەیە بەلایـەنی کەمـەوە لەبـەر سـێ فاکتـەر ڕاستی تێدایە:

خــودی حیزبــەکان بەدرێــژایی کــات ئــەو شتەیان گۆڕیوە کە بەرگرییان لێکردووە، حیزبە سـێیەمینەکان بوونەتـە مایـەی ئـەوەی حیزبـە سـەرەکییەکان دیـدگاکانی دەنگـدەران بگـۆڕن و خۆشیان بگۆڕێن، سەرەنجامەکەشی ئەوەیە کە هـــەر سیاســـەتێك یـــاخود یاســـایەك لەلایـــەن کـــۆنگریس یـــاخود دەزگـــای بـــەڕێوەبردنی ســـەرۆکایەتی کۆمـارەوە پراکتیـزە کـراوە، لـە دادگـــــای بـــــاڵادا لـــــەڕووی تـــــەبابوونی لەگــەڵ دەســتوردا لەبــەردەم هەڵــسەنگاندن و ئاستەنگدا بووە.

### ئازادی کاری ئۆپۆزسیۆنەکان:

بەبێ مافی خۆهەڵبـژاردن، دەنگدان کارێکی بێــسودە. هەڵبــژاردنی هۆشمەندانــە پابەنــدی ئەوەیـــە کـــە هاوڵاتیـــانی نـــەیاری خـــاوەن دەســـەڵاتەکان خـــاوەنی ئـــازادی ڕاگەیانـــدنی دیـدگاکانی خۆیـان بـن و بتـوانن سیاسـەتەکانی هەنوکە بخەنەژێر ڕەخنـەوەو لایـەنگرانی خۆیـان ڕاکێش بکـەن و ئۆرگانیزەیـان بکـەن. کاتێـك کـە بەرپرســـە دەوڵەتییـــەکان ڕێگــــەیان پێـــدرا ئۆپۆزسـیۆنەکان بێـدەنگ بکـەن، هەڵبــژاردنی ئـازاد و دادپەروەرانـە نایەتـەدی. بەگـشتی لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکان ئازادییـەکی کـارکردنی بەرفراوان دراوەتە ئۆپۆزسیۆنەکان، بەڵام ئاورتـە بایەخـدارەکان نیـشانی دەدات ئـەو کاتـەی کـە ئازادییەکان پتر لـە هـەموو کاتێکی تر پێویست بێـت، زیـاتر لـە هەمیـشە دەکەوێتـە بـەردەم مەترسـییەوە. هەنـدێك پێیانوایـە لـە هەنـدێك قۆنـاغی دیـاریکراوی مێژوودا کـە پەیوەنـدی بـە ئاسایشی نەتەوەییەوە هەیە، پێویستە دەنگی نەیاران و دیدگا مەترسیدارەکان خامۆش بکەن. نمونـــەکانیان لـــە یاســـای گێرەشـــێوێنی (1798)ەوە وەرگرتووە کە بەپێی ئەو یاسایە بۆ مـاوەی سـێ سـاڵ ڕەخنـەگرتنی ڕیسواکەرانە لـە سـەرۆك کۆمـارو کـۆنگریس بەبەشـێك لـە تـاوان دادەنرا، تادەگاتە جێبەجێکردنی یاسای سمیت کـە لـە مـاوەی جـەنگی سـارد لـە سـاڵانی دەیـەی (1950) پڕوپاگەنـــدەکردن بـــۆ لـــەناوبردنی دەوڵەتی بە تاوان هەژمار دەکرد.

بەپێچەوانەوە، کەسانی تر لەو بڕوایەدان کە باشـترین ڕێگـای پاراسـتنی ئاسـایش لەڕێگـەی ئازادییەوەیـە، ئـەوەش دیدگایەکـە کـە جێگـەی بایەخـدانی بنیاتنـەرانی ئـەمریکا بـووەو بەسـەر ڕۆحـــی زۆرینـــەی بڕیـــارە دەرکراوەکـــانی دادگاکـانی ویلایەتـە یەکگرتووەکانـدا زاڵ بـووە.

(رۆبەرت ئێچ جاکسۆن)ی دادوەری باڵا لە ساڵی (1943) بۆ دادگای باڵای نوسی: "ئازادی بیروباوەڕی جیاواز تایبەت بەو کەسانە نییە کە گرنگیان نییە. ئەمە تاکە سێبەری ئازادییە. تاقیکردنەوەی واقیعییەتی ئەم مەسەلەیە، بوونی مافی جیاوازی تێڕوانینە دەربارەی ئەو شتگەلانەی کە دەست لەسەر دڵی سیستەمی ئێستا دادەنێت". ( *Brennan Jr. William J.*)ی دادوەری باڵا وتویەتی: " باسوخواس دەربارەی مەسەلە گشتییەکان دەبێ قەدەغە نەکراو، تێروتەسەل و تەواو ئاشکراو...هتد بێت و هێرشە توندو هەجوئامێزو هەندێکجار بەشێوەیەکی نەخوازراو توندو دژ بە دەوڵەت و بەرپرسە گشتییەکانی لەخۆگرتبێت". کرۆکی مەسەلەکەی ئەوەیە لەکاتێکدا لەوانەیە دەوڵەت ئەو وتە بزوێنەرانە سنوردار بکات کە توندوتیژی تیایدا حەتمییە، بەڵام ئەمڕۆ بەپێی دەستور شتێك نییە ناوی تێڕوانین یاخود بیرۆکەی نایاسایی بێت. (*Louis D. Brandeis*) ی دادوەری باڵا لە ساڵی (1927) ڕایگەیاند: "ئەگەر سەردەمێك بێت کە فێڵ و تەڵەکە لەڕێگەی توێژینەوەوە ئاشکرا بکرێن و لەڕێگە فێرکارییەکانەوە ڕێگەی شەڕو هەڵە دابخرێت، ئەوا ڕێگەچارەسەر لەڕێی توێژینەوەوە پتر شیاوی وەدیهێنانە نەك سەپاندنی بێدەنگی".

## نوێنەرایەتی:

هەڵبژاردن دەبێتەمایەی هەڵبژاردنی ئەو بەرپرسانەی کە بە نوێنەرایەتی خەڵك کار دەکەن. لە ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەم ئەڵقەی پەیوەندییە لە ئەنجومەنی یاسادانانی ویلایەتدا یاخود لە کۆنگریسی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا لە هەمووان زیاتر ئاشکرایە، واتا ئەو شوێنەی کە بەرپرسە دەوڵەتییەکان لە ڕۆڵی یاسادانانی خۆیاندا نوێنەری سەرجەم ویلایەتەکە یاخود بەشێك لەو ناوچەن. سیستەمی نوێنەرایەتی کە لەسەر ئاستی ویلایەت یاخود نەتەوەیی پیادە دەکرێت گرنگە، چونکە نەك تەنها لە پیادەکردنی دەسەڵات بەسەر ناوچە جیۆگرافییەکاندا، بەڵکو کاریگەریی لەسەر بەرژەوەندییە دژیەکەکانیش دادەنێت. بۆنمونە لە کۆنگریسدا تەرخانکردنی سیناتۆرەکان بەپێی دەستور دوو سیناتۆرە بۆ هەر ویلایەتێك، لەکاتێکدا لە ئەنجومەنی نوێنەراندا ئەم ژمارەیە بەپێی دانیشتوان جیاوازە. بەمپێیە ویلایەتی وایۆمینگ کە دانیشتوانەکەی تەنانەت نەگەیشتۆتە (500,000)هەزار کەسیش، هەمان ژمارەی نوێنەری لە سەنادا هەیە کە کالیفۆرنیا بە نزیکەی (34) میلیۆن دانیشتوانەوە هەیەتی. هەرچەندە لە ئەنجومەنی نوێنەراندا وایۆمینگ خاوەنی تەنها یەك نوێنەرە، لەکاتێکدا کالیفۆرنیا لە ئەنجامی ئاماری ساڵی (2000)ەوە خاوەنی (53) نوێنەرە. ئەم بەرنامەیە کە بەرهەمی سازشێکە لە کۆنڤاشیۆنی دەستوری (1783)دا، ڕێگە بەوە دەدا کە ویلایەتە بچوکترەکان لە ڕوانگەی سیاسییەوە گرنگییەکی پتر دەستەبەر بکەن تا ئەو ئاستەی کە ژمارەی نوێنەرەکانیان بە تەواوەتی وابەستەی دانیشتوانەکەی بێت.

یاسادانەرانی ویلایەتەکان، بەرپرسیارێتی دروستکردنی ناوەندەکانی یاسادانانیان بۆ خۆیان و ناردنی نوێنەر لە ویلایەتەکەی خۆیانەوە بۆ ئەنجومەنی نوێنەرانی ویلایەتە یەکگرتووەکانیان لەئەستۆدایە. سەرپشکێتی زۆرینە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ ئەو ناوچانە بووە کە تەنها خاوەنی یەك نوێنەرن. ئەگەر ویلایەتێك (10) ئەندام بۆ ئەنجومەنی نوێنەران بنێرێت، دەسەڵاتە جێبەجێکارییەکەی ئەو ویلایەتە بۆ (10) بەش دابەش دەکرێت

بەجۆرێك كە هەر نوێنەرێك لە یەك ناوچەوە هەڵبژێردرێت.

بەپێچەوانەی هەڵبژاردنی نوێنەر بەپێی دانیشتوانو هەندێ لە ناوچە فرەئەندامەكان، ناوچە تاك نوێنەرەكان هانی گەشەپێدانی پارتە سێیەمینەكان نادەن. هەروەها ئەوان لەوانەیە بەتوندییەوە ڕۆڵی كەمینەیەكی گرنگی سیاسی كەم بكەنەوە. ئەمەش لەبەر ئەو فاكتەرەیە كە كێشانی هێڵەكانی ناوچەكە دەتوانرێ لەبەر زیادكردن یاخود كەمكردنی دەسەڵاتی گروپێك لە دەنگدەران یاخود حیزبێك ئەنجام بدرێت، ئەو پرۆسەیەیە كە بە (*gerrymandering*) ناودەبرێت. (ئەم وشەیە ئاوێتەیەكە لەناوی *Elbridge Gerry*ی فەرمانڕەوای ماساچوست لە ساڵی (1812)دا كە سەرپەرشتی گۆڕینی سنورەكانی ناوچەی پەیوەندیدار بە سەنای ویلایەتەكەی خۆی كرد لەگەڵ ناوی (*Salamander* واتا مارمێلكە)، چونكە دەیانوت ناوچە نوێیەكان هاوشێوەی ئەم گیانلەبەرەن. ئەگەر ئەم كارە لە ویلایەتێكدا بە توندی ئەنجام بدرێتو بۆ ساڵانێكی درێژ بەردەوام بێت، پێدەچێ دادگای باڵا ئەم پێكهاتانە بە پێچەوانەی دەستور بزانێت. ئەگینا كارێكە كە بەپێی تێپەڕبوونی كات پراكتیزەكردنەكەی لە سیاسەتی ئەمریكادا متمانەی پێبەخشیوە. هەرچەندە هەوڵدان لەلایەن حیزبێكەوە بۆ گرەنتیكردنی زاڵبوونی یەكلایەنە لەڕێگەی كێشانی سنورەكانی ناوچەكەوە بەشێوەیەكی تایبەت، هێشتاش دەبێ لەگەڵ پرەنسیپی دیاریكراودا تەبایی هەبێت. نابێ وابزانرێت كە سنورەكانی ناوچەكە بەدڵخوازانە كێشراونو دەبێ ئەو سنورانە یەكگرتوو و پەیوەستو پێكەوەلكێنراو بەیەكتریش بن. لەگەڵ ئەوەشدا هەڵبژاردن لەهەمان ئەو ساڵەی ئاماری (10) ساڵەی تیادا ئەنجام دەدرێت، گرنگییەكی تایبەتیانەی هەیە. ئەو حیزبەی كە لە سەرەتای دەیەی نوێوە كۆنترۆڵی ئەنجومەنی یاسادانانی بەدەستەوەبێت، سنورەكانی ناوچەكە بۆ ئەنجومەنی ویلایەتیو كورسییەكانی كۆنگریس وێنا دەكات كە تا دوای ئامارگیریی (10) ساڵی دواتر هەر وا دەمێنێتەوە.

ئەگەرچی ماوەگەلێك لەمەوپێش دادگای باڵا بەجۆرێكی تر كۆتایی بە پێكهاتەی ئەو سنورانەی ناوچەكە هێنا كە ببووە مایەی نایەكسانییەكی بەرچاو. تا ساڵی (1950) ناكۆكی جۆراوجۆری بەرچاو لە نێوان دەسەڵاتی یاسادانانی ویلایەتیو ناوچەكانی كۆنگریسدا بەنزیكەیی لەهەموو ویلایەتێكدا كارێكی ئاسایی بوو. لەبەرئەوەی خەڵك شوێنی خۆیان لە ناوچە كشتوكاڵییەكانەوە بەرەو شارەكانو لە شارەكانەوە بۆ دەرەوەی شار دەگواستەوە، ئەم دابەشبوونی ناوچانە هاوكات نەبوو لەگەڵ گۆڕانی دانیشتواندا. هەندێ لە ناوچە كەم دانیشتوانە گوندنشینەكان خاوەن نوێنەرێكی زۆرتر بوون تا ناوچە پڕ لە دانیشتوانە شارییەكان. دیاربوو كە بەرپرسانی یاسادانان حەزیان نەدەكرد كە خۆیانو بەرژەوەندییەكانی نوێنەرایەتییەكانیان لە دەسەڵات بێبەش بكەن.

زنجیرە بڕیارێكی دادگای باڵا لە ساڵانی دەیەی (1960) ئەم بەرنامەڕێژییە ناوچەییانەی لەكارخست، لەبری ئەوە بڕیاری دا كە هەموو سنوردانانەكان لەسەر بنەمای یەك كەس/ یەك دەنگ ئەنجام بدرێت. بەو مانایەی ژمارەی كەسەكانی ناوخۆی ناوچەیەك، دەبێ یەكسان بێت لەگەڵ دانیشتوانی ئەو ویلایەتەو بەسەر ژمارەی ناوچەكاندا دابەش بكرێت. بەر لە كۆتایی ئەو دەیەیە، دادگای باڵا گۆڕانێكی شۆڕشگێڕانەی لە چۆنییەتی نوێنەرایەتی لە ویلایەتە یەكگرتووەكاندا

هێنایەئاراو دەسەڵاتی سیاسی لە ناوچەکانی دەرەوەی شارەوە بۆ ناوچە شارییەکان و بەتایبەت ناوچەکانی دەوروبەری شارەکان گواستەوە. سەرەنجام ئەمە زۆرینەی خەڵکن کە توانای ئەوەیان هەیە زۆرینەی نوێنەران هەڵببژێرن.

### ستراکتورەکان و قۆناغەکانی هەڵبژاردن:

هەروەها دەشێ یاساکانی هەڵبژاردن یاریدەی ئەو هەستە بدەن کە هەڵبژاردن ئازادو دادپەروەرانەیە یا ئەوەیە کە لاوازی بکات. بۆنمونە کێشەکانی هەڵبژاردن، هەژمارکردنی دەنگەکان و بڕیارەکانی بودجەکانی هەڵبژاردن لەبەرچاوبگریت. ڕاستییەکی ئاشکرا دەربارەی هەڵبژاردن لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، دیاردەی سەرتاپاگیرانەی دەنگ نەدانە. (دەنگدان بەپێچەوانەی هەندێ لە وڵاتانەوە کە بەپێی یاسا ناچاریانەیە، لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا ئارەزوومەندانەیە) تەنانەت لە هەڵبژاردنی سەرۆک کۆماردا کە هەموو شتێك ئاشکرایە، ڕێژەی بەشداربووان ڕێژەیەکی نزیك (50٪)یە، بەم مانایەی دروست نیوەی ئەو دانیشتوانەی مەرجەکانیان تێدایە (نزیکەی هەموو هاوڵاتیانی سەروو تەمەن 17ساڵ) دەنگ نادەن. ئەم ڕێژەیە لەگەڵ ڕێژەی (65٪)ی دەنگدەرانی هەڵبژاردنی ساڵی (1960) کە زۆرترین ڕێژەیە لە سەردەمی هاوچەرخدا، ناتەبایە. بەمپێیە کاتێك پریزیدێنت بیل کلینتۆن لە ساڵی (1996) بەڕێژەی (49٪)ی دەنگی گشتی لە هەڵبژاردندا بردەوە کە ڕێژەی بەشدارییەکەی (49٪)بوو، ئەو کەسێکی هەڵبژێردراوی کەمێ زیاتر لە (4/1)ی کەسانی خاوەن مافی دەنگدان بوو.

بەرپرسیارێتی ئەم پرۆسیسە چ فاکتەرێکە؟ فاکتەرەکانی وەك کەمبوونەوەی هەستی بەرپرسیارێتی مەدەنی و کۆمەڵایەتی، نائینتیمایی دەنگدەران لەم وێنایەوە سەرچاوەی گرتووە کە هەڵبژاردن کاریگەرییەکی لە ژیانیاندا نییە، و زیادبوونی ڕێژەی ئەو خێزانانەی کە خاوەنی دوو نان پەیداکەرن لەوانەیە کاریگەریی لەسەر هێنانەخوارەوەی ئەم ڕێژەیە هەبووبێت، هەروەها هەستێکی تر لە هەڵبژاردنی میللی ئەم ساڵانەی دواییدا دروست بووە کە پێی وایە لەسەردەمی ئاشتی و خۆشگوزەرانیدا هیچ مەسەلەیەکی گرنگ ڕووبەڕووی مەترسی نابێتەوە.

هەروەها پێویستە ئەم خاڵە گرنگە لەبەرچاوبگرین کە دەنگدان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، پابەندە بە سێ بڕیاری جیاوازەوە. جگە لە بڕیار بۆ دەنگدان و بڕیاردان لەمبارەیەوە کە دەنگ بە کێ دەدرێت، هەروەها دەنگدەری ئایندە دەبێ ناو بۆ دەنگدان تۆمار بکات. ئەم مەرجە پێدەچێ ببێتە لەمپەر لەبەردەم دەنگداندا، چونکە ناوەندەکانی ناو تۆمارکردن بەگشتی چەندین هەفتە بەر لە خودی هەڵبژاردنەکان دادەخرێن. جگە لەمەش لەبەرئەوەی ناو تۆمارکردن لەلایەن ویلایەتەکانەوە ئەنجام دەدراو لەناو خودی ویلایەتەکاندا ئەم کارە لەلایەن بەشەکانەوە ئەنجام دەدرێت و لەناو بەشەکانیشدا لەلایەن ناوەندەکانەوەیە، ئەوا ئەو کەسانەی کە لەم دوادواییەدا شوێنیان گواستۆتەوە تا ئەندازەیەك هەمیشە ناچارن سەرلەنوێ ناو تۆمار بکەنەوە یاخود دڵنیا ببنەوە کە ناوە تۆمارکراوەکەیان بۆ شوێنە نوێیەکە گوازراوەتەوە.

لێرەوە شوێنگۆڕکێی دانیشتوان لە ئەمریکا ئەم وێنایە دەهێنێتە پێش کە هەمیشە ژمارەیەکی دیاریکراو لە دەنگدەرە بەهێزەکان

بەهۆی بڕیارەکانی ناو تۆمارکردنەوە لە دەنگدان بێبەش دەکرێن. ئایا ئەم مەسەلەیە کە سیستەمە ئاسانترەکانی تۆمارکردنی ناو، شتێکی وەك داواکردنی نوێکردنەوەی مۆڵەتی شۆفێرێتی، ڕێژەی بەشداربووان زیاد دەکات یاخود نا، ڕوون نییە.

بەدرێژایی کات لە پرۆسیسی هەژمارکردنی سەرجەم دەنگەکاندا، کۆمەڵە پرەنسیپێکی یاسایی هاتوونەتەئارا کە هەڵەکانی بە کەمترین ڕێژە گەیاندووەو دادپەروەرانەبوونیان دابین دەکەن. لەبەر ئەم هۆیەیە کە یاساکانی سەرجەم ویلایەتەکان جەخت دەکەنەوە لە هەندێ هەلومەرجدا سەرلەنوێ دەنگەکان هەژمار بکرێنەوەو ڕێگە بەوە دەدات کە کەسێك لە سەرەتاوە بەدۆڕاو دێتەبەرچاو ڕەخنە لە ئەنجامەکەی بگرێت. بەدەرلەمە، گومان دەربارەی ڕاستو دروستی هەژمارکردنی دەنگەکان لەوانەیە متمانەی خەڵك لەبارەی ڕاستو دروستی هەڵبژاردنەکانەوە کەم بکاتەوەو لە ڕەوایەتی کەسە براوەکە کەم بکاتەوە. لەمبارەیەوە نمونەیەکی باشترمان لە هەڵبژاردنی درێژخایەنی ساڵی (2000) نییە کە هەموو مەسەلەکانی دیاریکرد کە دەکرێ لە پرۆسەیەکی گشتی سادەی هەژمارکردنی دەنگەکانەوە سەرچاوە بگرێت.

## دەنگدان لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی کۆماریدا:

بەپێی دەستور، هەر ویلایەتێك خاوەنی ژمارەیەك دەنگی هەڵبژاردنە بەپێی ژمارەی نوێنەرەکانی ئەو ویلایەتە لە کۆنگریسدا، ناوچەی کۆڵۆمبیاش بەپێی چاکسازی بیستوسێیەمی ساڵی (1961) خاوەنی سێ دەنگی هەڵبژاردنە. کاندیدێك بەپێی بەدەستهێنانی زۆرینەی دەنگەکان لەنێو (538) دەنگی هەڵبژاردندا پۆستی سەرۆك کۆماریی بۆخۆی دەستەبەر دەکات (کەمترین دەنگی پێویست 270 دەنگە). ئەم دەنگانە کاتێك هەڵبژێرەران لە ناوەندی ولایەتەکانی خۆیاندا لە (28)ی کانونی یەکەمدا کۆدەبنەوە، دەخرێتە سندوقەکەوە (لەبەر ئەم هۆیەیە کە بەم لیژنەی هەڵبژێرەرانە دەوترێ دامەزراوەی هەڵبژاردن). دەستور ڕایدەگەیەنێت کە هەڵبژێرەرانی هەر ویلایەتێك :"بەڕێبازێك هەڵببژێردرێن کە یاسادانەر دەیڵێت". لە ناوەڕاستەکانی سەدەی هەژدەهەم، هەڵبژێرەرانی سەرۆك کۆمار لەڕێگەی دەنگدانی خەڵکی هەر ویلایەتێکەوە هەڵدەبژێردرا. لەنێو (50) ویلایەتدا، جگە لە ویلایەتەکانی مێن و نەبراسکا، یاسای (براوە لەسەروو هەمووانەوەیە) زاڵە. ئەو کاندیدەی سەرۆکایەتی کۆماریی کە زۆرترین دەنگی لە هەر ویلایەتێکدا بەدەستهێنابێت، دەبێتەخاوەنی هەموو دەنگەکانی هەڵبژاردنی ئەو ویلایەتەو لە پراکتیکدا هەموو دەنگەکانی کاندیدەکانی تر پوچەڵ دەکاتەوە.

دامەزراوەی هەڵبژاردن، تەنانەت لە ڕوانگەی زۆرینەی ئەمریکییەکانەوە، دامەزراوەی هەڵبژاردن تەنانەت بەناوەندێکی نابەجێ دەژمێردرێت. دوای هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی کۆماری (17)ی تشرینی دووەمی ساڵی (2000)، فلۆریدا بووە مەیدانێکی شەڕو هۆکارە سەرەکییەکەشی دەرەنجامی دامەزراوەی هەڵبژاردن بوو. دەنگی سەرۆکایەتی کۆماری لە فلۆریدا لە تشرینی دووەمو تەنانەت لە کانونی یەکەمی (2000)دا جێگەی باسو مشتومڕ بوو، چونکە نزیکی نائاساییانەی دەنگی خەڵك لەو ویلایەتەدا کاندیدی کۆماریخواز (جۆرج بوش)ی لە کاندیدی دیموکرات (ئەلبێرت ئالگۆر) بەتەواوەتی جوداو دەستنیشان نەدەکرد.

لەبەرئەوەی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن لە (49) ویلایەتەکەی تر (بوش) و (ئالگۆر)ی زۆر بە نزیك لەیەکتر نیشان دەدا. هیچکامیان نەیاندەتوانی بەبێ (25) دەنگەکەی هەڵبژاردنی فلۆریدا ببنەخاوەنی (270) دەنگ. ئەو کاندیدەی کە ببووە خاوەنی دەنگی گشتی فلۆریدا، دەبووە براوەی دەنگی دەنگدانی ئەو ویلایەتەو چلوسێیەمین سەرۆك کۆمار. ئەگەرچی هەمووان ئەوەیان قبوڵ بوو کە لەسەرئاستی میللی، ئالگۆر لە ڕوانگەی هەڵبژاردنی گشتییەوە چەند سەد هەزار دەنگێك لەپێشتر بوو، ئەم جیاوازییە لەسەر ئاستی میللی کاریگەریی نەبوو. ئەوەی کە بایەخی هەبوو، دەنگی گشتی لە فلۆریدا بوو.

زۆرینەی دەنگەکان هەڵرژاو لە فلۆریدا لەلایەن ئامێرەوە دەخوێندرایەوە. هەرچەندە هەندێ لە دەنگەکان شیاوی خوێندنەوە نەبوو، چونکە ئەو دەنگدەرانەی کارتەکانی پشکنینیان بەکارهێنابوو بەتەواوەتی پڕیان نەکردبۆوە یاخود ئەگەر پڕیشیان کردبێتەوە پارچە کاغەزی تێکەڵ یاخود تەنها پارچەیەکیان جێهێشتبوو، ئامێرەکانی بژاردنی دەنگ ئەو دەنگانەی وەك دەنگێکی یاسایی هەژمار نەکرد. لەڕاستیدا دەنگدەرەکانی تر لە بنەڕەتدا دەنگیان بۆ سەرۆك کۆمار نەدابوو. هەمان مەسەلە لە هەڵبژاردنی ویلایەتەکانی تریشدا ڕوویدابوو، بەڵام هیچ کەسێ ئەوەی بەجددی وەرنەگرتبوو، چونکە جیاوازی دەنگ هێندە نزیكو ئەنجامەکەی بەو ئاستە گرنگ نەبوو. لەبەر کورتهێنانی تەنها چەند دەنگێکی زیادە (لەنێو 6 ملیۆن دەنگی ویلایەتێکدا)، ئالگۆڕ و لایەنگرەکانی داوایان دەکرد کە دەنگە پوچەڵکراوەکان لەلایەن ئامرازەکانی هەڵبژاردنەوە لەهەموو ناوچەیەکداو لەڕێگەی بەرپرسە ڕەسمییەکانەوە سەرلەنوێ هەژمار بکرێتەوە. بوش و لایەنگرانی لەوە دەترسان کە هەژمارکردنی دەستی دەنگەکان بۆ دەستنیشانکردنی مەبەستو ئامانجی هەر دەنگدەرێك، دەشێ هەندێك مەبەست و نییەت بخاتە پرۆسەکەوە. بەشێوەیەکی نادادپەروەرانە ببێتە مایەی هەڵنەبژاردنی. بەلای بوشەوە ئامرازەکانی هەژمارکردنەوەی دەنگ جوداخوازی بۆ کاندیدێك و دژ بەکاندیدێکی تر ناکات، لەکاتێکدا لە هەر هەژمارکردنێکی دەستیدا ئەگەری ئەوە هەبوو ئەوەی لەئارادابوو بخرێتە ژێر فشارو کاریگەرییەوە. ئەم مشتومڕە مەیدانی هاوبەشی هەردوولای لاواز کرد، هەرکامیان جەختیان لەسەر هەژمارکردنی دادپەروەرانەی دەنگەکان دەکردەوە. ڕێك نەکەوتنەکە لەسەر ئەوە بوو کە دەبێ چۆن ئەم کارە ئەنجام بدرێت.

سەرەنجام دادگای باڵا لە ناوەڕاستی کانونی یەکەمدا، بریاری دا کە هەژمارکردنی دەستیانەی دەنگەکان بەبێ هەبوونی کۆمەڵە پێوەرێك بۆ دەستنیشانکردنی مەبەستی دەنگدەران، شیاو نییە. تەنها چەند ڕۆژێك بەر لە دەنگدانی دامەزراوەی هەڵبژاردن، دواجار دادگای باڵا لە ناوەڕاستی کانونی یەکەمدا گەیشتە ئەم دەرەنجامەی کە هەژمارکردنی دەستی دەنگەکان بەبێبوونی پێوەرگەلێك بۆ دیاریکردنی مەبەستی دەنگدەران، شیاو نییە. دادگای باڵا تەنها چەند ڕۆژێك پێش دەنگدانی ناوەندی هەڵبژاردن بەو دەرەنجامە گەیشت کە هیچ جۆرە هەژمارکردنێکی دەستی کە لەگەڵ دەستوردا گونجاو بێت، بوونی نییە.

ئەگینا دەنگی یەك کەس دەکرێ بەبەراورد لەگەڵ دەنگی یەك کەسی تردا بەشێوەیەکی جیاواز بخرێتەژێر دادو هەڵسەنگاندنەوەو ئەمەش لە ماددەی یاسای چاکسازی چواردەهەم لادەدات کە پارێزگاریی وەکیەك

دابین دەکات. ئەم بڕیارە لەلایەن بەرزترین دادگای وڵاتەوە کاریگەرییەکی زۆر گەورەتری لە هەڵبژاردنی ساڵی (2000)دا هەبوو.

دادگای باڵا یاسایەکی هێنایە ئارا کە ڕەنگە ڕێنماییەك بێت بۆ هەر دووبارە هەژمارکردنەوەیەك لە ململانێ سیاسییەکانی ئاییندە لە سەرتاسەری ویلایەتە یەکگرتووەکاندا. ئێستا دووبارە هەژمارکردنەوە تەنها کاتێك ئەنجام دەدرێت کە دەنگەکان لەژێر ئەو ستانداردو پێوەرانە بەدواداچوونیان بۆ بکرێت کە بۆ دابینکردنی مامەڵەیەکی یەکسان و کەمترکردنەوەی تێڕوانینی تاکەکەس خرابنەڕوو.

## پیادەکردنی سنورداریێتی بەسەر خەرجییەکاندا:

هەروەها هەڵبژاردنی ساڵی (2000) لەمڕووەوە شیاوی بایەخ بوو کە بە ڕوونی ڕۆڵی پارەی لە ململانێی ڕاکێشکردنی دەنگدا نیشان دا. دەڵێن ستراتیژیستی کۆماریخواز (مارك هانا) بەرلە سەد ساڵ لەمەوپێش وتویەتی: "دوو شت کە لە سیاسەتدا بایەخی هەیە: یەکەمیان پارەیەو بیرم نییە کە دووەمیشیان کامەیە". یاسای تێکۆشانەکانی هەڵبژاردنی فیدراڵ (*FECA*) لە چاکسازییەکانی (1974)ی خۆیدا، کۆمەڵە سنورداریێتییەکی سەرەکیانەی بەسەر سەرچاوەو بڕو جۆری سەرفیاتی ململانێکانی هەڵبژاردنی کردەباو تا ڕێگە لە گەندەڵی و گەندەڵی ڕواڵەتدار بگرێت. هەرچەندە ئەم سنورداریێتیانە لەگەڵ چاکسازی یەکەمی دەستور لەبارەی ئازادی دەربڕین و مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە گەندەڵییەوە ناتەبا بوو، چونکە ئەو پارەیەی کە لە سیاسەتدا خەرج دەکرێت، بەخشینی جۆرە بریکارییەکە بۆ قسەکردن. کاندیدەکان، حیزبەکان و گروپە سیاسییەکانی تر بۆ بیناکردنی ڕێکخراوەکانی خۆیان و گەیاندنی پەیامەکانیشیان بە دەنگدەران لە ڕێگەی ماس میدیاکانەوە، پێویستیان بە پارە هەیە.

لە جەختکردنەوەی بەشێك لەم یاسا ئاڵۆزە لە ساڵی (1976)دا دادگای باڵا هێڵێکی جیاکەرەوەی بەپێی دەستور لە نێوان پارە پێشکەشکراوەکان و خەرجییەکاندا کێشا، لەبەرئەوەی پیادەکردنی سنورداریێتی بەسەر بڕە پێشکەشکراوەکاندا وادێتەبەرچاو کە کەمتر زیان بە ئازادی دەربڕین بگەیەنێت تادەگاتە سنوردارکردن لە شێوازی خەرجکردن. هەربۆیەشە یارمەتییە پێشکەشکراوەکان مەترسییەکی گەورە بۆ گەندەڵی یاخود ڕواڵەتی گەندەڵی دروست دەکات. هەروەها جەخت لەسەر بەرنامەیەکی مەرجدار بۆ یارمەتییە گشتییەکان لەپێناو ململانێی سەرۆك کۆماردا کرا (لەسەر بنەمای بڕێکی یەکسان بۆ هەڵبژاردنە بەراییەکان و ئەنجومەنە حیزبییەکان و پشتیوانییەکی تەواوی دارایی لە هەڵبژاردنی گشتیدا) کە بەپێچەوانەی ئەوەشەوە کاندیدەکان ڕازی دەبن مل بۆ پیادەکردنی سنورداریێتی لەسەر مەسرەفەکان کەچ بکەن. ئامانجەکەشی ئەوە بوو کە تا ئەندازەیەك مەیدانی کاری دارایی لەنێو کاندیدی حیزبەکاندا بەشێوەیەکی یەکسان لێبکەن. لە دەرەوەی دەستراگەیشتن و سنورداریێتی یاسای هەوڵەکانی هەڵبژاردن لەبارەی (پارە ئاشکراکانەوە)، کۆمەڵە بڕێکی تر هەن کە بە (پارە شاردراوەکان) ناودەبرێن کە بریتین لەو کۆمەکە بەربڵاوانەی لە دەرەوەی سنورداریێتی بڕیارەکاندا لەپێناو بەهێزکردنی حیزب و شرۆڤەکردنی ئەو پاڵنەرانەی کە دەبنەمایەی وازهێنان لە درێژەدان بە تێکۆشان و مەسەلەکانی

پەیوەندیدار بە هەڵمەتەکانی ڕۆژنامەوانی سەرف دەکرێت.

## پرۆسیسێکی دیموکراسیانە بە سەقامگیریی:

هەڵبژاردنێکی ئازادی دادپەروەرانە بۆ دڵنیابوون لە (ڕەزامەندی هاوڵاتیانی دەوڵەت) واتا زەمینەی بنەڕەتی سیاسەتە ئازادو دیموکراسییەکان گرنگییەکی بنچینەیی هەیە. ئەمە هاوکات هەم ئامرازی دەسەڵاتەو هەم سەرچاوەی ڕەوایی (مەشروعییەت)، بە هەمانشێوەش هەڵبژاردنێکی نادادپەروەرانەو فرتوفێڵاویی دەتوانێ گومان لەسەر بانگەشەی کەسێك لەهەمبەر پێگەکەی خۆیدا دروست بکاتو لە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتییەکەی کەم بکاتەوە.

تەنها ژمارەیەکی کەم لە خەڵك بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ڕێبازەکانی هەڵبژاردن لە ولایەتە یەکگرتووەکان کامڵو بێ کەموکورتییە. جاربەجاریش هەندێ لە خەسڵەتەکانی بۆتەمایەی دواکەوتن، لادان، لابردن، یا کورتهێنانی ڕەزامەندیو ڕازیبوونی خەڵك. لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر هۆکاری جۆراوجۆر، زۆرینەی ئەمریکییەکان لەم بڕوایەدان کە سیستەمی هەڵبژاردنەکەیان بەگشتی دادپەروەرانەیەو ڕاستگۆیی لەگەڵدایە. یەکەم بەپێی نمونە بەرچاو و سودمەندەکانی ئەو شەڕانەی کە نزیکەی (5,1) سەدە لەمەوپێش بووەمایەی جەنگی ناوخۆیی، هەڵبژاردن لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بەشێوەیەکی کاریگەر گرنگ بووە. لەگەڵ دەستنیشانکردنی براوەکانو دۆڕاوەکان، ئەوان شتگەلێك بەدەستدەهێنن کە هەڵبژاردنی لەپێناودا دانراوە.

کاندیدە شکستخواردووەکانو لایەنگرەکانیان، بە ئینتیماو ئارەزووە ئەگەرچی نەك بەشادی، تەسلیمی براوەکان دەبنو مافی فەرمانڕەوایەتییەکان بەڕەسمی دەناسن. ئەمە دەستکەوتێکی گچکە نییە. کاتێك کە بەهاکانو بەرژەوەندییە سەرەکییەکان، ئەگەرچی بە دەگمەن لە مەترسیشدا بێت، ئەو چەشنە قبوڵکردنە پرەنسیپی سیستەمێکی سەقامگیرە.

دووەمیان دووبارەبوونەوەی هەڵبژاردن بەو مانایەیە کە گرەنتی مانەوە لەسەر دەسەڵات بە هیچ حیزبێك یاخود باڵێك نەدراوە. سبەی لەوانەیە زۆرینەیەکی زۆر جیاواز شوێنی زۆرینەی ئەمڕۆ بگرێتەوە، ئەمە ڕۆحی وشەی تیۆری دیموکراسییە. زۆرینەکان سات دوای سات دەگۆڕێن. سێیەمیان زۆرینەکان لەوانەیە ساتی بن لەبەرئەوەی سیستەمی هەڵبژاردن پارێزگاریی لە مافی ململانێ دەکات. هەڵبژاردن بێ ئۆپۆزسیۆنێکی جددی لە گاڵتەجاڕییەکی فریودەرانە زیاتر نییە.

سەرەنجامەکەشی ئەوەیە کە هەڵبژاردن لە ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەڵقەیەکی پەیوەندی نێوان دەنگدەرانو بەرپرسانی دەوڵەتە. بەرپرسانی دەوڵەت لەپێناو فەرمانڕەوایەتیدا، وابەستەی زۆرینەی دەنگدەرانن. بەمپێیە خەڵك بەچاوی خزمەتکار دەڕواننە بەرپرسە دەوڵەتییەکان کە لەڕێگەی ئەوانەوە ڕێگەیان پێدراوە کار بکەن. هەڵبژاردن لە ئەمریکا، بەرپرسە ڕەسمییەکانی بۆ خزمەتکارانی خەڵك گۆڕیوە تا خەڵکیش ببێتە خزمەتکاری ئەوان. ئەگەرچی لەوانەیە ئەو ڕێبازو پێوەرانەی کە ولایەتە یەکگرتووەکان لەپێناو بەرەوپێشڤەبردنی سیاسەتە ئازادەکانی خۆی دایناوە، بە وردیی لەلایەن ئەوانی ترەوە شیاوی لاسایی کردنەوە نەبێت و میللەتانی تر بڕیار لەوە نەدەن کە لە هەموو وردەکارییەکاندا پەیڕەویی لە مۆدیلی ئەمریکی بکەن. هەندێ لە خەسڵەتی سیاسەتەکانی هەڵبژاردن لە ویلایەتە

یەکگرتووەکان، تەنها وەك یادەوەرییەکی مێژوویی ماونەتەوەو میللەتی ئەمریکا کە پێدەنێتە سەدەی بیست و یەکەمەوە، چیتر بەرپرسە گرنگە پراکتیزەکارەکانی خۆی لە ڕێگەی دامەزراوەی هەڵبژاردنەوە هەڵنەبژێرن. لەوانەیە دەنگی وەکیەك بۆ هەر ویلایەتێك لە سەنادا چیتر بە متمانەدار دانەنێن. خەسڵەتەکانی تری وەك گرەنتی چاپەمەنی ئازاد یاخود هەڵبژاردنی گشتیانەی ئەندامانی کۆنگریس بێگومان دەمێننەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو وانانەی کە لە ئەزموونە دیموکراسییەکەی ئەمریکاوە بەدەستدێت، ئاماژە بۆ خەسڵەتگەلێك دەکات کە ڕەنگە لەپێناو پاراستنی پرۆسیسێکی سەقامگیری دیموکراسیانە لە شوێنێکی تردا ژیاریانە بێت.

یەکەمیان دەستەبەرکردنی هەڵبژاردن و سندوقی دەنگدان دەبێ بەشێوەیەکی بەرفراوان فەراهەم کرابێت و بەهای دەنگێك هەرگیز نابێ لە دەنگێکی تر زیاتر بێت. بۆنمونە سنووردارکردنی کۆمەڵگای سیاسی لەسەر بنەمای ڕەگەزایەتی، باوەڕە سیاسییەکان، نەتەوایەتی یاخود مەزهەب دەبێتە مایەی لەناوبردنی ڕەوایەتی ڕژێمەکە. بەپێچەوانەوە، هەڵبژاردنێکی سەرتاپاگیر هەموو توخمەکانی کۆمەڵگا هان دەدات کە خۆیان لەو سیستەمەی ئێستادا بە هاوبەش ببیننەوە، چونکە هەرکامیان ئەم چانسەیان هەیە کە سەرەنجام بەسەر ئەوانی تردا سەربکەون.

دووەمیان دەبێ هاندانی خەڵك بۆ بەشداربوونێکی بەرفراوانتر لە هەڵبژاردندا، لە پلەی یەکەمدا بێت. نزمی ڕێژەی بەشداربوونی تاکەکان دەبێ مایەی نیگەرانی و تەنانەت مەترسیش بێت. ئەم کارە نەك تەنها دەبێتەمایەی هەڵبژاردنی بەرایی کە لە پشتیوانی زۆرینەی ئەو تاکانەی مەرجەکانی دەنگدانیان تێدایە، بێبەش دەبێت. تەنانەت خودی ئەم بەرپرسە بەرژەوەند کاریگەرانە بەباشی ئۆرگانیزە دەکات و پتر لە جاران خاوەن پاڵنەرە بەهێزەکان توندتر دەکەن.

سێیەمیان ئاستێکی بەرز بۆ ئازادیی دەربڕینی هەڵوێستە سیاسییەکان لەپێناو پرۆسەیەکی دیموکراسیدا خاوەنی گرنگییەکی ژیاریانەیە. سنووردارکردنی چالاکییەکانی ئۆپۆزسیۆنە یاساییەکان، لەڕێگەی سەرکوتکردنی ئۆپۆزسیۆنەکانەوە، نەك تەنها سیستەمەکانی هەڵبژاردن ئیفلیج دەکات، بەڵکو سەرکوتکردنی بیروباوەڕەکان دەتوانێ ئۆپۆزسیۆنەکان لە ڕەوتی یاساییانەی بەشداریی سیاسییەوە بەرەو ڕێگا توندوتیژەکانی ناڕەزایی ڕاکێش بکات.

چوارەم هەڵبژاردن و سیستەمێکی نوێنەرایەتی دەبێ وا لە زۆرینەی خەڵك بکات کە دەوڵەت کۆنترۆڵ بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ هەنگاوە پارێزگارییە پێویستەکان بخرێتەکار تا ڕێگر بێت کە زۆرینە زاڵ ببێت و کەمینەش لەناوببردرێت. بەم هەموو کارەی کە بەمەبەستی ڕێگەگرتن لە فشارە ناڕەواکان بۆسەر بەرژەوەندییەکانی کەمینە دەکرێت، لەوانەیە ببێتە مایەی نائومێدی زۆرینەی هاوڵاتیانی وڵات، واتا ئەو یاسایە سست دەبێت کە بەشێوەیەکی کارا ڕەنگدانەوەی ئیرادەی زۆرینەیە. بەدەرلەمە، دیدگاکانی کەمینە جێگەی زۆرینە دەگرێتەوە یاخود هێندە پرۆسەی بڕیاردان ئیفلیج دەکات کە دەوڵەت هەرگیز چیتر توانای کارکردنی نییە.

پێنجەم لەبەر ئەو هۆکارەی کە هەڵبژاردن تەنها کاتێك کاریگەرە کە خەڵك بە ئازادو دادپەروەرانەی بزانن، دەبێ کارێك بکرێت کە بەخێرایی وەڵامی تۆمەتەکانی

تەزویرکاریی لە دەنگداندا بدرێتەوە. بەبێ بوونی ئەم هەنگاوە چاکسازیانە، لەوانەیە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا هەڵبژاردنەکە بە تەزویرکاریی ناوزەد بکرێت.

سەرەنجامی ئەوەش کە لە کۆمەڵگایەکدا کە نیشانە تایبەتمەندەکەی ئەوەیە ناکۆکییە قوڵە کۆمەڵایەتییەکەی لەسەر مەسەلە ژیارییەکانە، ڕەنگە ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی ئازادو دادپەروەرانە بەگرفت بێت، هەندێکجار سەلامەتی سیستەمێکی سیاسی بە سەرهەڵدانی ئەو مەسەلە تاقیکراوانە دەست پێدەکات کە لە تێکۆشانەکانی هەڵبژاردندا لەئارادا نەبووەو ئەو یاسایانە دێنەئارا کە لەکاتی دەنگداندا ناوی لە گۆڕێدا نەبووە.

ودرۆ ویڵسۆن یەك سەدە لەمەوپێش ئەوەی خستەڕوو کە:" ناوەندەکانی دیموکراسی هەرگیز کامڵ نابن، ئەو ناوەندانە وەك خانە زیندووەکانن، هەمیشە لەساتی گەشەو پێشڤەچووندان. چەند کاراو دڵگەرمو بەوزەیە ژیانی خەڵکانی ئازاد". بەدیهێنانو دەستەبەرکردنی لە نزیکترین کاتداو ئەگەری گۆڕان، هێشتا لە بەرنامەی ڕۆژەڤدایە. ئاگاداربوون لە کەموکورتییەکانی سیستەمێکی هەڵبژاردن، هێندەی ناسینو ڕێزلێنان لە فەزیلەتەکانی بایەخی هەیە.

## بۆ خوێندنەوەی پتر:

*Mark E. Bush, Does Redistricting Make a Difference? Partisan Representation and Electoral Behavior (Johns Hopkins University Press, 1993)*

*Marchette Gaylord Chute, The First Liberty: A History of the Right to Vote in America, 1619-1850 (Button, 1969)*

*William Gillette, The Right to Vote: Politics and Passage of the Fifteenth Amendment (Johns Hopkins University Press, 1965)*

*Samuel Huntington, The Third Wave: Democratization In The Late Twentieth Century (University of Oklahoma Press, 1993)*

*Bernard Grofman and Arend Lijphant, eds. Electoral Laws and Their Political Consequences (Agathon Press, 1986)*

*Alexander Keysser, The Right to Vote: The Contested History of Democracy in the United States (Basic Books, 2000)*

*Harold Porter Kirk, A History of Suffrage in the United States (AMS Press, 1971)*

*Donald W. Rogers, ed. Voting and the Spirit of American Democracy: Essays on the History of Voting and Voting Rights in America (University of Illinois Press, 1992)*

## دەربارەی نوسەر

*D. Grier Stephenson, Jr* خاوەنی کورسی مامۆستایەتی (*Charles A. Dana*) ی پەیوەندیدار بە مەسەلە دەوڵەتییەکانە لە زانکۆی فرانکلین مارشال، واتا ئەو شوێنەی وانە دەربارەی سیاسەت لە ئەمریکا، دادگای باڵاو مافە دەستورییەکان دەوترێتەوە. لەڕیزی بەرهەمانی ئەودا دەتوانرێ ناوی دادگای باڵاو ویلایەتە یەکگرتووەکان لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی کۆماریو هەروەها دەستوری ویلایەتە یەکگرتووەکانو وتارە بەراییەکانو دۆسییەکانی کاندیدکراوەکان (بەهاوکاری لەگەڵ *Alpheus Thomas Mason*) ببردرێت.

## سەرچاوە:

د. گرییەر ستیڤنسۆن: کتێبی دیموکراسی، سایتی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا.

# شانشینی عەرەبستانی سعودییە
# لە ئاوێنەی ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوادا

هاشم سالّح

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

ئـەم لێکۆڵینەوەیـە هەوڵـدەدات بـیروڕای هەنـدێ لـە بیرمەنـدانی ڕۆژئـاوا سـەبارەت بـە شانـشینی عـەرەبی سـعودیە بخاتـەڕو. لـەو بیرمەندانە "برنارد لویس"، "باسکال مینۆری"، "جێل کێبیـل"، "داڤێد ڕیکۆلیـە رۆز"، "جۆرج جودت دوالیبی"..هتد. دوای سێپتێمبەر وڵاتی سـعودیە بووەتـە شـوێنی بیرکردنـەوەی ڕۆشنبیرانی ئەوروپاو ئەمریکا. ناکرێ ژمارەی ئـەو کتێـبو وتارانـە بـژمێرین کـە دوای 11 سێپتێمبەر لە زمانە بیانییەکاندا سەبارەت بە سـعودیە بڵاوکراونەتـەوە. ئـەو ڕۆشـنبیرانە لـەناکاو بۆیـان دەرکـەوت هـیچ شـتێکی ئـەوتۆ لەبارەی ئەم وڵاتە گەورەیە، چ بە قەبارەکەیو چ بەو پێگەو توانستە ماددیو دەلالەتە ڕەمزیو ڕۆحییـە بـەرزەی لـەلای هـەمو عـەرەبو موسڵمانان هەیەتی، نازانن. ئیدی لە ڕێگەی ئەم توێژینـەوەو کتێبانـەوە، کەوتنـە شـکاندنی ئـەو دیـوارە ترسـناکەی بێـدەنگی کـە بەدرێـژایی ساڵانی پێشوو دەورەی سعودییەی دابوو.

خەڵکی دەیانەوێ نهێنی ئەم وڵاتە بزانن کە نەك تـەنها "بن لادن"ی بەرهـەمهێناوە، بـەڵکو لـە کـۆی 19 خۆکـوژ 15 دانـەیان خـەڵکی ئـەم وڵاتـەبوون. (مەبەسـت لـەو تیرۆرسـتانەیە کارەسـاتی 11 سـێپتێمبەریان خولقانـد، واتـە گروپەکـەی محمـەد عـەتاو ڕەمـزی بـن شـەیبەو ئـەوانی دیکـە کـە ژمارەیـان 19 کـەس بـووە، لەوانـە 15 کەسـیان خـەڵکی سـعودییەن. -و-) بۆیـە بیرمەنـدانی ڕۆژئـاوا دەسـتیان کـرد بـە توێژینەوەی سعودییە لە ناوەوە، تاکو پێکهاتە خێڵـەکیو مەزهەبییەکـەی، جوگرافیاکـەی، پەیوەندی نێوان دەسەڵاتی سیاسیو دەسەڵاتی ئاینی، مانای دیاردەی وەهابییەت، هۆکاری ئەو داخرانـە فکرییـە مەترسـیدارە بـزانن کـە لـە جیهاندا نمونەی نییە. ئێمە ئەمە دەڵێین گەرچی

ڕەوتێکی میانڕەو لە پیاوانی ئاینیو ڕەوتێکی لیبرالی لە ناوەندی ڕۆشنبیرانی سعودییەدا هەیە. بەڵام ڕەوتی توندڕەوی فێندەمێنتالیزم تیۆری فیکری خۆی بەسەر هەمواندا سەپاندووە، وەك ئەوەی توێژەر "جۆرج جەودەت دوالیبی" لە توێژینەوەیەکی بەپێزدا کە بەم دوایانە لە فەرەنسا بڵاوبووەتەوە، باسی لێوەدەکات.

بە مانایەکی تر ئەو بیرمەندە ڕۆژئاواییانە بۆ یەکەمجارە میتۆدێکی زانستی بەسەر وڵاتێکدا پراکتیزە دەکەن کە کەوتبووە دەرەوەی توێژینەوەی زانستی، بگرە کەس نەیدەوێرا توێژینەوەیەکی زانستی سۆسیۆلۆجی مێژویی بەسەریدا پراکتیزە بکات. لێرەوە ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئێمە تیشك دەخاتە سەر هەموو ئەو ڕۆشنایانەی ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوا خستویانەتە سەر وڵاتی سعودییە. ئەو ڕۆشنایانەش هەندێجار بەوەوە ناوەستن تەنها دەستنیشانی کێشەکان بکەن، بەڵکو پێشنیاری چارەسەرکردنیشی بۆ دەکەن. ڕەنگە بۆ ڕۆشنبیرانی عەرەب باشبێت ئەو بیروڕاو دەستنیشانکردنانە، گەر لەگەڵیدا بن یاخود لەگەڵیدا نەبن، بخوێننەوە. چونکە تێڕوانینی دەرەکی بە پێوانە بە تێڕوانینی ناوەکی باشەی خۆی هەیە. ئەوەی دووره لەوانەیە کۆمەڵێ شت لە تۆدا ببینێ کە نزیك نایبینێ. ئێمە ئەمە دەڵێین گەرچی تێڕوانینی دەرەکی ئەویش ناتەواوی خۆی هەیە. لەوانەیە لە دژت ڕاوەستێت، یاخود هەڵوێستێکی نەیار لە دژت وەربگرێ، یان مەسافەیەکی زیاد لەپێویست لە بابەتی توێژینەوەکە دووردەکەوێتەوە. لەکاتی خوێندنەوەی ئەم لاپەڕانەی خوارەوەدا، پێویستە هەمو ئەو شتانەی لای سەرەوە لەبەرچاوبگیرێن. چونکە ئەم لاپەڕانەی کە دێن نە مەعسومنو نە بێ هەڵە، بگرە ئەوانە تەنها جۆرێکن لە ئیجتهاد، ڕەنگە ڕاستبن و ڕەنگە هەڵە. کەواتە با بە شێخی ڕۆژهەڵاتناسان لەسەر ئاستی هەمو ڕۆژئاوا دەستپێبکەین: "برنارد لویس".

**سعودییە لە ئاوێنەی (برنارد لویس) دا:**

دوای لێدانەکەی 11 سێپتێمبەر، چاوەڕوانی ئەوە دەکرا "برنارد لویس" بۆ شرۆڤەکردنی هۆکارە قووڵەکانی ئەوەی ڕویدا، چی وزەو توانای خۆی هەیە بیانخاتە کار. لەم بارەیەوە کۆمەڵێ کتێبی لەسەر ئەو بابەتە بڵاوکردەوە، لەنێویاندا ئەم دوو کتێبە کە ئەمە ناونیشانەکانیانە: (بەدروستی ئەوە چی بوو ڕویدا؟ ئیسلام، ڕۆژئاوا، مۆدێرنە)، پاشان کتێبی (قەیرانی ئیسلام: جەنگێکی پیرۆزو تیرۆرێکی ناپیرۆز)، لێرەدا ئەوەی بەلامانەوە گرنگە کتێبی دووەمەو من پشتم بە وەرگێڕانە فەرەنسییەکەی بەستووە. "برنارد لویس" لەم کتێبەیدا بەشێکی تەواو تەرخان دەکات بۆ ئەم بابەتەی خوارەوە: (دەسەڵاتی سعودیو عەقیدەی وەهابی)، تێدا شتێکی ئاوا دەڵێ: لە دەڤەری عەرەبی ئیسلامیدا، ڕەتکردنەوەی مۆدێرنە بەناوی ڕابردوی پیرۆز یان دوای ئەوەی کراسی پیرۆزیی دەکرێت بەبەر ئەو ڕابردووەدا، مێژوییەکی دوورودرێژی هەیە. بەڵام لە سەدە مۆدێرنەکاندا مەترسیدارترن. بزوتنەوە کە لەلای عەرەبەوە سەریهەڵداو هەڵوێستێکی دوژمنکارانەی ڕەهای دژ بە مۆدێرنە وەرگرت، بێگومان بزوتنەوەی وەهابییەت بوو. ئەم بزوتنەوەیە لەهەر شوێنێکدا سەرکەوتنی بەدەستهێنابێ، سیستمێکی ئاینی توندوتیژی بێ ڕەحمی سەپاندووە. توانی دورگەی عەرەبیو ناوچەکانی دەوروبەری پاوان بکات، خەڵکی بە ژنو پیاوو منداڵەوەو بەبێ جیاوازی کردن

دەکوژران، چونکە ئەوانە ئیسلام وەك ئەوەی وەهابییەکان دەیانەوێ و لێیتێگەشتون، جێبەجێ ناکەن. وەهابیەکان ئەو خەڵکانەیان بە چونەدەرەوە لە ئیسلام لەقەڵەمدەدا، لێرەوە سەربڕینیان و لەناوبردنیان لە ڕەگوڕیشەوە بەبێ هیچ سۆزو بەزەییەك حەڵاڵە. ئەم بزوتنەوە ئاینییە کە تا دواسنور توندڕەوە، هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ "ئال سعود" هاوپەیمانێتییەکیان بەست، بەپێی ئەو هاوپەیمانەتیە "ئال عەبدولوەهاب" یان "ئال الشیخ" وەك ئەوەی ئێستا وایان پێدەڵێن، دەسەڵاتی ئاینیان دەبێت و "ئال سعود" دەسەڵاتی سیاسیان دەبێ. ئەم هاوپەیمانییە ئاینی/ سیاسییە کە لێکدی جیانابنەوە، ئەو بوو ساڵی 1932 بووە هۆی دامەزراندنی شانشینی عەرەبی سعودییە. ئەم هاوپەیمانەتییە تاکو ئێستاش هەر بەردەوامە، گەرچی دوای بومەلەرزەکەی 11 سێپتێمبەر توشی لەقبون و لەرزین هاتووە، وەك ئەوەی دواتر باسی لێوەدەکەین.

مەسەلەکە هەرچۆنێك بێت، "برنارد لویس" پێیوایە گەر نەوت و پارە قەبەکەی نەبوایە، ئەوا بزوتنەوەی وەهابییەت لەناو چواردیواری (نەجد) دەمایەوە یاخود ئەوپەڕەکەی دەگەشتە دورگەی عەرەبی، ئیتر ئەم هەمو فراوانبوون و بڵاوبونەوەیەی کە بەم دوایانە بەخۆیەوە بینی و کردی بە دیاردەیەکی جیهانی گەورە، نەدەبینی. دواتر "برنارد لویس" بۆ ئەوەی بیروڕاکەی لە هزرو تێگەشتن نزیك بکاتەوە، ئەم نمونەیەی خوارەوە دێنێتەوە: (بیهێننە بەرچاوی خۆتان گەر بزوتنەوەی توندڕەوی ئەمریکی (کیۆ کلۆکس کلان) بیتوانیایە دەست بەسەر ویلایەتی تەکساسی بە نەوت دەوڵەمەنددا بگرێت، پاشان بڕیاربدا پارەی ئەم نەوتە لە دروستکردنی تۆڕێکی تەواو لە کڵێسا و قوتابخانە و زانکۆی ئوسوڵی خەرج بکات، نەك تەنها لە ئەمریکا، بگرە لە هەموو لایەکی جیهانی مەسیحی، ئایا ئەوکات توندڕەویی لە هەمو شوێنێکدا بڵاونەدەبووەوە؟ ئایا لە هەمو شوێنێکی جیهانی ئەورووپی و ئەمریکی، دەستی نەدەخستە بینەقاقای ئازادی بیرکردنەوەو ئازادی ڕۆح؟.

لە ڕاستیدا بزوتنەوەی وەهابی لەم بزوتنەوە ڕاستڕەوە توندڕەوەی مەکسیك زۆر زۆر مەترسیدارترە. بۆیە بەراوردکردن لەنێوان ئەم دوو بزوتنەوەیەدا، لەبەر هۆکارێکی بچوك ڕاست نییە و دوورە لە حەقیقەتەوە، هۆکارەکەش ئەوەیە وڵاتانی مەسیحی خاوەنی سیستمێکی خوێندنی بەهێزو مۆدێرنن، لێرەوە مەحاڵە بزوتنەوەی (کیۆ کلۆکس کلان)ی ڕاستڕەوی توندڕەو بەو پرۆگرامی خوێندنەی هەیەتی، بتوانێ دەستبگرێ بەسەر وڵاتانی مەسیحیدا، یان بتوانێ ژەهرو بیروڕا توندڕەوەکەی لەناویاندا بڵاوبکاتەوە، گەرچی سەروەت و سامانێکی زۆریشی هەبێت. بەڵام ئەم حاڵەتە لە وڵاتانی ئیسلامیدا بەو شێوەیە نییە، لە وڵاتانی ئیسلامیدا سیستمێکی خوێندن نییە شایەنی ئەوەبێت پێی بوترێت سیستمی خوێندن. ئالێرەدا با تەنها بۆ یەك چرکە بیر لە ئەفغانستان یان بەنگلادیش یاخود تەنانەت پاکستان یان چەندین وڵاتی دیکە بکەینەوە کە تێیدا وەهابیەت شوێنێکی بەپیتی بۆخۆی دۆزیوەتەوە. لەبەر ئەم هۆیەیە وەهابیەت توانی وەك بڵاوبونەوەی ئاگر لە پوش و پەڵاش لەو وڵاتانەدا بڵاوببێتەوە و توانی لەمیانەی تەنها دوو دەیەدا و لەرێگەی پارەی نەوت و قوتابخانە قورئانییەکانەوە، کۆنترۆڵیان بکات. بگرە کاریگەری وەهابیەت تەنانەت گەشتە رۆژئاوای پێشکەوتو لە ئەمریکا و باکوری ئەورووپا کە جالییەیەکی گەورەی

عـــەرەبی و ئیـــسلامی لێیـــە. پڕوپاگەنـــدەی وەهابییـەت پاڵپـشت بـە پارەیـەکی زۆر، گەشـتە ئـەو وڵاتانـەو کاریگـەریی لەسـەر عەقڵیـەتی زۆربـەی کوڕوکـاڵی ئـەو وڵاتانـە دانـا، ئەمـەش کێـشەی بـۆ وڵاتـانی گـەورەی وەك فەرەنـسا و ئینگلتـەرەو ئـەڵمانیا..هتـد نایـەوە. بگـرە سعودییە لـەوێ، لـە ناوجەرگـەی پایتەختـەکانی ئـەوروپا، وەك پـاریس و رۆمـا و برۆکـسێل و مەدریـدو لەنـدەن و ئـەوانی دیکـە، مزگـەوتی گـەورەو ناوەنـدی ئیـسلامی دروسـتکرد. ئەمـە لەکاتێکدایـە سـعودییە ڕازی نابێـت تـەنها یـەك کڵێسا چییە لەسەر خاکەکەی دروستبکرێت.

پاشـان "برنـارد لـویس" بـەردەوام دەبـێ و دەڵـێ: سـعودییە بـۆ بڵاوکردنـەوەی هەیمەنـەی خـۆی لەسـەر ئاسـتی عـەرەبی و ئیسلامی، بگـرە تەنانـەت لەسـەر ئاسـتی جیهـانیش، سـودی لـە دوو فاکتـەر بینیـوە: یەکـەمیان بـوونی شـوێنە پیرۆزەکـانی ئیـسلامە لەسـەر زەویەکـەی. دووەمیان دۆزینەوەی نەوت بە بڕی هێجگار زۆر لـەژێر خاکەکەیـدا. گـەر ئەوانـە نەبونایـە، ئـەوا وەهابییەت وەك تایفەیـەکی توندڕەوی تـاریکبین لە وڵاتێکی پەراوێزخراودا دەمایەوە. دوای ئەوە "برنـارد لـویس" دەچێتە سـەر چارەسـەرکردنی کێـــشەیەکی مەترســـیدار کـــە کێـــشەی فێندەمێنتالیزمەو دەڵێ: یەکەمجار ئەم زاراوەیـە (فێنـــدەمێنتالیزم) بەســـەر بزوتنـــەوەی پرۆتـستانتی ئـەمریکی پراکتیـزە کـرا، کـە لـە ڕەوتـی زۆرینـەی مەسـیحی ڕۆژئـاوا لایـداو جیابوەوە، ئەم بزوتنەوەیە لێکدانـەوەی مێـژویی بـۆ کتێبـە پیرۆزەکـان و تیۆلۆژیـای لیبرالـی ئازادیخوازی ڕەتدەکردەوە کە دوای سەرکەوتنی مۆدێرنـــە لـــە ڕۆژئـــاوادا بڵاوبـــوەوە. فێنـدەمێنتالیزمی ئـەمریکی بەپێوانـە لەگـەڵ ڕەوتی گشتیدا کەمینەن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پابەنـدی تیۆلۆژیـای سـەدەکانی ناوەڕاسـت و لێکدانەوەی حەرفی کتێبی پیرۆز بوون. "برنـارد لـویس" پێیوایـە ئـەم زاراوەیـە لەبـەر هۆکـارێکی سـادە بەسـەر بـارودۆخی ئێـستای ئیـسلامدا پراکتیزە ناکرێ، ئەو هۆکارەش بریتییە لـەوەی هەموو موسڵمانەکان دواجار فێندەمێنتالیستن و دابەش نەبوون بۆ دوو ڕەوتی لیبرالی و ڕەوتی فێنـدەمێنتالیزمی دەمـارگیر، وەك ئـەوەی لـە ئەمریکا و سەرتاپای ئەوروپادا ڕویدا. بەڵگەی بۆ ئەوە چییە؟ بەڵگەی بۆ ئەوە ئەوەیە ڕەوتی لیبرالـــی لـــە ئیـــسلامدا دوای لـــەناوبردنی موعتەزیلـەو فەیلەسـوفەکان، پوکایـەوەو مـرد. لێرەوە دوای ئـەوە هـەموو موسڵمانان بـە پلـەی جیاواز جیاواز بوونە فێندەمێنیتالیست. لەمەوە ئـەوە دێتـەدی جیـاوازی نێـوان موسـڵمانی فێندەمێنتالیـست و موسـڵمانی میـانڕەو لـە پلەکەیدایـە نـەك لـە جۆرایەتیەکەیـدا. ڕاسـتە تیۆلۆژیای لیبرالی، واتـە عـەقڵانی، لـە ڕابردودا موســڵمانانی دابەشــکردووەو لەوانەیـــە لـــە داهاتوشـدا دابەشیـان بکـات، بـەڵام مەسـەلەکان لـەم بارودۆخـەی ئێستادا ئەوەیـە تیۆلۆژیایـەکی لیبرالـی لای موسـڵمانەکان نییـە، چـونکە هـەر هـەموویان لـە دەوری قورئـان کۆبونەتـەوەو پێیـان وایـە قورئـان قسەی خودایـەو بەهیچ شێوەیەك خەڵقنـــەکراوە. بۆیـــە نـــاکرێ ســـەرلەنوێ خوێندنەوەو لێکدانەوەی تازە بۆ قورئـان بکـرێ. بەڵکو پێویستە وەك خۆی چۆنە ئـاوا حەرفیانـە وەریبگرین. قورئان قسەی خواوەندەو بەڕەهایی مەعسومە. ڕەنگـە هەنـدێ ڕۆشـنبیری موسـڵمان هـەبن باوەڕیـان بـەوە نـەبێت، بـەڵام هـیچ کەسێك جورئەتی ئەوە ناکات بیروڕای خۆی ڕاشکاوانە ڕاگەیەنێت.

دواجـار "برنـارد لـویس" پێیوایـە بزوتنـەوە فێندەمێنتالیزمەکانی ئیسلام، ئەو کەسانەن کە لـەو بڕوایـەدان کێـشەو قەیرانـەکانی جیهـانی ئیـسلامی، لەبـەر ئـەوە نییـە تازەکردنـەوە

(التحديث) ناتەواوو کەموکوڕی تێدایە، بەڵکو ئەو کەسانە پێیان وایە کێشەو قەیرانەکان لەبەر زۆری پرۆسەی تازەکردنەوە هاتووەنەتە بەرهەم! زۆربوونی تازەکردنەوە یاخود زیادەڕۆیی تێیدا، ئەوەیە بووەتە هۆی خیانەتکردن لە بەها ڕاستەقینەکانی ئیسلام. لێرەوە چارەسەر ئەوەیە بگەڕێینەوە بۆ ئیسلامی ڕەسەنی یەکەمجارو چی بیروڕاو دابونەریتی خوستراوی ڕۆژئاوا هەیە، ڕەتیان کەینەوەو ئافەرۆزیان بکەین. پێویستە بگەڕێینەوە بۆ شەریعەت، واتە بۆ یاسا پیرۆزەکەی ئیسلام کە لەلایەن یەزدانەوە گرنگییەکی تەواوی هەیە. لێرەوە دوژمنی بنەڕەتی بەلای فێندەمێنتالیزمی ئێستاوە، ڕۆژئاوای دەخیل نییە، هێندەی ئەو موسڵمانە ڕیفۆرمخوازە ڕۆشنفکرەیە کە لەناوەوە ئیسلام بۆمبڕێژ دەکات و یەقینە جێگیرەکان لەقدەکات. لەبەر ئەم هۆیەیە لە جیهانی عەرەبیدا ڕۆشنبیرە لیبرالییەکان بەو حسابەی سەرچاوەی بنەڕەتی دەردوبەڵا و میکرۆبی بەڕۆژئاوایکردنن، تیرۆرو پاکتاو دەکرێن. هەروەها فێندەمێنتالیستەکان هەوڵدەدەن ڕژێمە حوکمڕانەکان لەناوبەرن، چونکە ئەو ڕژێمانە پاشکۆی ڕۆژئاوان و حوکم بە شەرعی خودا ناکەن.

**باسکال مینۆری و نهێنی سعودییە:**

ئێستا دەگوێزینەوە بۆ لێکدانەوەی بیروڕاکانی توێژەری فەرەنسی "باسکال مینۆری" کە دەرچوی بەشی فەلسەفەیە لە زانکۆکانی پاریس. پێشتر وەك ئەندامی باڵیۆزخانەی فەرەنسا لە ڕیاز کاریکردووە، دواتر گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی و لە یەکێك لە وەزارەتەکاندا بووە بە بەرپرس، پاشان بە ماوەیەکی کەم دوای ڕودانی تەقینەوەکانی 11 سێپتێمبەر، دیسانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ڕیازو یەك ساڵی تەواوی تێدا دەمێنێتەوەو لە یەکێك لە زانکۆکانی سعودییەدا وانە دەڵێتەوە، تێکەڵ بە خوێندکاران دەبێ و هەندێ لە سیاسییە ڕۆشنبیرە لیبرال و ئوسوڵییەکان دەناسێ، دواتر سەفەرێکی زۆر بە هەموو ناوچەکانی جەزیرەی عەرەبیدا دەکات، ئینجا دەستدەکات بە دانانی ئەم کتێبەی لێرەدا پشتی پێدەبەستین.

"فرانسوا بۆرگا"ی توێژەر پێشەکیەکی بۆ کتێبەکەی "باسکال مینۆری" نوسیوە. "فرانسوا بۆرگا" لە "باسکال مینۆری" بەتەمەنترەو ئەزمونیشی لەو زیاترەو دانەری کتێبی (ڕووبەڕو لەگەڵ فێندەمێنتالیزمدا)یەو لە شاری سەنعای پایتەختی یەمەن بەڕێوەبەری ناوەندی فەرەنسییە بۆ زانستی شوێنەوارناسی و زانستە مرۆڤایەتیەکان. لێرەوە دەکرێ "فرانسوا بۆرگا" وەك مامۆستای "باسکال مینۆری" دابنێین. "فرانسوا بۆرگا" باشی و بەپێزی ئەم کتێبە لەوەدا دەبینێتەوە تیشکێکی زانستی و مرۆڤانە دەخاتەسەر کۆمەڵگایەك کە بۆ ئێمەی ڕۆژئاوا نادیارو نەناسراوە، واتە کۆمەڵگای میرنشینی عەرەبی سعودییە. دوای 11 سێپتێمبەر کتێبگەلێکی زۆر لەسەر سعودییە بڵاوبونەوە، زۆربەی کتێبەکان هێرش دەکەنە سەر ئەو وڵاتەو بەخراپ باسی لێوەدەکەن. بەشی زۆری کتێبەکان کلێشەیەکی گشتی لەخۆگرتووە، کلێشەی لە جۆری: سعودیە ئەو وڵاتەیە "بن لادن"ی بەرهەمهێناوە، حکومەتەکەی یارمەتی تیرۆر دەدات، پارەکانی بۆ فێندەمێنتالیستەکان دەڕوا، سعودیە دەمارگیرترین وڵاتی وەهابییە لە جیهاندا..هتد.

دواتر "فرانسوا بۆرگا" دەڵێ: ئێستا ئیدی کاتی ئەوە هاتووە سەبارەت بەم وڵاتە، وێنەکە ڕاستکەینەوەو وێنەیەکی دیکە پێشکەش

بکەین کە نەرمترو مرۆڤانەتربێت. دواتر ئەم توێژەرە فەرەنسییە گلەیی ئەوە لە سعودییە دەکات کە پێشتر هیچ هەوڵێکی نەداوە بۆ باشترکردنی وێنەی خۆی لە دەرەوە، سعودییە بەرپرسیارەتی ئەو وێنەیەی بۆ بزنس مانەکانو بازرگانانی پترۆڵو چەك جێهێشتووە، هەروەها پەیوەندی لەگەڵ ڕۆشنبیرانی ئەوروپا یاخود ئەمریکا نەبەستووە، لەبەر ئەوە کاتێ کار لەکار دەترازێ، هیچ ڕۆشنبیرێکی ڕۆژئاوا هەوڵنادات بەرگری لێبکات. لەڕاستیدا بەرپرسانی سعودییە لەو بڕوایەدابوون جیهان پێویستی بە شانشینی دەوڵەمەند بە نەوت هەیە، بەلاَم شانشین پێویستی بە جیهان نییە، ئەمەش هەڵەیەك بوو نەدەبا تێیکەوتنایە. وەلێ بەرپرسانی سعودییە دوای 11 سێپتێمبەر، هەستیان کرد پێویستییان بەوەیە بەسەر جیهاندا بکرێنەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی ئەو وێنە زۆر نێگەتیڤەی لەسەریانە ڕاستکەنەوە. ئەو وێنەیەش ئەو وێنەیەیە کە میدیاکانی ڕاگەیاندن لە ڕۆژئاواو لەسەر ئاستێکی فراوانو بەو پێودانگەی شانشینی سعودییە ئەو وڵاتەیە تیرۆرستان هەڵدەهێنێ، بلاَویانکردۆتەوە، واتە وڵاتی فێندەمێنتالیزمو دەمارگیر. لەوانەیە ئەم کتێبە یەکەم کتێب بێت بەرگری لە وێنەیەکی مەعقولو پۆزەتیف لەسەر شانشینی عەرەبی سعودییە بکات. لە واقیعدا دانەری ئەم کتێبە "باسکال مینۆری" زۆرجار ڕەخنەی لە کتێبێکی پێشتر گرتووە کە ناوی سعودییەی زڕانەدووەو ناوبانگی لەکەدارکردووە، ئەو کتێبەش توێژەرێکی فەرەنسی بە ناوی "لۆران مۆراویك" نوسیویەتی کە پسپۆڕەو لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئیش دەکاتو پەیوەندی بە پنتاگۆنو "ریشارد بێرل"و کۆنزێرڤاتیفە تازەکانو ئەو ناوەندانەوە هەیە نەیاری سعودییەن. دەکرێ ئەم کتێبە نوێیەی "باسکال مینۆری" وەك وەلاَمدانەوەیەك بۆ کتێبەکەی "لۆران مۆراویك" تەماشای بکەین کە پێدەچێ بەرپرسانی سعودییەی زۆر ناڕەحەت کردبێ، بگرە تێبینی دەکەین "باسکال مینۆری" لەم کتێبەیدا هێرش دەکاتە سەر زۆربەی ئەو کتێبانەی لە فەرەنسادا دەربارەی سعودیە بلاَوکراونەتەوە، "باسکال مینۆری" پێیوایە ئەو کتێبانە پڕن لە بڕیارو ئەحکامی پێشوەختو کلێشەی سادەو ساکاری نەیار بە سعودییە، نمونە بۆ ئەو جۆرە کتێبانە، ئەمانەی خوارەوەیە:

1-کتێبی (دورگەی عەرەبی لانکەی فێندەمێنتالیزمی ئاینی، تۆڕە دەمارگیرو مەشقپێکراوەکانە کە لەلایەن شانشینی ئال سعودەوە کۆمەك دەکرێن، نوسینی "کلۆد فۆییە"ی توێژەر، لە بلاَوکراوەکانی فافر، لۆزان، سویسرا، 2001.

2-کتێبی (شانشینی عەرەبی سعودی لە قەفەزی تۆمەتباریدا)، نوسینی توێژەرو ڕۆژنامەنوسی لوبنانی "ئەنتوان بەصبوص"، لە بلاَوکراوەکانی بیران، پاریس، 2002.

3-کتێبی (شانشینی عەرەبی سعودی، مەترسییەکی لەناکاو)، نوسینی "ستیڤان مارشان"ی توێژەر، فایار، پاریس 2003.

4-کتێبی (نەخۆشی ئیسلام)، نوسینی توێژەری تونسیو مامۆستای زانکۆ "عبدالوهاب المودب"، لە بلاَوکراوەکانی سوی، پاریس 2002.

جگە لەوانە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەنوس "ئەمیر تاهری" لەگەڵ "لۆران مۆراویك" لە گۆڤاری سیاسەتی دەولی ژمارە 98 لەژێر ئەم ناونیشانە: (شانشینی عەرەبی سعودییە، دوژمنی ژمارە یەك).

هەمو ئەو کتێبانەو زۆرێکی دیکە، وەك "باسکال مینۆری" دەڵێ بەجۆرێك بوونەتە هۆی

تێكدانی وێنەی سعودییە كە پێشتر شتی وا لەئارادا نەبووە. لەبەر ئەم هۆیەیە ئەو ئەم كتێبەی بڵاوكردوەتەوە تاكو وێنەیەكی تازادەیەك هاوسەنگ پێشكەش بكات. دانەر بۆ نوسینی ئەم كتێبەی پشتی بە مەنهەجەكانی زانستە مرۆڤایەتیی و كۆمەڵایەتیەكان بەستووە، هەربۆیە دەستپێكی كتێبەكەی بە توێژینەوە دەربارەی هەمو لایەنەكانی شانشینی سعودییە دەستپێدەكات، لایەنی جوگرافی، مێژویی، سیاسی، كۆمەڵایەتی، ئابوری، ئەمەش بۆ ئەوەی ڕوداوەكان بخاتەوە ناو چوارچێوەی سروشتی خۆیانو وا دیارنەبن لە سیاقی خۆیان دەرهێنرابن، وەك ئەوەی لێكۆڵینەوە ڕۆژنامەوانییە خێراو بەپەلەكان دەیكەن. دوای پێشەكییەكەی "فرانسوا بۆرگا" كە لە دەستپێكی كتێبەكەدایە، پێشەكی خودی نوسەرەكە دێتو دابەش دەبێت بۆ سێ بەش، یەكەمیان ئەم ناونیشانە لەخۆدەگرێ: چۆنیەتی تێپەڕاندنی لۆژیكی ئەمنی، بەو مانایەی ئێمەی توێژەرانی ڕۆژئاوا پێویستە لەسەرمان لە گۆشەنیگایەكی مرۆڤدۆستانەو كۆمەڵایەتییەوە تەماشای عەرەب بكەین، نەك تەنها لە گۆشەنیگایەكی ئەمنی، یان پۆلیسیو هەواڵگرییەوە تەماشایان بكەین، وەك ئەوەی لە دوای 11 سێپتێمبەرو لە ئێستادا ڕودەدات. دانەری كتێبەكە دەڵێ: عەرەب، وەك مرۆڤەكانی دیكە مرۆڤن، هەر هەموویان دڕندە نین یاخود فێندەمێنتاڵستی توندڕەو نین بیانەوێ ڕۆژئاوا وێران بكەنو بۆمب لە ناوەندە گەورەكانو كۆگاكاندا دابنێن، وەك ئەوەی میدیاكانی ئەمریكیو ئەوروپی پڕوپاگەندەی بۆ دەكەن، عەرەبیش ئێشو ئازارو قەیرانو گیروگرفتی خۆیان هەیەو پێویستە پێش ئەوەی حوكم بدەین بەسەریاندا، بەشێوەیەكی ڕاستو دروست لێیان تێبگەین.

دواتر دانەری كتێبەكە دەچێتە سەر پەرەگرافێك بەناونیشانی: (ئوسامە بن لادنو شانشینی عەرەبی سعودییە)، دانەر پێی سەیرە چۆن "بن لادن" لەسەر سعودییە حساب دەكرێ، لەكاتێكدا ئەوان ڕەگەزنامەی سعودییەیان لێوەرگرتوەتەوەو شاربەدەریان كردووە، بگرە سودانیشیان ناچاركرد لەسەر خاكەكەی دەریبكات، لێرەوە سعودییە بەرپرس نییە لە كارو تاوانەكانی. نوسەری كتێبەكە لە دوا پەرەگرافی پێشەكییەكەیدا بەجۆرێك سعودییە نیشاندەدا وەك ئەوەی لەلایەنی هێنانی تازەترین جۆری تەكنەلۆژیاو كەلوپەلی ئەوروپیو ئەمریكی، گەڕەكێك بێت لە گەڕەكەكانی ڕۆژئاوا. نوسەر هەروەها باس لە چاو تێبڕینی ئەمریكا دەكات لە سعودییە، هەر لە ساڵی 1920 كاتێ زانی سعودیە یەدەكێكی نەوتی خەیاڵی هەیە. لەبەرئەوە سەرۆك "ڕۆزفێڵت" ساڵی 1945 پەیماننامەی ژنهێنانێكی بەرژەوەندیخوازانەی لەگەڵ شا "عەبدالعزیز" مۆركرد، ئەم ژنهێنانەش تاكو ئێستا هەر بەردەوامە. پاشان دانەر دەڵێ سعودییە دوای 11 سێپتێمبەریش، هێشتا هەر هاوپەیمانێكی سەرەكی ئەمریكایە لە ناوچەكە، هەڵبەتە لەگەڵ ئیسرائیل. لێرەوە ئەوەی "مۆراویك"ی قین لەدڵ دەیڵێ ڕاست نییە، گوایە ئەمریكا دەستبەرداری سعودییە بووە یاخود هاوپەیمانییەكەی لەگەڵدا هەڵدەوەشێنێتەوە، یان دوای جەنگی عێراق جەنگ لەدژی ئەو بەرپادەكات.

دواتر "پاسكال مینۆری" دەڵێ ساڵی 1933 ساڵی كۆتایی هاتنی دەسەڵاتی بەریتانی بوو لە ناوچەكەو جێگرتنەوەی بە دەسەڵاتی ئەمریكی. دانەر گەرچی بەرگری لە سعودییە دەكات، بەڵام دان بەوەدا دەنێ كە بوونی ئەو هەموو ئامێرو تەكنەلۆژیا تازەو مۆدێرنەی لە سعودییە هەیە،

پێــچەوانەی بــەردەوامبونی ئــەو عەقڵیەتــە تەقلیدییە توندڕەوەی ئەوێیە. لێرەوە کێشەیەك هەیــە نــاکرێ نکــوڵی لێبکــرێ. لەبــەر ئەوەیــە ڕۆژئاواییەکان زۆریــان پــێ سەیرە سعودییەکان کەل‌وپــەل‌و کاڵایــەکی زۆر لەســەر شــێوازی ئــەورووپا ســەرف دەکــەن‌و هــەموو داهێنانــە مۆدێرنــەکان دەهێــنن، کەچــی لــە هــەمان کاتــدا بــــەهاکانی ڕۆژئــــاواو شارســــتانیەتەکەی ڕەتدەکەنـــەوە! ڕۆژئاواییـــەکان پێیانوایـــە ناکۆکیـــەکی مەترســـیدار هەیـــە لـــەنێوان ئامــادەبونێکی چــڕی مۆدێرنــەی مــاددی لــە سعودییە لەگــەڵ دەمــارگیری وەهــابی بــەربڵاو. هەروەها دەڵێن ئەم ناکۆکییە ترسێنەرەیە بووە هــۆی ڕودانــی تەقینــەوەکانی 11 ســێپتێمبەر. پاشــان دوژمنــەکانی ســعودییە دەڵــێن: گــەر ســـعودیە کەمـــەکێك هەوڵیبدایـــە فیکـــرو عەقڵییەتەکانی لە ڕێگەی پرۆسەی پەروەردەوە تـــازە بکردایەتـــەوە، ئـــەوا ئـــەم تەقینـــەوە تیرۆرستیانە ڕوینەدەدا. وەلێ دانەر بەرگری لە هەڵوێستی سعودییە دەکات‌و دەڵێ: سعودییە مــافی خۆیــەتی لــە مۆدێرنــەی ڕۆژئــاوا چــی بــە گونجاو دەزانێ وەریبگرێ‌و باقییەکەی دیکەی وەرنەگرێ‌و ڕەتیبکاتەوە، مۆدێرنەی سعودییە یان عەرەبی هیچ پێویست ناکات نوسخەیەکی فۆتۆکۆپی مۆدێرنــەی ئــەوروپی یــان ئــەمریکی بێت، بێگومان ئەم قسانە هەرگیز مانای ئەوە نییە ئیدانەی توندڕەوی ئاینی‌و تیرۆر نەکرێت، بەپێچەوانەوە.

دوای ئـــەو پێـــشەکییە گـــشتییە، تێبـــینی دەکەین کتێبەکە بۆ سێ بەشی بنەڕەتی‌و لەگەڵ کۆتاییەکدا دابەشبووە، هەر بەشەش بۆ چەند نەسکێك دابەشبووە. بۆ نمونە بەشی یەکەم بــاس لــە پێکهــاتنی شــوناس دەکــات، لێــرەدا دەبیــنین دانــەر بــاس لــە چــۆنیەتی پێکهــاتنی شوناسی سعودییە دەکات، پاشان ئەم پرسیارە دەخاتــەڕوو: ئایــا ڕاســتە مەســەلەی شوناســی نیشتیمانی مەسەلەیەکە زەحمەتە بێتەدی؟ ئەی ئەو فاکتەرانــە چــین لێناگــەڕێن ئــەو شوناســە نیشتیمانییە بێتەدی؟ تویژەر ئالێرەدا سەبارەت بــە مەســـەلەی جیــاوازی نێــوان بیابانن‍ــشین‌و شارنشین، یاخود جیاوازی نێوان سونەو شیعە، یان جیاوازی نێوان مۆدێرنەو تەقلید، یاخود جیــاوازی نێــوان ناوەنــد(نەجــد)و هەرێمــە پــشتگوێخراوەکانی دیکــە، ڕادەوەســتێت. لــە بەشــی دووەمــدا لەســەر پەیوەنــدی نێــوان دەسەڵات‌و ئۆپۆزسیۆن ڕادەوەستێت، لە بەشی سێیەمدا قسە لەسەر ئابوری‌و کۆمەڵگا دەکات.

ئایا ڕاستە ناکۆکی نێوان سونەو شیعە هەڕەشە لە یەکێتی سعودییە دەکات؟

ئاشکرایە تێزەکەی "مۆراویك" کە زۆر دژ بە سعودییەیە دەڵێ ئەم وڵاتە بە ڕاستی وڵاتێکی یــەك پارچــە نییــە، بــەڵکو پێکهاتەیــەکی دروستکراوە، بۆیە پێویستە بۆ چەند هەرێمێك دابەشبکرێت: هــەرێمی (ئەحسای ڕۆژهــەڵاتی شیعی)، هــەرێمی (حیجازی شافعی‌و سۆفی)، هــەرێمی (عەسیری یــومنی)، پاشــان هــەرێمی (نەجدی حەنبەلی، وەهابی). بەڵام "باسکال مینۆری" وەڵامی ئەم تێزە دەداتەوەو بەرگری لە سعودییەو یەکێتییەکەی دەکات‌و دەڵێ: ئایا دابەشبونی ئاینی لە سعودییە هیچ مانایەکی هەیە؟ پێویستە ئەوە بزانین ئەم وڵاتە بەشی هەرە زۆری سونەیە، بەڵام کەمایەتییەکی گرنگی شیعەی تێدایــە، ڕێــژەیان بــەگوێرەی ژمــارەی ســەرجەم دانیــشتوانی وڵاتەکــە لــەنێوان 5 بــۆ 10٪. خــودی ســونەکان بۆخۆیــان دابەشــبون بەسەر حەنابلەکان لە نەجد، شافعییەکان لەسەر کــەناری ڕۆژئــاوای دورگــەی عــەرەب. وەلــێ شانـــشینی عـــەرەبی ســـعودییە خـــۆی وا وەسفدەکات کە وڵاتێکی موسڵمانەو هیچیتر. نە ســونییەو نــە شــیعییەو نــە حەنبەلییــەو نــە

شـافعییه، بـەڵکو موسـڵمانە. لەگـەڵ هـەموو ئەوانەشدا "باسكال مینۆری" دان بەوەدا دەنێ کەمایەتییە ئاینییەکان لە ڕابردوداو لەلایەن حەنابلەو وەهابییەکانی نەجدەوە، دوچاری چەوساندنەوە هاتوون، پاشان دەڵێ: لە ڕابردودا ڕوخاندنی گۆڕەکان لە حیجازدا ڕوویداوە، هەروەها ڕوخاندنی مزگەوتەکانی شیعە لە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتدا ڕوویداوە، بەڵام لە ئێستادا ئەم کارە قەدەغەیەو دەسەڵات ڕێگەدەدات ڕێوڕەسمو سروتە شیعییەکان یاخود سۆفییەکان لە وڵاتدا ئەنجامبدرێن. ئەوە ڕاستە کاتێ لە ساڵی 1926 هەرێمی حیجاز خرایە سەر شانشینی سعودییە، حەنابلەکانی نەجد شافعییەکانی حیجازیان دەچەوساندەوە، بەڵام ئەم چەوساندنەوەیە زۆری نەخایاند، بگرە زۆر لەمێژە ڕاوەستاوە.

ئەوەی تایبەتە بە شیعەکان، مەسەلەیەکی ئاڵۆزترە، چونکە بە درێژایی مێژوو بەربەستێکی سایکۆلۆژی لەنێوان هەردوو لایەنی سونەو شیعەدا هەیە. بەڵام دوای هێوربونەوەی گروتینی شۆڕشی ئێرانو باشبونی پەیوەندییەکانی نێوان تارانو ڕیاز، مەسەلەکان گۆڕانێکی زۆریان بەسەردا هاتووەو بارودۆخی شیعە لە سعودییە لە جاران باشترە. ساڵی 1993 ڕێکەوتنێك لەنێوان سەرانی ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامی شیعی لەلایەك، لەگەڵ حکومەتی ڕیاز لەلایەکی دیکەوە مۆرکراو کەسێکی شیعی لە هەرێمی ڕۆژهەڵات لە ئەنجومەنی شورا دامەزرا. دواجار وەلی عەهد شازادە "عەبدوڵڵا" بۆ یەکەمجار لە 21 حوزەیرانی ساڵی 2003 دانی نا بە بوونی فرەیی مەزهەبی لە وڵاتدا، هەروەها لەگەڵیدا زاناکانی سونە لە نەجد دانیاننا بەو فرەییەدا. ئەمەش بڕیارێکی مێژووییەو پێشتر بڕیاری لەو شێوەیە مەحاڵ بوو. جگە لەوە لە سەرەتای ساڵی 1993 لە پرۆگرامەکانی خوێندن کە بڕیاری لەسەردرابوو لە قوتابخانەکانی سعودییەدا بخوێنرێت، ئەو قسە سوكو نابەجێو تۆمەتانە لابران کە دژ بە شیعە یان مەزهەبی شافعی بوون. لێرەوە ناکرێ بڵێین لە ئێستادا شیعەکان لە سعودییە دەچەوسێنرێنەوە، وەك ئەوەی پێشتر چەوسابونەوە. گومانی تێدانییە شیعەکان لە کۆمەڵگایەکدا زۆرینەی سونەن، جێ و ڕێیان خۆش نییەو پلەوپایەیان لە ئاستێکی بەرزدا نییە، وەلێ لە جاران باشترە. هەنوکە دەبینین سونەو شیعە تێکەڵ بەیەك دەبن، تەنانەت لە فەرمانگاکانی سەر بە دەسەڵاتو لە هەمان زانکۆکانو نوسینگەی ڕۆژنامەکانو شوێنانی دیکەش تێکەڵ بەیەك دەبن. بەڵام تاکو ئێستاش دیوارێکی سایکۆلۆژی لەنێوان هەردولادا هەیە، ئەو دیوارە وردە وردە ڕۆژێك دێ نامێنێ.

دواتر دانەر دەڵێ جیابونەوەی هەرێمی شیعی لە شانشینی سعودییە، چیتر ئەگەری ڕودانی نەماوە، ئەویش لەبەر ئەم هۆیە سادەیەی خوارەوە: ئەو هەرێمە شیعییە چیتر هەرێمێك نییە زۆرینەی دانیشتوانی شیعە بن، ئەم هەرێمە نەوتاوییە لە هەموو هەرێمو ناوچەکانی دیکەی سعودییەوە خەڵکی شەپۆل شەپۆل ڕوویان تێکردووەو تێیدا جێگیربوون، لێرەوە ئەو شەپۆلە زۆرانەی خەڵك بە تەواوی لەگەڵ یەکتردا تێکەڵبوون. ئەمەش شتێکە "مۆراویك"و زۆربەی ڕۆژنامەنوسانی ڕۆژئاوا لەبەرچاویان نەگرتووە.

### ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لە شانشینی عەرەبستانی سعودییەدا:

"باسكال مینۆری" لە کتێبەکەیدا چەندین لاپەڕەی دووردرێژ بۆ ئەم بابەتە تەرخان دەکات. ئەو پێیوایە لە پەنجاکانو شەستەکاندا

ئۆپۆزسیۆن ئۆپۆزسیۆنێکی نەتەوەیی عەرەبی بوو، واتە ناسری بوو، یاخود "مارکس"یزمی سۆشیالیزمی بووە، بەڵام لە ئێستادا زۆربەیان ئۆپۆزسیۆنێکی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامییە. ئەمە بەبێ ئەوەی ڕۆڵی ڕۆشنبیرە لیبرالییەکان لەبیر بکەین کە لە ئێستادا باڵێکی دیکەی ئۆپۆزسیۆن پێکدەهێنن، وەلێ ئەوانە ئەو دەستەبژێرە ڕۆشنبیرەن کە بەسەر ڕۆژئاوادا کراونەتەوە. لێرەوە ئەو دەستەبژێرە ڕۆشنبیرە بە پێوانە بە ئۆپۆزسیۆنی فێندەمێنتالیزم کە نوێنەری توێژێکی هێجگار بەرفراوانن لە شانشینی عەرەبی سعودییە، هێشتا هەر کەمینەن.

دواتر توێژەری فەرەنسی "باسکال مینۆری"بەردەوام دەبێ‌و دەڵێ: ئۆپۆزسیۆنی ئوسولی لە کۆتایی حەفتاکاندا دژ بە بنەماڵەی پاشایەتی کەوتنە جموجوڵ‌و سەردەرهێنان. لە سەرەتای سەدەی پازدەهەمی کۆچی‌و دروست لە 20 تشرینی دووەمی ساڵی 1979، دانیشتوانی (الحدیث) بە سەرکردایەتی "جەهیمان ئەلعەتێبی"و "محەمەد ئەلقەحتانی" هێرشە بەناوبانگەکەیان کردە سەر (المسجد الحرام) لە شاری مەکەی پیرۆز، ئەودەم حکومەتی سعودی لەپێناو شکستپێهێنانی هێرشەکەو لەناوبردنی یاخیبووەکان، ناچاربوو پەنابەرێتە بەر هێزەکانی فەرەنسا. ئاخۆ بیانوی ئەو دەستەیە دژ بە ڕژێمی ئەوسای سعودییە چی بووە؟ ئەوانە وتیان بنەماڵەی حوکمڕان بنەماڵەیەکی مادیی گەندەڵە، ملکەچی ڕۆژئاوایە. هەروەها داوایانکرد پیاوانی ئاینی سەربەخۆبن. لەو کاتەدا بنەماڵەی پاشایەتی پیاوانی ئاینییان بەکاردەهێنا بۆ ڕەوایەتیدان بە سیاسەت‌و ئەو بڕیارانەی دەریاندەکرد، پیاوانی ئاینی لەلایەن دەسەڵاتەوە ماڵیکرابوون. دواتر لە 27 تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا، ئاهەنگی شیعەکان بە یادکردنەوەی عاشورا دەستیپێکرد. دواتر لە سەرەتای ساڵی 1980 ڕاپەڕین دەستیپێکرد، هاوکات لەگەڵ ڕاپەڕیندا لە ناوچەی کێڵگە نەوتییەکان‌و زانکۆی دەمام، بە بەشداری کرێکاران‌و خوێندکاران مانگرتنەکان دەستیپێکرد. ئەودەم پاسەوانی نیشتیمانی سعودییە بە سەرۆکایەتی شازادە "عەبدوڵڵا" بەشێوەیەکی زۆر توند ئەو مانگرتنانەیان سەرکوتکرد. وەلێ بنەماڵەی حوکمڕان بۆ چارەسەرکردنی بارودۆخەکە، تەنها توندوتیژی بەکارنەهێنا، بەڵکو سیاسەتی چاکسازی‌و بەدەمەوەچوونی داواکاری دانیشتوانی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی بەکارهێنا. سیاسەتی سعودییە هەموکاتێ هەر بەمجۆرە بووە، واتە سیاسەتێکی دوولایەنەیە، لەلایەکەوە لێدان‌و سەرکوتکردن بەکاردەهێنێ، لەلایەکی دیکەوە پێشکەشکردنی یارمەتی مادیی‌و لەبەرچاوگرتنی داواکاری دانیشتوان‌و جێبەجێکردنیان، واتە بنەماڵەی حوکمڕان سیاسەتی تێڵاو گێزەری بەکاردەهێنا، نەك بە تەنها تێڵا. ئابەمجۆرە حکومەت دەستیکرد بە چاکردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی‌و ئابوری کەمایەتی شیعەو بەڵێنی دا لەپێناو نزیکبونەوەی سونەو شیعە لەیەکتر، کۆمەڵێ چاکسازی‌و ڕێوشوێنی پێویست بگرێتەبەر، گرتنەبەری ئەو ڕێوشوێنە پێویستانە تەنها دوای تێپەرینی 10 ساڵ بەسەر ئەو مێژووەی سەرەوەدا، ئەوسا بەرهەمەکەی دەرکەوت، واتە لە سەرەتای نەوەدەکاندا.

دواتر حکومەت بۆ یەکەمجارو لە ڕێگەی قەدەغەکردنی ڕۆشتنی کچانی سعودییە بە مەبەستی خوێندن بۆ دەرەوەی وڵات، یاخود قەدەغەکردنی دەرکەوتنیان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە، کۆمەڵێ تەنازولاتی پێشکەشی بە بزوتنەوە ئیسلامییەکان کرد.

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران‌و گەشەکردنی بزوتنەوە فێندەمێنتالیزمەکان لە هەموو لایەکی جیهانی عەرەبی‌و ئیسلامیدا، دەسەڵات‌و قەڵەمڕەوی بزوتنەوە ئیسلامییەکان لە سعودییە زیادیکردو تادەهات هەڵدەکشا. لە ساڵی 1987 گەنجێکی ڕۆشنبیر بەناوی "سەعید ئەلغامری"لە (عەسیر) کاسێتێکی تۆمارکراوی بڵاوکردەوە کە تێیدا ئیدانەی بزوتنەوەی تازەگەری لە سعودییە دەکات، ئەم کاسێتە بەخێرایی بروسك لەهەموو لایەکی سعودییەدا بڵاوبوەوەو بە ملیۆنان دانەی لێ چاپکرا. دوای "سەعید ئەلغامری"، شێخ "عەواد ئەلقەرنی" کتێبێکی بەناونیشانی (تازەگەری لە تەرازوی ئیسلامدا) بڵاوکردەوە، تێیدا ڕۆشنبیرانی تازەگەری بەوە تۆمەتبارکرد لەژێرەوە دەستیان لەگەڵ دامودەزگاکانی دەسەڵاتدا تێکەڵکردووە، بەتایبەتی دەزگاکانی ڕۆژنامەگەری، ئەمەش لەبەرخاتری ئەوەی دەستبگرن بەسەر دەسەڵاتی فیکری‌و ئایدۆلۆژی وڵاتدا، ئەم شێخە لەمبارەیەوە دەڵێ: ئەو ڕۆشنبیرانە بریتین لە کەمینەیەکی بچوك کە لە ڕۆژئاوا خوێندویانەو کەوتونەتە ژێر کاریگەری ئەوان‌و دەیانەوێ شێوازی شارستانیەتی ڕۆژئاوا بەسەر ئێمەشدا بسەپێنن...ئەمەیە ئێمە ڕێگەی پێنادەین.

دواتر ناوی دوو شێخی دیکە دەستیان بە دەرکەوتن‌و درەوشانەوە کرد، ئەوانیش شێخ "سەلمان ئەلعەودە"و "سەفەر ئەلحەوالی"بوون، ئەم دوانە هاتنە ناو گۆڕەپانی جەنگی ئایدۆلۆژیا لە دژی ڕۆشنبیرە لیبرالییەکان. بەم شێوەیە تەڵاق لەنێوان ڕەوتی فێندەمێنتالیزم‌و ڕەوتی تازەگەری لە شانشینی عەرەبی سعودییە ڕویدا، ئیدی ئەم پرسیارەی خوارەوە هاتەئارا: ئایا پێویستە تازەگەری ئەسلەمە (بەئیسلامیکردن) بکرێ، یاخود ئیسلام تازەبکرێتەوە؟ لێرەوە تازەگەری هاوردە لە ڕۆژئاواوە خرایە قەفەزی تۆمەتبارکردنەوە.

دواتر دانەر بەردەوام دەبێ‌و دەڵێ: بەڵام بزاوتی ئیسلامی لە سعودییە بۆ دووبەش دابەش دەبێ: بەشێکی میانڕەو کە لەژێر کاریگەری بزوتنەوەی ئیخوان موسلمینی میسریدایە، بەشێکی جیهادی توندڕەو کە بۆ گۆڕینی بارودۆخەکە بانگەشەی توندوتیژی‌و بەکارهێنانی هێز دەکات. لێرەوە نابێ هەردوکیان تێکەڵ بە یەکبکەین، وەك ئەوەی میدیاکانی ڕاگەیاندن لە ڕۆژئاوا دەیکەن. چونکە هەمو فێندەمێنتالیستەکان تیرۆریست نین‌و، هەموو موسڵمانەکانیش فێندەمێنتالیست نین. لە ڕاستیدا خودی بنەماڵەی حوکمڕان، ئەوانیش بۆ دوو بەش دابەشبوون، بەشێکیان لە فێندەمینتالیستەکانەوە نزیکن، بەشەکەی دیکەیان لە ڕۆشنبیرە لیبرالەکانەوە نزیکن کە لە زانکۆکانی ڕۆژئاوادا خوێندویانە. لێرەوە وێنەی ئەم بنەماڵەیەش هاوشێوەی وێنەی خودی کۆمەڵگای سعودییەیە. ئەو جیابونەوانەی لە کۆمەڵگادا ڕودەدەن، هەمان ئەو جیابونەوانەیە کە لەبنەماڵەدا ڕودەدەن.

دوای جەنگی کەنداوی دووەم لە ساڵی 1990، هێرش‌و پەلاماری بزوتنەوە فێندەمێنتالیزمەکان بۆسەر دەوڵەت‌و بۆسەر بنەماڵەی حوکمڕان زیاتربوو. بۆ یەکەمجار شێخەکان سڵیان لەوە نەکردەوە دەوڵەت بە بەکرێگیراوی ئەمریکاو خائین دابنێن، چونکە دەوڵەت بۆ ڕوبەڕوبونەوەی "سەدام حسێن" پەنایان بردەبەر ژمارەیەکی هێجار زۆری هێزەکانی ئەمریکا، ئەو شێخانە وتیان: دەوڵەت لەنێوان ساڵانی 1975–1995 بڕی 275ملیار

دۆلاری بۆ کڕینی چەك خەرجکردووە، ئیتر بۆچی ناتوانێ خۆی بەرگری لەخۆی بکات، ئەی بۆچی ئەم هەموو پارەیەی خەرجکردووە؟ هەر هەموو ئەو پارەیەش چووەتە گیرفانی کۆمپانیا ئەمریکی و ئینگلیزییەکان. لەسەرو ئەوانەشەوە سعودییە لە جەنگی کەنداوی دووەم بڕی 70 ملیار دۆلاری بەخشییە ئەمریکا، ئەم بڕە پارەیە پشکی سعودییە بوو لە تەکالیفی خەرجی جەنگەکە. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا شا "فەهد" تواني فەتوایەکی شەرعی لە زانا ئایینییە ڕەسمییەکان کە سەربە دەسەلاتن وەبگرێت، تاکو ڕێگەبدەن بەهێنانی هێزی بیانی بۆ سەر خاکی سعودییە. ئەمە ئەو پوشە بوو پشتی حوشترەکەی شکاندو ئاگری یاخیبونی لە نێوەندی پیاوانی ئاینی ناڕەسمی هەڵگیرساند. ئیدی لە مانگی ئایاری ساڵی 1991 ئۆپۆزسیۆنی ئوسوڵی بەسەرۆکایەتی شێخ "سەفەر ئەلحەوالی" و شێخ "سەلمان ئەلعۆدە" و شێخ "ناسر ئەلعمر" بەیاننامەیەکیان بەناوی (کتێبی داواکارییەکان) دەرکردو ئاراستەی خودی شا "فەهد"یان کرد، بگرە تەنانەت موفتی گەورەی شانشینی سعودییە "عەبدولعەزیز بن باز"یش بەیاننامەکەی واژۆکرد، هەروەها 52 کەسایەتی فێندەمێنتالیستی دیکەش هەمان بەیاننامەیان واژۆکرد. لە هەمانکاتدا یاخود کەمەکێك پێشتر، 43 ڕۆشنبیری عەلمانی بەیاننامەیەکی هاوشێوەی ئەو بەیاننامەیەی ئەوانیان دەرکردو ئاراستەی شا "فەهد"یان کرد، تێیدا داوای ئەنجامدانی چاکسازییان دەکرد لە وڵاتدا، وەك دامەزراندنی ئەنجومەنی شورا، سەرلەنوێ کردنەوەی ئەنجومەنی شارەوانییەکان کە پێشتر لە وڵاتدا هەبوون، یاخود لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا لە حیجازدا هەبووە، هەروەها داوایانکرد سیستمی داد تازەبکرێتەوە، ئازادییەکی گەورەتر بدرێت بە ڕۆژنامەگەری، باشترکردنی پۆلیسی مەدەنی، بەشداریکردنی زیاتری ئافرەتان لە ژیانی گشتیدا. هەر هەموو ئەوانەش لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا ئەنجامبدرێ کە لەلایەن شەریعەتی ئیسلامەوە دیاریکراوە.

لەڕاستیدا داواکاری فێندەمینتالیستەکان لەزۆر خاڵدا لەگەڵ داواکاری عەلمانییەکان یەکیاندەگرتەوە، چونکە ئەوانیش دوایان کرد ئەنجومەنێکی سەربەخۆ بۆ شورا دابمەزرێ و دووربێ لە هەموو فشارێکی ڕەسمی، تاکو کارنەکاتە سەر بەرپرسیارەتییە ڕاستەقینەکانی، هەروەها داوایانکرد حکومەتێ لە شارەزایان پێکبهێنرێ، یەکسانی لە مافەکاندا هەبێت، ڕێزی کەرامەتی مرۆڤ بگیرێ، هەروەها داوای بەرپرسیاربونی حاکمەکانیان کرد، واتە بتوانرێ لێپێچنەوەیان لەگەڵدا بکرێ، ئاشکرایە بەشێك لەو حاکمانە سەر بە بنەماڵەی حوکمڕان بوون. هەروەها داوایانکرد سامانی نەوت بەشێوەیەکی یەکسان و دادپەروەرانە بەسەر میللەتدا دابەشبکرێ. داوایانکرد سوپا تازەبکرێتەوە تاکو بتوانێ بەرگری لە نیشتیمان بکات. چاککردنی میدیا و هۆیەکانی ڕاگەیاندن و دابینکردنی ئازادی بیروڕادەربڕین، لەگەڵ پابەندبون بە ڕێزگرتن لە شەریعەت. دوایانکرد چاکسازی لە سیاسەتی دەرەوەدا بکرێ و چیتر شانشینی عەرەبی سعودییە پاشکۆی ئەمریکا نەبێت، دواجار داوای چاکردنی دەزگای (قەزا)یان کرد. حکومەت وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی، وەلامی ئەم هەڵچونە میللیی و خۆپیشاندان و دەرکردنی بەیاننامەو داواکارییانەی بە گرتنەبەری سیاسەتێکی دوولایەنە دایەوە. ئەوەش هەمان ئەو سیاسەتەیە لە پەنجاکان و شەستەکاندا

لەبەرامبەر هەر یاخیبونێکی میللی گرتبویەبەر. وەڵامدانەوەکە لەلایەکەوە وەڵامدانەوەیەکی پۆلیسی سەرکوتکەرانەبوو، لەلایەن وەزارەتی ناوخۆوە دەستکرا بە چاودێریکردنێکی توندو وردی مزگەوتەکان‌و دەستگیرکردنی هەزاران کەس لە یاخیبووەکان لەنێوان ساڵانی 1992-1994. لەلایەکی دیکەوە بەدەم جێبەجێکردنی هەندێ لە داواکارییەکانەوە چوو، لەوانە دامەزراندنی ئەنجومەنی شورا. بەڵام ئەوە بەلای ئۆپۆزسیۆنەوە بەس نەبوو، بۆیە لە ساڵی 1993 بەسەرۆکایەتی "عەبدوڵڵا ئەلمەسعەری"و "عەبدوڵڵا ئەلتەویجری"و ژمارەیەك لە هاوڕێکانیان، لە سعودییە لیژنەیەکیان بۆ بەرگریکردن لە مافە شەرعییەکان پێکهێنا. ئەم لیژنەیە لە ڕێگەی ڕادیۆی (*BBC*) بەریتانییەوە، لە ڕۆژئاوا ناوبانگێکی باشی پەیداکرد، بۆیە حکومەتی سعودییە کاروباری لیژنەکەی لە سعودییە قەدەغە کرد. دوای ئەو قەدەغەکردنە، لیژنەکە ساڵی 1994 بە سەرۆکایەتی "محەمەد ئەلمسعەری"و "سەعد ئەلفقییە" گواستییەوە بۆ لەندەن.

**11 سێپتێمبەرو ڕەنگدانەوەی لەسەر ناوخۆی سعودییە:**

دوای 11 سێپتێمبەر شتێکی تاڕادەیەك پێچەوانە ڕویدا. چیتر ئۆپۆزسیۆنی فێندەمێنتالیزم وەك ئۆپۆزسیۆنێکی هێرشبەر نەمایەوە، بەڵکو دەوڵەت‌و ڕۆشنبیرانی تازەگەر، ئەوان بوون دەستیانکرد بە هێرش کردنە سەر فێندەمێنتالیستەکان، چونکە ئەوە فێندەمێنتالیستەکان بوون تیرۆرستەکانیان بەرهەمهێناو وێنەی شانشینی عەرەبی سعودییەو ئیسلامیان لە دەرەوە شێواند. ئیدی لەو کاتەوە بانگەوازی چاکسازی بە هۆی فشاری ڕۆژئاواوە یاخود بەهۆی فشاری ڕۆشنبیرانی تازەگەر لەناوەوە یان بەهۆی فشاری هەردوکیان پێکەوە، ئاراستەیەکی پێچەوانەی دیکەی وەرگرت. لەو کاتەوە دەستکرا بە قسەکردن لەسەر پێویستی چاکردنی پرۆگرامەکانی خوێندن لە قوتابخانەو زانکۆکانی سعودییە، چونکە بابەتی ئاین لە پرۆگرامەکانی خوێندندا پێگەیەکی فراوانی داگیرکردبوو. جگە لەوە زۆربەی جار ناوەڕۆکی وانە ئاینییەکان ناوەڕۆکێکی دوژمنکارانە بوو بەرامبەر بە ئاینەکانی دیکەی وەك مەسیحی‌و جوولەکەو بەشێوەیەکی گشتی بەرامبەر بە شارستانیەتی ڕۆژئاوا، چیتر نەدەکرا ئەم بارودۆخە بەو شێوەیە بەردەوام بێت. هەروەها ڕیفۆرمخوازەکان داوایان کرد خوتبەکانی ڕۆژانی هەینی تازەبکرێنەوە کە پڕە لە بانگەشەی دنەدان‌و هەندێجار سوکایەتی پێکردن. ئەودەم کۆمەڵێ لە ڕۆشنبیرە گەنجەکانی سعودییە هەستان بە دامەزراندنی ڕۆژنامەیەکی لیبرالی تازەگەر بەناوی (الوطن). ئەم ڕۆژنامەیە لە هێرشکردنە سەر فێندەمێنتالیستە دەمارگیرو توندڕەوەکان‌و پیاوانی ئاینی درێخییان نەدەکرد، یەکێك لەو ڕۆشنبیرانە "عادل ئەلجبیر" بوو کە ڕاوێژکاری دبلۆماسی وەلی عەهد بوو.

لێرەوە میدیاکانی سعودییە هەوڵیاندا مونافەسەی کەناڵی (الجزيرة)ی قەتەری بکەن کە دەرگای بەرنامەکانی لەسەر گفتوگۆی ئازاد واڵاکردبوو. هەروەها باسی ئەو بابەتانەشی دەکرد کە لە کۆمەڵگای عەربی‌و ئیسلامیدا قەدەغەن یاخود چەپێنرابون. هەر ئەم شتەیە وایکردووە کەناڵی (الجزيرة) ئەم هەموو سەرکەوتنە بەدەستبێنێت‌و لە ئۆقیانوسەوە بۆ کەنداوی عەرەبی بینەرێکی زۆر لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە، ئەمە ئیرەیی سعودییەکانی وروژاند.

بەم شێوەیەو بۆ یەکەمجار ڕەخنە لەخۆگرتن لە میدیاکانی سعودییە دەرکەوتو شنەبای ئازادی بەسەریدا هەڵیکرد. چیتر ڕەخنەگرتن تەنها دژی ئەمریکاو ڕۆژئاوا ئاراستە نەدەکرا، بەڵکو دژ بە خـــودی خۆشـــیان ئاراســـتە دەکـــرا. دژ بـــە تێگەیـــشتنی هەڵـــە لـــە ئـــاینو دژ بـــە فێندەمێنتالیـــستە جیهادییـــەکان ئاراســـتە دەکـــرا کـــە بەئاشـــکرا بانگەشـــەی توندوتیژیان دەکرد.

لەو کاتەوە شازادە "عەبدوڵڵا" دەرکی بەوە کرد شانشینی سعودییە تەنها ئەو کاتە لەم نەهامەتییە ڕزگاری دەبیٚ کە ڕەوتی جیهادی جڵەو بکات، بگرە گەر مەسەلەکە پێویستی کرد لەگەڵیاندا بکەوێتە جەنگەوە. هەر ئەمەشە لە ئێـــستادا ڕودەدات. لەڕاســـتیدا شـــازادە "عەبـــدوڵڵا" خـــۆی لـــەنێوان دوو مەســـەلەدا بینییەوە خۆشەکەیان تاڵە: یا ئەوەتا دەچێتە پاڵ توندڕەوەکانو ئەمریکا توڕە دەکات، یاخود ئەمریکا ڕازیدەکاتو لە توندڕەوەکان دەدات. پێدەچیٚ مەسەلەکەی بەلای چارەسەری دووەمدا شکاندبێتەوە. "بن لادن"و تاقمەکەی بوونەتە دەردو بەڵایەك بەسەر شانشینەوەو سەرچاوەی شێواندنی وێنەی سعودییەن لە دەرەوە. شازادە "عەبدوڵڵا" لە کۆبونەوەی بێروت چارەسەری ئاشـــتیانەی نێـــوان عـــەرەبو ئیـــسرائیلی پەســـەند کـــردو بەئاشـــکرا دەســـتی بـــۆ گـــەلی ئیـــسرائیلی درێـــژکرد، بەمـــەرجیٚ پاشەکشە لە زەوی و زارە عەرەبییەکان بکاتو بگەڕێتەوە بۆ سنوری ساڵی 1967، ئەمە یەکەمجار بوو سەرکردەیەکی سعودی ئاوا گەورە بەشێوەیەکی ڕوونو ئاشکرا ناوی گەلی ئیسرائیل بێنێت.

دواجار دانەر کۆتایی بە قسەکانی دەهێنیٚو دەڵیٚ: ئەم شازادەیە کە دواتر دەبێت بە شا، لەوانەیـــە شـــەڕەکەی لـــە دژی تونـــدڕەوەکان بباتـــەوە، چـــونکە زۆرینـــەی ڕەوتـــی ئیسلامی لەگەڵ میانڕەوەکانن کە ڕازین بە زمـانی گفتوگـۆ، بـە پێـچەوانەی تاقمەکـەی "بن لادن" کە زمانی چەكو بۆمبو ئۆتۆمۆبێلی مینڕێـــژکراوو کـــردەوە خۆکوژییـــەکان بـــە شیاوتر دەزانن.

**تێبینی:**

ئەم وتارە سیٚ بەشە، ئێمە لێرەدا تەنها بەشی یەکەممان بڵاوکردۆتەوە.

**سەرچاوە:**

www.alawan.com 25/9/ 2007

# سەردەمی ڕۆشنگەری و
# سەرهەڵدانی فەلسەفەی فەردانیەت

د. مەهدی مەحفوز

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

شۆڕشـــی ئینگلیـــزی ســـاڵی 1688 و بڵاوبوونـــەوەی بەرهەمـــەکانی "جـــۆن لـــۆك"، کۆتـایی قۆناغێـك بـوون کـە ئینگلتـەرا تێیـدا فەلسەفەیەکی سیاسی ئاست بەرزی بە خۆیەوە بینی. لە پاش ئەمە قۆناغێکی مەنگ و بێدەنگ دەسـت پێـدەکات و فیکـری سیاسـی ئینگلیـزی خەسـڵەتێکی موحافیزکارانە وەردەگرێت، واتـە بەشـێوەیەکی گـشتی فیکـری سیاســی لـەو قۆناغـەدا قایـل دەبێـت بـەو هەلومەرجـەی کـە لەوڵاتدا هەیـە. هەرچـەندە سـستمی فـەرمانڕەوا خزمـەتی بەرژەوەندیـەکانی چـین و توێـژێکی دیـاریکراو دەکـرد و گەنـدەڵی هـەموو جێیـەکی تـەنی بـوو، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا سـستمی حوکمڕانی ئینگلیزی هەر بە سستمێکی لیبراڵ دەدرایـە قەڵـەم و لـەو سـستمی حوکمڕانیانـەی دیکـە چـاکتر بـوو کـە لـە وڵاتـانی دیکـەی ئەوروپپیدا هەبوون.

لێـرەوە و لـــە دەوروبـــەری کۆتاییـــەکانی سـەدەی حەڤدەهەمـەوە تـا بـەر لـە هەڵایـسانی شۆڕشـی فەرەنـسی، وڵاتـی فەرەنـسا لـەبری ئینگلتـەرا دەبێـت بـە مەڵبەنـدی تیۆریـای سیاسـی. ئەمـەش دەرەنجـامی سیاسـەتەکانی "لویـسی چواردەهەم" بـوو کـە لەسـەر ئاسـتی دەرەوە، وڵاتـی بـە چـۆکدا هێنـاو شـلۆقیەکی زۆریش ناوخۆی وڵاتی گرتەوە. کارێك کە وڵاتی گەیانـــدە قـــەیران و ئیفلاســـیەکی گـــەورە. فەیلەسوف و نوسەرانی فەرەنسا هەر تەنها بە چارەسەرکردنی کایەی سیاسیەوە دانەکەوتن، بـەڵکو ئاوڕیـان لـە بـواری کۆمەڵایـەتی و ئـابووریش دایـەوە. لێرەوەیـە کـە شۆڕشـی فەرەنسی لەیەك کاتدا بە شۆڕشێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیش دەدرێتە قەڵەم. ڕەخنە گرتن لە دەسـەڵاتی ڕەهـای فـەرمانڕەوا لـە فەرەنـسادا، پێویـستی بـە فەلـسەفەیەك هـەبوو، ئەوەشـی لـە

بەردەستدا بوو فەلسەفەی ئینگلیزی بوو. لەم سەرو بەندەدا بیر و بۆچوونەکانی "جۆن لۆك"، دەبنــە ئــەو بنەمایـــەی بزاوتـــی ڕۆشــنگەری فەرەنـــسی لـــە ســـەدەی هـــەژدەدا پـــشتی پێدەبەستێت. ئـەو پرانـسیپانەی ڕۆشـنگەری کـاری بـۆ دەکـرد زۆر ئاسـان و سـادە بـوو، بـۆ نموونە دەبێت یاسای سروشتی یاخود یاسای ئەقڵ ستایلێکی گونجاو و بەکەڵکیان بۆ ژیـان هـەبێت و کرۆکی ئەو یاسایەش بریتی بێت لە بەرژەوەنـدی کارەکتـەرێکی ڕۆشـنگەر، بـەڵام دەبێت بەرژەوەندی ئەو کارەکتەرە ببێتە مایەی خێری گشتی و ئاسودەیی بۆ هەموان. کەواتە حکومەت بۆیە هەیە، تا ئازادی و ئاسایش دابین بکـات و مـافی موڵکـداری و مافـەکانی دیکـە بـە هاوڵاتیـان ڕەوا ببینێـت. بـەم پێیـە پێویـستە ئامـانجی چاکسازی ئـەوە بێـت، حکومـەتێکی پەرلـەمانی بـەرپرس بێنێتـە ئـاراو ئاسـتێك بـۆ خراپـــــەکاری و ســــــتەمکاری دابنێـــــت و پاوانخوازیو مەحسوبیەت نەهێڵێت.

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین بزاوتی فیکری سیاسی فەرەنسی، زۆر جەختی لەسەر ئایـــدیای یاســـای سروشـــتی و مافـــە سروشـــتیەکانو بەرژەوەنـــدی تاکـــە کەســـی دەکـردەوە، بەمـەش بـرەوی زیـاتری بـە ئاقـاری فەردانیــەت دەدا. کەواتــە دەکرێــت بڵــێین لــە سەدەی هەژدەهەمدا، فەرەنسا بوو بە سەنتەری تیۆریـــای سیاســـی و لـــە مـــاوەی حـــوکمڕانی "لویـــسی چـــواردە"شـــدا کـــە حـــوکمڕانی پادشـــایەتی ڕەهـــا بـــوو گەیـــشتە ترۆپـــك. لەبەرئـەوەی سـی ساڵەی تەمـەنی حـوکمڕانی "لویـــسی چـــواردە"، قۆنـــاغی تێکـــچون و لەبەریەکهەڵوەشـانی هـەموو شتەکان بوو. دوای ئـەوەی فەرەنسا ماوەیـەك شـکۆمەندی لـە ڕوی سـەربازیەوە بەخۆیـەوە بـینی، "لـویس" کەوتـە هەڵەیـەکی گـەورە، کاتێـك خواسـت و ویـستی زۆری پاوانخوازانــەی، بوونــە مایــەی ئــەوەی هـەموو ئـەوروپا بەیـەك ڕیـز لـە دژی بوەستنەوە. پلانە پاوانخوازیەکانی بە شکستو سەر شۆڕی کۆتـایی هـات و تێچونی ئـەو لەشکرکێشیانەی، وڵاتـی بـەرەو ئیفلاسـی و مـاڵوێرانی بـرد. ئـەو بـــاجو ســـەرانە زۆرەی بەســـەر هاوڵاتیانـــدا سـەپاندی، وڵاتـی دوچـاری هـەژاری و قـات و قڕیـەکی گـەورە کـرد. نـاڕەزایی دەربـڕین لـەو هەلومەرجـە هـەر بـە تـەنها هاوڵاتیـانی ئاسـایی نـەگرتبووەوە، بـەڵکو لای توێـژی خانـەدان و چینی ناوەڕاستیش هـەبوو، چـونکە ئـەمانیش دەســەڵاتی "لــویس"یــان بــە دوژمــنی خۆیــان دەزانـــی و وەك کۆســـپ و ڕێگرێـــك لەبـــەردەم گەشــەو بــەرەو پێشــچونی خۆیــان ســەیریان دەکـرد. گـرنگترین ئـەو شـتانەی لـە ژیـانی کۆمەڵایەتیـــدا بـــوو بوونەمایـــەی تـــوڕەییو ناڕەزایی کۆمەڵگەی فەرەنسی، ئەمانە بوون:

یەکەم: سستمی پلە و پایە دابەشکردن کە ناهەقیــەکی گــەورەی تێــدا بــوو بەرامبــەر بــە زۆرینــەی خــەڵك و کۆمــەڵگای کردبــوو بــە دوو بەشەوە. ئەمە وایکردبوو خانەدانەکان بەرزترین پلـە و پایـەی سـەربازی و مـەدەنی دەوڵـەت بـۆ خۆیان پـاوان بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا لە باجدان ببەخشرێن. هاوکات چەندین ماف و دەسکەوتی دیکەشـیان هـەبوو کـە پاشمـاوەی سـستمی فیودالیزم بوو، وەك: (مافی ڕاوشکار لە کێڵگە و بـاخ و باخـاتی هاوڵاتیانـدا و مـافی دادوەریکـردن لە نێوان جوتیاراندا و وەرگرتنی سەرانە لێیـان). ئـەم خانەدانانـە ئەگەرچـی وەك جـاران هـیچ ڕۆڵێکیـان نـەمابوو، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە دەوری کۆشـکی پاشـا لـە پـاریس و ڤێرسـای پاڵیـان لێـدابووەو ژیـانێکی پڕکـەیف و سـەفا دەژیان.

دووەم: کلێسا بوو بووە خاوەن سەروەت و سامانێکی بێشومار و موڵك و ماڵاتی کلێسا و

پیاوانی ئایینی لە باجدان بەخشرابوون. ئەم پارە بێشومارەش بۆ دەسگیرۆیکردنی هەژاران‌و کەسانی نەدار خەرج نەدەکرا، بەڵکو گەورە پیاوانی کڵێسا بۆ خۆیانیان خەرج دەکرد و وەك خانەدانەکان ژیانێکی پڕ عەیش و نۆشیان بەسەر دەبرد.

سێیەم: بێبەشکردنی خانەدانەکان لە دەسەڵاتی سیاسی. سەرەڕای ئەوەی خانەدانەکان ئەو هەموو دەسکەوتانەیان هەبوو، بەڵام پادشاکان هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوون، نەهێڵن خانەدانەکان هیچ پۆست و دەسەڵاتێکی سیاسی بگرنە دەست. ئەمەش وای لە زۆرێك لە خانەدانەکان کردبوو، بە هەموو شێوازێك خۆیان لە پادشا و دەست و دایەرەکەی نزیك بکەنەوە و پلان لە دژی یەکتری بگێڕن. سەرەنجام ئەمەش وایلێکردن ببنە نەیاری پادشا و دژایەتی دەسەڵاتی ڕەهای بکەن.

چوارەم: سستمی کشتوکاڵی هەلی ئەوەی بۆ جوتیارانی فەرەنسا نەدەڕەخساند تا سەرمایە کەڵەکە بکەن، ئەمەش بە پێچەوانەی ئینگلتەراوە بوو. لە فەرەنسا دەسەڵاتی خانەدانەکان و سستمی دارایی و باجدان، ڕێگەیان بە دروستبونی سەرمایەی گەورە نەدەدا.

پێنجەم: لەو سەردەمەدا سستمێکی ناڕەوای باجدان لە ئارەدا بوو، کە باری سەرشانی هاوڵاتیانی گران کردبوو. لەگەڵ زیادبوونی پێداویستیەکانی دەسەڵاتیش، باجیش زیادی دەکرد. ئەمە و سەرەڕای ئەوەی حکومەت بازرگانی خوێی بۆ خۆی پاوانکردبوو، هەموو هاوڵاتیانیشی ناچار کردبوو دەبێت بڕێکی دیاریکراوی لێبکڕن. تەنانەت ئەگەر پێویستیشیان نەبێت و خاوەنی قوتی ڕۆژانەش نەبن.

شەشەم: بە پێچەوانەی ئینگلتەراوە، لە فەرەنسا چینی ناوەند بەسەر شارەکاندا دابەش بوو بوون. ئەم چینە بە چاوی ڕقەوە سەیری خانەدان و پیاوانی کڵێسایان دەکرد و وەك کەسانی مشەخۆر دەیان دانە قەڵەم. کەسانێك کە دەسکەوتی کۆمەڵایەتی زۆریان خرابووە بەردەست و لە پێدانی باجیش بەخشرابوون. ئەندامانی چینی ناوەڕاست پێیان وابوو ئەم حاڵەتە کۆسپ لەبەردەم ئازادی کاری پیشەسازی و بازرگانیدا دروست دەکات. سەرەڕای ئەوەش ئەوان خۆیان بە شایستەتر دەزانی، بۆ ئەوەی ئەو دەسکەوتانەیان هەبێت و پۆستی باڵایان لە حکومەتدا پێبدرێت، لەبەرئەوەی ئەوان پێیان وابوو خاوەنی سامان‌و زانستێکی وان کە بۆ بەڕێوەبردنی حکومەت و ئیدارەدانی دەوڵەت پێویستن.

لە ناو ئەم هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و ئابوری‌و سیاسیەدا، لە فەرەنسا توێژێك لە نوسەران پەیدابوون، گۆڕین و لەبەریەك هەڵوەشانی ئەو سستمی حوکمڕانیەیان بە پێویست دەزانی کە لەسەر دەسەڵاتی ڕەها و ناعەدالەتی و گەندەڵی دامەزرابوو. لێرەوە ئابوریناسەکان ڕایانگەیاند کە چارەسەری قەیرانی ئابوری و لاوازی ئاستی بەرهەم هێنان، بە پێدانی ئازادی زیاتر و هەڵگرتنی کۆت و بەندەکانی سەر بواری پیشەسازی و بازرگانی دەکرێت، هاوکات سیاسەتمەدارەکان پێیان وابوو سستمی پلە و پایە بەخشینەوە و فەرمانڕەوایەتی ڕەها، پێچەوانەی پرانسیپەکانی برایەتی مرۆڤەکان و ئەو ڕێسایانەیە حکومەتەکان لەسەری دروست بوون، کە ئەویش دەستەبەرکردنی ئازادی و یەکسانی ئینسانەکانە. پێویستە تەواوی ئەو مافە سروشتیانە بدرێتەوە بە هاوڵاتیان، بۆ ئەوەی سستمی حوکمڕانی لەو وڵاتەو لەسەر

بنەمایەکی پتەو دروست بێت. لەم ڕووەوە نوسینەکانی "جۆن لۆك"، کاریگەری زۆری لەسەر کۆمەڵگەی فەرەنسی هەبوو، چ لەسەر خەڵکانی ئاسایی یان لەسەر بزنس مان و پارەدارەکان، یاخود لەسەر نوسەرانی سیاسی کە تیۆریاکەی "لۆك"یان بە پاڵپشتێك دەزانی بۆ نەهێشتنی ئەو هەلومەرجە نالەبارەی لە وڵاتدا هەبوو.

ڕەخنەگرتن لە حوکمڕانی ڕەها پێویستیەکی زۆری بە فەلسەفەیەك هەبوو، لەم سەروبەندەشدا فەلسەفەی ئینگلیزی لەسەردەمو ڕۆژگاری شۆڕشەکاندا، شتێکی حازر و بەردەست بوو. لە سەدەی حەڤدەهەمدا فەلسەفەی ئینگلیزی لە ئەوجی داهێنانی خۆیدا بوو، ئەمە لە کاتێکدا فەلسەفە و زانست لە فەرەنسادا کەم تا زۆر بەسەر خۆیاندا داخرابوون و لە دۆخی وەستاندا بوون. لە سەدەی هەژدەهەمیشدا فەلسەفەی "جۆن لۆك"و زانستەکانی "نیوتن"، هاتنە ئاراو بوونە بنەمایەك بۆ بۆچون و دنیا بینیە نوێیەکان. سەردەمی پادشایەتی ڕەها لە فەرەنسا، سەردەمێك کە سەرجەم ترادسیۆن و دامو دەزگا سیاسیەکانی پێش خۆی ڕامالّی، نەیتوانی بە فیعلی هیچ نمونەیەکی تازە پێشکەش بکات کە هاوشانی مۆدێلی سیاسی پەرلەمانی بێت لە ئینگلتەرا. نوسەرانی فەرەنسا بۆ دۆزینەوەی ڕێگای پێشکەوتن و ئەلتەرناتیڤێك بۆ حوکمڕانی ڕەها، نەیانتوانی پەنا بەرنە بەر ڕابردووی سیاسی وڵاتی خۆیان، لەبەرئەوە فیکر و سستمی سیاسی ئینگلیزیان کردە بنەمایەك بۆ دروستکردنی فەرەنسای نوێ.

وەك بەرەنجامێکی ڕاستەوخۆی بیرو بۆچوونەکانی "تۆماس هۆبس" و "جۆن لۆك"، ناوەڕۆکی یاسای سروشت بووبە بەرژەوەندی کارەکتەری ڕۆشنگەر، بەڵام بەو مەرجەی ئەو بەرژەوەندیە ببێتە مایەی خێر و خۆشی گشتی. لەگەڵ ئەم پرانسیپانەدا بۆچونێکی وا هاتە ئارا، کە حکومەت بۆ ئەوە دەبێت تا ئازادی و ئاسایش دەستەبەر بکات و هەموو ئەو شتانە مسۆگەر بکات کە دەبنە مایەی خۆشخوانی و کامەرانی تاکەکان. لێرەوە پێویستە ئامانجی ڕیفۆرمی سیاسیی ئەوە بێت کە حکومەتێکی بەرپرس بێنێتە ئاراو، ئەو حکومەتەش بکاتە حکومەتێکی پەرلەمانی و خراپەکاری و ستەمکاری نەهێڵێت و هەموو پاوانخوازی و پلەو پایە بەخشینەوەیەك یاساغ بکات. واتە دەبێت مەبەستی ڕیفۆرمی سیاسی، دروستکردنی کۆمەڵگەیەك بێت کە تیایدا توانا و چالاکی نواندنی تاکەکەس کلیلی دەسەڵات و بەدەست هێنانی پلە و پایە بێت.

هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری ناوخۆی فەرەنسا، لە پاڵ ئەو کاریگەریانەی زانستە سروشتیەکان دروستیانکردبوو، شوێن دەستیان لەسەر ئەو ڕێبازە تازەیەی فەرەنسای سەدەی هەژدەهەم دیاربوو، لەبەر ئەوە فیکری فەرەنسی بە تەواوەتی پشتی بەو فەلسەفەی یاسای سروشتیەی شۆڕش نەبەست، بەڵکو ڕەهەندێکی ئەقڵانی تازە و پێشکەوتوشی سەربار خست. کاریگەری زانستە سروشتیەکان و دۆزینەوەکانی لەم ڕووەوە گەورە و ئاشکرابوو.

خەسڵەتی سەرەکی فیکری کۆمەڵایەتی لەسەدەی هەژدەهەمدا، بڕوابوون بوو بەوەی کە مرۆڤ دەتوانێت پێشبکەوێت و بەختەوەربێت، ئەویش لە سایەی ڕێنماییەکانی ڕوناکی ئەقڵدا. بەهۆی هێز و توانای ئەقڵیشەوە، لەمڕۆ بەدواوە هیچ شتێك زەحمەت و دوورە دەست نییە و مرۆڤ دەتوانێت پێیان بگات. فەیلەسوفانی ئەو قۆناغە وەك چەکێك ڕەخنەی ئەقڵانیان

بـەکارهێنا، تـا ڕایبگەیـەنن کـە هـەموو خێـر و چاکەیەك لە ئازادیدایە. بەوپەڕی هوشیاریشەوە لـە هـەوڵی ئـەوەدا بـوون، بنـەبڕی تـەواوی ئـەو شـتانە بکـەن کـە ڕێگـرن لـەوەی تاکـە کـەس بەویستی خۆی ژیانی بگوزەرێنێت. لەم سیاقە گشتیەدا فیکـر بـیرو بۆچـونی نـوێی دەهێنایـە ئاراو، ئەمەش بووە مایـەی ئەوەی بەشێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ زەمینـە بـۆ شـۆڕش خـۆش بکـات، شۆڕشـێك کـە سـاڵی 1789 دەسـتی پێکـرد بـۆ تێکوپێکـدانی بنکـەو بارەگاکـانی پادشـایەتی ڕەهـا. کارێـك کـە وایکـرد، ئـەزمونی شۆڕشـی فەرەنسی ببێتـە قیبلـەگای زۆربـەی زۆری گـەلان لە خەباتیاندا بۆ ئازادی و سەرفرازی.

ئەڵبەتــە لێــرەدا نابێــت پێمــان وا بێــت فەیلەسـوفانی ئـەو سـەردەم و ڕۆژگـارە، کۆمەڵـە کەسانێکی کۆك و یەکگرتووبوون، کە هـەموویان وەکو یەك لە بیروبۆچونی تازەدا هاوبەش بـوون. چونکە ئەوەی "ڤۆڵتێر" دەیویست، زۆر جیـاواز بـوو لـەو نمونـە ئایدیالیانـەی "ڕۆسـۆ" باسـی دەکرد. هاوکات "هۆڵباخ" و "هلفتیۆس" لە زۆر بۆچـوندا لەگـەڵ "ڤـۆڵتێر"دا کـۆك و تـەبا بـوون، بـەلاّم بەرنامــە و میتــۆدی ئــەوان لەگــەڵ هــی "ڤــۆڵتێر"دا نــەدەگونجا. بۆیــە پێویــستە سەروەختێك بێینە سەر باسکردنی فەیلەسوف و بیریــارانی ئــەم قۆناغــە، بــە جیــا بــاس لــە هەریەکـەیان بکـەین، بـەلاّم بـەردەوام لـە هـەوڵی بەراوردکردنیانــدا بــین بــە یــەکتری. لێــرەوە هەوڵدەدەین لەم نەسکەدا کە تەرخانە بۆ باس و خواسی قوتابخانـەی فەردانیـەتی فەرەنسی، بە جیـا جیـا بـاس لـە هەریەکـە لـە "شـارل دی مۆنتــسکیۆ" و "ڤــۆڵتێر" و "هلفتیــۆس" و "هۆڵباخ" و "ڕۆسۆ" بکەین.

**سەرچاوە:**

الدكتور مهدي محفوظ: اتجاهات الفكر السياسي في العـصر الحـديث – المؤسـسة الجامعيـة للدراسـات و النشر و التوزيع، بيروت– الطبعة الثالثة، 2007.

# فایلی ژماره..

# ڕەخنەی ئەدەبی



- **رەخنەی ئەدەبی سەدەی بیستەم**

رۆبرت کان دیویس و لای فینك

له فارسییەوە: رێبین هەردی

- **زانستە مرۆڤایەتییەکان و رەخنەی ئەدەبی**

د.ئیبراهیم مەحمود خەلیل

له عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

- **ئەدەبو رەخنەی خۆرئاوایی لە چاخی رێنیسانسدا**

جۆرج پارفیت

له عەرەبییەوە: د. شاهۆ سەعید

- **ئاقارێکی نوێی رەخنەی ئەدەبی تیۆریای وەرگرتن یان سۆسیۆلۆژیای خوێندنەوە**
  **گفتوگۆیەك لەگەڵ "جاك لینهارت"**

سازدانی: هاشم سالّح

له عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

- **میراتی بێرێزکراوی سێرڤانتس**

میلان کۆندێرا

له فارسییەوە: رێبین هەردی

- **پرسیاری فەلسەفی لە گوتاری گێڕانەوەدا**
  **سەرەتایەکی تیۆریی دەربارەی فەلسەفەی ژانری رۆمان**

د. شاهۆ سەعید

# ڕەخنەی ئەدەبی سەدەی بیستەم

ڕۆبرت کان دیویس و لای فینك

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

ئەگەرچی سەدەی بیستەم هێشتا کۆتایی نەهاتووە، بەڵام ئاشکرایە لەرووی مێژوییەوە ڕەخنەی ئەدەبی ئەم سەدەیە بەشێکە لە مۆدێرنیزم یان کاردانەوەیە لەبەرامبەریدا. ئەم خاڵە بەو مانایە نیە کە کۆی ڕەخنە مۆدێرنەکان لەگەڵ یەکدا گونجاون و یەك بزوتنەوە پێکدەهێنن، یان دەکرێت کۆی ڕەخنەی مۆدێرن بۆ یەك بەرنامە کورتبکەینەوە. بەڵکو بەو مانایەیە کە دیاردەی کلتوریی مۆدێرنیزم بەڕادەیەك فراوانە و بەشی جیاوازی پێکەوە گرێدراوی هەیە، کە دەکرێت گۆڕانی مەزن بگرێتەوە. مۆدێرنیزم وەك بزوتنەوەیەکی ئەدەبی لە جیهانی ئەمەریکی–ئینگلیزیدا لە سەرەتاکانی سەدەی بیستدا و بە کاریگەری شیعری ڕەمزی بۆدلێر و مالارمە و ڤالری و کەسانی دی دەستی پێکرد. مۆدێرنیزم هەم ئەدەبیات و ڕەخنەی ئەدەبی دەگرێتەوە، هەم خاوەن دیدێکی ڕەخنەییە، یان باشترە بڵێم چەند دیدی پێکەوەبەستراوە کە بووە هۆی دەرکەوتنی گەورەترین نوسەران و ڕەخنەگرانی ئێمە. هەندێکجار دەگوترێت بزوتنەوەی مۆدێرنیزم بە کۆنڕاد و بتیس دەستی پێکرد. بەڵام کەسانی دی بڕوایان وایە ئەم بزوتنەوەیە بە ئاشکرا دیاردەی پاش جەنگی جیهانی یەکەمە کە چاپی ڕۆمانی ئولیسی جیمس جویس و وێرانە خاکی شیعری ئەلیوت لەساڵی 1922دا باشترین دەرکەوتنێتی. بە تەفسیرێك بزوتنەوەکە لە ناوەڕاستەکانی دەیەی 1930دا کۆتایی هات، هەندێك دەڵێن تا کۆتایهاتنی جەنگی جیهانی دوهەم بەردەوام بوو، و هەندێکیش وەك فردریك جیمسۆن گوتویانە ومنیش لەسەر هەمان بڕوام کە پۆستمۆدێرنیزمی هاوچەرخ، نوسخەیەکی گۆڕاوی مۆدێرنیزمە.

بەهەرحاڵ وتەکەی ڤیرجینیا وڵف لە ساڵی 1924دا "کە نزیك دیسامبەری 1910 کەسایەتی مرۆڤ گۆڕا"، بێگومان خاڵی لوتکەی مۆدێرنیزمە. ڤیرجینا وڵف رونیکردەوە کە

"سەرجەم پەیوەندیە مرۆییەکان گۆڕان- پەیوەندی نێوان ئاغا و خزمەتکاران، ژن و مێرد، باوکان و منالآن. هاوکات لەگەڵ گۆڕانی پەیوەندیە مرۆییەکاندا، کۆمەڵێك گۆڕان لە دینو رەفتار و سیاسەت و ئەدەبیاتیشدا رویداوە". دەیەیەك دوای ئەمە دی ئیچ لۆرانسیش وەك ڤیرجینا ولف تێڕوانینێکی رادیکالی بۆ تایبەتمەندی مرۆیی بەدەستەوەدا. لۆرانس لە نامەیەکدا بۆ پەخشکەرەکەی پاڵەوانی ژنی رۆمانی "رەنگین کەمان" بەمشێوەیە وەسفدەکات: "گرنگی بەو شتە نادەم کە ژن بەمانای ئاسایی وشەکە هەستی پێدەکات، چونکە پێویستی ئەمکارە ئەوەیە خودێك (ئیگۆ) هەبێت تا هەستی پێوە بکات. من لەبری ئەوەی تەماشی هەستی ژن لەدیدی مرۆییەوە بکەم، دەمەوێت بزانم کە ئەو وەك دیاردەیەك (یان وەك دەرکەوتی ئیرادەیەکی گەورەتر و نامرۆیی) چیە". لۆرانس وەك ولف و ئەلیوت تێڕوانینێکی دژ رۆمانتیك و دژ ئیمپرسۆنیزم بۆ کەسایەتی مرۆیی لە ئەدەبیاتدا پێشکەش دەکات، وەك ئەلیوت دەڵێت سەیری بابەتەکە لە دیدێکی ناشەخسیەوە دەکات و ئەدەبیات بەشێکی سوزداری نازانێت. تێڕوانینی ئەوان جەخت لەسەر شێوازەکانی ئەدەبیات و ئەزمون دەکات و نەك بەشێوەیەکی سنوردار لەسەر مانایەکی شەخسی و مرۆیی کە لەناویاندایە.

مۆدێرنیستەکان سەرەڕای سودوەرگرتن لە خوازەکانی گومبوون، ئاخر زەمان و سەرەتا تازەکان (ئەو خوازانەی کە بەجۆرێك لە مۆدێرنیزمدا رونکردنەوە و رەخنەکردنیان بەچاو بینراوە)و سەرەڕای ئاراستە سیاسیە گۆمانلێکراوەکان بە فاشیزم و زایۆنیزم، دەرگیری هەڵسەنگاندنی جدی سەرلەنوێی سنوردارێتیەکانی شێوازە ئەدەبیەکان و تواناکانی بۆ دۆزینەوەی ستاتیکایەکی تازە لە هونەردا بەشێوەیەکی گشتی بوون، ئەوان ئەگەرچی بەوردی بەدوای دۆزینەوەی شێوە تازەکانی مرۆڤبوون نەبوون، لایەنیکەم بەدوای پارادیمێکی تازەوە بوون بۆ پێشکەشکردنی بەرهەمهێنانی کلتوری سەدەی بیستەم. لێرەوە وەك "ئیرۆینگ بیبت" گوتویێتی هەموو ئاراستە خەیاڵی یا رۆمانسیەکان لەئەدەبیاتدا دەبێ وەك"سروشتگەریەکی سۆزداری" پەتی تەماشا بکرێت کە جیاوازیەکانی دنیای واقعی لەناودەبات و جیاوازییە کلتوریە گرنگەکان، فەرامۆشدەکات.


ئیلیۆت

بییت دەڵێت: "رۆحی مۆدێرن" لەحاڵەتی دەرکەوتنی جێگرێکدا بۆ "بێ بەندوباری" رۆمانسیەتی سەدەی نۆزدەهەمدایە، رۆحێکی "رەخنەگرانە و پۆزەتیڤ" رۆحێك کە ویلایەتی دەسەلآت و دەسەلآتدارێتی بەسەر شتەکاندا قبوڵناکات- "ببیت" تەنانەت خوازیاری جوڵەیەکی زیاتر بوو، جوڵەیەك لە رۆمانسیەتەوە کە وادەبنیرا کە "نەرم" و "نارەخنەگرانە"یە، بەرەو مۆدێرنیزمی "رەخنەگرانە" و توند. وەك هیوم بەڵگاندنی کرد ئەم گۆڕانە دەبێت بەرەو جۆری هاچەرخی هەستیاری کلاسیکی نوێ بڕوات، شێوازێك کە دەربڕینی وردە و هەستەکانی بەتەواوی رێکدەخات و کۆنترۆڵدەکات. بەکورتی "ببیت" و هیوم خوازیاری وازهێنانی تەواو لە

ڕۆمانسیەت و گۆڕانی هەستیاری وێنەیی و دژە ڕۆمانتیك و مۆدێرنی تازە دەرکەوتوو بوون.

لە وتەکانی ۆلف و ئەلیوتەوە وادێتە بەرچاو کە ئەم هەستیاریە بە خێرای خوازیاری تێپەڕانە لە جۆرێك ڕاکردن لە عەقڵ کە شاعیرانی ڕۆمانتیك ناویاننابوو خەیاڵ. ئەلیوت لە وتاری "نەریت و توانای فەردی" کاتێك وتەزای "ناشەخسی" بوونی هونەر ڕوندەکاتەوە، بەتەواوی دژی ڕۆمانسیەتە. مۆدێرنیستەکان لەبری" ئەوە، "وێناکردنیان" هەڵبژارد، زاراوەیەك کە کۆلریج بۆ دەربڕینی توانای بیرکردنەوەی مرۆیی و ئاشکراکردنی ئەو پەیوەندیە گرنگ و ئاڵۆزانەی کە لەناو ئەزمونەکان یان لەنێوانیاندا هەیە، بەکاردەهێنێت. هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئەم پەیوەندیانە، هەوڵدانێکی بێکۆتایی، بەڵام کردارێکی سنوردارە کە ئامانجی دۆزینەوەی شێوە وردەکان (وێنە جیاوازەکان و هاوشێوەکانێتی). مۆدێرنیستەکان ئەمو تەزایەیان لەبەر هۆی ئەبستۆلۆجی هەڵبژارد، بەتایبەتی بڕوایانوابوو کە هونەری مەزن دەرئەنجامی زانینێکە کە بەرهەمی جیاوازیە بەڵگەندراوەکان و دیدی عەقڵانی بێت. هیوم ئەم دیدەی بە کاریگەری شیعری "سەخت" و "وشك" ناونا. مەبەستی ئەوان لە "وشك" ئیبتزالی شیعر نەبوو، بەڵکو ئەوان بەدوای پێشکەشکردنی وشك و سەختی وێنە وردەکاندا نەبوون و دەیانویست زمان بەشێوەیەکی تەواو ڕێکخراو و کۆنترۆڵکراو بەکاربهێنن. ئامانجی ئەم وێنانە وەك وێناکانی ئەلیوت بۆ "جوتێك پەنجەی توند/ کە بە خێرایی بەسەر ڕوی دەریا بێدەنگەکاندا دەکشێت)ئەوەیە وێنەیەکی سەخت و ڕاستەوخۆ و بەش بە بەشی زانیاری هەستی بەدەستەوە بدات. ئەم وێنەیە وشکە، چونکە وابەستە نیە بە ئەو سۆزداریانەی لەپێشەوە دیاریکراوون، سۆزداریەك کە دەکرێ بخرێتە ناو تێکستەوە یان بەسەریدا بسەپێنرێت.

سەرەڕای ئەمە بە دروشمبوونی زمانی وشك و سەخت، پێویستیەك بە سەپاندنی سۆزەکان بەسەر تێکستدا نیە. چونکە تێکست خۆی لەشێوە گۆڕاویدا یان بەدەربڕینێکی تر لە گوتاری خۆیدا، سۆزداری تایبەتی خۆی بەرهەمدێنێت. ئەلیوت ئەم سۆزانە بە " سۆزی بونیادی" ناودەنێت و دەڵێت ئەم سۆزانە لەخودی تێکستەوە دورستدەبن. مەبەستی ئەلیوت ئەوەیە کە بەخوێندنەوەی شیعر، خوێنەر بەهۆی ڕێکخستنی وێنایی وێنەکانی شیعر، هەستی تایبەت لەخۆی پیشاندەدات. ئەم وێنانە لە تێکستدا دەبن بە هاوتای بابەتی (*objective correlative*) یان بەدواداهاتنی وێنەیی تایبەت و هاوتای سۆزی مرۆیین. لە ئەنجامی کاری خوێندنەوەدا، هەموو ئەو هەستانەی کە بۆ دۆزینەوەی سۆزێکی تایبەت دەردەکەون لە تێکستەوە بەردەهێنرێن (استنتاج). لەبەرئەمە دەتوانرێت بگوترێت ئەم سۆزە "لە" تێکستدا بوونی هەیە کە تێکست بەهۆی شکڵەوە بەوردی هەمان سۆز دەردەخات. بەکورتی کۆی ئەم ڕوداوانە لە وەرگرتنی وێنەکانەوە وەك هاوتای بابەتی بیگرە تا قبوڵکردنی کاریگەری "سۆزی بونیادی"، لەژێر کاریگەری تێکستدا ڕوودەدەن، بەدەربڕینێکی دی ئەم ئەزمونە، ئەزمونێکی شیعریە کە وەك ئەزمونێکی شەخسی ناچێتە ناو تێکستەوە، بەڵکو بەوردی لە پێکهاتە و بونیادی خودی تێکستەوە دروستدەبێت. ئەگەر بەمشێوەیە مۆدێرنیستەکان وێنایان لە خەیاڵکردنەوە بەباشتر دەزانی، بەمانای ئەوەیە کە بۆ بونیادی ستاتیکای تێکست کە لە وێنادا دەردەبڕێت، و بەکردەوە خودی تێکست بەرهەمی دێنێت،

گرنگیـەکی زیـاتری پێـدەدەن لـەو کاردانـەوە شەخسیترانەی کە خوێندنەوەی کەمتر وردی (یا شیعرێکی کەمتر وردی) دروستیان دەکات.

لێـــرەوە بۆتیکـــای مۆدێرنیـــستی وەك رونکردنـــەوەی وێنـــەیی کـــارکردنی شـــیعر، پرۆژەیـەك بـۆ هونـەر پێشکەش دەکاتکە لەگـەڵ نمـای فـروانتری دابـڕان و راکـردن لـە عـەقڵی سـەدەی بیـستدا دەگونجێـت. واتـە پرۆسـەی عـــەقڵانی وروژانـــدنی ســـۆزی بونیـــادی لـــە خوێنـەردا لەڕێگـەی وێنـە شـیعریەکانەوە لـە زەمەنێکـــدا روودەدات کـــە لـــە ناویـــدا پەیوەندیـــەکانی نێـــوان کلتـــوری رابـــردوو و کلتـوری ئـەمڕۆیی دابڕاوە.

ئـەم جیهانـە جیهانێکـە کـە بەهـــەر کـــارێکی هونـــەری تازە، دەگۆڕێت. لەروانگەی مۆدێرنیزمـــەوە سیـــستەم خـــاوەن هـــیچ جـــۆرە سـنورێکی سروشـتی یـان پـەیمانیی نیـە. ئـەو زەمینـە کلتوریەش کە خۆبەخۆ مانا بـە تێکـست دەبەخـشێت، بـوونی نیـە، هـیچ جـۆرە چارەنوسـێکی داڕێـژراویش نیـە کـە لەسـەر بناغەکـەی مێـژوو و دەرئەنجامـەکانی مانـا پەیـدا بکـەن، بەپێچەوانەوە ئەگەر کلتوری مۆدێرن میراتێکی درێـو نیە، بەوردی بەو مانایەیە کە باوەڕی بە پـرۆژە کلاسـیکیەکان وەك زنجیرەیـەکی مـەزنی پێکـەوە بەسـتراوی بـوون نیـە. پاونـد و ئـەلیوت بەشێوەیەکی تایبەتی باسی سیستەمە کلتوریە مەزنـەکان دەکـەن (زیهنـی ئـەوروپی، نـەریت و رابـــردوو..و هتـــد)، بـــەڵام ئـــەم سیـــستەمانە بەردەوام دروستکراوی تایبەتی مرۆیین کە هـەر شیعر و کلتورێك دەبێت بەجیا وێنایان بکات.

ئـــەلیوت جۆرێـــك تەســـلیمبوونی داهێنەرانـــە وەســـــفدەکات کـــــە لەرێگەیـــــەوە شـــــاعیر بەتواناکانیـــەوە مامەڵـــە بکـــات و لەئەنجامـــدا توانایەکی تازە بەناوی شیعرەوە دروستبێت، بۆ ئەوەی دواجار کلتورێکی "تازە" دروستببێت.

بـەکورتی مۆدێرنیـستەکان بڕوایـان وایـە شـێوازە شـیعریە تازەکـان، جیهانگـەلێکی تـازە دروســتدەکات، لەکاتێکــدا لــە ســەردەمەکانی رابردودا تەنها یەك جیهان هەبوو کە خودایەکی یـــــەکتا بـــــە مرۆڤایـــــەتی بەخـــــشیبوو. مۆدێرنیـستەکان بـە پـشتبەستن بـە بۆتیکـای "نـوێ" بـەدوای سـەلماندنی پێویـستی کلتـوری مـــۆدێرن و هەســـتیاریەکی هونەریـــەوە بـــوون کـــە شایستەی ژیانـە لـە قۆنـاغی کلتوری پاش رۆشنگەریدا. مێـــژوویی راکـــان دەبێـــت ســـەرنج لـــە تێڕوانینـــی مۆدێرنـستی بـۆ قـەیرانی هاوچـــەرخی بـــەهاکان و شێوازە هونەریـەکان بـدات. بەرنامـەی مۆدێرنیـستی بـۆ گەیـشتن بـە تێگەیـشتنێکی تـازە بـۆ شـێوازە ئـەدەبی و شـیعریەکان، کاریگەریـەکی راسـتەخۆی کـردە سـەر رەخنـەی ئـەوروپی و ئەمەریکاو ئینگلیزی.


جێمس جۆیس

### فۆرمالیزم:

یەکێك لە سەرنجراکێشترین و سەقامگیرترین رەهەنـدەکانی مـۆدێرنیزم، دیدێکـە لـە رەخنـەی ئەدەبیـدا کـە بـە فۆرمـالیزم ناودەبرێـت. ئـەم بزوتنەوە بەرفراوانە، ستاتیکا و ئەبستۆلۆجیای مۆدێرنیـــستی بـــەقوڵی قبـــوڵکرد و هەوڵیـــدا ئـەدەبیات نـەك بـە پـشتبەستن بـە نـاوەڕۆکێکی

تایبەتی یان "سروشت" یان "ڕەنگدانەوە"ی، بەڵکو بەردەوام بەهۆی شێوازەکەیەوە شیبکاتەوە. پرسیارەکە ئەوەیە کە شکڵ چۆن دروستدەبێت، و کاردەکات تا لە بنەڕەتدا مانایەك دروستبکات. جەختکردن لەسەر فۆرم لە ڕەخنەی ئەدەبیدا دوو بەکارهێنانی هەمەکی هەیە: (1) تێگەیشتن لە نمونەی دەرونی تێکست و چۆنێتی کارکردنی و (2) ناسینەوەی ئەو شتەی کە فۆرم دەستنیشانی دەکات، بەرهەمەکە سەر بەچ ژانرێکی ئەدەبی ڕۆمان یان بەرهەمێکی درامی یان سەر بە ژانرێکی دیە. لێرەوە فۆرمالیزم بەمانای فراوانی وشە، ئەدەبیات بە سیستەمێکی ئاڵۆزی فۆرمەکان دەزانێت کە دەکرێت هەریەکێکیان لە ئاستی جیاوازی هەمەکیدا و بە سەرنجدان لەیەکدی، شیبکرێتەوە..ئەو ئاستانەی کە لە شیکردنەوەی تایبەتمەندیەکانی وێنەی شیعریەوە دەست پێدەکات، بە تاوتوێکردنی بەیت درێژە دەکێشێت، تا بە دیارکردنی ژانری ئەو شیعرە بگات. بەکورتی فۆرمالیزم هەوڵدەدات دەربیخات ئەدەبیات لە مانای زاتی یان چیەتیەوە نەهاتووە، واتە ئەدەبیات لاسایکردنەوەی واقع نیە، بەڵکو لەو نمونە ڕێژەییانەوە هاتوون کە ژانر و بەرهەمێکی تایبەتدا، مانایان هەیە.

سەرەڕای فۆرمالیزمی روسی، ڕەخنەی نوێ کاریگەرترین جۆری ڕەخنەیە لە ئەمەریکاو ئینگلتەرەدا. بیروڕایەکی یەکتا لەبارەی ئەم بزوتنەوەیەوە نیە، بەڵام دەتوانین ئاماژە بۆ کۆمەڵێك ناوەڕۆکی سەرەکی بکەین کە ڕەخنەگرە گەورەکانی ئەمەریکی- ئینگلیزی لە کۆتاییەکانی 1920وە تا 1950 هێناویانەتە ئاراوە (قۆناغی گۆڕانی خێرای ڕەخنەی نوێ). ڕەخنەی نوێ بەشێوەیەکی تایبەت هەوڵیدا بە لابردنی "ناوەڕۆك" لە شیکردنەوەی ئەدەبیدا، بەرخوردێکی تایبەت لەگەڵ فۆرمی بەرهەمدا بکات، شێوەیەك کە زۆر لە شێوەی لێکۆڵینەوەی ئەزمونیانە دەچێت. ڕەخنەی نوێ هەوڵیدا فۆرمە پێکهاتەیەکان یان پانتایی ئەدەبی بەپێی ڕێکخستنی دەرونی بەرهەمەکانەوە دیاری بکات، ڕێکخستنێك کە بە شیکردنەوە تایبەتیەکان، واتە بە "خوێندنەوەی وردەوە" ئاشکرا دەبێت.

خاوەنانی ڕەخنەی نوێ، ئەدەبیات بە " دروستکراوێکی" پشتبەستوو بەخودیا بەوتەی جۆزیف فرانك بە "فۆرمێکی فەزایی" دەزانی، فۆرمیشیان بە ڕەگەزێکی "سەربەخۆ" دەبینی کە کلینت بروکس بە خوازەی "قاپی باش دروستکراو" دەربڕیوە. ڕەنگە گرنگترین ڕەهەندی ڕەخنەی نوی سودوەرگرتن بێت لە چەمکی وێنەکانی خەیاڵ بۆ پێناسەکردنی فۆرم. ڕەخنەگرانی نوێ وەك بروکس بە پشبەستنێکی تەواو بەرەخنەگرانی مۆدێرنیست وێنەی ئەدەبیان بە کەرەسەی سەرەتایی فۆرم وێنادەکرد. بۆ نمونە "خوێندنەوەی وردی شیعر" بەشێوەی ڕەخنەی نوێ، واتە لە سەرەتاوە دیاریکردنی ئەو وێنە کلیلیەکان لە زنجیرە نمونە دژەکاندا بان ئەوەی بروکس ناوی دەنێت "چنین" (*Tension*). تەنها کاتێك نمونەی وێنەکردن دیاریکرا، ئەوسا ڕەخنەگرانی نوێ دەست بە تەفسیری فۆرم یان مانای شیعر دەکەن و پاشان پارادۆکس و کنایە وەك پێداویستیەکانی کونترۆڵی چنین، دەهێننە ئاراوە. کاتێك ڕەخنەگرانی نوێ ڕێگەیان دا سود لە دوو چەمکی پارادۆکس و کنایە لە ڕەخنەی هەموو شێوەکانی شیعردا وەربگیرێت، بەدوای ئەوەوە بوون پارادۆکس و کنایە بکەنە جێگری شتێك کە ناوی ناوەڕۆکە. بەبڕوای بروکس پارادۆکس و کنایە لەبەرئەوە هێندە گرنگن، چونکە لەراستیدا بونیادی خودی

خەیاڵکردنەوە پیشاندەدەنەوە. بەڵگاندنەکەی برۆکس کە لەسەر بناغەی ستاتیکای کانتی دامەزراوە، بەسادەیی دەکرێت بەمشێوەیە دەربڕێت: لەو ڕووەوە کە شیعر زادەی خەیاڵە، کەوابوو دەبێت بونیادی خودی خەیاڵکردنەوە پیشان بداتەوە. ئەگەر بەشێوەیەکی خوازەیی تەماشای وتەزاکانی پارادۆکس و کنایە بکەین، تێدەگەین کە بونیاد یان "فۆرم" یەکێتیەکە لە ڕەگەزە ناکۆك و ناچونیەکەکان. لێرەوە ئەگەرچی ئەم وتەزایانە دەبوو بە فۆرمی شیعر بژمێرێن، لەراستیدا دەبن بە ناوەڕۆکی، چونکە گۆڕاوون بەمەرجەعی ئامانجی هەموو ئاماژەکانی مانا کە بەگشتی وێنەیین. لەم روانگەیەوە دەکرێت بگوترێت هەموو شیعرەکان لەو ڕووەوە خاوەن مانان کە ئاماژە بۆ ئەم نمونانە دەکەن یان ئەم نمونانە لەخۆ دەگرن.

ڕەخنەگرانی نوێ بڕوایان وایە دەکرێ بەرهەم بەشێوەیەکی بابەتی و ورد لەژێر تیشکی بونیاد یان بەفۆرمی واقی بزانین. لێرەوەیە کە بەرهەمێك دەتوانێت یەك ڕاڤەکردنی ڕاستی هەبێت. بۆ نمونە لە"هەڵەی مەبەستداری" ویمست و بردسلیدا، شێوەی خوێندنەوەی بەرهەمیان بەشێوەیەکی "دروست" ئاشکرا کردووە. ئەوان رونی دەکەنەوە کە کاتێك ئەگەری دەستێوەردان و ناوردبینی دێتە پێشێ کە مەبەست و ئامانجەکانی نوسەر لە "خوێندنەوەی ورد"دا سەرنجی لێبدرێت. ئەو خوێندنەوەیەی ئامانجی نوسەر لەبەرچاو دەگرێت، خوێندنەوەیەکی هەڵەیە. پاشان لە "هەڵەی سۆزداریدا" ئەوان جەمسەرێکی تری ئەم مەسەلەیە تاوتوێ دەکەن، واتە کاردانەوە "هەستی" و سۆزداری و ناپوختیەکانی خوێنەر بەرامبەر بە تێکست، ڕەنگە تەفسیر و تێگەیشتنی ڕاستی وێنەکان بشێوێنێت. دواجار ئەوان سەرلەنوێ لەپێشبوونی خودی وێنەکان بەبیردەهێننەوە. بەمشێوەیە ڕەخنەگرانی نوێ کە خۆیان هێندەی مۆدێرنیستەکان دژی ڕۆمانسیەتن، لە ڕۆمانسیەتەوە چەمکی هەمەکی ستاتیکا و یەکێتی بەرهەم و هەروەها ڕاڤەکردنی چونیەك یان یەکتایان وەرگرت. ئەوان بەڵگاندنیان کرد کە بەرهەمی هونەری زنجیرە چنینێك کە بۆ نمونە لە پارادۆکس و کنایەدا دەردەکەون، یەکێتی پێدەبەخشێت، و بڕوایان وایە ئەگەر بەرهەمێك دروست بخوێنرێتەوە، بەتەواوی هاوئاهەنگە.

### ڕەخنە لەنێوەی سەدەدا:

لەنێوەی سەدەدا بزوتنەوەی فۆرمالیستی بەسەر ڕەخنەی ئەوروپی و ئەمەریکیدا زاڵبوو: ڕەخنەی نوێ کە تاهەنوکە باسمانکردووە و نمونە فەڕەنسیەکی "تەفسیری تێکست". ئەم قوتابخانانە شێوەیەکی خوێندنەوەی وردیان پێشنیارکردو هەوڵیاندا تا زانیاریە فرەکانی تێکست وەك وێنە خەیاڵیەکان و نمونە وێنەییەکان و ریتم و دەنگ و ئاهەنگ و بونیادە سەرتاسەری، لە خوێندنەوەکەی خۆیاندا لەبەرچاو بگرن. هەریەك لەم شێوانە خۆیان بە کامڵ دەزانی و بڕوایان وابوو دەتوانن کۆی وردەکاریەکانی تێکستێك بەشێوەیەك بدۆزنەوەو دیاریبکەن کە لە گشتیبوون و بابەتیبوندا لە بینینە ئەزمونیەکانەوە نزیك بێت. بەهەرحاڵ لە کۆتاییەکانی دەیەی 1950دا لە ئەکادیمیای ئینگلیزی-ئەمەریکیدا گۆڕانی خێرای ڕەخنەی نوێ، بە ڕەخنەی وێنەی ئەزەلی کە لە بەرهەمەکانی کارل یۆنگی دەرونناسەوە هاتبوو، کۆتایی پێهات. ڕەخنەی وێنەی ئەزەلی بەخێرایی خۆی گەیاندە بایەخ و دەسەڵاتی ڕەخنەی نوێ.

ڕەخنـەی وێنـە ئـەزەلی سـەدی لـە هەنـدێك لایـەنی ڕەخنـەی نـوێ وەرگـرت بەتایبـەتی وتـەزاکانی وەك پـارادۆکس و کنایـە و پاشـان ڕاستەوخۆ لەو بەشانەدا کەوتە کار کە ڕەخنەی نـوێ یـان ئامـادە نـەبوو کاریـان تیابکـات، یـان لەمکارەدا شکستی هێنابوو، بەتایبەتی لـەبارەی پەیوەنـدی ئـەدەبیات بـەو بابەتانـەوە کـە لـــە"دەرەوەی" تێڕوانینـــی فۆرمالیـــستی تەسکبینانەدا بوون، دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە. ئـەم بەشـانە بوارەکـانی وەك "زیهـن" یـا دەروونناسـی تاکەکەسـی و مێـژوو و کلتـور دەگرێتـەوە، و تەنانـەت ئـەو پەیوەندیانـەش دەگرێتـەوە کـە لـەناو "دەرونـی" تێکستدایە، بـەڵام لـە هەمانکاتـدا لـە تێکـستە تایبەتـەکان سـەروتر دەڕوات- ئـەوەی نـۆرترۆپ فـرای بەتایبەتی بە "چوارچێوەی چەمکی" ئەدەبیاتی ناودەنێت- واتـە ڕێکخستنێکی فکری "تـەواو ڕێکخراو" یان سیستەمی ئەدەبیات کە شتێکی زیاترە لە "کۆمەڵێکی پەرشوبڵاو یان خەزینـەی هەوڵە داهێنـەرەکان". لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە فرای و هەنـدێك کەسـی دی ڕەخنـەگرانی نوێی وەك کلینت برۆکس، مارك شور و جۆزێف فرانك تۆمـەتبار دەکـەن کـە ڕەخنـەی ئـەدەبیان بەشـێوەیەکی ترسـناك خـستۆتە دەرەوەی مێژوو-بەمانای دەرەوەی زەمـەن- و پشتگیری ڕەخنەیـەك دەکـەن کـە لەتوانایـدا نیـە گۆڕانـە کلتوریـەکان کـە کاریگـەری لەسـەر فۆرمـە ئەدەبیەکان دادەنێن، تاوتوێ بکەن.

خەسڵەتی ڕەخنـەی وێنـەیی جـەخت لەسـەر وێنە ئەزەلیەکان و وێنا کلتوریەکانە، ئەو وێنـەو وێنایانـەی کـە دەکرێـت بەشـێوەی دابـڕاو یـان تـەجلیاتی کـەموکوڕ، وەك تیـشکەکانی ڕونـاکی کـە لەسـەر دیـواری ئەشـکەوتەکەی ئـەفلاتۆن دەردەکـەوێت. وێنـەکانی وێنـەی ئـەزەلی – کـە دابـڕاون و هـیچ کاتێـك سـەرجەمی وێنەیـەکی ئـەزەلی لـەخۆناگرن- کاریگـەریـەکی پەرشـوبڵاون کـە دەکەونـە سـەر پـەڕەی بیرکردنـەوەی هوشـیاری. ئـەم وێنانـە کـە نمونـە گـەلێکی هۆشـیاری بەخـشن، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە هـیچ کاتێـك بەتـەواوی نائـاڵۆز و بەتـەواوی یـەکڕەگ نین، بەڵام نیشانە گرنگەکان کلتورین. نۆرترۆپ فرای لـە کتێبی "ئاناتۆمی ڕەخنـە"دا (1957) بەتـەواوی سـودی لـەم چـەمکە وەرگرتـووە، و وتاری "کارکردنی ڕەخنە لە زەمـەنی هەنوکەدا" وەك پێـشەکیەتی. لـەم کتێبـەدا فـرای ڕایدەگەیـەنێت کـە لەراسـتیدا سـەرکەوتنی ڕەخنـەی وێنـەی ئـەزەلی، بـەوردی لەهـەمان جێگـەوە دەستپێدەکات کە بزوتنەوەی پێشوی تیاییـدا شکستی خـواردوە. فـرای هەوڵـدەدات بەخوێندنـەوەی تایبـەتی گـۆڕانی وێنـەی ئـەزەلی ئـەدەبیاتی ڕۆژئـاوا، کـە دەکـرێ بـە نمونـەی یەکەمی خوێندنەوەی بونیادگەرانە ناوی بنێین. کـۆی کلتـور لـە بونیـادێکی تـاك ئەفسانەییدا دادەنێـت کـە لـە کلتـوری پـێش مێـژوو و ئەفسانەی پـیرۆزەوە بگـرە تـا کنایـەی زەمـەنی هەنوکـە لـەخۆ دەگرێـت. فـرای لـە ڕونکردنەوەیـەکی ئاسـانکارانەری وێنـە ئەزەلیـەکانی ئەدەبـدا، پێڕسـتێکی گـشتی بـۆ فۆرمـە ئەدەبیـەکان (ژانـر و دەنـگ و قافیـە و ئاهەنگ و شتی دی) وەك بەشێك لە کۆمەڵێك کە دەرخـەری پـارادیمی وێنـەی ئەزەلیـە، پێشکەشکرد. باسـەکەی فـرای هـەم گـۆڕانی "چوارچـێوەی چـەمکی" ڕەخنـەی ئـەزەلی لـەخۆدەگرێت و هـەم هەڵـسەنگاندن و تاوتوێکردنی مێژووی ئەدەبیاتە.

بەدرێژای دەیـەکانی1960 تێڕوانینـی فرای بـۆ ڕەخنـەی دامـەزراو لەسـەر بناغـەی وێنـەی ئەزەلی، کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر ڕەخنەی پراکتیکـی و تیـوری بەتایبـەتی لـە خوێندنـەوەکانی سـەدەکانی ناوەڕاسـت و

قۆناغی ڕێنسانسدا. بەهەرحاڵ هێواش هێواش میتۆدی فرای لەلایەن ڕەخنەگرە مێژووییەکان و بونیادگەران و فەمەنیستەکانەوە هێرشی کرایەسەر. هۆی ئەم هێرشە ئەوەبوو کە میتۆدەکەی فرای نە بەتەواوی مێژووی بوو و دەیتوانی "هەقیقەتی" گۆڕانە مێژووییەکان لەبەرچاو بگرێت، نە لە بەکارهێنانی بنەماکانی خۆیدا سەقامگیر و جێگیرە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا وێرانکارترین ڕەخنە، ڕەخنەی فەمەنیستی بوو لە فرای کە هێرشی کردە سەر پارادایمی یۆنگی و چەمکی تاك ئەفسانەیی. وەك فەمەنیستەکان ئاماژەی بۆدەکەن پاڵەوانی وێنەی ئەزەلی لە بنەڕەتدا نێرێکە کە هەوڵدەدات لەگەڵ مێینەی "بنەڕەتی"دا کە هەمان (دایە گەورەیە)و لەگەڵ ئەنیمیایی بەزەبردا کە هەم جوتی نمونەیەتی و هەم پاداشتێتی بۆ سەرکەوتن لە ڕوداوەکەدا، بسازێت. پاڵەوانی ئەم پارادایمە پیاوانەیە، دەبێت پیاو بێت. لەبیرکردنەوەی یۆنگ یان فرایدا بۆ تێگەیشتنی دەوری ژن جێگەیەك نیە، مەگەر ئەوکاتەی بەشێوەی نەریتی پشتیوانی لەپیاو دەکات.

هەموان بڕوایان وایە، ژیانی بزوتنەوە ڕەخنەییەکان بەرز و نزمیەکی هەیە کەدواجار دەبێتە هۆی ڕمانیان و لەئەنجامدا بەئیلهامبەخشین بە بزوتنەوە تازەکان کاری خۆیان کۆتای پێدێنن. بۆ نمونە دەرونشیکاری سەرچاوەی فکری ڕەخنەی دامەزراو لەسەر وێنەی ئەزەلیە، بەڵام لەڕاستیدا ڕەخنەی دەرونشیکاری بەسەر ڕەخنەی دامەزراو لەسەر وێنەی ئەزەلی هەم پێشکەوتوە و هەم دواکەوتوو. پێشکەوتووە لەبەرئەوەی لەگەڵ ئەوەی یەکەمی لایەنگرانی فرۆیددا لە دەیەکانی 20و30دا دەستی پێکرد و دواکەوتوە چونکە لە بزوتنەوەی دوای سیمۆلۆجیادا کە"بەگەڕانەوەیەك بۆ فرۆید" دەژمێرێت، دوبارە دەژێتەوە و و ئێمە لەم وتارەدا لە باسی پاش بونیادگەریدا باسی دەکەین. ڕەخنەی دەرونشیکارانە کە لە ئەوەی یەکەمی ڕەخنەگرانی فرۆیدەوە دەستی پێکرد– ئەم گروپە دەیانویست تێزەکانی فرۆید و گرێی ئۆدیب لە ئەدەبیاتدا بدۆزنەوە. نمونەی زیرەکانەی ئەم ڕەخنە کلاسیکیە (*The Theme of the three caskets*)ی نوسینی فرۆیدە– تادەیەی 1960 بەردەوامبوو، و باشترین ڕەخنەگرانی سەدەی بیستەمی بەخۆیەوە خەریککرد" ئەرنست جۆنز، مری بناپارت، ئەدمۆند ویلسۆنو لایونل تریلینگ و فردریك کروز و کەسانی دی. ئەم میتۆدە فرۆیدیانەی سەرەتا بۆ ئەدەبیات، لەنیوەی سەدەدا ڕووی لە لاوازی کرد. ڕەخنەی یۆنگی و ڕەخنەی نویٚ زۆرتر لەبەرئەوەی نەیانتوانی لە شیکردنەوەی بونیادی ئەدەبیدا لە جۆرێکی شەرحی ناوەڕۆکی ("دەرمانی") زیاتر بڕوا، لاوازبوون. بەکورتی هەموان هێواش بەو دەرئەنجامە گەیشتن کە بەرجەستەکردنی گرێی ئۆدیب لە تێکستدا، کارێکی سوك و بەدیهیە و هیچ بینینێکی تیا نیە.


ڕۆلان بارت

**بونیادگەری:**

لــــە دەیــــەی 1960دا هاوکـــات لەگـــەڵ لاوازبـــوونی هەنـــدێك میتـــۆدی رەخنـــەیی ناوەڕاستی سـەدەدا، چالاکیەکی تـازە دەسـتی پێکـرد کـە نـاوی نـرا بونیادگـەری. هەوڵـدان بـۆ شیکردنەوەی بونیادی (و سیمۆلۆجیانە) لەبری تاقیکردنەوەی کاریگەریەکان یا دەرئەنجامەکان یـــان بـــەکارهێنانی پەیوەندیانـــەی زمـــان، لێکۆڵینـــەوەی هەلومەرجێکــە کــە لــە پێــشەوە دەبێتــە هــۆی دەرکــەوتنی زمــان و مانــا. بــە دەربڕینێکی دی بەگوتەی رۆلان بارت لە وتاری "کــرداری بونیادگــەر"دا پرســیاری ســەرەکی بونیادگـــەری ئەمەیـــە: "چـــۆن مانـــا مـــومکین دەبێـــت؟". بونیادگـــەری لـــەناو پێـــشکەوتنە مەزنـــەکانی زمانناســـی ســـەدەی بیـــستەمەوە دروستبوو. هـۆ و بونیادنـەری ئـەم پێشکەوتنە، زانستێك بـوو کـە فردیناند دو سۆسـێر بـەناوی ســـیمۆلۆجیایەوە بونیادینـــا و بەمـــشێوەیەش پێناسـی کـرد: "زانـستێك کـە تـاوتوێی ژیـانی ئاماژەکــان لــەناو کۆمــەڵگادا دەکــات". لــەبری پرســـیار دەربـــارەی سەرچـــاوەی شـــکڵبەندیە زمانییـــەکان یـــان مێژووەکـــەیان، ســـیمۆلۆجیا دەپرسێت چۆن رەگەزە زمانیەکان دروستدەبن و دەرئەنجام و کاریگەریـەکانی خۆیـان بەجێدێڵن. دۆ سۆسـێر ئـەو خاڵـە گرنگـە زیـاد دەکـات کـە گــرنگترین تایبەتمەنــدی ئامــاژە –وەك چــرای رێنمـایی– خۆبـەخۆ بـونێتی و ئامـاژە لەسـەر بناغەی رێکەوتن دەبێت بە پەیامێکی دیار. بە دەربڕینێکـــی دی هـــەموو رەگـــەزەکانی زمـــان دەتوانن شتێکی دی بن جگە لەوەی کە هەن. بۆ نمونــە "رەنگــی ســەوز" وەك چــۆن نیــشانەی "جوڵەکردنـــــــە" دەتوانێـــــــت نیـــــــشانەی "راوەستان"یش بێت.

کلـــۆد لـــۆڤی شـــتراوس بونیادگـــەری لـــە سەرەتاکانی دەیـەی 1950 بـە سودوەرگرتن لـە سیمۆلۆجیا لە ئەنسرۆپۆلۆجیادا، بونیادنا. ئەم قۆتابخانەیــە کاریگەرییــەکی زۆری کــردە ســەر رەخنـــەی ســـەدەی بیـــستەم و لـــە دەیـــەکانی 1960و سەرەتاکانی دەیـەی 1970دا دەرکـەوت بـەخاڵی وەرچـەرخانێك لـە رەخنـەی مۆدیرنـدا دەژمێرێـت. سـەرەتا دەرکـەوتنی بونیادگـەری روبەڕوی دژایەتی توندی رەخنەگرە ئەمەریکی و ئەوروپییەکان بـۆوە، بـەڵام بەگشتی قبوڵکرا کـە ئــەم بزوتنەوەیــە هەڵــسەنگاندنی بەرزەفڕانــەی "زانستی" ئەدەبیاتە لە هـەموو رەهەندەکانیدا. بەهـەر جۆرێـك بێـت لـەبڕوای نـامۆیی روکەشـی لێکۆڵینەوەیـــەکی لەمـــچەشنە، بەشـــێوەیەکی ناسروشتی نامرۆییانە بوو، وە لەگەڵ بەهاکانی پـــەروەردەی لیبڕاڵـــی رۆژئـــاوادا نـــەدەگونجا. جیهانی ئینگلیزی–ئەمـەریکی بونیادگـەری نـەك بە نامرۆیی دادەنا، بەڵکو وەك بەدبینی هاتوو لە فەرەنــساوە وێنــاکرا، گەمەیــەکی دڵــڕفێن کــە هەندێك رۆشنبیری سەرگەرم کـرد، رۆشنبیرانێك کـە کوێرانـە هـەموو شـتێکی بێگانـە سـتایش دەکــەن. لەگــەڵ هـــەموو ئەمانەشـــدا لەســـاڵی 1975دا دەزگـــای زمـــانی مـــۆدێرن خـــەڵاتی ســاڵانەی جیمــز راســل لاول کــە پەیوەنــدی بــە لێکۆڵینــەوە ئەدەبیەکانــەوە هەیــە، بەخــشی بــە کتێبـــی بۆتیکـــای بونیادگەرانـــەی نوســـینی جۆناتـــان کولـــەر، و لایـــەنگرانی قوتابخانـــەیی ئەمـەریکی–ئینگلیـزی (ئەگەرچـی نـەك هـەموو رەخنـەگران و خوێنـەرانی) کـەم کـەم قبوڵیـانکرد کــە بونیادگـــەری جگــە لەلایەنــە پــۆزەتیڤ یــا نیگەتیڤەکانی، لەجێگـەی خۆیـدا سیـستەمێکی رەخنەگرانەی کارایە.

ئەگەر تەماشی رابردوو بکـەین تێدەگـەین کە دەرکـــەوتنی بونیادگـــەری و ســـیمۆلۆجیا لـــە دەیـەکانی 1960دا، بـە لوتکـەی پـسپۆڕیبوونی تیـــورەی مـــۆدێرن دەژمێرێـــت. بونیادگـــەری و سیمۆلۆجیا بەکردەوە بەشێکیان دروستکرد کە

بەتەواوی دەکرێ ناوی بنێین "تیورە"، چونکە مانا و هەلومەرجەکانی مانایان کردە بابەتی خوێندنەوە و بەمشێوەیە بێئەوەی خۆیان بە زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکانی وەک ئەدەبیات و فەلسەفە و مێژوو، زمانناسی و دەروونناسی و ئەنسرۆپۆلۆجیا سنوردار بکەن، هەموو ئەوانەیان بەیەکەوە گرێدا. زانستگەلێک کە لە کۆتاییەکانی 1960 وە کاریگەری راستەوخۆیان کردبووە سەر تیورەی ئەدەبی.

بونیادگەری لە رەخنەی ئەدەبیدا پەیوەندیەکی نزیکی بە فۆرمالیزمی ئەدەبیەوە هەیە. لقێک کە رەخنەی نوێی ئەمەریکی و فۆرمالیزمی روسی، نوێنەرە دیارەکانی بوون. ئامانجی سەرەکی ئەم بزوتنەوانە ئەوەبوو کە لە شیکردنەوەی ئەدەبیدا لەبری خەریکبوون بە ناوەڕۆکەوە، سەرنج بۆ فۆرمی ئەدەبی رابکێشن و بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش سود لە میتۆدێک وەربگرن کە تەواو لە میتۆدەکانی لێکۆڵینەوە ئەزمونییەکان بچێت. هەردوو بزوتنەوەکە بەدوای رێکخستنی بونیادە پێکهێنەرەکانی ئەدەبیات وەک سیستەمێک هاوئاهەنگ لەگەڵ رێکخستنی دەروونی بەرهەمەکانەوە بوون. سیستەمێک کە لەرێگەی خوێندنەوەی وردەوە ئاشکرا دەبێت. بەبڕوای ئەوان ئەدەبیات سیستەمێکی ئاڵۆزە لە کۆمەڵێک فۆرم کە دەکرێ بەشێوەیەکی بابەتی لە ئاستی جیاوازی هەمەکیدا شیبکرێنەوە- لە بەشە تایبەتیەکانی جوانکاری شیعرییەوە بیگرە تا بەیت و ژانری شیعری و جێگەی ئەو ژانرە لەناو سیستەمدا. بەکورتی رەخنەی نوێ و فۆرمالیزمی روسی بوونە هۆ و دامەزرێنەری دیدێک بۆ ئەدەبیات کە ئەدەبیات وەک سیستەمێک وێنادەکات و ئاراستەیەکی زانستی بۆ خوێندنەوە ئەدەبییەکان هەبوو. ئارەزوی سیستەمسازی و زانستیکردن کە بەتایبەتی لە فۆرمالیزمی روسیدا کە ئاراستەگەلێکی زمانناسیانەی هەبوو، بوو بە پردی پەیوەندی لەنێوان فۆرمالیزمی مۆدێرن سەرەتایی و بونیادگەری دەیەکانی 1960.

بەهەرجۆرێک بێت، ئەو سنورداریێتیانەی بونیادگەری بەسەر خۆیدا سەپاندبووی، بەتایبەتی سەرنج نەدان لە گۆڕانی زەمەنی (مێژوویی) و جەختکردن لەسەر سیستەمە هەمەکییەکان لەبری شتە فەردییەکان، بەشێوەیەکی روو لە زیاد لە کۆتاییەکانی 1960دا ئاشکرابوو. فەیلەسوفی فەڕەنسی ژاک دێریدا رەخنەیەکی بەهێز و سەلمێنراوی پێشکەشکرد. نمونەی بەرجەستەی رەخنەکەی دێریدا وتاری "بونیاد و



نیشانە و گەمە لە گوتاری زانستە مرۆییەکاندا"یە. بابەتی ئەم وتارە، لێکۆڵینەوەی ئەنسرۆپۆلوجیای بونیادگەرانەی کلۆد لیڤی شتراوسە. دێریدا بونیادگەری بەستەوە بە نابینایی رۆژئاوا بە "بونیادمەندی" بونیاد (*Structurality of structure*)یان بە بێمەیلی بۆ تاقیکردنەوەی بەکارهێنانە تیوری و ئایدۆلۆژیەکانی چەمکی بونیاد. دێریدا پیشانی دەدات کە هەوڵدان بۆ لێکۆڵینەوەی بونیاد پێویستی بەتوانای جیابونەوە و چونەدەرەوە لە بونیاد هەیە- وەک ئەوەی مرۆڤ بتوانێت لە کلتورێک بچێتە دەرەوە بۆئەوەی بەشێوەیەکی بێلایەن تەماشای ئەو کلتورە بکات. رەخنەی دێریدا لە کلۆد لیڤی شتراوس (نەک تەنها لە "بونیاد و ئاماژە و گەمە"دا، بەڵکو لە "خودای

لۆگۆس" و گراماتۆلۆژی و بەرهەمەکانی تریدا) رەخنەیەکە بۆ بەرجەستەکردنی دژایەتی نێوان سروشت و کلتور، هەمان ئەو شتەی کە لیڤی شتراوس لە تێکستە جیاوازەکاندا ناوی دەنێت هەستپێکراو (*Tangible*)و تێگەیشتنی (*Intelligible*). دێریدا دەڵێت لەبەرئەوەی مرۆڤ هیچ کاتێك لە کلتور سەرتر ناڕوات و ناتوانێت لە دەرەوە کلتور تاوتوێ بکات، و هیچ رێگەی رزگاربونێك لە بونیاد نیە و هیچ هەلومەرجێکی سروشتی نیە کە خاڵی لە کاریگەریەکانی بونیاد بێت -ئەو کاریگەریانەی لە شیکردنەوەی بونیادگەراندا دروستکەری مانایە- کەوابوو هیچ ئەزمونێکی بابەتی بۆ بونیاد ناتوانێت بوونی هەبێت. لێرەوە وەك دێریدا پیشانی دەدات ناکرێ خوێندنەوە و تەفسیرەکانی بونیادە کلتوریەکان، بەشێوەیەکی شایستە و پێویست بە مۆدێلە زانستیە وردەکان وەربگێڕین. دواجار گەر نەکرێت بونیاد جیا بکرێتەوە و تاقیبکرێتەوە، کەوابوو بونیادگەری وەك میتۆدێك بەجدی مەحکوم بەلەناوچوونە. لەراستیدا دێریدا دەیگوت لەبری سودوەرگرتن لە بونیادگەری، دەبێت ئێمە مامەڵەی جیاوازیەکان لەناو تێکستەکاندا بناسینەوە، چالاکیەك کە کەسانی دی ناوی دەنێن بونیادمەندبوون *structuration*- تێکەڵەیەك لە دەلالەت و کار دروستدەکات.

## پاش بونیادگەری:

پاش بونیادگەری بەشێوەیەکی سەرەکی لە کردارێکی فەلسەفیەوە گەشەی کرد کە بە دیستراکشن ناودەبرێت و دێریدا بە رەخنەی خۆی لە بونیادگەری، دەستی پێکرد. وەك هیلیس میلەر لە "گەڕان بەدوای بونیادەکانی خوێندنەوەی ئەدەبی" دەڵێت مانای سەرەکی "رەخنە"ی دیستراکشن جیاوازکاری و ئەزمونکردنە. واتە رەخنەی دیستراکشن ئەو گریمانانەی بناغەی لقە فکریەکانی ئەزمون دەکات و بۆئەوەی لەبارەی ئەو راستیە بەدیهیانەوە کە ئەو لقانەی لەسەر دامەزراون، گفتوگۆبکات. رەخنەی دیستراکشن رەوایەتی "سنورەکانی" زەمینە و تێکست کە تێگەیشتن هەم دەریانەخات و هەم پێویستی پێیەتی، تاقیدەکاتەوە. رەخنەی دیستراکشن بەر لەوەی بەدوای رێگەیەك بۆ کردنەوەی جۆرێك تێگەیشتن بێت -واتە شێوە یان رێگایەك کە لەسەر بناغەکەی دیاردە تازەکە لە مۆدێلە هاوئاهەنگ (کە خاوەن مەرز و سنورن) هەبوەکاندا بئاخنێت- بەدوای دۆزینەوەی ئەو بنەما تاقینەکراو و تاوتوێنەکراوانەوەیە کە بونەتە هۆی دروستبوونی ئەو مۆدێلە ناوبراوانەو سنورەکانیان.

دیستراکشن تا ئەو شوێنەی پەیوەندی بە رەخنەی ئەدەبیەوە هەیە، ستراتیژێکی خوێندنەوەیە. دێریدا ئەمجۆرە خوێندنەوەیە بە خوێندنەوەیەك وەسفدەکات کە کارەکەی لە زنجیرە پلەی فەلسەفیەوە دەست پێدەکات کە تیایدا دوو جەمسەر لەبەرامبەر یەکدا دەوەستن و بە دوو وتەزا دەردەبڕێن: یەکێکیان شتێکی گشتیە کە بە وتەزای "بەرزتر" ***Superior*** وەسفدەکرێت و ئەوی دیان شتێکی تایبەتیە و بە وتەزای "نزمتر" ***inferior*** وەسفدەکرێت. ئەم دوالیزمانە گرنگترین وتەزا فکری و کلتوریەکانی رۆژئاوا پێکدەهێنن. وتەزاکانی وەك راستی/هەڵە، تەندروستی/نەخۆشی، نێر/مێ، سروشت/کلتور، فەلسەفە/ئەدەبیات، ئاخاوتن/نوسین، جدیبوون/ گەمە. بۆ نمونە جاناتان کۆلەر دەڵێت دوو تێڕوانینی نەیار بۆ زمان هەیە، یەکەمیان تێڕوانینی گوزارەیی ***constative*** بۆ زمان (واتە زمان لە بنەڕەتدا سیستەمێکە لە مانای راست و درۆ) و دوهەم

تێڕوانینی وەزیفی ***perfomative*** بۆ زمان کە پێ لەسەر بەکارهێنانی فعلی سودوەرگرتن لە زمان، دادەگرێت. فەمەنیستەکان بڕوایانوایە نمونەیەکی تری ئەم دوالیزمە سودوەرگرتنی گشتی قبوڵکراوە بۆ وشەی "پیاو" لەبری مرۆڤ و سودوەرگرتن لە وشەی "ژن" بۆ ناونانی جۆرێکی مرۆڤ، واتە مرۆڤی مێینە. لێرەوە ڕەخنەی دیستراکشن بەشێوەیەکی ستراتیژی ئەم زنجیرە پلە بڕاوەیە هەڵدەگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی "نزمتر" لەسەرو "بەرزتر"ەوە دانێت- بە وتەی کۆلەر تێڕوانینی گوزارەی بۆ زمان دەگۆڕێت بە شتێکی تایبەتی تێڕوانینی وەزیفی بۆ زمان. نمونەیەکی تری "هەڵگەڕانەوەی" دیستراکشنی، ئەوەیە کە خودی دێرێدا دەیهێنێتەوە کە ئەویش بریتیە لە هەڵگەڕانەوەی تێڕوانینی لیڤی شتراوس بۆ سروشت/کلتور. لیڤی شتراوس وتەزای سروشت کە سەردەمێك وتەزایەکی بەرزتر بوو، دەکات بە شتێکی تایبەتی وتەزای کلتور (واتە دەیکات بە وتەزایەکی نزمتر).




بەهەرحاڵ ئامانجی ئەم هەڵگەڕانەوانە، تەنها هەڵگەڕانەوەی سیستەمەکانی بەها نیە، چونکە لەم حاڵەتەدا وەك خودی دێرێدا دەڵێت تەنها سیستەمی کۆنی دوالیزمەکان "دەسەلمێنرێت" (تەنها بەو جیاوازیەوە کە گرنکی بە وتەزای نزمتر دەدرێت)، بەڵکو ڕەخنەی دیستراکشن دەیەوێت پەیوەندی سەرەکی نێوان بەرزتر و نزمتر کە بۆتە هۆی دروستبوونی ئاسۆی مانایی-ئەگەری دروستبوونی هەر مانایەکی تایبەت-گوتارە تایبەتیەکان، بەخوازەی خودی دێرێدا بتەقێنێتەوە ***explode***. کەوابوو بە دەربڕینی دێرێدا ڕەخنەی دیستراکشن دەیەوێت کە تەفسیرێك بۆ "تەفسیر" و بونیاد و ئاماژە و گەمەکاری – تەفسیرێك کە بەدوای "هەقیقەت و خاڵی دەرچونێکەوەیە کە خاڵی بێت لە گەمەکاری و سیستەمی نیشانە"- لەبەرامبەر تەفسیرێکی تری تەفسیردا دابنێت کە "چیدی ناگەڕێتەوە بۆ خاڵی دەرچوون، بەڵکو گەمەکاری دەسەلمێنێت و هەوڵدەدات بچێتە ئەودیو مرۆڤ و مرۆڤسەنتەریەوە".

سەردەمی پاش بونیادگەری کە لەدوای بەرهەمەکانی دێرێداوە دەستی پێکرد، بەشێکی گەورەی ڕەخنەی ئەدەبی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. ڕەخنەی دەرونشیکاری باو کە لەژێر کاریگەری ژاك لاکاندایە، بەشێوەیەکی دیار خەسڵەتێکی دیستراکشنی هەیە: زیهن ***subject***-خود ***ego*** لەناوەند دەکاتە دەرێ و تێڕوانینی کلاسیکی فرۆید بۆ ئیگۆ، دیستراکشن دەکات.

لە فەمەنیستیشدا سود لە دیستراکشن وەردەگرن. بۆ نمونە فەمەنیستەکانی وەك هلن سیو، باربارا جۆنسۆن و گایاتری و چاکرواتی سپیواك و جۆلیا کریستڤا، سود لە ستراتیژیەکانی دیستراکشن وەردەگرن، بۆ ئەوەی پیاوەتی و خوێندنەوەی "پیاوانە" بۆ تێکستە ئەدەبیەکان دیستراکشن بکەن. ڕەخنەگرە مارکسیەکان و بەتایبەتی ئالتۆسیر و فردریك جیمسۆن و جۆن ئۆلیس و ڕۆزالین کوارد و مایکل رایان، لێکچونە قوڵەکانی نێوان ڕەخنە مارکسیەکان و ڕەخنەی دیستراکشنیانە

لە بەرهەمهێنانی کلتور، دەرککردووە, هەموو ئەم رەخنەگرانە میتۆدی دیستراکشنیان بۆ تێکستە ئەدەبیەکان قبوڵکردووە و لە گۆشەی جیاوازەوە هەوڵیانداوە، لەو هێزانە تێبگەن کە فۆرمی بەو تێکستانە داوە و لەهەمانکاتدا "لێکیان هەڵدەوەشێنێت".

دەکرێ بگوترێ قوتابخانەی پاش بونیادگەری بەیەك مانا پەردەیەکە بۆ سەرجەم گۆڕانەکانی پاش دێریدای لە رەخنەدا کە میتۆدی خوازەیی ستانلی فیش و رەخنەگرانی تری لایەنگری رەخنەی کاردانەوەی خوێنەریش دەگرێتەوە. ئەگەر بە پارێزگاریەوە قسەبکەین دەبێ دان بەوەدا بنێین میتۆدی پاش بونیادگەرانە بۆ تێکستە ئەدەبیەکان، سەرچاوە لە پێناسگەلێکەوە بۆ ئەدەب و رەخنە دەگرن کە پەیرەوی رای دێریدایە لەبارەی رەگەزە دروستکەرەکانی تێکست و سود لە ستراتیژیەکانی بۆ رەمز دامالینی تێکست، وەردەگرێت.

**رەخنەی کلتوری:**

لەدوای قۆناغی پاش بونیادگەری و بەرجەستەبوونی مەسەلەی دەلالەت و تێکست و راڤەکردن، شێوازێك بۆ خوێندنەوەی کلتوری دەرکەوت کە رەخنەی ئەدەبیشی گرتەوە. ئەم بزوتنەوەیە -دەکرێ بۆ لایەنگرانی ئەم بزوتنەوەیە ئاماژە بۆ ناوی دێریدا و میشل فۆکۆ، ژاك لاکان، میخائیل باختین، جولیا کریستڤا، گایاتری، چاکرواتی سپیواك، ژان فرانسوا لیوتار و فردریك جیمسۆن و کەسانی دی بکەین- بڕوای وایە ئەگەر رەخنە وەك بەشێك یان بە دەربڕینێکی باشتر وەك بەشی رێنمایکەری خوێندنەوەی کلتور وێنابکەین، ئەوا ئەم تێڕوانینە بەرهەمێکی زۆری دەبێت. ئاراستەکردنی ئەم بەرفراوانیە، پێویستی بە پێناسێکی گشتگیر بۆ خودی کلتور هەیە. ریمۆند ویلیامز لە کتێبی وشە کلیلیەکاندا بڕوای وایە وشەی کلتور"یەکێکە لەو دوو یان سێ وشەیەی کە لە ئاڵۆزترین وشەکانن لە زمانی ئینگلیزیدا". ویلیامز لە کتێبێکی تردا بەناوی کلتورەوە دەڵێت "کرداری کلتوری" و "بەرهەمی کلتوری" راستەوخۆ لە سیستەمی کۆمەڵایەتیەوە کە لە رەگەزی تر دروستبووە، وەرنەگیراوە، بەڵکو خۆی رەگەزیگەلێکی سەرەکی دروستبونی ئەم سیستەمە کۆمەڵایەتیەن. بەپێی ئەم تێڕوانینە کلتور جۆرێك "رۆحی هوشیاری بەخش" لەناو کۆمەڵگادا نیە، بەڵکو وەك ویلیامز دەڵێت "سیستەمێکی دەلالیە کە لەرێگەیەوە بەناچار:::سیستەمی کۆمەڵایەتی پەیوەندی دروستدەکات و دوبارە بەرهەمدێتەوە و ئەزمون دەکرێت و دەدۆزرێتەوە".

دیارە پێناسەکانی ویلیامز تاکە وەسفی بایەخداری کلتور نین، بەڵکو لە راکانیەوە بەئاشکرا ئەوە دەردەکەوێت خوێندنەوەی ئەدەبی کە ویلیامز وەك کرداری رەخنەگرانەی سیستماتیك تەفسیری دەکات- رەخنەیەك کە بەشێوەیەکی کەمتازۆر سیستماتیك و ورد و بەگشتیبودا دەست بە خوێندنەوەی "سیستەمە دەلالیەکان" دەکات- دەستی بەجێگەیەك گەیشتووە کە دەتوانێت بینین و میتۆدەکانی خۆی بەرەو بوارێکی فراوانی بەرهەمهێنانی مانا بەرێت- واتە بەرەو کردارە کلتوریەکان وەك کرداری دەلالی تایبەت و وەك بواری گشتی لێکۆڵینەوە.

لەراستیدا دەکرێ بەشێوەیەکی بەڵگەدار وتوێژ لەسەر ئەوە بکەین کە ئەو تێکستانەی ئێمە بەشێوەی باو ناوی "ئەدەبیاتی" لێدەنێن، جێگەیەکی بەرزیان گرتووە، جێگەیەك کە تیایدا گرنگترین هێزە کۆمەڵایەتی و

دەروونناسی و کلتوریەکان کۆدەبنەوە و دەکەونە رکەبەرایەتیـــەوە. لێـــرەوە زۆر سروشـــتیە کـــە خوێندنـــەوە ئەدەبیـــەکان ســـەرنج لـــە ئاخـــاوتن و زمان بدەن، و بەرهەمهێنان و قبوڵکردن و هەموو دەرکەوتـــەکانی تـــاوتوێ بکـــەن. دەکرێـــت ئـــەم لێکۆڵینەوانە بە پەرەسەندنی سروشتی رەخنە بـزانین. کۆنـت بـرك و میخایـل بـاختین و مـەری ئەلمەن و هلن سیو و باربارا کریستین و رۆبێرت ســـتاپتۆ و ســـتنلی فـــیش و میـــشل فۆکـــۆ خوێندنەوە کلتوریەکان بەخوێندنەوەیەك دەزانن کە دەکرێت مەسەلە سیاسی و پـەروەردەیی و مێـــژوویی و جنـــسی و ئەدەبیـــەکانی تیـــادا باسکرێن و گفتوگۆیان لەبارەوە بکرێت. یـەکێك لـــە پـــڕ بەرهـــەمترین بەشـــەکانی خوێندنـــەوە کلتوریەکان، هەڵسەنگاندنی سروشتی رەخنـەی ئـەدەبی لـە ناوەنـدە ئەکادیمیەکانـدا لـە رۆژانـی دواییـدا بـووە. لـە کتێبـەکانی وەك "دەسـەڵاتی تێکستی" نوسینی رابرت شۆلز و ئینگلزی لە ئەمەریکادا نوسینی ریچارد ئۆمان و ئـەدبیاتی بـێ پـەروا نوسـینی جرالـد گـراف، قـاڵبگرتنی ئامـاژە: رەخنـەکردن و سروشـتەکانی نوسـینی جاناتـان کوڵـەر و رەخنـە گـۆڕانی کۆمەڵایـەتی نوسینی فرانك لن تریچیا، چیەتی خوێندنەوە ئەدەبیەکان و پەیوندیان بە کردارە کلتوریـەکانی دیوە، تاوتوێکراوە.

خوێندنـەوە کلتوریـەکانی کۆتـایی سـەدەی بیـستەم، دیـدێکی مـۆدێرنی رادیکالیـان بـۆ گۆڕان و بەردەوامی و فرەیی کلتوری پێشکەش کـردووە، کـە لـە سـەرەتای سـەدەدا بەدەگمـەن دەکرا پێشبینی بـەدیهاتنی بکرێـت. لەکاتێکدا مـۆدێرنیزم دابـڕان لـە رابـردووی راگەیانـد، و جەژنی بۆ دەرکەوتنی فرەیی کلتوری دەگرت – پێشوازی لـە "چـەند لایـەنی" و فرەیـی کـرد و رێکەوت و گۆڕان و کاریگەری "زەمەنی" بەسەر دنیـای مۆدێرنـدا بەرجەسـتەکرد- رەخنـەی کلتـوری جـەختی لەسـەر گوتـارە جیاوازەکـانی کلتـور و ئـەو خەسـڵەتانە کـرد کـە بەهۆیانـەوە کردارە کلتوریەکان دروستدەبن. سەرەڕای ئەمە رەخنـەی کلتـوری و جـۆرێکی ئـەم رەخنەیـە کـە لەدەیـــەی 1970 و 1980 دا بڵاوبـــۆوە و پەرەیسەند، سەبارەت بەزۆرێك لە میتۆدەکانی پێشوو بۆ کلتور، بۆ دژایەتی و ئایدۆلۆژی، زۆر هەســـتیارتر و ئارەزومەنـــدترە. بەمـــشێوەیە خوێندنـەوە کلتوریـە هاوچـەرخەکان–هـاوڕێ لەگـــەڵ خوێندنـــەوەکانی پەیوەندیـــدار بـــە جنـــسیەت و ئایـــدۆلۆژی و سیاســـەت و خوێندنەوەکانی ترەوە– هەندێك ئامانجی پرۆژە کلتوریـــە مۆدێرنیـــستی و ئاڤانگاردیـــەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمی، بەدیهێنا.

**سەرچاوە:**

ارغنون- سال اول شماره 4- زمستان 1373.ص 1

وەرگێڕی فارسی: رەزا سەید حسەینی

# زانسته مرۆڤایەتییەکان و ڕەخنەی ئەدەبی

د. ئیبراهیم مەحمود خەلیل

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

ماوەیەکی زۆرە زانسته مرۆڤایەتییەکان ئاراستەی ڕەخنەی ئەدەبییان دیاری کردووە، لە سەرەتادا فەلسەفە، بەتایبەتی لەلای ئەفلاتون و ئەرستۆ، خۆی بەسەر ڕەخنەدا سەپاند. ئەرستۆ بەوەندە نەوەستا کە بڵێت حەقیقەت لە ئەدەبی شانۆییدا جیاوازە لەو حەقیقەتەی لە ژیانی واقیعیدا هەیە، بەڵکو باسی بابەتێکی دیکەیشی دەکرد کە بە پاکبوونەوە (التطهیر) *catharsis* ناسراوە، بەپێی ئەرستۆ ئەم زاراوەیە بەو مانایە دێت کە تەماشاکردنی کارە شانۆییەکان دەبێتە مایەی پاکبوونەوەی دەروونی بینەر لە توندوتیژی و تاوان و لادان، لەڕێگەی وروژاندنی هەستی بەزەیی پیاهاتنەوە و ترس لەو سزایەی کە خواوەند بەسەر پاڵەوانی تراژیدیدا دەیسەپێنێت. ئەگەر لەم رایەی ئەرستۆ وردبینەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە وەزیفەی شیکارێکی دەروونی بە ڕەخنە دەبەخشێت، ئەو وەزیفەیەی کە ڕێگەی ڕزگاربوون لە نائارامی و دڵەڕاوکێمان نیشان دەدات.

لە ڕەخنەی سانت بیێڤ و هیبۆلت تێن، کە هەردووکیان نوێنەری ڕەخنەی ڕۆمانسین لەگەڵ جیاوازیی ڕێگەی ئیشکردن و میتۆدیان، پشت بە مێژوو و بیۆگرافیا دەبەستن. کاتێك ڕەخنەگر دەچێتە ناو وردو درشتی ژیانی ئەدیبانەوە، لەڕاستیدا کاری مێژوونوسی دەکات. یەکێك لە ناودارترین بەرهەمی تێن کتێبێکە بەناونیشانی "مێژووی ئەدەبی ئینگلیزی" کە لەوێدا بەرهەمی ئەدەبی دەگەڕێنێتەوە بۆ چەند فاکتەرێکی پەیوەست بە ژینگە و ڕەگەز و زمان.

لە هەموو حاڵەتێکدا ئەم جۆرە ڕەخنەیە بووە بە ڕەخنەیەکی سکولاستیکی و کلاسیکی کە لەلای ڕەخنەگرانی سەرەتای سەدەی بیستدا باو بوو، ئەمە ڕەخنەیەکە تێکەڵ لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی و مێژوویی و ژینگەیی. بەکورتی دەتوانین بڵێین ڕۆڵی ئەدەب لە ڕەخنەگرتندا ڕۆڵێکی پەراوێزی بوو. زانسته مرۆڤایەتییەکان کاریگەرییەکی گەورەیان لە پرۆسەی ڕەخنەی ئەدەبیدا هەبوو. لێرەدا هەوڵدەدەین لە سێ زانستی گرنگ بدوێین کە

کاریگەرییەکی بەهێزیان لە رەخنەی ئەدەبیدا هەبوو، ئەوانیش بەپلەی یەکەم سایکۆلۆژیا و پاشان سۆسیۆلۆژیا و زانستی زمانەوانین.(ئێمە لێرەدا تەنها رەخنەی سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژیمان وەرگێڕاوە. -و.ك-)

## سایکۆلۆژیا و ئەدەب، یان رەخنەی سایکۆلۆژی:

سایکۆلۆژیا لە هەڵوێستیدا بەرامبەر ئەدەب چەند مەسەلەیەك لەبەرچاو دەگرێت، دەشێت گرنگترینیان بریتی بێت لە قۆناغەکانی گەشەکردنی مرۆڤ و پێکهاتەی کەسایەتی و رێگرەکانی بەردەم ئەو پێکهاتەیە و چەپاندن و کرانەوە و داخران لەو کەسایەتییەدا، هەروەها کاریگەریی سەرچاوەکانی کەسایەتی، پەیوەندیی کەسی داهێنەر بە خێزانەکەی، پەیوەندیی بە ژینگە کۆمەلاّیەتییەکەی، پەیوەندییە سۆزدارییەکانی بەپێی قۆناغەکانی گەشەکردنی لە منداڵییەوە تا قۆناغی هەرزەکاری و گەنجێتی و پێگەیشتن و تادەگاتە قۆناغی پیری.


سیگمۆند فرۆید

رەخنەی سایکۆلۆژی لە بنەڕەتدا بە زانای شیکاری دەروونی سیگمۆند فرۆید (1865-1939) پەیوەستە، فرۆید وایدەبینێت کاری ئەدەبی بریتییە لە چەند چینێك لە مانا و دەلالەتی کەڵەکەبوو کە دەبێ ئەو چینانە هەڵبکۆڵرێن تا نهێنی و لایەنە تاریك و تەماوییەکانی ئاشکرا بکرێن. فرۆید یەکەم کەس بوو زاراوەی (نائاگایی)ی داهێنا، نائاگایی لەلای فرۆید بریتییە لەوەی مرۆڤ واقیعی خۆی بەپێی ئارەزووە چەپێنراو و متبوەکانی بنیات دەنێت، لەبەر ئەوە هەموو گوزارشتێك، سا ئەو گوزارشتە رەفتار بێت یان خەیاڵ، بریتییە لە کۆمەڵێ هێمای ئاڵۆز کە هەوڵدەدات ناڕاستەوخۆ خواستەکانی مرۆ کەشف بکات، بەلاّم نەریتی کۆمەلاّیەتی و ئەخلاقی رێگرن لەبەردەم بەدیهێنانیاندا. نائاگایی لە ژیانی عاتیفی و جەستەیی مرۆڤدا ریشەیەکی قوڵی هەیە، کە پێویستە جەستە و سۆز تێر بکرێن، بەلاّم سلوکی کۆمەلاّیەتی و حەرامکراوەکان دەبن بە رێگر.

بەبۆچوونی فرۆید، ئەدەب و هونەر بەگشتی، فۆرمێکن لە فۆرمەکانی گوزارشتکردن لەو ئارەزووە متبووانە و وێنەیەکن لە دەرخستنی نائاگایی خەزنکراو. فرۆید دەڵێ کارە ئەدەبی و هونەرییە مەزنەکان شێوازێکن کە نائاگایی پەنایان بۆ دەبات تا بە شێوەیەکی بڵند گوزارشت لەخۆی بکات، ئیدی نوسەر یان شاعیر یان هونەرمەند پاش ئەنجامدانی کارە هونەرییەکەی، هەست بە خۆشی و لەخۆرازیبون دەکات، چونکە لە چەپاندن رزگاری دەبێت. بۆیە لێکۆڵیاری کاری ئەدەبی و هونەری هەر دەبێ بەدوای ژیان و مێژوو و پەیوەندییەکانی نووسەرەوە بێت و بەدوای بچوکترین ئاماژەشدا دەگەڕێت کە لەوانەیە رۆشناییەك بخاتە سەر ئەو گرفتە دەروونییانەی لە نائاگایی هونەرمەندا پەنهانن.

بەپێی فرۆید هەموو کارێکی ئەدەبی یان هونەری دوو دیوی هەیە، دیوێکیان نادیارە و دیوەکەی تری دیارە. دەبێ ڕەخنەگری دەروونی سوود لە هەموو ئامرازێك وەربگرێ تا بتوانێت بەجۆرێك تێکستەکە شیبکاتەوە دیوە نادیارەکەی ئاشکرا بکات. بەم ڕێگەیە فرۆید هەندێ لە کارەکانی لیۆناردۆ داڤینشیی خوێندەوەو گەیشتە ئەو بڕوایەی کە داڤینشی دوچاری لادانی سێکسی ببوو. لەبارەی ڕۆماننوسی رووسیی ناودار فیۆدۆر دیستویڤسکی، فرۆید پێی وایە کە دوچاری فێلێهاتن ببوو و ئارەزوویەکی زۆری بۆ تاوان و ئازاردانی خودی خۆی هەبوو.

فرۆید دەرونی مرۆ بەسەر سێ گۆشەدا دابەش دەکات:

یەکەم: ئیگۆ-"من" *ego*

دووەم: ئید-"ئەو" *id*

سێیەم: سوپەر ئیگۆ-"منی بالاّ" *super ego*

گۆشەی یەکەمی دەروون -واتە "من"- بریتییە لە تێکەڵێك لە ئاگایی و نائاگایی کە پەیوەندیی بە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەوە هەیە، ئەمە پەیوەندیی سروشتیی مرۆڤ بە ژینگە کۆمەلاّیەتییەکەیەوە دەنوێنێت.

بەلاّم منی بالاّ مەیلی ئایدیالی لەلای مرۆڤ دەنوێنێت، بە پێچەوانەی "ئەو" کە لایەنی لادان یاخود ئارەزووی تێرکردنی شەهوەت دەنوێنێت، ئەم دوو گۆشەیەی دەرون لە ململانێیەکی بەردەوامدان و دەبنە هۆی ئەو دڵەڕاوکێ و خەمۆکییەی هونەرمەند پیایدا تێدەپەڕێت، کەچی "من" ڕۆڵی ناوبژیکارێك لەنێوان "منی بالاّ" و "ئەو"دا دەبینێت.

میتۆدی فرۆید لە شیکردنەوەی ئەدەبیدا، لە توێژینەوە تیۆری و پراکتیکییەکانیشیدا، کاریگەرییەگی گەورەیان لەسەر ڕەخنەی ئەدەبیدا هەبوو، کە ئەمە بووە مایەی سەرهەڵدانی چەندین قوتابخانەی ئەدەبی کە لەژێر کاریگەریی نائاگایی و هەستی ناوەکیدا کاریان دەکرد، یەکێك لەو قوتابخانانە سوریالیزمە کە پتر بایەخی بە گوزارشت لە خەون و روانین دەدا، واتە ئازادکردنی ناوەکیی ئینسان لە هەژمووونی کۆتە ئەقڵی و ئەخلاقییەکان. هەروەها هونەری بیۆگرافیاش گەشەی کرد چونکە ژمارەیەك لە توێژەران دەستیان کرد بە نووسینەوەی بیۆگرافیای ئەدیبان و لەژێر ڕۆشنایی تیۆرەکانی فرۆیدا کەسایەتیی ئەو ئەدیبانەیان شیدەکردەوە. وای لێهات بایەخدان بە ژیانی ئەدیبان لەسەروی بایەخدانەوە بوو بە بەرهەمەکانیان، ئەمەش وای لە هەندێ لە ڕەخنەگران کرد دژی ئەم ڕەوتە بنووسن، تەنانەت شانۆنوس و ڕۆماننوسەکانیش لەکاتی نوسینی تێکستەکانیاندا بە پێی تیۆرەکانی فرۆید مامەڵەیان لەگەڵ کارەکتەرەکانیاندا دەکرد، بەهۆی ئەمەشەوە هەندێ ڕۆمان سەریان هەڵدا کە بۆ پراکتیزەکردنی تیۆرەکانی شیکردنەوەی دەروونی نوسرابون، لەوانە ڕۆمانی (سەراب)ی نەجیب مەحفوز و ڕۆمانی تەوژمی ئاگایی، هەندێ لە ڕەخنەگرانی سایکۆلۆژی دەستیان کرد بە خوێندنەوەی کارە ئەدەبییە کلاسیکییەکان لەژێر ڕۆشنایی شیکردنەوەی دەروونیدا، لەوانە بۆ نموونە شانۆنامەی هاملێت کە ڕەخنەگران گەیشتنە ئەو رایەی کە هاملێت دوچاری گرێی ئۆدیب ببوو بۆیە دوو دڵ بوو لەوەی بکوژی باوکی بکوژێت کە دایکی خواستبوو و دەسەلاّتی گرتبووە دەست.

هەندێ لە قوتابیانی فرۆید هەمان ڕێبازی ئەویان نەگرت، بەڵکو لەچەند سەرێکەوە جیاواز بوون، بۆ نموونە ئۆتۆ رانك لەساڵی 1908دا کتێبێکی چاپ کرد لەبارەی مەسەلەی داهێنانی

هونــەری، لەوێــدا جــەخت لــەوە دەكــات كــە هونەرمەنـد چـالاكییەكی دیـاریكراوی هەیـە و لەراسـتیدا كەسـێكی خـەونبین یـان عوسـابی (نیرۆسـی) نییـە، ئـەم چـالاكییە لـەوە دووری دەخاتـەوە كـە نەخۆشیی دەرونیی هـەبێت وەك فرۆید پێی وابوو، كەسی نەخۆش یان عوسابی خـۆی پـەناگیر دەكـات وەك هــەڵهاتنێك لــە رووبەروبونــەوەی واقیــع، بــەڵام ئــەدیب و هونەرمەند ئارەزووی ئەوە دەكەن كە ئاوێزانی ژینگـە كۆمەڵایەتییەكـە بـن. ئۆتـۆ رانـك دەڵـێ هــەموو داهێنــانێكی ئــەدەبی یــان هونــەری كۆششێكی زەینـی لەگەڵدایـە، هـەروەك ژانـداری (موعانــات)یــشی لەگەڵدایــە، كەســی نــیرۆس ناتوانێـت كـاری هونـەریی نـەمر دابهێنێت، بـەڵام دەشێت ئـەدیب یــان هونەرمەنــد كەســێكی نێرگسی (خۆشەویستیی خـود) بێـت، چـونكە كـاری ئـەدەبی و هونــــەری، ســــەركەوتن و دابینكردنی خودی بۆ دەستەبەر دەكات.



كـارل یـۆنگ دەروونناسـێكی ترە كە بەشێوەیەكی تر سایكۆلۆژیای ئەدەبیی نــوێ كردۆتــەوە، ئــەم زانایــە ئەڵمانییــە و چـەمكێكی دیكـەی بـە نائاگـایی بەخـشیوە و لەراستیدا داهێنەری (نائاگایی كۆ)یە، لە دیدی یۆنگـدا نائاگـایی دوو جـۆرە: نائاگـایی تـاك پەیوەسـتە بـە مرۆڤـی تاكـەوە، نائاگـایی كـۆ پەیوەستە بە كۆمەڵگاوە، هەروەك چۆن تاك لە نائاگـایی خۆیـدا یـان لـە منـی بـاڵادا زۆر شـت هەڵـدەگرێت، بەهــەمان شـێوە كۆمەڵگــەش لــە نائاگایی كۆدا زۆ شت خەزن دەكات و لەكاتی زیندوو كردنەوە و بەئاگاهێناندا لەسەر زمان و قەڵەمی تاكەكاندا، دەبێتە بەشێك لە تەعبیركردن لـە ئاگـایی خـودی كۆمەڵگاكـە. ئـەدەب و هونـەر بەبۆچــونی كــارل یــۆنگ ســەرباری ئــەوەی گوزارشـت لـە نائاگـایی تـاك دەكـەن، هاوكـات گوزارشت لە نائاگایی كۆش دەكەن.

بـۆ روونكردنـەوەی ئـەم خاڵـە، یـۆنگ قسە لـەبارەی شانۆنامەی (فاوست)ی گۆتـە دەكـات، كە لە بنەڕەتدا ئەو ناوەی لە كەلەپوری میللیی ئەڵمانی وەرگرتووە، وەك نمونەیەك كە هەمیشە لـە نـاخی هـەموو ئەڵمانییەكدا زینـدووە، بۆیـە كاتێــك بینــەری ئــەڵمانی تەماشــای ئــەو شـانۆنامەیە دەكـات، یەكـسەر دەنگدانـەوەی رۆحی ئەڵمانی بەخەیاڵیدا دێت و دەچێت، كە لــە ویــژدانی هەمووانــدا ریــشەی هەیــە. كەسایەتیی فاوست دەبێتە نموونەیەكی رەمزی كە لـە نـاخی نائاگـایی ئەڵمانیـدا جێگیرە.

نۆرترۆپ فرای پێی وایە ئەم تیۆرییەی یۆنگ لە پراكتیزەدا لە خولی مرۆیی دەچێت كە لەپاش خـــەون و ئاگاییـــەوە دێـــت و گونجاویشە لەگەڵ خولی زەمەنیدا كە خـۆی لـە تـاریكی و روناكیـدا دەبینێـت. لـە رۆژدا مـرۆڤ دەبێتـە نێـچیری لاوازی و شكست و لـە شـەودا دەبێتـە قارەمــان. كــاری هونــەریش بریتییــە لــە رزگـاركردنی ئەقڵەكان، رێگـە بـەو كەسـایەتییە ئەفسانەیی و خـورافی و میللیانـە دەدات،- كـە لــەناخی ئێمــەدا شــاردراونەتەوە-، لــە كــاری داهێنەرانــدا بەشــێوەیەكی نــوێ دەربكــەون و بەقوڵی گوزارشت لە ئێمە بكەن. بەمجۆرە كارل یـۆنگ رەخنـەی سـایكۆلۆژیی لـە توێژینـەوەی هۆكـارە نیرۆسـی و نەخۆشـییە دەروونییــەكان دەرهێنـا و مـۆركێكی دیكـەی پـێ بەخـشی كـە نائاگـایی كـۆ لـە ئـەدەب و هونـەردا بەرجەسـتە دەكـات، داهێنـەر كارەكـەی خـۆی لـە بازنـەی تاكەكەسەوە دەباتە نێو بازنەی جەماعی.

نـۆرتـرۆپ فـرای و ریـچاردس لـە چـەرخی نوێدا بە دوو رەخنەگری سایکۆلۆژی دادەنرێن، یەکـەمیان لـە کتێبـی (ئـەناتۆمیی رەخنـە)دا و دووەمیشیان لە کتێبی (پرەنسیپەکانی رەخنەی ئەدەبی)دا، کە ئەم کتێبە یەکێکە لە گرنگترین کتێبـی بـواری رەخنـەی ئـەدەبی، گـەلێ بابـەتی گرنـگ و سودبەخـشی تێدایـە، بەتایبـەتی لـە بـواری رەخنـــەی ســـایکۆلۆژیدا. ریـــچاردس بایەخی بە تیۆری گەیاندن داوە، واتە بنیاتنانی پردێـك لـەنێوان نوسـەر یـان شـاعیر لەلایـەك و خوێنەر یان وەرگر لەلایەکی دی، سائەو وەرگرە تاك بێت یان کۆ، ئەو پێی وایە فاکتـەری ئاگایی بـۆ راڤـەکردنی پرۆسـەی گەیانـدن بـەس نییـە، بـەڵکو پێویستە فاکتـەری نائاگاییش لەبەرچاو بگرین تا گرنگیی گەیاندن روونتر دەربکەوێت. واتە ریچاردس جەخت لە گرنگیی خوێنـەر یان وەرگر دەکات.

ئەگـــەر فرۆیـــد و ئۆتـــۆ رانـــك و بێرگلـــەر و یـــۆنگو نـــۆرترۆب فـــرای بایـــەخیان بـــە شـــیکردنەوەی دەروونیـــی ئـــەدیب و نوســـەر دابێـت، ئـەوا ریـچاردس ئـاوڕ لـە شـیکردنەوەی (بەدەنگـەوەهاتنی خوێنـەر) بـۆ کـاری داهێنـان، دەداتەوە، بەبۆچوونی ریچاردس نابێت خوێنـەر تـەنها بـۆ چێـژ و خۆشـی تێکست بخوێنێتـەوە، ئەمـە شـتێکی سروشـتییە و لـەدوای هـەموو خوێندنەوەیـەکی سـەرکەوتوو بـۆ تێکـستێکی ئـەدەبیی جـوان، ئـەو شـتە، واتـە چـێژ، دێتـە ئاراوە.

خوێنـەری ئاسـایی لـە ژیـانی رۆژانەیـدا پاڵنـەرو ئارەزوەکـانی خـۆی دەچـەپێنێت و ناتوانێـت ئـەو ئـارەزوو و پێداویـستیانە تێـر بکات، کەچی کاتێك قەسیدەیەك یان تێکستێکی ئـەدەبیی دیکـە دەخوێنێتـەوە، هـەموو ئـەو ئارەزووانەی لەلا زیندوو دەبنـەوە کە لە ژیانی رۆژانـــەدا کـــەبتی کـــردوون، لـــەمیانی ئـــەو خوێندنەوەیەشـــدا هاوســـەنگییەك لـــەنێوان ئارەزوەکـان و هەسـتەکانیدا رادەگرێـت، ئـەم بۆچـــوونە پەیوەندییـــەکی راســـتەوخۆی بـــە رەخنەی بەدەنگەوەهاتنی وەرگرەوە هەیە.

ریـچاردس لـە چـەندین بەشـی کتێبەکەیـدا جەخت لـەوە دەکات کە رەخنـەی سایکۆلۆژی، بەتایبـەتی سایکۆلۆژیای سلوکی، بەتێپەڕبونی کات دەتوانێت وەڵامێکی بێشومار پێشکەشی ئـەو پرسـیارە قورسـانە بکـات کـە سروشـتی ئاڵۆزی هونەر لەناخماندا دەیوروژێنێت.

دواتـر دەرونناسـیی سـلوکی لـە رەخنـەی ئەدەبیـدا وردە وردە کـاڵ بـۆوە، رەخنـەگری فەرەنـسی شـارل مـۆرۆن لەسـاڵی 1938 ەوە میتـــۆدی ســـایکۆلۆژیی بـــۆ شـــیکردنەوە و راڤـەکردنی تێکـستی ئـەدەبی بـەکارهێنا، بەتایبـەتی لـە هێما تاریـك و تەمومژاوییـەکانی شـیعرەکانی مالارمێـدا، کـە لـە سـەردەمی مالارمێدا لەو باوەڕەدابوون ئەو شیعرانە تەئویل نـاکرێن، بـەڵام شـارل مـۆرۆن لەکارەکانیـدا دەسـتی کـرد بـە راڤـەکردنی رەمزەکـان بـەو رێگەیەی کە فرۆید لە شیکردنەوەی خەونەکاندا پـەنای بـۆ بردبـوو، مـۆرۆن لـە لێکۆڵینـەوە ئەدەبیەکانیـدا گەیـشتە ئـەو دەرەنجامـەی کـە راڤـەکردنی رەمزەکـان بـەپێی میتـۆدی فرۆیـد باشترین رێگەیە کە دەبێتە مایەی تێگەیشتن لە کاری ئەدەبی.

لەراستیدا شـارل مـۆرۆن لـە ساڵی 1948دا زاراوەی (رەخنـــەی ســـایکۆلۆژی) *psycho-criticism*ی داهێنـا و ئـەم میتـۆدەی بەسـەر بەرهەمی ژمارەیەك ئەدیبی ناوداری فەرەنسیدا پراکتیـك کـرد، بـۆ نموونـە بەرهەمـەکانی جـان راسین و بـۆدلێر و مـۆلییێر و ڤـالێری و ڤیکتـۆر هۆگۆ و ئەوانی دی.

لەپاش شارل مۆرۆن چەندین رەخنـەگری تر هاتن و بەشێوەی جیاجیا بایەخیان بە رەخنەی

دەروونی دەدا، لەوانە خاتوو ئان کلانسیٚ کە گرنگیی بە کەسایەتیی نائاگایی و بە شیکردنەوەی هێمای شیعریی دەدا، هەروەها ئیف گۆهین و سیرجی دۆبرۆڤسکی کە زاراوەی خوێندنەوەی دەرونییان داهێنا، پاشان مارسیل مارینی کە لەبارەی چالاکیی گەیاندن و وەرگر دەینووسی و چۆن ئەم کێشەیە دژایەتی دەخاتەوە کە پەیوەندیی بە ئەدای رەوانبێژییەوە هەیە، ئەمە مەسەلەیەکە فرۆید و ئەوانیدی -جگە لە ریچاردس- فەرامۆشیان کردبوو. ئەم ڕێگەیە لە شیکردنەوە، بەرادەیەکی زۆر، جەخت لە لایەنی چەپێنراو یاخود بێدەنگەلێکراو دەکات، واتە ئەوەی کە لە ناوەرۆکی کاری ئەدەبیدا پەنهانە.

لەپەراوێزی ئەم رەوتەی رەخنەی سایکۆلۆژیدا، رەوتێکی دیکە سەریهەڵدا کە بە رەخنەی سایکۆلۆژیی بونگەرایی ناسرا، سارتەر دیارترین نوێنەری ئەم رەوتەیە کە لێکۆڵینەوەیەکی درێژی لەسەر رۆماننوسی فەرەنسی فلوبێر نووسی.

هەندیٚ لە بونیادگەراکان هەوڵیاندا هاوگونجانێك لەنێوان شیکردنەوەی دەروونی و رەخنەی بونیادگەریدا دروست بکەن، لێرەدا زاراوەی (نائاگایی تێکست) سەریهەڵدا کە دەیویست شوێنی (نائاگایی نووسەر) بگرێتەوە، هەروەها لەبری ئەفسانەی نوسەر، ئەفسانەی تێکست هاتە ئاراوە، ئەمە بۆ ئەوەی گونجانێك لەنێوان "خوێندنەوەی سایکۆلۆژی"و وتە ناودارەکەی رۆلان بارت "مەرگی نووسەر"دا دروست بکەن. ئەم خوێندنەوەیە پشت بە کەمکردنەوەی شوێنگەی خود دەبەستێت لەبەرامبەر بایەخدان بە (نائاگایی نووسراو).

یەکێك لەو رەخنەگرە بونیادگەرایانەی بانگەشەی ئەم رەوتەی دەکرد جاك لاکان بوو، لاکان ئەم کاتیگۆریە ناودارەی فرۆید (نائاگایی)ی کرد بە کاتیگۆرییەکی گشتی یان بیرۆکەیەکی گشتی، نەك کاتیگۆرییەك بشێت ملکەچی میزاجی تاك بێت، جا لەبەرئەوەی نائاگایی لەدەرەوەی مرۆڤدا نییە، ئەوا سلیٚ لەوە دەکرێتەوە کە بیرۆکەی نائاگایی بگۆڕدرێت بۆ نائاگایی خوێنەر لەبری نائاگایی نووسەر.

رەخنەگری ناوداری فەرەنسی خاتوو ژولیا کریستیڤا، ئەویش وردە وردە هەنگاوی بەرەو شیکردنەوەی دەرونی هاویشت، لەچەندین لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا بایەخی بە پێکەوەبەستنی نێوان شیکردنەوەی سیمیۆتیك و شیکردنەوەی دەروونی داوە، لەمەشدا پشتی بە نووسینەکانی توێژەرانی بواری سایکۆلۆژیای زمانەوانی بەستووە، ئەم میتۆدەی بەسەر کارە ئەدەبییەکانی مالارمیٚ و باتای و جێمس جۆیسدا پراکتیك کردووە.

هەرچۆنێك بێت ئەم زانستە، واتە رەخنەی سایکۆلۆژی، بەدرێژایی سەدەی بیستەم شوێنێکی تایبەتی لە دنیای رەخنەی ئەدەبییدا گرتبوو، بەڵام لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بەدواوە، وردە وردە پاشەکشەی کرد. بەڵام ئەوەی کە جێگەی مشتومڕ نییە ئەوەیە کە سایکۆلۆژیا وەك سەرجەم زانستە مرۆڤایەتییەکانی دی، خزمەتێکی گەورەی ئەدەبی کردووە و لەوێوە خزمەتی خۆیشی کردووە، وەك دەزانین سایکۆلۆژیا بەئەندازەیەکی زۆر سوودی لە تێکستە شیعریی و دراماییەکان وەرگرتووە، ژمارەیەکی زۆری ئەو زاراوانەی فرۆید و قوتابیەکانی دایانهێناوە بوونەتە بناغەیەك لە شیکردنەوەی ئەدەبیدا، لەوانە گرێی ئۆدیب و گرێی ئەلیکترا و نێرگسیزم و ...تاد.

### کۆمەڵناسی و ئەدەب - رەخنەی سۆسیۆلۆژی:

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ بابەتەکەی پێشوو لەبارەی رەخنەی سایکۆلۆژی، دەبینین پەیوەندییەکی زۆری بە رەخنەی سۆسیۆلۆژیاوە هەیە. جەمسەرە سەرەکییەکانی شیکردنەوەی دەروونی، لە فرۆیدەوە بۆ یۆنگ تا دەگاتە خوێندنەوەی سایکۆلۆژی لای جاک لاکان، ئەمانە سەرجەمیان بایەخ بەو ئاماژانە دەدەن کە لە بیۆگرافیای نووسەر یان شاعیردا کەشف دەکرێن و ئاماژەکانیش پتر ئاماژەی کۆمەڵایەتین، ئاماژەیەکن کاریگەرییان لەسەر داهێنانی نوسەر هەیە. خۆ ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ رابردوویەکی دور دەبینین ئەفلاتون یەکەمین رەخنەگرە بایەخ بە لایەنی کۆمەڵایەتی دەدات بەو پێیەی پێوەرێکە بۆ باشیی شیعر. ئەفلاتون شاعیرانی لە کۆمارە یۆتۆپییەکەی وەدەرناوە چونکە ئەخلاق تێکدەدەن، بەڵام ئەوانەی شیعر بۆ بەرزکردنەوەی وورەی جەنگاوەران دەهۆننەوە شایستەی هەموو رێزێکن. ئەمە لەراستیدا تێڕوانینێکی کۆمەڵایەتییانەیە بۆ ئەدەب.

لەو قۆناغەی کە کلاسیزم پاشەکشەی دەکرد و ئەدەبی رۆمانسی جێگەی دەگرتەوە، تێکەڵکردنێك لە نێوان رەخنەی سایکۆلۆژی و رەخنەی سۆسیۆلۆژی دروست بوو. بۆ نموونە سانت بیێڤ لە گەڕانیدا بەدوای بیۆگرافیا و نهێنییەکانی ژیانی شاعیران و ئەدیبان و هونەرمەندان، تێبینییە سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژییەکانی تێکەڵ دەکرد. هیبۆڵت تێن پێی وابوو بلیمەتی لە ئەدەبدا دەگەڕێتەوە بۆ سێ فاکتەر، ئەوانیش بریتین لە: ژینگە و زەمەن و رەگەز، ئەم سێ فاکتەرە دوور نین لە رەهەندی کۆمەڵایەتی، چونکە ژینگەی هەر نوسەرێك بریتییە لە کۆمەڵگاکەی.

ساڵی 1800 لە مێژووی رەخنەی سۆسیۆلۆژیدا بە ساڵێکی یەکلاکەرەوە دادەنرێت، چونکە لەو ساڵەدا مەدام دی ستایل (1766–1817) کتێبێکی بە زمانی فەرەنسی نووسی بە ناونیشانی (لەبارەی ئەدەب)، لەوێدا مەدام دو ستایل جەخت لەوە دەکات کە ئێمە ناتوانین لە بەرهەمی ئەدەبی تێبگەین و چێژێکی راستەقینەی لێوەربگرین بەبێ زانینی ئەو دۆخە کۆمەڵایەتییەی بووە بە مایەی سەرهەڵدان و داهێنانی ئەو کارە ئەدەبییە. دواتر دۆناڵد لێکستێکی پێشکەش کرد هەمان بانگەشەی مەدام دی ستایلی دوپات کردەوە و ئەم رستە ناودارەی وەشاند: "ئەدەب گوزارشتکردنە لە کۆمەڵگە".

ئەدەب، بەبۆچونی مەدام دی ستایل، بە گۆڕانی کۆمەڵگە گۆڕانکاری بەسەردا دێت، هەرچەندە ئازادیی تاکەکەس و ئازادیی گشتی لە کۆمەڵگادا بەرفراوان بێت، ئەدەب پتر پێشدەکەوێت، بۆ نمونە ئەدەبی فەرەنسی لە چەرخی پێش شۆڕشدا ئەدەبێك بوو بەئاراستەی داشۆرین و گوزارشتی تاڵ و داخران دەجولا، وەك بڵێی ئاسۆی مێژوو لەبەردەمیدا داخرابێت، بەپێچەوانەی ئەو ئەدەبە، لەپاش شۆڕش لە ئەنجامی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و گەورەبونی ئازادیی تاکەکەسدا، ئەدەب بە ئەندازەیەکی گەورە پێشکەوت و گۆڕانکاریی بەسەردا هات، جا لەبەر ئەوەی ئەو ئازادییە تازەیە بەتەنها فەرەنسی نەبوو، بەڵکو بەرفراوان بۆوە تا هەموو ئەوروپای گرتەوە، ئیدی سەرانسەری ئەدەبی ئەورووپیش گۆڕانکاریی بەسەردا هات، لەوانە درامای ئینگلیزی و رۆمانی ئەڵمانی.

بۆچونەکانی دۆناڵد کە لە رۆژنامە ئەدەبییەکان بڵاوی دەکردنەوە، بەشدارییەکی کاریگەری کرد لە دانانی ئەو شتەی بە دیاردەی

کۆمەڵناسیی ئەدەب ناودەبرێت، یان ئەوەی بە لێکدانەوەی کۆمەڵایەتییانەی ئەدەب دەناسرێت. لەساڵی 1853دا هیپۆلت تێن کتێبێکی لەبارەی لافۆنتێن نووسی تا ئەو راستییە بسەلمێنێت کە ئەدەب ئەو شتانە بنیات دەنێ و دایاندەهێنێت و رێکیان دەخات کە لە کۆمەڵگەدا پەرت و بڵاون.

بەڵام مارکسیزم بەوەندە نەوەستا کە بڵێت ئەدەب گوزارشتە لە کۆمەڵگە، یان بەوەی ئەدەب کاریگەریی ژیانی کۆمەڵایەتیی لەسەرە، مارکسیزم سیفەتی ئایدیۆلۆژیای بە ئەدەب، وەك چالاکییەکی رۆشنبیری، بەخشی، بەو پێیەی ئایدیۆلۆژیا ئامرازێکە بۆ رێنوێنی یان بۆ کۆنترۆڵکردنی جەماوەر، لەبەر ئەوە ئەدەب وەك سەرخانی کۆمەڵگە، دواجار بەشێکە لە بونیادە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان. لە تێڕوانینی مارکسیزمدا دەبێ ئەدەب گۆڕانکاریی بەسەردا بێت ئەگەر شۆرش هەڵگیرسا و بونیادە بنچینەییەکانی کۆمەڵگەی هەڵتەکاند، ئەوسا ئەو ئەدەبە دەبێت بە ئەدەبێکی نوێ و گوزارشت لە خەون و خواستەکانی چین و توێژە کۆمەڵایەتییە هەڵکشاوەکان دەکات. لەژێر رۆشنایی ئەم بیرۆکەیەدا مارکسیستەکان چاویان بە دوو مەسەلەدا خشاندەوە، یەکەمیان: سروشتی ئەدەب، دووەمیان: ئامانج یان نیازی ئەدەب.




لەبارەی سروشتی ئەدەب، مارکسیستەکان پێیان وابوو نوسەر بیەوێ یان نا، ئەدەب رەنگدانەوەی واقیعە، لە تێڕوانینی ئەواندا تیۆری رەنگدانەوە، یاخود تیۆری پێچەوانە کردنەوە، زۆر چەمکی رەخنەیی بەتاڵ دەکاتەوە، بۆ نمونە بیرۆکەی بەهرە (ئیلهام) کە ئەفلاتون و ئەرستۆ و رەخنەگرانی رۆمانسی و هەندێ لە ئیستاتیکستەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد، ئەمە جگە لە رەتکردنەوەی ئەو گوتەیەی کە دەڵێت ئەدەب و هونەر گوزارشتن لە خەون و ئارەزووە چەپێنراوەکان.

بەڵام ئامانج و نیازی ئەدەب، بەندە بە هەڵوێستی ئەدیب لەبەرامبەر ئەو ململانێیەی سەرانسەری کۆمەڵگای داگرتووە، ئەگەر کۆمەڵگە لەنێو ململانێی چینایەتیدا بێت، ئەوسا ئامانج و نیازی ئەدەب بەلایەنگیری یاخود گوزارشتکردن لە یەکێك لە چینەکان دیاری دەکرێت. ئەگەر کۆمەڵگە لە ساتەوەختی گۆڕانکارییەکدا بێت کە چینی کرێکاران دەسەڵات بگرنە دەست، ئەوا ئامانجی ئەدەب لەم حاڵەتەدا بریتی دەبێت لە داکۆکیکردن لە دەستکەوتەکانی ئەو چینە نوێیە.

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی رەخنەی مارکسیزمدا، زانستێکی دی سەریهەڵدا کە بریتییە لە ئیستاتیکای مارکسیزم، ئەم ئیستاتیکایە سنووری وڵاتە کۆمۆنیستییەکانی بەزاند و ئەو وڵاتانەیشی گرتەوە کە پشێویی کۆمەڵایەتییان تیادا هەبوو. ئیدی چەندین رەوت و تەوژمی دیکەی کاریگەر بە مارکسیزم دەرکەوتن، لەوانە: رەخنەی کۆمەڵایەتی، رەخنەی ئایدیۆلۆژی، رەخنەی ریالیزم، ریالیزمی نوێ، هەروەها وشەی ئیلتیزام کە ئەمە واژەیەك بوو سەر بە چەشنە ئەدەبێك بوو ئامانجەکانی ئەدەب و رەخنەی مارکسیستی بەدی دەهێنا.

هەندێ لە توێژەران و بایەخپێدەرانی ئەدەب وایدەبینن ئەو ئەدەبەی لەسەر ئەم بیرۆکەیە دامەزرابێت، بەهای هونەریی لاواز دەبێت،

چونکە ئەدیبانی سەر بە ڕەوتی مارکسیزم پتر بایەخ بە فیکر و بابەت دەدەن و فۆرمی هونەری فەرامۆش دەکەن، لەبری ئەوەی ئەدیب ئازادانە گوزارشت لە خودی خۆی بکات، کەچی لە ڕێگەیەکی تەسکی پڕ لە بەربەست و ڕێگریدا قەتیس بووە، ئەمە وای لە هەندێ لە ئەدیبانی ڕوسیای سۆڤێتی جاران کرد بێزاری بەرامبەر بە ریالیزم دەربڕن، دواتر ئەمانە بەمونشەقەکان ناوبران، ئەمانە داوایان دەکرد چاو بەو بۆچوونە سادانەدا بخشێننەوە، ئیدی ڕەخنەگرانی سۆڤێتی نەرمییەکی زیاتریان نواند، کە دواتر ئەو قۆناغە بە تواندنەوەی سەهۆڵبەندان ناسرا، ئیدی ئەدەب و ڕەخنەی مارکسیستی لەسەر دەستی ئیلیا ئیهرینبۆرگ، وردە وردە لەژێر هەژموونی بۆچوونە تیۆرییەکانی هەندێ ڕەخنەگری وەك ژدانۆڤ ڕزگاری بوو.

پاشان جۆرج لۆکاچ و لوسیان گۆڵدمان، بەپێی ڕێسای جیاوازی، ڕەخنەی مارکسییان نوێ کردەوە، بۆ نمونە جۆرج لۆکاچ لە کتێبی (ڕۆمانی مێژوویی)دا دیدی مێژوویی تێکەڵ بە دیدی سۆسیۆلۆژیی کرد، بەم پێیە زەحمەتە تەنها بە پشت بەستن بە زانینی ژیانی نووسەرەکە، بتوانین لە ڕەفتاری کەسایەتییەکانی ڕۆمانی مێژوویی تێبگەین، بەڵکو دەبێ لەتەك ئەمەدا ئاگاداری ڕەفتاری کۆمەڵایەتیشیان بین، ئەمەش پێویستیی بە لێکۆڵینەوەی ئەو زەمەنە مێژووییە هەیە کە باسی دەکات، بەم پێیە ڕەوتی مێژوویی لە ئەدەبی مارکسیستیدا جیاوازە لە ڕەوتەکانی دی، مێژوو لەئەدەبی مارکسیدا مۆرکێکی سۆسیۆلۆژی-کۆمەڵایەتیی پێ دەبەخشرێت.

جۆرج لۆکاچ لەسەر ئەم بنەمایەی خوارەوە ئەدەبی واقیعی و ناواقیعی جیادەکاتەوە:

ئەو ئەدەبەی لاسایی واقیع دەکاتەوە و وێنەی دەکێشێت، ئەگەر دیدێکی وای تێدا نەبێت کە ئەو واقیعە بگۆڕێت، ئەوە ئەدەبی واقیعی نییە تەنانەت ئەگەر لە نووسیندا پشت بەو واقیعەش ببەستێت، واتە ریالیزم لە کاری ئەدەبیدا ناگەڕێتەوە بۆ پەیوەندیی ئەدەب بەو واقیعەی وێنەی دەکێشێت، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تێڕوانین و دیدە مێژوویی و ئایندەیەی کارە ئەدەبییەکە لەخۆی دەگرێت.

کاتێك لۆکاچ جیاوازی دەکات لەنێوان ئەدەبی واقیعی و ناواقیعیدا، لەوێوە جیاوازی لە نێوان ناچورالیزم و ریالیزم لەلای ئیمیل زۆلا و ئۆنۆرێ دی بەلزاکدا دەکات، بەبۆچوونی لۆکاچ ئەو شتەی ژدانۆڤ و کەسانی وەك ئەو بانگەشەیان بۆ دەکرد، بریتی بوو لە ناچورالیزم (سروشتخوازی یان سروشتگەرایی) کە ئەدەب لە نێو واقیعدا بەند دەکات، نوسەرێکی وەك ئیمیل زۆلا کە واقیع وەکو خۆی پیشان دەدات، ڕۆماننوسێکی ریالیستی نییە، بەڵکو ناچورالیستە، بەڵام بەلزاك بەراستی ڕۆماننوسێکی ریالیستییە لەبەرئەوەی بایەخی بە هێزە ناوەکییەکانی کارەکتەرەکانی دەدا پتر لە بایەخدان بە پێچەوانەکردنەوەی واقیع، ئیدی کەسایەتییەکانی بەلزاك هاوتەریب بوون لەگەڵ هێزی هەڵکشاوی بورژوازیدا کە خۆی وەك چینێکی ئەلتەرناتیڤی چینە خانەدان و فیودالیستەکان دەناساند.

کەواتە ریالیزم لەلای جۆرج لۆکاچ بریتی نییە لە وێنەگرتنێکی فۆتۆگرافیانەی واقیع، بەڵکو بریتییە لەو شێوازەی کە ئەدەب پەیوەست دەکات بە جەوهەری ئینسانەوە و بەو هێزە ناوەکییەی گۆڕانکاریی ڕیشەیی دروست دەکات، واتە ریالیزم لە ئەدەبدا بریتییە لە پەیوەندیی ئەو ئەدەبە بە دیالێکتیکی مێژوویی.

بـەڵام لوسـیان گۆڵـدمان بەشـێوەیەكی تـر دیدی ماركسیزمی بۆ ئەدەب نوێ كردەوە، ئەو لەرێگـەی تێكـەڵكردنی بونیادگـەری، كـە لـە لێكۆڵینـەوە ئەنترۆپۆلۆژییـەكانی ژان پیـاژێ و لیڤـی شتراوسـدا هـەبوون، لەگـەڵ ماتریـالیزمی مێژووییـدا، رۆحێكـی تـازەتری بـە ئـەدەبی ماركسیستی بەخشی.

لوسـیان گۆڵـدمان بەڕادەیـەكی زۆر كاریگەریی جۆرج لۆكاچی لەسەر بوو. لۆكاچ لە كتێبـە ناودارەكەیـدا (رۆمـانی مێـژوویی) بۆچوونەكانی خۆی دەربڕیوە، بەڵام گۆڵدمان لە زیاد لـە كتێبێك تیۆرییە ئەدەبییـەكانی پـەخش كردووە كە گرنگترینیان كتێبی (سۆسیۆلۆژیای رۆمـان)ە. گۆڵـدمان لـە زوربـەی نووسـینەكانیدا جەخت لەوە دەكات كە ئەو كارە ئەدەبییانەی لە سـەردەمێكی زەمەنیـدا دەنوسـرێن، هەوڵـدەدەن بونیـادێكی دەلالی پێكبهێـنن، ئـەو دیلالەتـەش ئاماژە بۆ روانینی هونەرمەندان و رۆشنبیران بـۆ جیهـان دەكـات، جـا بـۆ ئـەوەی لـەو روانینـە تێبگەین، دەبێ لێكۆڵینـەوەی كارە ئەدەبییـەكان بكـرێ بـەو پێیـەی ئەمانـە یەكەیـەكی سەرجەمگیرو گشتگیرن، خۆ ئەگەر پێچەوانەی ئەمـەمان كـرد، ئـەوا لێكۆڵینـەوەكانمان بـۆ كـارە ئەدەبییـەكان دەبـن بـە چـەند لێكۆڵینەوەیـەكی پـچڕ پـچڕ، رۆڵـی راسـتەقینەی ئـەدەب و هونـەر لەژیاندا دەشارێتەوە.

جیـاوازیی گۆڵـدمان لەگـەڵ بونیادگەراكانـدا ئەوەیــە كــە بونیادگــەراكانی وەك شــتراوس و پیـاژێ و رۆلان بـارت، بـە چەشـنێك لـە تێكست دەكۆڵنـــەوە، وەك ئـــەوەی دەق بونیـــادێكی ناوەكیی سەربەخۆیە، وەك چۆن لە مۆرفۆلۆژیدا (علـم الـصرف) لـە تـەنها وشـەیەك دەكۆڵرێتـەوە. بەڵام لای گۆڵدمان دەق بونیادێكی رێژەگەراییە، تــەواوكاریی ئــەو دەقــە دەوەســتێتە ســەر بـەدیهێنانی گونجـانی نێـوان ئـەو دەقـە و كـارە ئەدەبییەكانی دی، رێك وەك رەفتاری تاكەكەس كــە تــەنها لــەمیانی ســیاقی خۆیــدا چــاكە و خراپــەی لێكـدی جیـا دەكرێنـەوە، بـەم پێیـە لێكۆڵینەوەی كاری ئەدەبی ئەگەر نەخرێتە سەر سـیاقی كۆمەڵایـەتی، دەبێتـە كـارێكی فریـودەر، چـونكە نامانباتـە سـەر دۆزینـەوەی سـیفەتی كۆمەڵایەتیانـەی كـاری ئـەدەبی و هونـەری لـە كات و شوێنی دیاریكراوی خۆیدا.

گۆڵـدمان بیرە رەخنەییـەكانی خـۆی بەسـەر كـارە ئەدەبییـەكانی چیرۆكنوسـی فەرەنـسی فلوبێر و باسكال و كارە شانۆییەكانی راسینیدا پراكتیـزە كـرد، ئیـدی گەیـشتە ئـەم دەرەنجامـە: ئەو نزیكبوونەوەیەی كە چەند كارێكی ئەدەبی، لــە چــەرخێكی دیــاریكراودا، لــە یەكەیــەكی گــشتیدا كۆدەكاتــەوە، بــوونی روانینێكــی هاوبــەش لــەنێو داهێنــەرانی ئــەو كــارە ئەدەبییانــەدا ئاشــكرا دەكــات. لێــرەوە سۆســیۆلۆژیای ئــەدەب یــان كۆمەڵناســیی ئەدەبی، ئەو زانستەیە بایەخ بە كاری ئەدەبی و ئــەو ژینگــە كۆمەڵایەتییــە دەدات كــە كــاری تێــدەكات، بــەجۆرێك ئــەو ئەدەبــە دەكــات بەبەرهــەمی هوشــیاریی كــۆ، لــەوەش زیــاتر، ئــەدەب كــار لــەو كۆمەڵــە یــان لــەو گروپــە كۆمەڵایەتییە دەكات.

گۆڵــدمان لــە لێكۆڵینەوەیەكــدا لــەبارەی باسكال و راسین و رۆسۆ، روانینێكی یەكگرتوو بۆ جیهان ئاشكرا دەكات كە روانینێكی هەمیشە تراژیـدی و تاریكبینـە. لەراسـتیدا توێژینـەوەی گۆڵدمان لە ئەودیوی دەق بۆ گەیشتن بەو شتەی دەقەكـە گوزارشـتی لێـدەكات، بـووە مایـەی ســەرهەڵدانی رەخنــەی پێكهاتــەیی، ئــەم رەخنەیـەش هەوڵـدەدات وەڵامـی ئـەم پرسـیارە بداتەوە: چۆن كاری ئەدەبی پێك دێت؟ بۆیە ئەو میتۆدە كۆمەڵایەتییەی گۆڵدمان لە لێكۆڵینەوەی ئەدەبیــدا، بــە بونیادگــەریی پێكهاتــەیی

*GENETIC STRUCTURALISM* ناوبرا، چونکە ئەم میتۆدە تێکەڵەیەکە لە بونیادگەریی ئەنترۆپۆلۆژیستەکان و لە پێکهاتەیی، کە ئەمەی دوایی لە بنەڕەتدا بریتییە لە تێڕوانینی مێژوویی، بۆیە یەکێك لە لایەنگرانی گۆڵدمان دەڵێ: ئێمە ناتوانین سروشتی ئەدەب لە خۆیدا دیاری بکەین، یان ناتوانین باسی جەوهەری ئەدەب بکەین بەبێ لەبەرچاوگرتنی سەمتە (سیاق) مێژوویەکەی.

ئەگەرچی بۆ ئەمرۆکە رەخنەی سۆسیۆلۆژی پاشەکشەی کردووە و لەچاو نیوەی سەدەی بیستەم کاڵ بۆتەوە، بەڵام تا ئەمرۆش ژمارەیەك لایەنگری هەیە. ئەمڕۆ سۆسیۆلۆژیای ئەدەب شێوەیەك لە شێوەکانی توێژینەوەی زانستیی لەخۆ گرتووە کە بنەما و گۆشە و رێسای خۆی هەیە، کە سۆسیۆلۆژیای نووسەر و سۆسیۆلۆژیای خوێنەر و سۆسیۆلۆژیای راگەیاندنی بینراو و خوێنراویش دەگرێتەوە، هەروەها مەودای کاریگەریی ئەدەب لەسەر جەماوەرەکەی.

لێرەدا چەند گۆشەنیگایەکی رەخنەئامێز هەیە بۆ رەخنەی سۆسیۆلۆژیا، دەشێت لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورتیان بکەینەوە:

- گەڕان بەدوای ژینگەی کۆمەڵایەتیی نووسەر و ناوەرۆکی کۆمەڵایەتییانەی کاری ئەدەبی، بووە مایەی فەرامۆشکردنی خودی کارە ئەدەبییەکە و پتر تەرکیز دەکرایە سەر کۆمەڵگە وەك لە ئەدەب.

- رەخنەی سۆسیۆلۆژی جەخت لەوەدەکات کە ئەدەب گوزارشتکردنە لە کێشەکانی ئەو چینەی نووسەر ئینتیمای بۆ دەکات، سا ئەگەر نووسەرەکە سەر بە چینی بورژوازی بچووك بێت، ئەوە لە کارەکانیدا کێشەکانی ئەو چینە دەردەکەون، ئەمەش تێڕوانینێکە بۆ داهێنان رێگەی ئەوەمان بۆ ناکاتەوە کە دەشێت نوسەر لە چینەکەی خۆی یاخی بێت و مەرج نییە هەمیشە تەعبیر لەو چینەی خۆی بکات.

- جەختکردن لە رۆڵی فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکان لە بەرهەمهێنانی ئەدەب و هونەردا، لایەنی تاکەکەسیی ئەدیب فەرامۆش دەکات. رەخنەی سۆسیۆلۆژی ناتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە: بۆچی دوو نووسەر کە لە بارودۆخێکی کۆمەڵایەتیی هاوبەشدا دەژین و یەك خواست و هیوایان هەیە، کەچی یەکێکیان دەبێت بە نووسەرێکی بلیمەت و ئەوی دیکەیان ناگاتە ئەو پلەیە لە داهێنان؟

- شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی، بەها و قورسایی بۆ بەهرەی تاکەکەس دانانێت، هەروەها لایەنە سایکۆلۆژی و مەسەلە ئیستاتیکیەکان فەرامۆش دەکات. خودی تیۆری پێچەوانەکردنەوە وێناکردنێکی میکانیکیمان بۆ پرۆسەی نووسین پێشکەش دەکات.

- دەرەنجامەکانی رەخنەی سۆسیۆلۆژی، لەوانە چاوخشاندنەوە بە کەلەپووردا، هیچ سوودێکیان بۆ تیۆری ئەدەب نییە، بەڵکو تەنها سوودیان بۆ زانستی دیکەی وەك سیاسەت و کۆمەڵناسی و ئەخلاق و لەوانەیە بۆ فەلسەفەی ماتریالیزمی مێژوویی و ماتریالیزمی دیالێکتیکی هەبێت.

- بۆیە دەگەڕێینەوە و دەڵێین، زەحمەتە داهێنان و بلیمەتی لە کاری ئەدەبی و هونەریدا بگەڕێتەوە بۆ تەنها یەك لایەن لە لایەنەکانی مرۆڤ یان کۆمەڵگە.

**سەرچاوە:**


د.ابراهیم محمود خلیل، النقد الادبي الحدیث من المحاکاة الی التفکیك، دار المسیرة للنشر والتوزیع، الاردن- عمان، 2003.

# ئەدەبو رەخنەی خۆرئاوایی لە چاخی ڕێنیسانسدا

جۆرج پارفیت

لە عەرەبییەوە: د. شاهۆ سەعید

ئـەم لێکۆڵینەوەیـە لـە سـەدەی بیـستەمدا دەنوسم، لە سەردەمێکدا کە دیدوبۆچوونی ورد سـەبارەت بـە سروشـتی ئـەدەبو رەخنـە لـە پاشەکشێدایە. لەبەرامبەردا، ئێستا لە نێوەندە ئەکادیمیەکانـدا دیدوبۆچـوونی تـازە لـەو بارەیەوە دێنە ئاراوە. من لە کاتێکدا هەوڵدەدەم زاراوەی چاخی ڕێنیسانس (بێداربوونەوە *The Renaissance*) روون بکەمـەوە هوشـیاریی تـەواوم هەیـە بـەوەی کـە پێناسـە باوەکـان دەگەڕێنـەوە بـۆ سـەردەمانێکی کـۆن، بـەر لـە سەردەمی من، کە ئەڵبەتە کاریان لە من کردووە، هـەروەك چـۆن هـەموو ئـەو پێداچـوونەوەو هەڵسەنگاندنانەش، کە حاڵی حازر لەو بارەیەوە ئەنجامدەدرێن، کارم لێدەکەن.

فەرهـەنگی کـۆلینز *Collins English Dictionary 1979* پێناسـەیەکی سـانای ڕێنیسانس *Renaissance* پێشکەشدەکا بەوەی بریتییە لە ژیاندنەوە *revival* یان زیندوبوونەوە *rebirth*، بـەڵام هـەمان فەرهـەنگ چـاخی ڕێنیـسانس *The Renaissance* بـە زمانێـك پێناسـەدەکا کـە پەیوەسـتە بـە قۆناغـە مێژووییەکانـەوە، لـەو بارەیـەوە دەڵـێ: "قۆنـاغێکی مێـژوی ئەوروپایـە، چـاخی ناوەراستی ئاوابوو لە جیهانی مۆدێرنی هەڵاتوو جیادەکاتـەوە، بەگـشتیش ئیتالیـا خـاڵی دەسپێکی ئـەو چاخەیە لـە سـەدەی چواردەیەم بـەدواوە". بـەڵام گـەر بمانـەوێ ئـەو مـاوە مێژووییـە لـە ئینگلتـەرا دیـاری بکـەین دەڵـێین: ڕێنیسانـسی ئینگلیـزی لـە سـەدەی شـازدەیەم بەدواوە رووناکی بینیوە. گەر زارەوەی مێژویی چـاخی ڕێنیـسانس *The Renaissance* ببەسـتینەوە بـەمانای "ژیاندنـەوەو زیندوبوونـەوە" دەبـێ لـە بـواری هەڵسەنگاندنی رەخنەییـدا ئـەو کـارە ئـەنجام بـدەین. لێـرەوە پێناسەکەی فەرهەنگی کۆلێنز هاوکاریمان دەکا کاتـێ دەڵـێ: "چـاخی ناوەڕاسـتی ئـاوابوو *Waning*"، چـونکە ئـاوابوون مانـای ئـەوە دەبەخـشێ کـە شارسـتانیەتی چـاخەکانی

ناوەڕاست *medievalism* دووچاری خامۆشیو لەناوچوون دەبۆوە..، دەبوو ژانێکی نوێ بێتەگۆڕێ: چونکە ژیان زادەی مەرگە {بۆ لەدایکبوونی شتە نوێیەکان دەبێ شتە کۆنەکان بمرن}. بەڵام سەبارەت بە ئینگلتەرا دەمەوێ بڵێم: بەر لە هەڵاتنی خۆری ڕێنیسانسی ئیتالیو گەیشتنی تیشکی ئەو خۆرە بە کەنار دەریاکانی، ئینگلتەرا دەوڵەتێکی بەربەریی بوو، نوغرۆی دەریای جەهالەتی ئیمپراتۆریای ئەورووپیی بوو.

هەڵەیە گەر زاراوەی "چاخەکانی ناوەڕاست" تەنها بە مانا مێژووییە زەمەنییەکەی بەکاربهێنین. ناتوانین بەچاوێکی مێژوویی و بێلایەنانە بڕوانینە پرسەکە، وەك ئەوەی بڵێین چاخی شاژن ڤیکتۆریا، چونکە لە حاڵەتێکی ئاوهادا چاخی ڕێنیسانس لە هەموو ڕەگەزو بەهاکانی دادەماڵین. بەڵکو ئێمە لە بەر ڕۆشنایی بەها پەیوەندیدارەکانو مانای زەمانەوانیی زاراوەکە "ژیاندنەوەو زیندوبوونەوە" باس لە زاراوەکە دەکەین. بەڵام ژیاندنەوەی چی؟. ئەڵبەتە وەڵامی لۆجیکی دەڵێ: "ژیاندنەوەی کولتووری کلاسیکی *Classicism*"، واتە ئەو شتەی کە دەژێنرێتەوە دەبێ پێشتر گیانی لە دەستدابێ. لە نەریتی مرۆییشدا هەمیشە ژیاندنەوە وابەستەی ڕووداوە خۆشەکانو مردنیش پەیوەستە بە ڕووداوە ناخۆشەکانەوە. بەمجۆرە چاخەکانی ناوەڕاست لە هەموو ئەو بەها باشانە داماڵدراوە کە چاخی کۆنی کلاسیکی هەڵگریان بوو. گەر بەهای ژیاندنەوەی کولتووری کلاسیکی لە چاخی ڕێنیسانسدا بنرخێنینو شوێن پێی ئەو کاریگەرییە لە ئینگلتەرای سەدەی شازدە هەڵگرین، تێبینیی هەندێ دیاردەی بەهادار دەکەین، وەك وەرگێڕانەکەی سێری *Surry* بۆ شیعرەکانی ڤرجیل. بەڵام ڕەنگە هەندێ دیاردەی تر لەیاد بکەین کە هیچیان لەو وەرگێڕانە کەمتر، وەك لەناوچوونی نەریتی شیعری نەتەوەیی ناوازە سەبارەت بە سیستمی کێشو سەروا. خەسڵەتی دینامیکیو زیندووی پرۆسەی (لەدایکبوون/ مەرگ/ زیندوبوونەوە) بەرەو خولانەوەیەکی بازنەیی ڕاپێچمان دەکا، لەڕێگەی پەنجە خستنە سەر مەرجەکانی بوژاندنەوەو خامۆشبوونو لەناوچوون لەو قۆناغە مێژووییەدا کە هاوکات بوو لەگەڵ پرۆسەی هەڵسەنگاندنو نرخاندنی ڕەخنەییدا. لێرەوە دەڵێن: هاوزەمان لەگەڵ ئاوابوونی چاخی ناوەڕاستو سەرەتای سپێدەی جیهانی نوێ، چاخێك دەستی پێکرد کە لێوانلێو بوو لە زیندوێتیو تازەیی.

ئەم پێشەکییە مانای ئەوەیە کە پێناسەکردنی "چاخی ڕێنیسانس *The Renaissance*"، وەك زاراوەیەك کە گوزارشت لە سەردەمێکی مێژوویی دەکا، سوودێکی ئەوتۆ نابەخشێ، بەڵکو باشترە باس لە زاراوەکە بکرێ وەك تێرمێك کە لە هەناویدا ژیاندنەوەی کەلەپوری کلاسیکی ئامادەیە. واتە وەك هەموو ئەو زاراوانەی کە بەدەر لە "ئامرازی ناساندن" پێناسەیان دەکەین: ڕۆمانسیەت ، تەنانەت خودی کلاسیکیەت ، دەشێ زاراوەی ڕێنیسانسیش بەدەر لە مانا مێژووییەکەی، لە ماوەیەکی دیاریکراودا پێناسە بکەین، چونکە ئێمە لە بواری هەڵسەنگاندنی ڕەخنەییدا ئەو کارە ئەنجام دەدەین. کاتێ وشەی ڕێنیسانس لەگەڵ ئامرازی ناساندندا پێناسەدەکەین دەمانەوێ واتایەکی دیاریکراوی پێ ببەخشین، یان وەك میتافۆرێك لێی بڕوانین، هەروەك چۆن هەندێ جار دەوترێ ڕێنیسانسی سەدەی دوازدە *Twelfth Century Renaissance* (کە ئەوەش هەر بەڕاستی ناونیشانی کتێبێکی کریستۆفەر برووکە *Christopher Brooke,*

*1969*)، یـان دەوتـرێ پیـاوی ڕێنیـسانس *a Renaissance man*، واتـە ئـەو کەسـەی کـە هەڵگری خەسڵەتەکانی چاخی ڕێنیسانسە. گەر واتــای مێــژوویی و هەڵــسەنگاندنی ڕەخنــەیی پێکــەوە گــرێ بــدەین، ئــەوە پێویــستمان بــە زاراوەگەلێکی تر هەیە کە گوزارشت لە ڕێچکەی پێچەوانەی ڕێنیسانس بکەن لە هەمان چاخدا. لێــرەوە ئێمــە بــاس لــە "چــاخی ناوەڕاســت *Medieval*" دەکـەین بەهـەمان ئـەو مانایـەی کـە ســــەردەمی بەســــەر چــــووەو هــــەڵگری خەسـڵەتگەلێکی خراپــە، یــان تــەنها وشــەی "چاکسازی *The Reformation*" بەکاردەهێنین. ئەوەش لەیادناکەین کە دەستەواژەی چاکسازی ڕوون و بــێ گرفــت نیــەو چــەند پرســیارێك دەوروژێنـــێ: ئایـــا "چاکـــسازی *The Reformation*" بەشێکە لە چاخی ڕێنیسانس، یان ناکۆکە لەگەڵیدا؟ یان ئایا تا چ ئەندازەیەك ریفـۆرم و چاکسازی، کـە لـە بنەڕەتـدا لـەبواری ئاینـدا ئـەنجام دراوە، گوزارشـت لـە ریفـۆرمی ئـاینییش دەکـا کـە خەسـڵەتی دیـاری چـاخی ڕێنیسانسە؟

دەگەڕێینــەوە بــۆ ڕوونکردنــەوەی زاراوەی چاخی ڕێنیسانس، بەڵام ئەوە لەیادناکەین کە زاراوەیــەکی تەمومژاوییــە، ئــەوەش بەهەنــد وەردەگرین کە هەڵگری دەلالەتێکی بنەڕەتییە بۆ گوزارشـتکردن لـە ڕێـچکەیەکی دیـاریکراو کـە پێویــستی بــە هەڵــسەنگاندنی ڕەخنەییــە. فەرهــەنگی کــۆلێنز ئاماژەدەکــا بــۆ "بایــەخی ئـەکادیمیی چـڕ بـە بەرهەمـە کلاسـیکییەکان و هەلومەرجــە دنیاییــەکان دەخاتــە پــێش هەلومەرجــە ئــاینی و ڕۆحییەکانــەوە"، بەدیاریکراوی ئاماژە دەکا بۆ داهێنان و کەشفە زانستی و جوگرافییەکان و هەستکردن بە بەهای تاکەکــەس و تەقاندنــەوەی وزە شــاراوەکانی. لێرەوە کارێکی ئاسانە گەر پەنجە بخەینە سەر هۆکارەکانی ناڕەزایی دژی کولتوری چاخەکانی ناوەڕاست: ئاینێکی مەسیحی کە دژی کولتوری کلاســیکیی بتپەرســتیی بــوو، هــەروەها دژی فەلـسەفەی سکولاسـتیك *Scholasticism* بـوو، ئاینێك بانگەشەی بۆ پەیوەستبوون بـە ژیـانی ڕۆحییــەوە دەکــرد و بەچــاوی نــزم تەماشــای تاکەکــەس و بــەهاو خواســتە جەســتەییەکانی دەکرد. بەڵام بەهامان شێوە کارێکی ئاسانە گەر بڵــێین بانگەشــە پێــچەوانەکان لــە ئاســتێکی ئەوتۆی پێگەیشتن و کەماڵدا نەبوون کە بڵێین دەسـکەوتی دیـاری چـاخی ڕێنیـسانس بـوون، بەڵکو تەنها دەتوانین وەك بەڵگەی بوونی شـەڕی فیکـری بڕوانینـە پێکاهەڵپـژانی ئـەو بانگەشـە ناکۆکانـە، لەبابـەتی شـەڕی نێـوان کولتـوری چـاخی ناوەڕاسـتی ئـاوابوو لەگـەڵ کولتـوری چاخی ڕێنیسانسی هەڵاتوو. بەڵام فاکتەرەکانی ئـەو ململانێیـە وەك یـەك نـەبوون، چـونکە لـە ئینگلتەرا ململانێی نێوان خوێندنی نوێ *New Learning* لەگــەڵ خوێنــدنی کۆنــدا (واتــە ئەرسـتۆتالیی کـۆن و پلاتـۆنیزمی نـوێ) تـا کۆتاییــەکانی ســەدەی شــازدەیەم و دواتــریش بــەردەوام بــوو. گــەر دۆزینــەوەی هــەردوو کیشوەری ئەمریکا لەلایەن کۆلۆمبۆس-ەوە لـە ساڵی 1492دا ئاماژەیـەك بـوو بـێ بـۆ کەشـفە جوگرافییەکانی چاخی ڕێنیسانس، ئیدی چۆن دەتوانین لە مانای چەوساندنەوەی گالیلۆ بگەین پاش سەدەیەکی ئەو مێژووە؟ پاشان کەس لە ئینگلتەرا، تا سەدەی شازدەیەم، پشتیوانی لە پرنسیپی "هەستکردن بە بەهای تاکەکـەس و تەقینــەوەی وزە شــاراوەکانی" نــەدەکرد. شــانۆنامەی فاوســت *Faustus*-ی مــارلۆ *Marlowe* لەگەڵ شانۆنامەی هاملێت *Hamlet*-ی شکسپیر دوو درامای نەمرن کە گوزارشت لە ململانێی تاکەکەس دەکەن لە پێناو سەلماندنی خودی خۆیدا، لە کاتێکدا هەمان ئەو تاکەکەسە

هوشیار نیە بەرامبەر ئەو مەبەستەی ململانێی بۆ دەکا.

بە درێژایی سەدەی شازدەیەم، بەهۆی درێژبوونەوەی کولتوری {ئاینی} کە لە چاخەکانی ناوەڕاستەوە ڕێچکەی گرتبوو، هەروەها بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەو بیرۆکە لاهوتیانەیەی کە بزاوتی ریفۆرمی ئاینی و پلاتۆنیزمی نوێ بانگەشەیان بۆ دەکرد..، ژیانی رۆحی، وەك پێشو، بەهێزو بەپیت مایەوە. لە راستیدا مێژووی سەدەی شازدەیەمی ئینگلتەرا مێژووی ململانێیە لەنێوان هاندەرە ئاینییەکان و هاندەرە دنیاییەکاندا، هەربۆیە ناتوانین هەر وا بەئاسانی ئەو ململانێیە لە تاکە رستەیەکدا کورتبکەینەوە "ئاوابوونی کۆن و هەڵاتنی نوێ"، چونکە ساناکردنەوەیەکی ئاوها پرسەکە دەشێوێنێ.

رەهەندێکی تر لە ئارادایە کە دیدوبۆچوونمان لەمەڕ چاخی رێنیسانس روونتردەکاتەوە، ئەویش رەهەندی کۆمەڵایەتییە. کتێبەکەی کاستیلیۆنی *Castiglione* پیاوی کۆشك *Ilcortegiano* (کە ساڵی 1528) بڵاوبۆتەوە، بەرهەمێکی نایابی رێنیسانسی ئەوروپییە، بەهەمان شێوە تەرجەمەکەشی لەلایەن تۆماس هۆبی-یەوە *Thomas Hoby* بەرهەمێکی بایەخداری رێنیسانسی ئینگلیزییە. یەکێك لە مەبەستەکانی کاستیلیۆنی بریتی بوو لەوەی باس لە خەسڵەتەکانی پیاوی کۆشك *courtier* یان جێنتڵمان *gentleman* بکا. بەڵام ئەو دوو زاراوەیە هاوواتا نین، چونکە جێنتڵمان سەر بە ژیانی کۆشك نیە، بەڵام هەندێ جار تێکەڵ بەیەکدی دەبن و خەسڵەتی یەکتر دەگۆڕنەوە. هەردوکیان رۆڵدەبینن لە دیاریکردنی ریزبەندیی پلیکانەی کۆمەڵایەتی و کولتورییدا کە مۆرکی ژیانی کۆشك و هەڵسوکەوتی

ئاکارئامێز دەبەخشنە چاخی رێنیسانس، وەك شێوازی موڵکداریێتی سەروەت و سامان و دەسەڵات و خۆشگوزەرانی. زاراوەی جێنتڵمان (کەسی خاوەن ئاکارو بەخشندە) زاراوەیەکی پلاستیکییەو لە ئینگلتەرا لە زۆر بواردا بەکاردێ، هەربۆیە باشترە خۆمان لە بەکارهێنانی بپارێزین، چونکە پەیوەندی بە گروپێکی دیاریکراوی کۆمەڵایەتییەوە هەیە. بۆ نمونە فیلیپ سیدنی هەر لە دایکبوونەوە جێنتڵمان بوو، بەڵام شکسپیر بەرزکرایەوە بۆ پلەی "خاوەن شمشێری سوارچاك". ئەڵبەتە پەیوەندییەکی ئاشکرا لەنێوان بەهاکانی چاخی رێنیسانس و چینی ئۆرۆستوکراتیدا هەیە، کە لەسەر بنەمای موڵکدارێتی و سەروەت و سامانی مادیی دامەزراوە لەپێناو تێرکردنی خواستە کولتورییەکاندا، لەپێناو بەرزکردنەوەی ئاستی هوشیاریی تاکەکەس و پەروەردەکردنی چێژی هونەری لەڕێگەی کڕین و تەماشاکردنی کارە هونەرییە ناوازەکانەوە. واتە بەگشتی دەبوو تاکەکەس خۆی زیاتر فێر بکا و زیاتر پەرە بە هوشیاری و تواناکانی خۆی بدا تاوەکو ببێتە تاکێکی سەر بە "چاخی رێنیسانس" هەروەك لە پێناسەکەی پێشوودا باسکرا.

مەبەستمانە بڵێین: لە چاخی رێنیسانسدا کەمینە یان نوخبەی دەستەبژێر باڵادەست بوو، کە دیدو بۆچوونی خۆی دەسەپاند، هەرچی خەڵکی رەش و رووت بوو ئەو شانسەیان نەبوو، یان نەیاندەتوانی وەك نوخبە هەڵس و کەوت بکەن. رێنیسانس چاخێك بوو لەگەڵ ژن و پیاوە جوتیارەکاندا بەخشندە نەبوو، هەروەها شتێکی ئەوتۆی نەبەخشییە خەڵکە پیشەوەرەکان. لە راستیدا باڵادەستیی دیدوبۆچوونی نێرینەیی *male* بەسەر بەرهەمەکانی چاخی رێنیسانسدا سەبارەت بە جوامێری و خانەدانی کە تەنها لە پیاوان

دەوەشـــایەوە **gentleman**، مانـــای ئـــەوەی دەگەیاند کە چاخێکی ستەمگەر بوو لەئاست ژناندا و لەبری ئەوەی ئازادبکرێن و هان بدرێن بـــۆ تەقاندنـــەوەی وزە شـــاراوەکانیان خـــراپ بەکاردەهێنران. ڕەنگە یەکێك بڵێ لە ئینگلتەرای سەدەی شازدەدا چینە نزم و پەراوێزخراوەکان چەند دەسکەوتێکیان بەدەستهێناوە، بەڵام ئێمە دەڵـێین: مەبەسـت لـەوە کۆششکردنی چـینە نزمـەکان بـــوو تـــا بگەنـــەوە بـــە چـــینە ئۆرسـتوکراتییە باڵاکـان، یـان بـە دەربڕینێکـی وردتر دەیانویست ئەو دەسکەوتە کولتورییانە بەدەســتبێنن کــە مــۆرکی چینە باڵاکانی پێوە بوو، لە هـــەردوو حاڵەتەکەشـــدا باڵادەســـــتیی چـــــینی ئۆرســـتوکرات وەك خـــۆی مایەوە.

بەدرێـــژایی ســـەدەی بیستەم خەمی لێکۆڵیارەکان پێناســـەکردنی چـــاخی ڕێنیسانس بوو، ئەوان دژی بـــەخراپ نـــاوبردنی چاخەکانی ناوەڕاست بوون، جۆرێـــك لـــە کـــۆدەنگی ئـەکادیمی لەنێوانیاندا هاتـەئاراوە دژی بزاوتـی چاکـسازی لـــە چـــاخی ڕێنیسانـــسدا. ئـــەو لێکۆڵیارانە لە بەڵگاندندا پشتیان دەبەست بە ئیدمۆنـد سپنـسەر **Edmund Spenser** کـە هەرچـەندە یـەکێك بـوو لـە پێشەنگانی چـاخی ڕێنیسانسی ئینگلیـزی، بەڵام لـە هـەمان کاتـدا دژی ئەوە بوو خەسڵەتی خراپ بخرێتە پاڵ ئەو چاخە. بـەڵام زۆرجـار ئـەو مشتومڕە بـەجۆرێك کۆتـایی دەهـات کـە خـاوەن دیـدە جیاوازەکـان ڕاوبۆچـوونی یـــەکتریان پەســـەنددەکردو، وەك باسمـــانکرد، دەرەنجامـــە کۆمەڵایەتییـــەکانیان هەڵدەسـەنگاند. شـتێك کـە هـەموویان لەسـەری کـــۆك بـــوون بـــەباش باســـکردنی ڕێـــچکەی مرۆڤگـــەری (هیومـــانیزم **Humanism**) بـــوو، هەروەها سەلماندنی ئەو ڕاستییەی کە کولتوری کلاسـیکی و جـوامێری کولتـورێکی پەسـەندە. لێرەوە فیلیپ سیدنی نمونەی ئەو مرۆڤە بوو کە پیـــاوان وەك پێـــشەنگ تەماشـــایان دەکـــرد، هـــەروەها ســـتێلا *Stella*، خانمـــە پاڵـــەوانی عاشقی سۆناتەکانی ***Astrophel and Stella* (1591)**، کـە وێنەیـەك بـوو هەرچـەندە پیـاو دروسـتی کردبـوو، بـەڵام ببـوە وێنـەی نمونـەیی هەموو ئافرەتـان لـە نێوەنـدە کۆمەڵایەتییەکانـدا. سـەیر بوو ئەو بیرۆکانە تا سەدەی نـۆزدە لـە ئینگلتـەرا وەك بیرۆکـەی بـاو مانـەوە، بـە ئەندازەیـــەك پرســـیارمان دەربـــارەی ســـوودی ڕێنیـــسانس دەکـــرد لـــە ژیانماندا، کە ئایا بەڕاستی ئەو بەهاو بیرۆکە خراپانەی لـە ژیانمانـدا گـۆڕی کـە فەرهەنگی کۆلێنز ئیدانەیان دەکـا. بـەڵام بـەر لـەوەی


ماتیو ئارنۆڵد

وەڵامـی ئـەم پرسـیارە بدەینـەوە پێویـستە بەخێرایی ئاوڕبدەینەوە بۆ دوو وەرچەرخان کە لــە ڕەوتــی لێکۆڵینــەوە ئەدەبییەکانــدا لــە سـەرەتاکانی سـەدەی بیستەمدا سـەبارەت بـە مێـژوی سەدەی شازدەیەمی ئـەدەبی ئینگلیـزی ڕوویانـدا، چـونکە هـەردوکیان پەیوەندییـەکی تۆکمەیان پێکەوە هەیە.

وەرچـــەرخانی یەکـــەم ڕەنگدانـــەوەی پەرچـەکردارێك بـوو لەئاسـت کەسـانێکدا کـە پێیـانوابوو ڕێنیسانسی ئینگلیـزی لـە کۆشـکی شـاژن ئێلیزابێـسی یەکەمـەوە (1533–1603)

سەریهەڵداوە، چونکە ئەو کۆشکە جمەی دەهات بە هونەری شیعرو مۆزیكو هونەری شێوەکاریو تەلارسازی. ئەو واقعە کارێکی وایکردبوو ئینگلتەرا شان لە شانی وڵاتانی خاوەن رێنیسانسی وەك فەرەنساو ئیسپانیا بدا. بەڵام ئەم دیدە" چاخی رێنیسانسی ئینگلیزی" لە ماوەیەکی کورتدا چڕدەکاتەوە کە لە بیستو پێنج ساڵ تێناپەڕێ، کە لە کازیوەیەکی درۆزنی پاش سەدەی شازدەو چاخەکانی ناوەڕاستەوە دەستیپێکردووە. بەگوێرەی ئەم دیدە رێنیسانسی راستەقینە هاوزەمان بوو لەگەڵ شیعرەکانی ئیدمۆند سپێنسەردا ***Shepherds Calendar*** (1579).
بەڵام هەندێ لە لێکۆڵیاران پەرچەکرداری پێچەوانەیان لەمبارەیەوە نیشاندا، هەربۆیە بایەخی زۆریان بە توێژینەوەی شیعرەکانی تۆماس وایت ***Wyatt*** (1503–1542) داوە لەسەر حسابی شاعیرێکی کۆشکی ئێلیزابێسی وەك هێنری هوارد سێری ***Surry*** (1517–1547)، هەروەها لەڕووی رەخنەییشەوە هاوسۆز بوون لەگەڵ نوسەرێکی شانۆنوسی وەك جۆرج جاسکۆین ***Gascoigne*** (1525–1577)و شاعیرێکی وەك واڵتەر راڵی ***Raleigh*** (1552–1618)و نوسەرێکی وەك فۆڵك جریڤڵ (1554–1628). ئەڵبەتە بایەخی رەخنەیی وان لەمبارەیەوە لەسەر حسابی هەردوو شاعیری چاخی ئێلیزابێسی فیلیپ سیدنیو ئیدمۆند سپنسەر بووە.

وەرچەرخانی دووەم، کە وەرچەرخانی یەکەمی لێکەوتۆتەوە، بە دوو ئاقاردا کاری کردووە، هەندێ جار سەردەمی لوتکەی درەوشانەوەی رێنیسانسی ئینگلیزی پشتگوێ خستووە، هەندێ جاریش بەراوردکارییەکی دژ بە بەرژەوەندیی ئەو سەردەمە ئەنجامداوە کاتێ بەراوردی کردووە بە سەردەمی رێنیسانسێکی تر لە سەدەی حەڤدەدا، کە بە سەردەمی "قوتابخانەی دەن ***Den***" ناسراوە.

داستانی شیعریی "شاژنی جندۆکان ***The Faerie Queen 1596***" یەکێکە لەو کارانەی سپنسەر کە گوزارشت لەم دۆخە دەکا، چونکە نمونەی چامەی داستانئامێزی ئینگلیزییە لە دۆخی رێنیسانسدا. واتە لوتکەی هوشیاریی دانەرە لەئاست کارە کلاسیکییەکاندا، لەئاست بایەخی هەستکردن بە تاکەکەسو نەتەوەو وزە پەنهانەکانیان. سەرباری ناکاملێی ئەو داستانە، بەڵام لەڕووی ئیستاتیکییەوە نمونەی گەشەکردنی هونەری میللییە لەو قۆناغەدا، بەتایبەتی کاتێ دەڕوانینە پێکەوە گونجانو هارمۆنیی نێوان بەشەکانیو بایەخدان بە وردەکارییو رەگەزە جوانکارییەکان. پاشان وازهێنانی شاعیران لەم جۆرە شیعرە داستانئامێزەو بایەخدانیان بە جۆرێك لە شیعری لیریکی کە پشتئەستور بوو بە یەکێتی بەیتی شیعریی لەسەر حسابی هەڵقولانی خۆڕسکانەی بڕگە شیعرییەکان، هەروەها پشتئەستور بوو بە هەمەڕەنگیی کێشو ریتمو کورتکردنەوەی رستەکان. لەو چەشنە شیعرەدا جوانکارییەکی ساختە دەبەخشرێتە وێنەکانو ئالۆزیی جێگەی سانایيو نەریتپارێزی دەگرێتەوە کە نمونەکانیان لای سپنسەرو تەنانەت جۆن دان-یش بەدیدەکرێن. ئەڵبەتە چاپکردنی شیعرەکانی جۆن دان لەلایەن هـ. چ. گریسۆنەوە ***H. J. Grison***، پاشان بڵاوکردنەوەی هەڵبژاردەیەك لە شیعری میتافیزیکی ***metaphysical poetry***، هەر لەلایەن گریسۆنەوە، رۆڵیان لەم وەرچەرخانەدا وازیکردووە. بەڵام ئێمە ناتوانین تیۆرەو کارە پراکتیکییەکانی ئیلیۆت ***Eliot*** لەیادبکەین، کە تیایاندا بنەمای مێژویی پەیوەندیی نێوان ئەو وەرچەرخانەو رەوتی مۆدێرنیزم ***modernism***

لای شاعیرە فەرەنسیەکانی سەدەی نۆزدەو لە داهێنانەکانی خۆشیدا ئاشکرا دەکا. رەنگدانەوەی کەلەپوری شیعریی سپنسەر لە چامەی "وێرانەخاك "ی ئیلیۆت–دا هیچ نیە جگە پریشکی ئەو وێنانەی کە وەك لاسایی تەوسئامێز وەگەڕخراون، لە هەمان کاتدا دەیەوێ ئەوە دەربخا کە نەریتەکانی چاخی رێنیسانس بۆ چاخی ئیلیۆت دەست نادا.

تا ماوەیەکی درێژ قوتابخانەی رەخنەی نوێ *New Criticism* سەرسام بوو بە ئیلیۆت، بەتایبەتی ئەو بزاوتە رەخنەییەی کە رەخنەگر ف. ر. لاڤیس *F. R. Lravis* لە گۆڤاری "سکروتینی *Scrutiny*"دا بەڕێوەی دەبرد. زۆرجار لاڤیس دژی بۆچوونی ئەو کەسانە بوو کە پێیانوابوو ئەوو لایەنگرەکانی بەچاوی سووك تەماشای سەدەی شازدە دەکەن. بەلام لە راستیدا ئەوە هەلویستە رەخنەییەکانی وی بوون کە سەرنجی زۆر کەسیان راکێشا بۆ لای چەند شاعیرێکی ئەو سەدەیە، لە بابەتی تۆماس وایەتو جاسکۆیین..، بەلام کارە رەخنەییەکەی لە کتێبی "هەلسەنگاندنەوە *Revaluation (1936)*"دا بایەخێکی ئەوتۆ نادا بە شیعری ئینگلیزیی سەدەی شازدەیەم. جگە لە چەند ئاماژەیەکی خێراو پچڕ پچڕ دەربارەی شکسپیر. لاڤیس پێیوایە سەرهەلدانی شیعری ئینگلیزی لە سەدەی حەڤدەیەم بەدواوە، لەگەل دۆن *Donne*، جۆنسۆن *Johnson*و مارڤێل *Marvell*دا دەستی پێکردووە، کە لە چوارچێوەی نەریتە شیعرییە نیشتمانیەکاندا، بەدەر لە کەلەپوری کلاسیکی، باسیان دەکا. ئیدی وشەگەلێکی وەك "پێگەیشتن *maturity*"و "شارستانیو بەرز *civilized*".. بوونە زاراوەگەلێکی بنەڕەتی کە لەسەر زمانی رەخنەگران، کە لە ستایشی ئەم جۆرە شیعرەدا دووبارە دەبنەوە، زیاتر لەو وشانەی کە لە ستایشی شیعری سەدەی شازدەدا بەکاردەهاتن، وەك: زمانشیرین *courtly*و کەشخە *genteel*.

گۆڤاری *Scrutiny*و قوتابخانەی رەخنەی نوێ لە میتۆدەکەیاندا زیاتر بایەخیان بە رەخنەی پراکتیکی دەدا *Practical Criticism*، کە توخنی مەعریفە پێشوەختو مەعریفەی بەدەر لە دەق ناکەون، هەروەها پێویستیان بە گەڕانەوە بۆ کتێبخانەکانو راوێژکاریی ئینسایکلۆپیداو فەرهەنگەکان نیە. هەندێ لە نوسەران هەلوێستی چەند رەخنەگرێکی وەك لاڤیسو هاوسەرەکەیو نایتس *L. C. Knights* دەبەستنەوە بە پێگەی کۆمەلایەتییانەوە کە دیدی رەخنەییان دیاری دەکا، چونکە بەڕای وان گەشەی ئەدەبی لە دیدێکی کۆمەلایەتییەوە یاخیبوونی چینی بۆرجوازیی لێدەکەوێتەوە دژی بالادەستیی چینی ئۆرستوکرات. یەکێك لە هەنگاوەکانی یاخیبوون بریتیە لە تێکشکاندنی ئەو سیمبولە مەزنانەی کە سەر بە کۆشکی پادشایەتین، کە بەشدارییان کرد لە بنیاتنانی رێنیسانسی شیعری ئینگلیزیدا، لە جێی ئەوان سیمبولی نوێیان هێنایە ئاراوە کە سەر بە ژاوەژاوی ژیانی ئاسایی بوون لە شارەکاندا، وەك (دۆن، جۆنسۆنو مارفیل). دواجار خودی بزاوتی گۆڤاری *Scrutiny* بووە بەشێك لە بزاوتێکی چینایەتی کە بایەخی بە نوخبە (دەستەبژێر *elitist*) دەدا. واتە نوخبەیەك جێگای نوخبەیەکی تری گرتەوە، دامەزراوەیەك چووە جێی ئەوی پێشوتر، چونکە بزاوتێك بوو بڕوای بە لێکۆلینەوەی فاکتەرە مێژوییو کۆمەلایەتیەکانو چالاککردنیان هەبوو لە گەشەی ژیانی ئەدەبیدا، هەربۆیە چاوەڕێی ئەوەی لێ ناکرێ کە بایەخێکی ئەوتۆ بدا بە چاخی رێنیسانس.

لــە ســاڵانی چــلەکانەوە تــا حــەفتاکان، گۆڕەپانی ڕەخنەی ئەدەبیی ئینگلیزی لەلایەن لاڤیس‌و گۆڤاری *Scrutiny* پاوانکرابوو. بەڵام چەند ڕەخنەگرێکی تر بەرەنگاریان بوونەوە، لە بابەتی: ف. و. بیتسیۆن *F. W. Bateson*و ئی. ئێم. تیلیارد *Tillyard*و لویس *C. S. Lewis*، کە دژی لاڤیس‌و لایەنگرانی بوون سەبارەت بە میتۆدو ئەنجام‌و هەڵسەنگاندنەکانیان بۆ چاخی ڕێنیسانس کە کەمبایەخانە تەماشایان دەکرد. بەڕای لویس، کە یەکێکە لە بەرگریکارانی کولتووری چاخەکانی ناوەڕاست، سەردەمی ڕێنیسانس، بەتایبەتی سەردەمی ئێلیزابێسی، باشترە لە کولتوری سەدەی شازدەی چاخەکانی ناوەڕاست. لە کاتێکدا لویس‌و لاڤیس بەرگری لە سپنسەر دەکەن، بیتسیۆن-ی هاوڕێیان لەئاست سەردەمی ڕێنیسانسی ئێلیزابێسیدا بە وریاییەوە هەڵوێست وەردەگرێ. واتە هەرچەندە وەك دوو هاوڕێکەی یەك بۆچوونی گشتیی هەیە لە لێکۆڵینەوە دەربارەی گەشەکردنی ژیانی ئەدەبی، بەڵام رای پێچەوانەی هەیە سەبارەت بە کەسایەتیەکانی ئەو دەمە. واتە تا ئێستا نمایشە شانۆییەکە بەردەوامە، ئەوەی گۆڕاوە تەنها ئەکتەرەکانە. لەمبارەیەوە بڕوانە: وردەکارییەکانی دنیای سەردەمی ئێلیزابێسی کە لەگەڵ کتێبەکەی تلیارد-دا پێکەوە دەگونجێ "وێنەی جیهانی ئێلیزابێسی *The Elizabethan World Picture* *1943*".

هەڵوێست وەرگرتن بەرامبەر چاخی ڕێنیسانس، چ لەلایەن ئەوانەوە کە بەرگریی لێدەکەن‌و چ لەلایەن ئەوانەوە کە دژی دەوەستنەوە، پێویستی بە لێکدانەوەی ئەو قسەیە هەیە کە دەڵێ: چینی ئۆرستوکرات، واتە چینی پیاوانی کۆشك‌و پیاوانی نزیك کۆشك، باڵادەست بووە بەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکانی چاخەکەدا. گۆڤاری *Scrutiny* کۆششێکی ڕەخنەیی گرتبووە ئەستۆ سەبارەت بە سەرلەنوێ نوسینەوەی مێژووی ڕاستەقینەی ئەدەبی ئینگلیزی، کە ئەڵبەتە کۆششی بایەخدار بوون، بەڵام ئەو وتارانەی کە باسیان لە مێژووی کۆمەڵایەتی دەکرد بەڵگەی ئەوە بوون کە ئەو کۆششانە زادەی دیدێکی سۆزداری بوون دژی بەها کۆنەکانی گوندنشینی، کە لەسەر بنەمای پلەبەندیی چینایەتی دامەزرابوون‌و باڵادەستیی چینی ئۆرستوکراتییان دەسەلماند. پاشان لە ماوەیەکی تردا، دیدێکی نوێ سەبارەت بە چاخی ڕێنیسانس، وردە.. وردە، هاتەئاراوە، کە لەگەڵ ئەوەی پێشودا تەواو پێچەوانە بوو، دیدێك کە لە وتەزایەکی گرنگی کتێبەکەی ریمۆند ولیامس-ەوە وەرگیرابوو "گوندو شار *Rymond Williams: The Country and the City*".

بەر لە هەموو شتێك دان بەوەدا دەنێین کە کتێبەکەی ولیامس هەوڵێك نیە بۆ پێشکەشکردنی وێنایەکی کامڵ دەربارەی چاخی ڕێنیسانس‌و بەهیچ جۆرێك تەرخان نەکراوە بۆ سەدەی شازدەیەم. لە بەشی دەسپێکی کتێبەکەدا نوسەر ئەم خاڵە ڕوون دەکاتەوە، بەتایبەتی کاتێ دەڵێ ئەو هوشیاریی ڕیشەیی‌و تایبەت بە ژیانی خۆی هەیە سەبارەت بە بابەتی شارو لادێ، بەتایبەتی لە ناوچەی نێوان ئینگلتەراو وێڵزدا. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بایەخ دەبەخشێتە کۆششەکانی ئەو، کە لە بیروبۆچوونی ماتیۆ ئارنۆڵد *Matthew Arnold (1822-1888)* دەترازێ، کە بڕوای بەو کولتوورە جەوهەرییە هاوبەشە هەبوو *essentailism* کە جیاوازییە فەردییەکانی نەدەسەلماند. لەوەش زیاتر ڕەهەندێکی چینایەتی دەبەخشێتە کتێبەکەی‌و پاڵپشتیی

دژایەتیکردنی شیعری گوندنشینی *Country House Poetry* دەکا، کە تەوەری بەشێکی کتێبەکەیە بۆ قسەکردن دەربارەی چاخی ڕێنیسانس.

دەروازەی نوسینەکەی ویلیامز بۆ خوێندنەوەی چەند چامەیەکی شیعریی، لە بابەتی چامەکەی جۆنسۆن "بۆ گوندی پنشێرست *To Penshurst*"، دەروازەیەکی ڕەخنەییە بۆ شیعریی شوانکارەیی *pastoral*، کە تیایدا ئیدعای ئەوە دەکا مێژووی ئەدەبی شوانکارەیی تۆمەتبارە بەوەی بۆشایی لەنێوان سروشت *Nature*و هونەر *Art*دا فراوانترکردووە. بەڕای وی چامەی ناوبراو باسی لەو تێکۆشانو ململانێ سەختە نەکردووە کە جوتیار بە زەوییەوە دەبەستێتەوە، چونکە زیاتر لەگەڵ چینی ئۆرستوکراتدا هاوسۆزە. سەرباری شکستی ویلیامز لەم خوێندنەوە ڕەخنەییەدا، سەرباری بەدتێگەیشتنی لە سروشتی ژانری شیعری شوانکارەیی، سەرباری ئەوەی کە تەنها دەربارەی یەك جۆر چامەی شیعریی سەدەی حەڤدە قسەدەکا...، بەڵام کتێبەکەی بەتاڵ نیە لە چەندین زانیاریی بەسود کە ڕۆشنایی دەخاتە سەر شێوازی تێگەیشتن لە چاخی ڕێنیسانس.

دیدێکی تر لە ئارادایە دەربارەی چاخی ڕێنیسانس کە لە بەشی یەکەمی کتێبێکدا هاتووە، تایبەت بە چاخی شکسپیر، بەناونیشانی "ڕێبەری پێلکان بۆ ئەدەبی ئینگلیزی *Pelican Guide to English Literature 1955*". ئەو دیدە جەخت لەوە دەکاتەوە کە هێزی ئەو چاخە ئەدەبییە زادەی پێکەوەگرێدانی کەلەپوری کلاسیکییە لەگەڵ کەلەپوری میللیدا، دوور لە لایەنە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکان، بەڵام هەمان ئەو دیدە زۆر بە جدی گفتوگۆ ناکا دەربارەی بۆچوونی ئەو کەسانەی، کە لە دیدیی ئایدۆلۆجیی دژ بە چینی ئۆرستوکراتەوە، نکوڵی لە چاخی ڕێنیسانس دەکەن.

بەهەر حاڵ، دیدی ولیامز بۆ چاخی ڕێنیسانس زادەی وێنایەکی ڕەخنەییە کە لە بنەڕەتدا بایەخ بە بۆچوونی پەراوێزخراوەکان دەداو گوێ بۆ ڕاوبۆچوونی چینە نزمەکانی کۆمەڵگا ڕائەدێرێ، وێنایەك کە لە دنیای مارکسیزمدا دەسوڕێتەوەو لەلایەن چەند مێژوونوسێکەوە پێڕەودەکرێ، وەك: ڕۆدنی هیڵتۆن *Rodney Hilton (1977)*، کریستۆفەر هیڵ *Christopher Hill (1958)*. ئەگەر ولیامز بەچاوی گومانەوە تەماشای "شیعری گوندنشینی" کردبێ، وەك ریکلامێك بۆ چینی ئۆرستوکراتی (هەر بۆ یادهێنانەوە ئەم شیعرانە هەڵگری پەیامێکن لە چوارچێوەی دیدێکی هاوسۆزدا لەگەڵ سیستمی شانشینیو بەرپرسیارێتی چینی ئۆرستوکرات)، هەربۆیە ئاساییە کە بەچاوی گومانەوە بڕوانێتە تەواوی ئەو بەهاو شێوازی ژیانەی کە لە کۆشکی شانشینیو لەلایەن چینی ئۆرستوکراتی چاخی ڕێنیسانسەوە پێڕەودەکران. پاشان سیمبوڵو نمونە تاکگەرییەکانی چاخی ڕێنیسانس کەوتن، ئیدی کەسێکی وەك سێر فلیپ سیدنی وەك نمونەی هەڵسوکەوتی بەرز نەمایەوە، کە پیاوان لاساییان دەکردەوە...، هەروەها



براکەیشی سێر رۆبێرت سیدنی، کە بۆ ماوەیەك نیشتەجێی گوندی "بنشرست" بوو، بووە نموونەی کەسێکی سەردەم بەسەرچوو کە سەرگەرمی مەی نۆشینی بەردەوام بوو. بەکورتی دیدی رەخنەگرانەی ولیامز بۆ شێوازی ژیانی ئۆرستوکراتی، بۆ شیعری ژیانی گوندنشینی، کتێبەکەی دەکاتە دەروازیەکی پڕ بایەخ کە رێگا رووناك دەکاتەوە بۆ دیدێکی هاوچەرخانەی جیاواز سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی چاخی رێنیسانس، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە هەموو ئەو پرسانەی مەبەستمانن بەتەواوی یەکلایی بوونەتەوە.

لێرەوە، ئەوە روونەبێتەوە کە ولیامز بۆچوونێك دەخاتەروو زادەی لێکدانەوەی فەلسەفەی سیاسییە بۆ کۆمەڵگەی چینایەتی، بۆچوونێکی دژ بە بۆچوونی ئەو کەسانەی کە پێیانوایە چاخی رێنیسانس چاخی نموونەی تاکەکانە، وەك: سیدنی و ستێللا. واتە ئاماژەدەکا بۆ چەند ئاڵتەرناتیڤێك بۆ هێورکردنەوەی دیدی نەریتی و ئەو هەڵمەتەی کە دژی چاخی رێنیسانس پێڕەوکراوە، داوادەکا کە پێداچوونەوەی زیاتری بۆ بکرێ. لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە گەڕان بەدوای رێچکەی ئاڵتەرناتیڤدا دەستپێدەکا، وەك رێچکەی مێژووگەریی نوێ، یان نوێکراوە، بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی کۆمەڵگا لەبەر رۆشنایی بزوتنەوەی ئەدەبی بەگشتی کە فرەیی سەرچاوەکانی چاخی رێنیسانس و هەمەجۆریی رێچکەکانی بەهەند وەردەگرێ، واتە وەك تەنها سەرچاوەیەك و تاکە رێچکەیەك لێی ناڕوانێ. هەرچەندە دیدی ولیامز دەنگدانەوەیەکی گەورەی بەخۆوە نەبینیوە و تا ئێستاش هەر بۆچوونە نەریتیەکان دەربارەی چاخی رێنیسانس جڵەوی لێکۆڵینەوە ئەدەبییە نوێیەکان دەکا، وەك لێکۆڵینەوەکەی گاری واڵر *Gary Waller* "شیعری ئینگلیزی لە سەدەی شازدەیەمدا *English Poetry in the Sixteenth Sentury (1986)*"، بەڵام چەند سەرەتایەکی گرنگ لە دەرکەوتندایە کە رەنگە وەرچەرخانی گەورە لەگەڵ خۆیاندا بێننە گۆڕێ. لێرەوە دەکرێ لێکۆڵینەوەکان ئاوڕبدەنەوە بۆ ئەدیبانی چاخی رێنیسانس، کە خاوەنی شانسێکی ئەوتۆ نەبوون و لێکۆڵینەوەکان بایەخیان پێ نەداون، وەك هەردوو ئەدیبی کۆمیدی جۆن مارستۆن *J. Marston (1575-1634)* و جۆزیف هۆڵ *J. Hall (1574-1656)*، هەروەها ئەو کەسانەی کە بایەخیان بە بڵاوکردنەوە دەدا، لە بابەتی تۆماس ناش *T. Nashe*. رەنگە لەوەش گرنگتر پێویست بکا چاوبگێڕینەوە بە رێکخستنی ئەو خاڵانەی کە لەبەرترن، تا پێودانگی بۆچوون دەربارەی چاخی رێنیسانس لە دۆخێکی دیاریکراودا بگیرسێتەوە. با چەند نموونەیەك لەمبارەیەوە بهێنینەوە: ئێمە گەر بایەخ بدەین بە لێکۆڵینەوە لەبارەی کاریگەریی ئاینزای پرۆتستانت لەسەر سیدنی، ئەوا ئەو بایەخەی ئێمە لەگەڵ لۆجیکی ئیستاتیکیی هونەری شیعریی ئەودا یەکدێتەوە. کاتێ دەڕوانینە نەریتی چاودێریکردنی ئەدیب و هونەرمەندان لەبەر رۆشنایی دۆخی کۆمەڵایەتی و ئابوریی ئەو دەمەی ناوچە جیاوازەکان، دەبینین خەسڵەتی لۆکاڵی و ئەدگاری نیشتمانی کە رۆڵێکی گەورەیان وازی کردووە لە تێگەیشتنی کولتووری سەرلەبەری چاخەکەدا. گەر ئاوڕبدەینەوە بۆ چالاکیی ئەدەبی شانۆگەریی کۆمیدی کە هۆڵە شانۆییەکانی *Inns of Court* لە لەندەن بەو چالاکییە جمەیان دەهات، مەزاجی گشتی ئەو چاخەمان بۆ دەردەکەوێ کە تا چ ئەندازەیەك کۆمیدی و پڕ پشێویی میللی بووە، بەپێچەوانەی هەموو ئەو شتانەی کە لە

تابلۆکانی هیلیار *Hilliard*دا بەدیدەکرێن، کە لێوانلێون لە وردەکاری و هونەری جوانکاری.

لەبەر رۆشنایی هەموو ئەو شتانەی باسکران دەکرێ خوێندنەوەمان بۆ وایت، جاسکۆین، راڵی، دۆن و ئەدیبگەلێکی تر.. خوێندنەوەیەك بێ مەزاجی ئاڵۆزی ئەو چاخە بەرجەستە بکا..، هەروەها دۆخی نیگەرانی و رۆحی تێکۆشان و هۆکارەکانی شکست دەربخا کە باڵیان بەسەر ئەو دەمەدا کێشابوو. بەڵگەی ئەم پرسە لەوەدا دەردەکەوێ کە هەوڵ و کۆششی سپنسەر بۆ وتەزاکانی چاخی ئێلیزابێسی دەربارەی دادپەروەریی لە داستانە شیعرییەکەیدا "شاژنی جندۆکان" (کتێبی پێنجەم) بەشکست کۆتایی هات. هێمایەکی تر هەیە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو سەردەمە لێوانلێو بوو لە کەف و کوڵ و هەڵچوون..، پڕ بوو لە پەیوەندیی پشێو لەنێوان سیستمی شانشینی و کۆمەلانی خەڵك. ئەو هێمایە لەسەر هێڵێکی تەریب دەڕوا لەگەڵ ئەو بابەتە سەرەکییەی کە شانۆنامە شیعرییەکەی تۆماس دیکەر *Thomas Dekker* "رۆژی پشووی پینەچی *The Shoemaker's Holiday (1600)*" گوزارشتی لێدەکا.

رێکخستنەوەی خاڵە گرنگەکان و هەڵوەشاندنەوەی ئەو دیدە تەقلیدییەی کە دژە لەگەڵ رێنیسانسی ئەدەبیی ئینگلتەرا..، دوو پرسن لەپێناو ئەرکێکدا کە لێکۆڵینەوە هاوچەرخەکان ئەنجامی دەدەن بۆ پێداچوونەوە بە سەرلەبەری مێژووی حوکمی بنەماڵەی تیۆدۆر *Tudor* (1485–1603)دا. ناونیشانی یەکێك لەو لێکۆڵینەوانە بریتییە لە "چاخی شاژنە ئەلیزابێسی یەکەم *ed.by Haigh, The Reign of Elizabeth*". ئەم کۆششانە هاوتان لەگەڵ پرۆسەی زیندوکردنەوەی رێچکەی مێژوگەری لەو لێکۆڵینەوە ئەدەبیانەدا کە بایەخ دەدەنە خەسڵەتە شەخسی و جیاوازییە

تایبەتیەکانی تاك و کولتورو کۆمەڵگا، واتە بەگشتی و بێ وردبوونەوە ناڕواننە ئەو خەسڵەت و جیاوازییانە. هەروەها گوشاری بزاوتی ژنانی هاوچەرخ *feminism* گومان دروست دەکا سەبارەت بە تاکڕەهەندیی دەقی ئەدەبی و قەتیسبوونی لە تەنها ژانرێکدا دوور لەوانی تر..، ئەوەش پرسێکی پڕبایەخی چاخی رێنیسانسی ئینگلیزییە کە لە سەردەمی ژنێکدا گەیشتە چڵەپۆپەی کەماڵ، ئەویش ئێلیزابێسی یەکەم بوو. راستە ئەو شاژنە لە نێوەندێکدا کاری دەکرد کە پیاو بەسەریدا زاڵ بوو (جا ئیتر بە ئارەزووی خۆی بووبێ یان بەسەریدا سەپێندرابێ)، بەڵام خۆی لە خۆیدا سەلماندنێکی ئاشکرای پێگەی ژن بوو لەو چاخەدا. هەروەها ئەوەش راستە کە شیکردنەوەیەکی زانستیی گشتی لەئارادا نیە سەبارەت بە کەسایەتی ئەفسانەیی ئەو شاژنە لە دیدێکی مێژویی فێمینیستییەوە *feminist historian*، بەڵام دیدی پیاو بەرامبەر ژن لە چاخی رێنیسانسدا دیدێکی گوماناوی بوو. بایەخدان بەو پرسە دەگەڕێتەوە بۆ نوسینی پیاوان دەربارەی ژنان لەلایەکەوە، لەگەڵ نوسینی ژنان لەسەر خۆیان لەلایەکی ترەوە. ئیدی لەوە بەدواوە دیدی گشتی بەرامبەر کەسێکی وەك "ستیللا" گۆڕانی بەسەر دێ و دەبێتە نمونەی ژن لەو دەمەدا، وێنەی زەینیی بەرامبەر ژن بەگشتی هەژان بەخۆوە دەبینێ و سەرلەنوێ رۆڵی ژنە ساحیرەکان لە شانۆنامە نەمرەکەی شکسپیر "ماکبێس"دا دەبێتەوە مایەی پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندن.

پاشان، لە مەودایەکی دوور خایەندا، ئەو دۆخە وەرچەرخانێکی گەورە دروستدەکا، کە لە سایەیدا لەبری بایەخدان بە بەرهەمی چینی ئۆرستوکرات بایەخ دەدرێتەوە بە دەسکەوتی کەرتە پەراوێزخراوەکانی کۆمەڵگا، هەروەها ئەو

دیدەی کە پێیوایە چاخی ڕێنیسانس چاخی چینی ئۆرستوکراتە دەچێتە ژێر باری ڕەخنەوە. هەروەك چۆن گومان دەکرێ لە لێهاتویی ڕێچکەی مرۆڤگەری (هیومانیزم ***Humanism***) کە کەلەپوری کۆنی کلاسیکیی پیرۆزدەکرد لەسەر حسابی کەلەپوری سکولاستیکی چەقبەستووی چاخەکانی ناوەڕاست. لەلایەکی ترەوە ئەم دۆخە دەبێتەهۆی دیاریکردنی واتای ئەو وشەو ئاوەڵناوانەی کە خەڵکی بۆ وەسفی ئەو چەرخە بەکاری دێنن (وەك کێماسی ***Flaw***، پشێوی ***tension***، ڕوخاندن ***subversion***و بەرەنگاری ***resistance***)، کە لە ڕەوتە ئایدیولۆجییە ڕەخنەییە باوەکاندا زۆر بەرگوێمان دەکەون، وەك ڕەوتی ڕەخنەی نوێ ***New Criticism***. بەڵام بایەخدانی زۆری ڕەخنەی نوێ بە قوتابخانەی دۆن ***Donne*** بە تەنها، پشتئەستور نیە بە بنەمایەکی مادیو بە بۆشاییدا دەسوڕێتەوە، لە کاتێکدا پشتبەستن بە بەڵگەی مادیی ئەدگارێکی دنیابینی هاوچەرخە بۆ خوێندنەوەی ڕێنیسانس.

ئەمە مانای ئەوە نیە کە سەرلەنوێ خوێندنەوەی چاخی ڕێنیسانس پێشکەوتنی گەورەی بەخۆوە بینیوە، چونکە گەر پرسیار بکەین لە خوێندکارانی زانکۆ ئەمریکییەکان دەربارەی مانای چاخی ڕێنیسانس، ئەوا ئاستی وەڵامەکانیان نزمەو زاراوەی ڕێنیسانس جێ‌بایەخی ئەوان نیە. بەڵام ئەوە سەیر نیە بۆ ئەو خوێندکارانەی کە زۆربەیان دەقەکانی سەدەی شازدەو مێژووی ئەو دەقانەیان لە خوێندنگاکاندا نەخوێندووە. تەنانەت ئەگەر شتێکیش دەربارەی ڕێنیسانسی ئینگلیزی بزانن، مێژووی ڕێنیسانسی ئەوروپی بە نەناسراوی دەمێنێتەوە. ڕەنگە هەمان وێناکردن لای بەشێکی زۆری خوێندکارانی خوێندنی باڵاو پسپۆڕانیش ببینینەوە، چونکە هەرچەندە ئەوانیش چاخی ڕێنیسانس دەناسنو لایان پەسەندە کە شارەزاییان دەربارەی هەبێ، بەڵام لەو بارەیەوە زۆر وردنین.

بێگومان، لە دۆخێکی ئاوهادا، پێشوازی لە هەر وەرچەرخانێك دەکەین لە ڕەوتی لێکۆڵینەوە ڕەخنەییەکان دەربارەی چاخی ڕێنیسانس، چونکە دەبنەهۆی ژیاندنەوەو سەرلەنوێ هەڵسەنگاندنەوەی. ئێمە پێویستمان بە تێگەیشتن هەیە لە سیستمی ئەو بەهایانەی کە ڕۆچوونەتە بیروباوەڕی کۆمەڵگاوەو پێوەرە ئەدەبییەکانی ئاراستەدەکەن. توخمەکانی ئەو سیستمە تەواوکەری یەکترنو ناکرێ هەندێکیان بسەلمێندرێنو هەندێکیان وەلابنرێن. بۆ نمونە ناکرێ کەسێکی خاوەن دیدی سۆشیالیستی ***socialist*** باس لە بەرهەمی ئەدەبیی چاخی ڕێنیسانسی ئێلیزابێسی بکا وەك کەسێك کە بوغزی بەرامبەر دەسەڵاتی کۆشکی شانشینیو شێوازی پلەبەندیی چینایەتی هەیە. هەروەك چۆن نابێ کەسێکی خاوەن دیدی بابەتیو بێلایەن باس لە بەرهەمی ئەدەبی بکا بەدەر لە دۆخە کۆمەڵایەتیو سیاسیەکان کە هاوزەمانی بوون، چونکە سەرلەبەری بەرهەمی کولتوریی ئەو چاخە لەژێر کاریگەریی دیاردەو بەهاکاندا بووە. باشتر وایە هەموو دەروازە ئایدیۆلۆجیو فیکرییەکان لەگەڵ پێوەرە ئەدەبییەکاندا یەك بگرن لەپێناو دیدێکی تردا بۆ هەڵسەنگاندنی بەرهەمی ڕۆشنبیریی چاخی ڕێنیسانسی ئینگلیزی. گەر وامان بکردایە حوکمە ڕەخنەییەکان سەبارەت بە کتێبی پێنجەمی داستانی سپنسەری شیعریی "شاژنی جندۆکان" بەو شێوەیە لە یەکدی دوور نەدەکەوتنەوە: بۆ نمونە هەندێکیان دژی لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی بابەتە شیعرییەکەی ئەو کارەن، لە کاتێکدا هەندێکیان پێیانوایە شاعیر زۆر لە واقعی پڕ نشێو نزیك کەوتۆتەوەو

ئەو نشێوییەش لەسەر شیعرە رەوانو دیدە ئایدیالیستییەکەی رەنگی داوەتەوە. لە لایەکی ترەوە حوکمێکی رەخنەیی تر دێتەئاراوە پێیوایە وێناکردنی شاعیر بۆ بەهای "دادپەروەری" لەم کتێبەدا وێناکردنێکی ئایدیاڵە کە مایەی سەرسامییە، بەڵام شێوازی بەدراماکردنی ئەو بابەتە قەناعەت ئاوەر نیە، چونکە کەسایەتیو هەڵوێستەکان کە لە ژێر ئیلهامی ئەو چاخەدان یەك نایەنەوە لەگەڵ هێماو وێنەکاندا.

لە راستیدا بایەخی کتێبی ئاماژەپێدراو لە "شاژنی جندۆکان"دا لەوەدا نیە کە شاعیر چەند سیمبوڵو وێنەیەکی خراپی بەکارهێناوە بۆ بەرجەستەکردنی بابەتێکی باش، بەڵکو لەبەر ئەوەیە بەرگریی لە پرسێك کردووە کە لە بنەڕەتدا دۆڕاوە، ئەویش پرسی "دادپەروەری" ستەمگەرانەیە، واتە دادپەروەریی چەوساندنەوەو زۆرداری. وێناکردنی شیعریی بۆ ئەو بابەتە چەندە بەهێز بێ، دواجار کاتێ دەمامك لە روخساری سیمبوڵە داستانئامێزەکان دەکەوێتەخوارەوە، واقع، بەهەموو نیشانەو شوێنەوارە ترسناکەکانیەوە، سەردەردێنێتەوە. ئەڵبەتە خاوەن دیدە نەریتییەکان، کە تۆمەت دەخەنە پاڵ چاخی رێنیسانسو رێچکەی مرۆڤگەری (هیومانیزم) بەرێچکەیەکی خاوەن کاریگەریی باش دەبینن کە داستانی وەك ئەم داستانە شیعرییەی بەرهەمهێناوە، بەرگریی لە "دادپەروەریی" سپنسەر دەکەنو گەر پێویستیش بکا چەندین پاساوی بۆ دەهێننەوە. ئەوانە گەر ئەندازەیەك بێلانەیی رەخنەییان تێدا بێ دەسبەرداری ئەو هەڵانە دەبنو دیدو بۆچوونیان لە کۆتی تێڕوانینی بەرتەسکانەی چاخی رێنیسانس ئازاد دەکەن.

بەکورتی زۆر حوکمی زاڵمانە لەئارادان بۆ وەسفی چاخی رێنیسانس، کە لەلایەن نوسەرانو بیریارگەلێکەوە بەکاردێن سەر بە رەوتی سیاسیی چەپن..، ئەوانە گەر لە روانگەیەکی فراوانترەوە بە حوکمەکانی خۆیاندا بچنەوە، دەردەکەوێ کە راوبۆچوونی هاوشێوە لەلایەن کەسانێکی ترەوە لەئارادان کە لە سێبەری بزاوتی ئەدەبیو پەراوێزی کۆمەڵگادا ژیاون، وەك هاورەگەز بازەکان (هۆمۆکان)و فێمێنیستە {توندڕەوەکان}. رەنگە ئەم وردبوونەوە رەخنەییە ببێتەهۆی قووڵبوونەوەو گشتگیری زیاتری جیهانبینیمان، ئیدی حوکمەکانمان حازر بەدەست نابنو لەسەر بنەمای دیاردەگەلێکی فەردیی دانەمەزرێنو تەنها باس لە لایەنە لاوازو بەهێزەکان ناکەین. دەبێ جیهانبینیمان درێژ ببێتەوە تا هەموو بەهاکانی سەردەمەکە بگرێتەوە، بە بەهاکانی خێرو شەڕیشەوە، بە جۆرێك لە زیاد لە دەروازەیەکەوە، بێ لایەنگیریی ئەملا یان ئەولا.. بەدەر لە حوکمی ئایدیۆلۆجیانەی پێشوەخت، بەرهەمی ئەدەبی هەڵبسەنگێنین. ئەمە ئەو میتۆدەیە کە نوسەرو بیریارە گەورەکان پەیيان پێبردووە، ئەوانەی خاوەن هەڵوێستی هەڵقوڵاوی کولتووری ئازادانەی سەدەی نۆزدەیەم بوون، ئەو میتۆدەیان پێڕەوکردووە بۆ لێکۆڵینەوە لە شیعرەکانی میڵتۆنو شیلیو چەندین دەرەنجامی گرنگیان بەدەستهێناوە کە مێژووی رەخنەی ئەدەبی تۆماری کردوون.

## سەرچاوە:

جورج بارفیت، عصر النهضة، الأدب و النقد و التاريخ الأدبي. ت: د. عبد الحميد شيحة. المجلس الاعلى للثقافة، ص179–200.

# ئاقارێكی نوێی ڕەخنەی ئەدەبی

## -تیۆریای وەرگرتن یان سۆسیۆلۆژیای خوێندنەوە -

## گفتوگۆیەك لەگەڵ "جاك لینهارت"

سازدانی: هاشم سالّح

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

*** پێموابێت تۆ هاوڕێی "لوسیان گۆڵدمان" بویت؟**

– بەڵێ بەدرێژایی چەند ساڵێك یاریدەدەری ئەو بووم، دواتریش لێرە لە خوێندنگەی خوێندنی باڵای زانستە كۆمەڵایەتییەكان جێگەیم گرتەوە.

*** لە هەفتاكاندا "گۆڵدمان" ئەستێرەی بەختی لە گەشانەوەدا بوو، پاشان بایەخ و گرنگی لە كایەی ڕەخنەی ئەدەبیدا دای لە كزی... ئێمە دەزانین ئەو بە بونیادگەری مێژوویی نێوبانگی پەیدا كرد، كە تێكەڵیەكە لە ماركسیزم (بەتایبەت لۆكاچ) لەگەڵ دەروونناسی (بەشێوازی جان بیاجێ). پرسیاری من ئەوەیە: گرنگترین خەسڵەتەكانی ئەم بونیادگەریە مێژووییە چییە؟**

– ئەمە پرسیارێكی زۆر ئاڵۆزە. دەكرێت لە چەندین ڕووەوە وەڵام بدرێتەوە. سەرەتا دەتوانین باس لە تایبەتمەندیەكانی تیۆریای بونیادگەری مێژوویی بكەین و پاشان بە میتۆدەكانی دیكەی وەك: (بونیادگەری فۆرمالستی یان میتۆدی دەرونشیكاری و ...هتد)، بەراوردی بكەین. حەزدەكەم ئەوەش بڵێم میتۆدی بونیادگەری مێژوویی، لەو كاتەدا هاتە ئارا كە "گۆڵدمان" ویستی لەیەك تیۆریادا دوو شت پێكەوە كۆبكاتەوە. یەكەمیان تاوتوێكردنی تێكستە لەگەڵ گرنگیدان بە فۆرم (گۆڵدمان زۆر گرنگی بەمە نەدەدا، بەڵام دژیشی نەبوو. بۆ خۆی زیاد لە جارێك باسی لەمە كردوە). گرنگی نەدانی بەم لایەنە، مانای ئەوە نییە كە ناكۆكیەكی تیۆری لە نێوان ئەم و زانستە فۆرمالستیەكانی دیكەی وەك زانستی گێڕانەوەو زانستی ماناگەری بونیادگەریدا هەیە.

هەرچی دووەمیشیانە، بایەخدانی ڕەخنەگرە بە كێشە گەورەكانی گەشەی هزر، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بە لایەنی كۆمەڵایەتی یاخود

لایەنی ستمە فەلسەفیە مەزنەکانەوە هەیە. کەواتە تایبەتمەندی سەرەکی بونیادگەری مێژوویی لەوەدایە توانای کۆکردنەوەی فۆرمی دەق و ئەو لایەنە کۆمەڵایەتی و مێژووییەی هەیە کە تەوقی هەموو تێکستێکی داوە.

"گۆڵدمان" لە سەرەتای شەستەکاندا بە ناچاری و بێویستی خۆی، رووبەرووی بونیادگەری فۆرمالستی بووەوە کە ئەو کات لە فەرەنساو جیهاندا لە هەڵکشاندا بوو. ئەم بەریانە دەیوست لەرێی تێزە رادیکالیەکانیەوە، بەرهەمی ئەدەبی لە هەموو شێوازە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکان و بگرە لە هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیان بە ماناوە هەبوو دابرێت! پەرگیری بونیادگەرە فۆرمالیستەکان گەشتبووە ئاستێکی ترسناک، بەڵام دەتوانم بڵێم هەندێك لەوانە ئێستا لەو بۆچوونە پەرگیرانەیان پاشگەزبوونەتەوە، بۆ نمونە "تزڤیتان تۆدۆرۆف".



***بەڵێ، من بۆ خۆم ماوەیەك بەر لە ئێستا بینیم و ئەوەم تیا بەدی کرد...**

– "تۆدۆرۆف" تەواو پەشیوان بۆتەوەو دەیەوێت دەستبەرداری هەموو ئەو میتۆدە بێت. هەڵەی ئەمانە لەوەدا بوو نەیاندەزانی کاری ئەدەبی زیاد لە رەهەندێکی هەیەو پێویستە لەیەك کاتدا ئەو رەهەندە جیاجیایانە تاوتوێ بکرێن. من پێمویە ئەوەی لە کاری "گۆڵدمان" دا گرنگە، ئەوەیە ئەو ئیرادەی پێکەوە گرێدانی سەرجەم رەهەندە جیاجیاکانی کارێکی ئەدەبی هەیە. من بۆ خۆم هەمان رێچکەی "گۆڵدمان"م گرتۆتە بەر. ئەو کارەشی پانزە ساڵ بەر لە ئێستا دەربارەی "ئالان رۆب گریێ" ئەنجامم دا، قەناعەتی تەواوم پێی ماوەو لێی پەشیمان نیم. لەم کارەدا من گرنگی تەواو زۆرم بە رەهەندی زمانەوانی ئەدەب دابوو، هاوکات تایبەتمەندی دەقی ئەدەبیم هەر بەتەنها نەدەگێرایەوە بۆ مێژووی فەلسەفە یاخود مێژووی ئایدۆلۆژیاکان، بەڵکو دەقی ئەدەبیم لەناو مێژووی شێوازە ئەدەبیەکاندا سەیر دەکرد. ئەوەندەی پەیوەندی بە خۆمەوە هەبێت، من پێم وایە لە تێکستی ئەدەبیدا، دیالەکتیکێکی دوالیزمی هەیە. دیالەکتیکێکی ناوەکی هەیە، بەڵام ئەمە رێگا لەوە ناگرێت کە گرنگی بە لێکدانەوەی مێژوویی و کۆمەڵایەتیش بدەین بەشێوەیەکی بەرفراوان، لەبەرئەوەی لە دەرەوە چواردەوری دەقیان گرتووە. پێموایە تا ئێستاش بونیادگەری مێژوویی ئامادەگی خۆیی هەیە، لەبەرئەوەی تیۆریایەکی شێلگیرەو فرە رەهەندیشە. من بۆچونم وایە، تەنانەت ئەگەر ئەمرۆ کارشناسانی ئەدەب "گۆڵدمان"یشیان بیر نەمابێت. لێرەدا دەمەوێت باس لە خاڵێکی دیکەش بکەم، ئەویش بەشداری تایبەتی خۆمە لە بواری سۆسیۆلۆژیای ئەدەبدا. بۆچونی من دەربارەی میتۆدی کۆمەڵناسی ئەدەب ئەوەیە ئەم میتۆدە هەر بەتەنها لێکۆڵینەوە نییە دەربارەی هەلومەرجی خوڵقاندن و بەرهەمهێنانی تێکستی ئەدەبی، بەڵکو گرنگی بە تاوتوێکردنی رەهەندە کۆمەڵایەتیەکانی دەقیش دەدەم و ئەمەش لەژێر ناوی سۆسیۆلۆژیای خوێندنەوەدا چارەسەر دەکەم.

*** مەبەستت تیۆریای وەرگرتنە (یان چۆنیەتی وەرگرتنی کارێکی ئەدەبیە لەلایەن خوێندەوارانەوە)، بەو شێوەیەی کە "هانس یاوس"ی ئەڵمانی باسی دەکات؟**

– نەخێر، من زاراوەکانی قوتابخانەی "یاوس" یان قوتابخانەی "کۆنستانس" یاخود قوتابخانەی ئەڵمانی بەکار ناهێنم، ئەویش لەو رووەوەی کە مەسەلەکان جیاوازن و یەکجۆر نین. بۆ نموونە ئەو تیۆریای وەرگرتنەی قوتابخانەی ئەڵمانی فۆرمەلەی کرد، تیۆریایەکە خوێنەرێکی ئایدیالی لەرێی تێکستەوە دەخولقێنێت. بەواتایەکی دی ئەوان دەیانەوێت ئەوە ببینن کە چۆن چۆنی لایەنی شێوازگەری و رەوانبێژی دەقێك، دەتوانێت گریمانەی خوێنەرێکی دیاریکراو یان شاراوە بکات. گرووپی قوتابخانەی "کۆنستانس" گرنگی بەم خوێنەرە دەدەن و خۆیان لە قەرەی لێکۆڵینەوەی مەیدانی نادەن، تا بزانن خوێنەر چۆن بیر دەکاتەوە و چاوەڕوانی چی لە بەرهەمی ئەدەبی دەکات.

من بۆ خۆم ماوەی بیستساڵێکە خەریکی توێژینەوەی مەیدانیم دەربارەی خوێندنەوە، مەبەستم لەمەش ئەوە بوو بزانم تێکستی ئەدەبی لە ئاکامی خوێندنەوەوە دوچاری گۆڕانکاری دێت. بێگومان بۆئەوەی بەمەش بگەم، دەبوو هەوڵێکی زۆر بە خەرج بدەم و دەست بە پشکنین و گەڕانێکی ئاڵۆز بکەم. یەکەم هەوڵم لەم بوارەدا لەگەڵ گرووپێکی لێکۆڵینەوەی تۆکمەدا بوو، گەڕانەکەشمان گەڕانێکی بەراوردکاریانە بوو کە فەرەنسا و هەنگاریای گرتەوە. مەبەستمان لەو کارەش بەو جۆە ئەوە بوو بزانین چۆن دوو کلتوری جیاواز مامەڵە لەگەڵ یەك تێکستدا دەکەن. بەم دواییانەش لێکۆڵینەوە مەیدانیەکەمان فراوانتر کردو سێ وڵاتمان هەڵبژارد، ئەوانیش (ئەڵەمانیا، فەرەنسا، ئیسپانیا) بوون، تا بزانین خوێنەران ئەو کتێبە لەو سێ وڵاتەدا چۆن دەخوێننەوەو چۆنی دەبینن.

*** کام کتێب؟**

– کتێبی (پەڕاوی مەزن)، (ئەمە رۆمانێکی لاگۆسا کریستۆفە کە خانمە نووسەرێکی هاوچەرخەو لە وڵاتی سویسرادا دەژی). لەم لێکۆڵینەوە مەیدانیەماندا هەوڵمان دا ئەوە ئاشکرا بکەین، چۆن خوێنەری هەر وڵاتێك لەو سێ وڵاتە سستمێکی تایبەتی خۆی لە تێگەیشتن و هەڵسەنگاندن هەیە کە جیاوازە لەوانی دی. لێرەوە دەچمە سەر پرسیارە تیۆریە گشتیەکەو دەڵێم: (ئەگەر ویستمان لە ئەدەب تێبگەین وەك پرۆسەیەکی ئەفراندن و خوێندنەوەی زیندوو لە کۆمەڵگەیەکدا، ئەوا پێویستە لەسەرمان گەشە بە دیدگایەکی سۆسیۆلۆژی بدەین کە تەواوی قۆناغەکانی ئەو پرۆسەیە بگرێتەوە). واتە نابێت ئێمە لە رێی نووسەری دەقەکەوە سەیری دەق بکەین و مامەڵەی لەتەکدا بکەین، بەڵکو دەبێت لە گۆشەنیگای خوێنەرانیشەوە ئەو کارە بکەین. ئەوەی ئێستا دەربارەی خوێندنەوە ئەنجامی دەدەین، ناکۆك نییە لەگەڵ ئەوەی "گۆڵدمان" دەیکرد، یاخود ئەوەی من جاران و لە سەرەتای دەست بە رەخنەگرتنمدا دەمکرد، بەڵکو ئەوەی دەیکەین تەواوکاری لایەنە جیاجاکانی پرۆسەی رەخنەی ئەدەبیە.

*** ئەم قسانەت پرسیارێکی دیکەم لا دروست دەکات... ئێمە دەزانین رۆمانی نوێ لە پەنجاو شەستەکاندا گەیشتە ترۆپك و لەو ماوەیەشدا جۆرە تەرێزکردنێك لە رۆمانی کلاسیکی حیکایەت ئامێز دروست بوو، بەڵام ئەمرۆ دەبینین رۆمانی نوێ لە پاشەکشەدایەو گەڕانەوەیەك بۆ فۆرمی کلاسیکی رۆمان نووسین لە ئارادایە (بەتایبەت فۆرمە بەلزاکیەکەی کە ئالان رۆب گریێ لە شەستەکاندا**

**هێرشی دەکردە سەری و تانەی لێدەدا). کەواتە لەماوەی بیست ساڵدا، جەماوەری فەرەنسا دوجار چەشەی ئەدەبی گۆڕانکاری بەخۆیەوە بینی؟**

– یەکەم شت ڕێگە بدە با وشەی (جەماوەر) بخەمە نا دوو کەوانەوە، لەبەرئەوەی چەندین جۆر لە (جەماوەر)مان هەیە. تەنانەت لەیەك وڵاتدا چەندین جۆر لە چەشەو حەزو داواکاریمان هەیە. ئەو پرسیارەی تۆ دەیکەیت پەیوەندی بەمەوە هەیە: ئایا گۆڕانێك لە خواستی خوێنەران و جەماوەردا هەیە، ئایا جەماوەر پێداویستیەکانی گۆڕیوەو لە ئەدەبدا بۆ پێداویستی و شتی دیکە دەگەڕێت؟ دەبێت بە ئەرێ وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، گەر بێتو لەو شێوازە بڕوانین کە ڕەخنەی فەرەنسی لە ئێستادا باسی ئەدەبی پێدەکات (بۆ نموونە ڕەخنەی ڕۆژنامەوانی). ئەم ڕەخنەیە گەشەسەندنی ڕۆمانی نوێ و هەڵکشانی ڕەخنەی بونیادگەری و فۆرمالیستی لە شەستەکاندا بەیەکەوە گرێ دەدات، بەڵام ئێستا دەبینین هەردووکیان لە پاشەکشەدان. من بۆ خۆم دڵنیا نیم لەوەی جەماوەری فەرەنسا بەگشتی لە شەستەکاندا، داوای ڕۆمانی بەبێ حیکایەت کردبێت. بە واتایەکی دی پێموانییە ڕۆمانی نوێ ڕۆژێك گەیشتبێتە قۆناغی بە میللی بوون. ڕۆمانی ئەو قۆناغە وەکی باسمکرد پەیوەست بوو بە ئاقارێکی فیکری و ڕەخنەیی فۆرمالیستیەوە، ڕەنگە خەڵکانێکی زۆریش وەکی جاران لەسەرهەمان چەشە و حەزی ئەدەبی مابنەوە (بابڵێین چەشەی بەلزاکیانە بۆ ڕۆمان). بەڵام لە بەرامبەریشدا خەڵکانیك هەبوون کە بە پێشڕەوو ڕۆشنفکر ناودەبرێن، بایەخیان زیاتر بە لایەنە قورس و ڕۆشنبیریەکانی ئەدەب داوە. ئەم توێژە لە خوێنەر و ڕەخنەگرانی پسپۆڕ، لە ئێستا ئارەزووی گۆڕینی چەشەو حەزەکانی دەکات– ڕاستی پرسیارەکەی تۆش لێرەدایە–، ئەمە ڕاستە. کەواتە دیاردەکە بەشێوەیەکی سەرەکی پەیوەندی بە ڕەخنەگران و دەوروبەریانەوە هەیە. ئەوا ئێستا حەزیان بەوەیە لەو ئاقاری ئەزمونگەریە دووركەونەوە کە لە شەستەکاندا لەئارەدا بوو، لەبەرامبەریشدا بگەڕێنەوە بۆ فۆرمە هەرە تەقلیدیەکانی ڕۆمان و ئەدەب.

تەنانەت "ئالان ڕۆب گریێ" خۆشی خەریکە لە بۆچونەکانی پێشوی واز دێنێت و بایۆگرافیا دەنوسێت. ڕاستە ئەوەی دەینوسێت بایۆگرافیایەکە تایبەتمەندی خۆی هەیەو کەمتر تەقلیدیە، بەڵام .. تەنانەت "فیلیب سولرز"ی پیری ئەزمونگەرو تەلیعیەکانیش، ئێستا بۆتە پیری کۆنسێرڤاتیڤەکان! (پاشەکشەیەکی ئایدیۆلۆژی تەواو).

*** تۆ پێت وایە ئەم بزاوتی پاشەکشەکردنە، پەیوەندی بەو ڕەوتەی ئێستای کۆمەڵگەی فەرەنسییەوە هەبێت بەرەو موحافیزکاری و گەڕانەوە بۆ بەها کلاسیکیەکانی وەك: (بەهای خێزان و ژن و ژنخوازیو ترادیسیۆنی ئەخلاقی و مەسیحیەت)؟**

–ئەستەمە پەیوەندی ڕاستەوخۆو دەستبەجێ لەنێوان هەردوو دیاردەکەدا دروست بکرێت. تەنها دەتوانین تێبینی جۆرێك لە هاوکاتی بکەین لە نێوان گەڕانەوە بۆ مێژوو (واتە گەڕانەوە بۆ خود و خودگەرایی)، پاشان لەنێوان پاشەکشەی بزاوتە کۆمەڵایەتیەکان کە خاوەنی ئایدۆلۆژیاو یۆتۆپیای گەورە بوون. بەڵام پێویستە بزانین ئەوانە کێن کە بە فیعلی ئەم بزاوتە قەرەیان دەکەوێت. ئایا قەرەی زۆربەی خەڵك دەکەوێت وەکی ئەوەی خوێندنەوەی ڕۆژنامەکان پێمانی دەڵێن؟ یاخود گۆڕانی ئایدیۆلۆژیاکان تەنها لای ئەنتلجنسیا ڕەنگ دەداتەوە؟ نازانم. ئەوەی دەیزانم ئەوەیە لەگەڵ ئەو بۆچونەی تۆدا کۆك بم کە ڕێکەوتێك لە ڕووی کاتەوە لەنێوان هەردوو دیاردەکەدا

بێـت. دەشـتوانم سـەرنجی ئـەو گۆڕانکاریانـەی ئێستای کۆمەڵگـەی فەرەنسی بدەم کـە بـەپێی نموونەگــەلێك رووەدات کــەمتر یۆتــۆبی تــرە لەوانـەی رابـردوو، واتـە کۆمەڵگـە زیـاتر بۆتـە پراگمــاتی و کــەمتر خــەون دەبینێــت. ڕەنگــە هۆکەشــی بگەڕێتــەوە بۆئــەوەی، کۆمەڵگــەی فەرەنسی خەریکـە خـۆی لـە ئایـدۆلۆژیا قوتـار دەکــات. ســـەردەمی ئایـــدۆلۆژیا چـــەپڕەوە مەزنەکان کۆتایی هات.

*** ئایا ئەوە پەیوەنـدی بـە دارمـانی کۆمۆنیزمـەوە هەیە لەو وڵاتانەی سەر بە بلۆکی خۆرهەڵات بـوون؟ وە ئایا مارکسیزم وەك فیکر ئـەو رووداوانـە کاریگـەریان لەسەری دەبێت؟**

-بێگومـان، ئـەوە شـتێکە هـەر لـە ئێـستاوە رووەدات و دەیبیـــنین. ئـــەوەتا مەرجەعیـــەتی مارکـسیزم لـە فەرەنـسادا بۆتـە شـتێکی تـەواو پەراوێز کەوتوو، بگرە هەندێ جار وەك ئـەوەی هەر نەبێت وایە. ئەڵبەتە "مارکس" خـۆی وەکـی بیریـارێکی مـەزن دەمێنێتـەوە، سەرەڕای ئـەوەی واقیـــع تیۆریاکـــەی یـــاخود بەشـــێکی زۆری تیۆریاکـەی بـە درۆ خـستەوە. لـە پەنجاکانـدا مەرجەعیـەتی فیکـری مارکـسیزم بـە تـەواوەتی هـــەژمونی خـــۆی ســـەپاندبوو، بـــەڵام لـــە شەسـتەکانەوە (ڕیـالیزمی سوسیالـستی) لـە بواری ڕەخنـەی ئەدەبیـدا دوچاری قـەیران بـوو، ئەمـە ئەگـەر بـاس لـەو قەیرانـە سیاسـیانەش نەکەین کە پەیوەنـدیان بە ستالینیەت و مێـژوی هەنگاریاو هتد.. هەبوو.

مـن بـۆ خـۆم هەفتـەی ڕابـردوو لـە هـەنگاریا گەڕامــەوە، ئــەوەی ســەیرەو هاوکــات مایــەی نیگەرانیـشە، ئەوەیـە تـۆ ئێـستا لـە هـەنگاریادا ناتوانیـت بـاس لـە "جـۆرج لوکـاچ" بکـەیت، یـان تەنانەت ناویـشی بهێنیـت! ئەگـەر چی بـۆ خـۆی بەرەچـــەڵەك هەنگارییـــە.. خـــۆ ســـەبارەت بـــە مارکـسیزم، ئـەوە هـەر باسـی مەکـە. ئەمـە بـۆت ئاشکرا دەکات ئەوان تا چەندە بێز لە ڕابردویان دەکەنـــەوەو چـــەند پێـــی جـــاڕس دەبـــن. ئـــەم دیاردەیـە زۆر سـەیرە، بـەڵام لـە هـەمان کاتیـشدا کەمەکێك مایەی نیگەرانیە. "لۆکـاچ" بیریـارێکی گرنگـە، تەنانـەت ئەگـەر لەگەڵیـشیدا نـاکۆك بین. من دەزانم کەسانێکی پسپۆڕ هـەن لـە هـەنگاریا، حـەز دەکـەن بـەهێمنی و بەشێوەیەکی بابەتیانـە بـــاس لـــەم مەســـەلانە بکـــەن، بـــەڵام ئەمـــە لـــە ســـاتەوەختی ئێـــستادا مەحاڵـــە. ڕەنگـــە دوای چـەند سـاڵێکی تـر بتـوانین بـاس لـەوە بکـەین. هەنوکـە مارکـسیزم قورسـایی خـۆی لەدەسـت داوە. من ناڵێم "لۆکـاچ" هـەموو بایـەخ و گرنگـی خـۆی دۆڕانـدووە. بێگومـان مـن خـۆم لەگـەڵ زۆرێـك لـە بـیرو بۆچـونەکانیدا نـەبووم، بـەڵام گرنگـی شـێوازی تایبـەتی ئـەو لـە مامەڵـەکردنی دەقـی ئەدەبیـدا، ڕەنگـە تـا ئێـستاش کۆمـەکمان بکـات بـۆ لێکۆڵینـەوەو توێژینـەوەی ڕەخنـەیی. من لـە ژیانمدا پـەڕگیر نـەبووم، لەبـەر ئـەوە حـەز ناکـەم بـەرد بگرمـە نوسـەری مـەزن. دەشـێت لەگـەڵیان نـاکۆك بـین و بەرپەرچیان بدەینـەوە، بـەڵام تەشـــەر لێـــدان و وێڵکردنیـــان کـــارێکی دروســت نییــە. ڕەنگــە ئــەمڕۆ لــە فەرەنــسادا مارکسیزم بەلای هیچ کەسێکەوە گرنگی نـەبێت، بـەڵام لەوانەیـە پـاش چـەند سـاڵێکی دی بـۆی بگەڕێینەوە، کە بێگومان گەڕانەوەکە بە شێواز و ڕێگایەکی تر دەبێت.

***پرسـیارێکم هەیـە دەربـارەی یـەکێك لـە تێرمـە گرنگـەکانی "لوسـیان گۆڵـدمان"، ئـەویش تێرمـی (نوسـەری دەسـتەجەمعییە – *Lauteur Callectif*)، کە مەبەست لێی ئەوەیـە نوسـەر گوزارشـت لـە خـۆی ناکـــات، هێنـــدەی تـــەعبیر لـــە ســـەرجەم چـــینە کۆمەڵایەتیەکەی دەکات؟**

-پێمـوا نییـە "گۆڵـدمان" تێرمـی (نوسـەری دەسـتەجەمعی) بـە مانـا حەرفیەکـەی و وەکـو خۆی بەکارهێنابێت. ئەوەی ئەو باسـی دەکات

ئەوەیــە نوســەر ناتوانێـت دنیابینیـەکی تۆکمـە لەســەر بنەمایــەکی فــەردی بنیادبنێـت. چـونکە ئەو پێی وایە دنیابینی بەرهـەمێکی تاکەکەسی نیـە، بـەڵکو دەسـتەجەمعیە. ئـەو پرسـیارەی ئێستا دێتە پێشێ ئەوەیە کە چۆن لەم تێرمە سێنترالە (دنیابینی)، لای "گۆڵدمان" تێبگەین؟ دنیـابینی بـەو پێیـەی فۆرمێکـە تێڕوانینێکـی هەمەلایـەنمان لەسـەر واقیـع و پەیوەنـدی نێـوان فــەردەکان و شــێوازی کۆمەڵگــە و دەربــارەی سروشـتی خوایـەتی و... هتـد، بەردەست دەخـات. ئێمــە چــۆن لــەم ئاســتە سۆســیۆلۆگیەوە (واتــە لــــــەم ئاســــــتە دەســــــتەجەمعیەوە)، بگوازینــەوە بــۆ ئاســتی مومارەسـەی تاکەکەسـی، تاکە کەس بەو سیفەتەی نوسـەرە. نوسـەر کاتێـك کــــارێکی ئــــەدەبی دەنوسێت بە تـەنیا خـۆی دەینوسـێت، نــەك ئــەو گروپــە بینوســێت کــە نوســەر یەکێکــە لــەوان. دەبێـــت ئەمـــە ڕوون و ئاشــکرا بێــت. نــە "گۆڵــدمان" و نــە منــیش، پێـچەوانەی ئەمــەمان نــەوتووە. بــەلام لێــرەدا دیالـەکتێکێك لـە نێـوان نوسـەر و هەلومـەرجی بەرهەمی ئەدەبیدا دروست دەبێت، کە دەتوانێت جیهانبینی بخوڵقێنێت (واتە دیدێکی گشتگیر و تۆکمە لە ڕێی کارە ئەدەبیەکەوە لەسەر جیهان و کۆی شتەکان دروست بکات). لێرەدا بە فیعلی ڕەهەندێکی دەستەجەمعی هەیە کە دزە دەکاتە ناو بەرهەمە ئەدەبیەکە، ئەویش لە ڕێی فۆرم و شێوازی داڕشتنەکەیەوە.


ئالان رۆب گری

ئێستا ئەو پرسیارەی دەبێت بکرێت ئەمەیە: ئەو دزە کردن و تێکەڵ بوونە چۆن ڕوودەدات؟ ئەمــــە مەســــەلەیەکی زۆر دژوار و ئــــاڵۆزە، لەبەرئـەوەی پێویـستی بـە شیکاریەکی دەرونـی هەیـە (هـەر لەبـەر ئەمەشە گۆڵـدمان دەگەڕێتـەوە بۆ لای جان بیاجێ، یەکێك لە گەورە پسپۆڕانی دەرونــشیکاری. بیــاجێ کۆمــەك بــە گۆڵــدمان دەکـات لـەو ڕووەوەی کـە یارمـەتی دەدات بـۆ ئەوەی چۆن بتوانین لە مومارەسەی فەردیماندا وتــەزاکانی پراکسیــسی کۆمەڵایــەتی بخــوازین، ئــەویش بــۆ خــاتری بیرکردنــەوە و پراکتیــزە کــردن و تێکــەڵ بــوون). ئێمـە وەك تاکەکـەس بـە خۆمـان بزانین یـان نـا، لـە پراکسیــسی کلتــوری و کۆمەڵایـەتی ئـەم یـان ئـەو گروپ شت وەردەگرین.

بێگومــــان نوســــەر کاتێــــك دەنوســــێت گوزارشــت لــە شــتێکی کەسێتی و تایبەتی خـۆی دەکات، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیــــە خــــەڵکانێکی دیکـەش هـەن لـەناو هـەمان هەلومـەرج و سیاقی کۆمەڵایەتیـدا دەژیـن و بـە هـەمان ئـەو تێـزە و بۆچــونانەی ئــەویش ئاشــنان، بــەلام لەگــەڵ ئەوەشــــدا نــــاتوانن وەك ئــــەو بنوســــن. لـە نـاو ئەوانـەدا یـەکێك لـە هـەمویان بلیمـەتر دەبێــــت و لێرەشــــدا نوســــەری داهێنــــەر بەرهــەمێك پێــشکەش دەکـات کـە خەسـڵەتێکی تایبــەتی هەیــە و تــەواو جیــاوازە، ئەگەرچــی وەك ئەوانی دیکە سەر بە هـەمان ژینگەیە. ئەمە چۆن ڕوودەدات؟

کەواتە پێویستە لێرەدا ڕوون و ڕەوان بین: نوسەری دەستەجەمعی بۆ کاری ئەدەبی شك نابەین، وەکی ئەوەی هەندێك سەردەمانێك پێیان وابوو. نوسین پرۆسەیەکی فەردانیە، بەڵام لەگەڵ شێوازی ئەو بیرکردنەوەیەی لای گروپێك یان چینێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو هەیە، لە پەیوەندیدایە. هەرکاتێکیش ئەم جەمسەرانە بەیەك گەیشتن و فۆرمێکی یەکگرتویان پێکهێنا، ئەوا ئەو کات ئەوە دروست دەبێت کە "گۆڵدمان" بە دنیابینی ناوی دەبات. لای "گۆڵدمان"یش سێ تێرمی گەورە هەن کە بریتین لە (خودا، مرۆڤ، جیهان)، بۆ دیاریکردنی دنیا بینی.

***لێرەدا جیاکاری لە نێوان نوسەری مەزن و نوسەری گچکەدا دروست دەبێت. تەنها ئەوانەی مەزنە نوسەرن کە دەتوانن تۆکمەییەکی تەواو بە کارەکانیانەوە دیار بێت و دنیابینی ڕاستەقینە بەرهەم بهێنن؟**

-بێگومان. "گۆڵدمان" ئەوانە بە نوسەری گەورە و بلیمەت ناودێر دەکات کە بە شێوەیەکی سەیر دەستیان بەسەر کارەکانیاندا دەشکێت.

***بەڵام لەوانەیە نوسەری مەزن کاتێك دەنوسێت خیانەت لە بۆچونە تایبەتیەکان و ئەو قەناعەتانە بکات کە بڕوای پێیانەو دڵخوازی خۆین، بۆ نمونە "بەلزاك" لە ڕووی کەسێتی و سیاسیەوە کۆنسێرڤاتیف بووە، بەڵام نوسینەکانی پڕیەتی لە بۆچونی پێشکەوتنخوازانە؟**

-ڕاستە. تۆ لێرەدا ئاماژە بۆ لێکۆڵینەوەکەی "لۆکاچ" دەکەیت دەربارەی "بەلزاك" کە هەموو لێی ئاگادارین. "لۆکاچ" لەوێدا جۆرە ناکۆکیەك لە نێوان بۆچونە سیاسیەکانی "بەلزاك" لە ژیانی ڕۆژانەیدا، لەگەڵ دەقە ئەدەبیەکانیدا دەدۆزێتەوە. "بەلزاك" لە دەقەکانیدا ڕەخنە لە بۆرژوازیەت دەگرێت. من نازانم ئەگەر خولیای ئەو بە چڕی ڕەخنەگرتن بوبێت لە بۆرژوازیەت، بەڵام ئەوەی دەیزانم ئەوەیە ئەو بۆ نمونە لە ڕۆمانی (جوتیاران – *Lespaysans*)دا، نیشانمان دەدات چۆن سەرمایەی بۆرژوازیەت کە خەریکە دەست بەسەر زەوی و زاری کشتوکاڵی فەرەنسادا دەگرێت، پرۆسەیەکە لە واقیعدا چینی جوتیاران لەناو دەبات و ماڵوێرانیان دەکات، بەبێ ئەوەی هیچ گرانتیەك و هیچ بەرامبەرێکیان بداتێ، وەکی ئەوەی سستمی دەرەبەگایەتی پێشوو پێی ڕەوا دەبینین. کەواتە بەڕای من کێشەکە ئەوە نییە بزانین ئایا "بەلزاك" لە نێوان بەرهەمەکانی و بۆچونەکانیدا کەوتۆتە ناکۆکیەوە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە "بەلزاك" خوێندنەوەیەکی زۆر وردبینانە و ژیرانەمان، دەربارەی هەلومەرجی ئابووری و سیاسی ئەو سەردەمەی فەرەنسا پێشکەش دەکات.

"بەلزاك" دیدگایەکی زۆر ورد پێشکەش دەکات و ڕەنگە بەلای کەسێکی وەك "لۆکاچ"یشەوە دیدگایەکی پێشکەوتنخوازانە بێت. لەبەرئەوەی "لۆکاچ" لەگەڵ خۆیدا دەیوت: (بەلزاك ڕەخنە لە بۆرژوازیەت دەگرێت، کەواتە پێش ڕۆژگار و سەردەمی خۆی کەوتووە، بەمجۆرە کەم تا زۆرێك لە مارکس دەچێت کە گەورەترین ڕەخنەگربوو لە بۆرژوازیەت و سەرمایەداری). بەڵام من بۆ خۆم دەتوانم مەسەلەکان بە شێوەیەکی جیاوازتر ببینم لەوەی "لۆکاچ". دەتوانم بڵێم: (بەلزاك بە ڕوونی و بێ ڕەتوش بۆرژوازیەت دەبینێت، نەك لەبەرئەوەی کەسێکی پێشکەوتنخوازە، نەخێر بە پێچەوانەوە، لەبەرئەوەی ئەو لەڕێی گروپ و هێزە کۆنەکانەوە بیر دەکاتەوە کە مەبەست لێی سستمی دەرەبەگایەتی کۆنە. ئەو سستمەی بۆرژوازیەت هات و ڕای ماڵی). دەکرێت ئەم قسانەش بۆ "تۆکڤێل"یش ڕاست بن.

"تۆکڤێـــل" کاتێـــك کەوتـــە ڕەخنـــەکردنی کۆمەڵگـەی لیبرالـی ئـەمریکی، لـە ڕێـی کۆمەڵـە بەهایەکەوە ئـەو ڕەخنانـەی ئاڕاستە کرد کە لە دەرەوەی کۆمەڵگەی ئەمریکی خۆی بوون، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا ئێمـە وەك بیریـارێکی پێـشەنگ لێـی دەڕوانین کە پـێش زۆرێك لـە ڕەخنـەگرانی سـستمی سـەرمایەداری کـەوت کـە لـە دوایـدا هـاتن! شـایەنی باسـە "تۆکڤێـل" بـۆ خـۆی ئەرسـتۆکراتیەتێکی گـەورەبوو، لـە دیدگایـەکی ئۆرستۆکراتیانەشـــەوە ســـەیری بۆرژوازیـــەتی دەکرد. ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە "بـەلزاك" و "تۆکڤێـــل"، لـــە خاڵێکـــدا یەکدەگرنـــەوەو کۆدەبنـەوە کە دەکەوێتە دەرەوەی بۆرژوازیـەت. هــەر لەبــەر ئەوەشـی لــە دەرەوەیــدان، ئــەوان دەتوانن زۆر بە چاکی ببینن. گەر بهاتبایـەو لە ناوەوەیـدا بونایـە، ئـەوا بـەو ڕوون و ڕەوانیـە نەیانـدەبینی. ئـەوە بونیانـە لـە دەرەوە کـە ئـەو دیـــــدگا سۆســـــۆلۆگی و ڕەخنەییــــــەیان پێدەبەخشێت. لەو قۆناغ و سەردەمەدا کارێکی ئاسان نەبوو مرۆڤ بتوانێت هـەڵگری دیدگایـەکی لەو جۆرە بێت، دەرهەق بە چینێکی کۆمەڵایـەتی کـە لـە سەرتاسـەری ئـەوروپادا، لـە هەڵکشان و گەورەبووندا بوو.

ئەوانــەی دیــدگای ڕەخنــەییان هــەبوو لــە بەرامبــەر بۆرژوازیەتــدا، یــان ســەر بــە چـینی کرێکاران و پرۆلیتاریا بوون (ئەگـەر وامان دانا پرۆلیتاریـا لـەو کاتـەدا دیـدگای خـۆی هـەبوو بێـت، کـە مـن لای خۆمــەوە بەڕاســتی نــازانم، لەبەرئەوەی هێشتا ساوا بوو)، یان دیدگای ئەو چینە کۆنە بوو کە لەسەر لێواری گلۆربوونەوەدا بـوو (بـۆ بـەلزاك و تۆکڤێـل، ئـەم بۆچـونەیان دروســـــتە). ســــەروەختێك کــــە چــــینی ئۆرستۆکراتیەتی فەرەنسی لە سەرەمەرگدا بوو، نوێنــەرەکانی کــەم تــا زۆر تــا ئــەو کاتــەش دەیـانتوانی بـە چاکی بـزانن چـی لـە کۆمەڵگـەدا ڕوودەدات. دەیـانزانی بۆرژوازیـەت لـە هـەوڵی گـۆڕینی دنیادایـە و لـە هـەوڵی ئەوەدایـە گەمـە باوەکەی کۆمەڵگە بگۆڕێت و ئەوانە قوت بدات کـە لـە خـۆی بێهێزتـر و لاوازتـرن (بـە تایبـەت جوتیـاران). مـن لای خۆمـەوە بـۆ ئـەم مەسـەلانە چـــەمکی پێـــشکەوتنخواز و کۆنەپەرســـت بەکارنابەم، بـەڵام باس لە هەلومـەرج دەکـەم کە دەشــێت لــە ڕێگایــەوە دیدگایــەکی قــوڵتر و سۆسیۆلۆگیانەتر بۆ مەسەلەکان پەیڕەو بکەین. ئەمە هەموو شتەکانە بێ زۆر و کەم.

## ڕێبازەکانی دیکەی ڕەخنەی ئەدەبی
## (دەرونشیکاری)

***پرسـیارگەلێکی دیکـەم هەیـە کـە زۆر گـشتین دەربارەی ڕێبازەکانی دیکە، بۆ نموونە سـەبارەت بـەو ڕەخنە ئەدەبیە چـی دەڵێـت کـە پـشت بـە تیۆریـای دەرونـشیکاری دەبەسـتێت؟ ئایـا ئـەم ئاقـارەش لـە قەیراندایە وەکـی ئـەوەی کـە پـشت بـە مارکـسیزم دەبەستێت؟ پاشان ڕات چییە بەرامبـەر بـە کارەکـانی "شارول مۆرۆن"؟**

-لـــە ڕاســـتیدا ئـــەو ڕەوتـــەی "مـــۆرۆن" گرتیەبــەر، بەداخــەوە کــەس نــە شــوێن پێــی هــەڵگرت و نەهــەواداری بـۆ دروسـت بـوو. لـە بەرامبەردا قۆنـاغی دوای ئەوە (واتە لە شەست و حەفتاکانـدا)، دەبیـنین دەرونـشیکاری لـە ژێـر کاریگەری "لاکان" و تیۆریاکانی ئەودا بوو. ئەم ئاقـارە شـتێکی ئـەوتۆی لـە بـواری ڕەخنـەی ئەدەبیـدا پێـشکەش نـەکرد کـە شـایەنی بـاس بێــت. مــن لــە بەرامبــەر دەرونــشیکاریدا زۆر دڵــڕەق و ســەختگیرم. پێموایـە دەرونـشیکاری ئـەرکی خـۆی بـەجێ نـەهێنا لـە بـواری ڕەخنـەی ئەدەبیدا و بە درێـژایی بیست ساڵی ڕابردوش، لـە ئاسـت چاوەڕوانیەکانماندا نـەبوو. هەنـدێ

جار وا هەست دەكەم دەرونشیكاری تەنها بە دووبارە كردنەوەو جوینەوەی بیروبۆچونەكانەوە خەریك بووە. ئەمڕۆكەش – وەك زانستێك، نەك ئامرازێكی چارەسەركردن–، لە دۆخێكی ناهەمواردایە و وەكی جاران خەڵك ئەو گرنگیەی پێنادەن، بێگومان ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ كاردانەوەو پەرچەكردارەكان لە دژی قوتابخانەی لاكانیزم و پەرتبونی گروپەكەی. پێموایە "لاكان" بە مەبەست ئەو هەموو تەمومژ و ئاڵۆزیەی لە كارەكانیدا بەكارهێناوە. حەز ناكەم زۆر باسی بكەم، چونكە لە ڕاستیدا بەلامەوە گرنگ نییە.

***بەهەر حاڵ بابەتی ئێمە "لاكان" نییە، بەڵكو پەیوەندی بەرهەمی ئەدەبیە بە میكانیزمە دەرونیە قوڵەكانی داهێنەرەكەیەوە، لەم ڕووەوە پێتوانییە كە گەورە داهێنەران كەسانی نێرڤۆسی بن؟**

–ئەمە وایە و گومانی تێدا نییە، بەڵام كاتێك باس لە ڕەخنەی ئەدەبی دەكەین، كێشەكە لەوەدایە چۆن چۆنی ئەم شتانە بەیەكەوە گرێ بدەین. كێشەكە ئەوەیە بزانین ئایا ئەوەی دەرونشیكاری دەربارەی ناخی مرۆڤایەتی دەیڵێت، یارمەتیمان دەدات بۆ تێگەشتن لەو كارە ئەدەبیانەی گرنگن بەلامانەوە. من دەڵێم: (كارە ئەدەبیەكان بەو پێیە گرنگن بەلامانەوە كە هەندێك لە گشتگیری و گەردونگەراییان تێدایە، گەروانەبوایە ئەوا مێژوو و سەدەكانیان نەدەبڕی و بە ئێمە نەدەگەیشتن، نەك لەبەرئەوەی تایبەتمەندی شەخسیان هەیە). لێرەوە ئەوەی زۆر شەخسیە لە كاری ئەدەبیدا (واتە ئەوەی پەیوەندی بە گرێ كەسیەكانی داهێنەرەوە هەیە)، شتێك نییە زۆر بەلای ئێمەوە گرنگ بێت. ئەمەش مانای ئەوە نییە ئێمە بونی پەیوەندی لە نێوان ئەفراندنی ئەدەبی و نێرڤۆسی فەردیدا ڕەتدەكەینەوە.

من وای بۆ دەچم دەتوانین دیاریكردنێكی كلینكی (یان پزیشكی) پێشكەش بە كارێكی ئەدەبی بكەین، بەڵام ئایا ئەم دەست نیشانكردنە بەشێك لە كۆی ئیشەكە دەگرێتەوە كە عادەتەن بە زۆرترین ژمارەی خەڵك دەگات؟ لێرەدا هەندێ گومانم هەیە. من لە ماوەی پێشوودا لەگەڵ چەند دەرونشیكارێكدا كارمكردووە و داكۆكیم لەو تێزەیە كردووە كە دەڵێت: (پێویستە لەسەر دەرونناسی و كۆمەڵناسی شان بە شانی یەكتری بڕۆن، لە پێناو شرۆڤەكردن و لێكدانەوەی دیاردە ئینسانیەكاندا).


سارتەر

پێویستە هاوكاری یەكتری بكەن، بۆ ئەوەی ئاشكرای بكەن نوسەری مەزن ئەو نوسەرەیە كە وڕێنەو گرێ دەرونییەكانی دەگەیەنێتە ئەوەی، بەشێوەیەكی سەركەوتوو لەگەڵ بونیادی كۆمەڵایەتیدا ئاوێزان بێت و تێكەڵ بەیەكتری بن. كەواتە من لەگەڵ ئەوەدا بووم جۆرێك لە گونجاندن لە نێوان بونیادی دەرونی، كەسێتی، تایبەتی) لەگەڵ ئیشكالیەتە كۆمەڵایەتیە گشتیەكاندا هەبێت. بەڵام ئەمڕۆكە لەسەر هەمان كار بەردەوام نیم، نەك لەبەر ئەوەی هەست دەكەم ئەوە هەڵەیە، بەڵكو لە بەرئەوەی زۆر چاوەڕوان بووم دەرونشیكاریش بۆ خۆی بەسەر ئیشكالیاتەكانی دیكەدا بكرێتەوە و هەر تەنها

بــە كێــشەی نۆرڤۆیــسی تاكــە كەســیەوە گــیر نـــەخوات. چـــاوەڕێم دەكـــرد دەرونـــشیكاری بتوانێـــت گوتـــار و نۆرڤۆســـی نەخۆشـــەكانی بخاتــــە چوارچــــێوەیەكی كۆمەڵایـــــەتی و مێــژوویی زۆر بــەرفراوانترەوە، بــەڵام ئەفــسوس ئەوە ڕوی نەدا.

***دەتوانیت چەند نمونەیەكمان پێ بڵێیـت لـە مـەڕ ئەدەبیاتی دەرونشیكاری كە بەسەر ئەدەبـدا پراكتیـزە كراوە؟**

–وەڵامدانەوەی ئەمە قورسە. هەمیشە شـتی گــرنگ وســەرنج راكــێش لــە كارەكــانی "شــارل بــودوان" و "مــاری پۆنــابرت"و ...هتــد، هەیــە. ئەمانە لە یەكەمین ئەو كارانەن كە لە ڕێیانەوە دەروونناســی بەســەر ئەدەبــدا پراكتیــزە كــراوە. دواتــر ســەرەی كارەكــانی "شــارل مــورون" دێـت كە پێشتر باسمان لێكرد. بەلای منەوە ئەمـەیان زۆر دەوڵەمەنـدترە و جێـی ڕەزامەندییـە. پـاش "مورون"، "ئەندریێ گرین" دێت كە هاوڕێیەكی خۆمـە، بـەڵام كارەكـانی ئـەم زۆر سنوردارە. مـن هـــــەر ئەمەنـــــدەم لـــــە بـــــیرە و لێرەشـــــدا دەگەڕێمـــــەوە ســـــەر نـــــاڕەزایی پێـــــشووم و دەڵـــێم: (مادامـــەكی دەرونـــشیكاری ئـــەوە ڕەتدەكاتــەوە كــە ئــەو مرۆڤــەی چارەســەری دەكــات، بونــەوەرێكی كۆمەڵایــەتی بێــت، ئــەوا ئەو دەزگـا تیۆریـەی نوقسان دەبێـت كە بـواری ئـــەوەی بـــداتێ ئـــەدەب وەك دیاردەیـــەكی كۆمەڵایــەتی ببینێــت، بــە ڕادەی ئــەوەی كــە دیاردەیەكی فەردیە).

***ئەوەی سەرنج ڕاكێشە لای "مورون" ئەوەیـە كـە خەریكی شیكردنەوەو لێكدانەوەی نوسەر یـان شـاعیر نییە، بەڵكو بـە تـاوتوێكردنی كـارو تێكـستەكانیانەوە خەریكە، لەم بوارەشـدا گرنگـی بـەو خواسـتە وڕێنـە ئامێزانە دەدات كـە بەسـەر بەرهـەمی شـاعیرێك لـە شاعیرانی وەك: "بۆدلێر یان ڕامبۆ یاخود مـالارمێ"دا زاڵە، لە ڕێی ئەم پرۆسەیەشەوە ئەوە ئاشكرا دەكات كە پێیدەڵێت (ئەفسانەی كەسێتی)، ئەو ئەفسانە تایبەتیـەی بەسەر نوسەرێك لە نوسەراندا زاڵە؟**

–چەمكی (ئەفسانەی كەسێتی) زۆر سەیر و سەرنج ڕاكێشە، لەبەرئەوەی ناكۆكیەكی تێدایە. واتــە لەیــەك كاتــدا هــەم ئەفــسانەییەو هــەم شەخــسی. ئێمــە دەزانــین ئەفــسانە هــەرگیز شەخــسی نییــە، بــەڵكو دەســتەجەمعیە. مــن پێموایــە پێگــەی (ئەفــسانەی كەســێتی) لای "مورون" زۆر بە پێگەی (دنیابینی) دەچێت لای "گۆڵـدمان" و بریتیـە لـە بەشـە كۆمەڵایەتیەكـەی نــاو خەیاڵــدانی تاكــە كــەس. پێموایــە گــەر بمانــەوێت دیــدگای دەرونــشیكاری فــراوانتر بكـەین، دەبێـت قەناعـەت بـەوە بكـەین لای هـەر تاكـە كەسـێك شـوێنگەیەك هەیـە كـە شـتەكان تیایـدا بەیـەكتری دەگـەن و مـرۆڤ بـۆ حسابی تایبـــەتی خـــۆی و بـــەپێی هەلومـــەرجێكی دیاریكراو فۆرمەلـەی دەكـات، ئەمـەش بە چەند ڕەگـەزێكی دیكـە ئاوێتـە دەكـات كـە لـە دەرەوە وەریان دەگرێت. بەڕای من ئەو ڕەخنـەگرەی لـەم بوارەدا لە پێش ئەوانی ترەوەیە تەنها"جان پۆل ســارتەر"ی فەیلەســوفە، لــە كتێبــە قــەوارە گەورەكەیـدا (ابلـة العائلـة). لـەو كتێبـەدا بـە لێكۆڵینەوەی "فلۆبێر"وە خەریكە و "سارتەر" ئـەم ڕێبازەشـی بـە (دەرونـشیكاری وجـودی) ناودەبات.

**سەرچاوە:**

هاشم صالح: الفكر الاوروبي الحديث– دار الرياض، الطبعة الاولی، 1994.

# میراتی بێڕێزکراوی سێرڤانتس

میلان کۆندێرا

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

1

ئەدموند هوسرەل لە ساڵی 1935دا واتە سێ ساڵ پێش مردنی، چەند کۆنفرانسێکی بەناوبانگی لەبارەی قەیرانی مرۆڤایەتی ئەوروپییەوە بەست. بەبڕوای هوسرەل سیفەتی "ئەوروپیی" دەستنیشانکەری ئەو شوناسە فکریە بوو کە لەچوارچێوەی ئەوروپا زیاتر دەڕوات (بۆ نمونە ئەمریکاش دەگرێتەوە)و بە فەلسەفەی دێرینی یۆنان دەست پێدەکات. بە بڕوای هۆسرەل ئەم فەلسەفەیە بۆ یەکەمجار لەمێژوودا جیهانی لە هەمەکیەکدا وەك پرسیارێك کە دەبێت وەڵام بدرێتەوە، لەبەرچاوبگریت. پاڵنەری ئەم پرسیارە تێرکردنی ئەم پێداویستی یان پێداویستیە نەبوو، بەڵکو "شەوق و سۆزی ناسین بەسەر مرۆڤدا زاڵ بووبوو".

ئەو قەیرانەی هۆسرەل باسی دەکرد بەبڕوای خۆی ئەوەندە قوڵ بوو کە دوو دڵ بوو لەوەی ئەوروپا بە زیندویی لێی بێتە دەرەوە. هۆسرەل ڕەگوڕیشەی قەیرانەکەی لە سەرەتای سەردەمی تازە، لە جیهانبینی گالیلۆو دیکارت‌و ماهیەتی یەکلایەنە بینی زانستە ئەوروپییەکاندا دەبینی، زانتسگەلێك کە جیهانیان تاسنوری بابەتێکی سادە بۆ لێکۆڵینەوەی تەکنیکی و ماتماتیکی دەهێنایە خوارەوە، و جیهانی هەستپێکراوی ژیانی کە هوسرەل ناوی نابوو *die Lebennswelt*، لەئاسۆی دیدی خۆی کردبووە دەرێ.

پێشکەوتنی زانستەکان مرۆڤی خستە ناو دەهلیزەکانی بوارە پسپۆریەکانەوە. هەرچەند مرۆڤ لە زانیندا پێشدەکەوت، هەمەکی جیهان و خودی خۆی زیاتر لەچاوی دوردەکەوتەوە. بەمشێوەیەش هێواش هێواش مرۆڤ لەو شتەدا کە هایدگەر کە قوتابی هوسرەلە، بەدەربڕینێکی جوان و ئەفسوناوی ناوینا "فەرامۆشی بوون" ڕۆچوو.

مرۆڤ کە لە ڕابردودا بەهۆی دیکارتەوە خۆی بە "ئاغا و موڵکداری سروشت" دەناسی، گۆڕا بەشتێکی سادە کە هێزە تەکنیکی، سیاسی‌و مێژوییەکان بەسەریا زاڵدەبن و دەچنە سەرو

مرۆڤـەوە و باڵادەسـت دەبـن بەسـەریدا. بـۆ ئـەم هێزانـە، بـوونی هەسـتپێکراوی مـرۆڤ، "ژیانگـا" (*die Lebennswelt*) چیدی خـاوەن هـیچ بـەها و سودێك نیە: بوونی هەستپێکراوی مـرۆڤ چیدی لەبەرچـاو ناگیرێـت، و بەدەسـتی فەرامۆشـی سپێرراوە.

2

لەگەڵ ئەوەشدا هەستدەکەم ساوێلکانە بێت ئەگـەر ئـەم دیـدە سـەختگیرانەیە بـۆ سـەردەمی تـازە، تـەنها وەك مـەحکومکردنێك تەماشابکرێت. بەبڕوای مـن دوو فەیلەسـوفی گەورە پـەردەیان لەسـەر دولایـەنی ئـەم قۆناغـە هەڵماڵیوە، قۆناغێك کە هـەم گەڕانەوەیـە بـۆ دواوە و هـەم پێـشکەوتنە، وەك هەموو شتێکی مرۆیش لەسـەرەتای لەدایکبونـەوە، نـاوکی کۆتـایی خـۆی لـەناو خۆیدا هەڵگرتووە. ئەم دوو لایەنیە بەبڕوای من بـەهای چـوار سـەدەی رابـردوی ئـەوروپا کەمناکاتـەوە، چـوار سـەدە کـە خـۆم وەك رۆماننوسـێك نـەك وەك فەیلەسـوف وابەسـتە پێـوەی دەبیـنم. لەراسـتیدا بـەبڕوای مـن بونیادنەری سەردەمی تازە تەنها دیکارت نیە، بەڵکو سرڤانتسیشە.

رەنگـە ئـەو دوو فەیلەسوفە دیاردەناسـە لـە هەڵسەنگاندیاندا بـۆ سـەردەمی تـازە، سـەرنجی سرڤانتسیان نـەدابێت. ئـەوەی دەمـەوێت بیڵـێم ئەوەیـە: ئەگـەر قبـوڵی بکـەین فەلـسەفەو زانـستەکان بـوونی مرۆییـان فەرامۆشـکردووە، ئەوەش بەرونیەکی زیاترەوە ئاشکرا دەبێت کە لەگەڵ سرڤانتسە هونەرێکی مەزنی ئەوروپایی دروسـتبووە، هونـەرێك کـە هـیچ نیـە جگـە لـە گەڕان بەناو "ئەو بونە فەرامۆشکراوەدا".

لەراسـتیدا هـەموو ناوەڕۆکـە سـەرەکیەکان لـەبارەی بـوونی مرۆڤـەوە کـە هایدگـەر لـە بەرهەمەکەی خۆیدا بەناوی "بوون و زەمان"وە شیدەکاتەوە و بڕوایوایە لە فەلسەفەی پێشوی ئەوروپادا خراونەتە لاوە، بەچوار سەدە رۆمان (چوار سەدە تەناسخی رۆمـان لـە ئـەوروپا) ئاشـکرا، رون‌و دیـاریکراون. رۆمـان بەشـێوەی تایبـەتی خـۆی و بـەلۆژیکی تایبـەتی خـۆی، رەهەنـدە جیاوازەکانی بـونی یـەك بەیـەك دۆزیوەتـەوە: لەسـەردەمی سرڤانتـسدا رۆمـان بـەدوای تێگەیـشتنی روداوەوەیـە، لەگـەڵ



سـامۆئیل ریـچاردسۆندا رۆمـان دەسـت بـە "تـاوتوێکردنی "ئەوەیـە کـە لەدەرونـدا روودەدات"و پەردە هـەڵماڵین لـەژیانی شاراوەی هەسـتەکان دەکـات، لەگـەڵ بالزاکـدا سەرچـاوەگرتنی مـرۆڤ لـە مێـژووەوە ئاشـکرا دەکات، لەگەڵ فلۆبێردا زەمینەکان دەپشکنێت کـە تائـەو سـەردەمە لـەژیانی رۆژانـەدا نەناسـراوبوو، لەگـەڵ تۆلـستۆیدا سـەرنج لـە هۆکـارە ناعەقلانیـەکان لـە بڕیـار و رەفتارەکـانی مرۆڤـدا دەدات. رۆمـان بـەدوای تێگەیـشتنی قوڵـەوەی زەمەنەوەیـە: سـاتەوەختی تێپـەڕی

رابردووەوە لەگەڵ مارسل پرۆستدا، ساتەوەختی تێپەڕی هەنوکە لەگەڵ جیمز جویسدا، ڕۆمان لەگەڵ تۆماس ماندا دەستدەکات بە تاوتوێکردنی ڕۆڵی ئەفسانەکان، ئەو ئەفسانانەی لە دورترین ڕۆژەکانەوە دێن و ڕێنماییمان دەکەنو...

ڕۆمان لە سەرەتای سەردەمی تازەوە بەردەوام و بەشێوەیەکی وەفادارانە هاوڕێی مرۆڤە. لەو کاتەوەی "سۆز و شەقی ناسین" (کە هوسەرل بە خودە مەعنویەتی ئەورووپی دادەنێت) بەسەر ڕۆماندا زاڵ دەبێت، بۆئەوەی ڕۆمان ژیانی هەستپێکراوی مرۆڤ بپشکنێت، لە بەرامبەر "فەرامۆشی وون"دا بیپارێزێت و بەردەوام "ژیانگا" ڕوناکبکاتەوە. بەم مانایە من لە سوربونی هرمان بڕۆخ بۆ ئەو دەربڕینە تێدەگەم و قبوڵی دەکەم کە: تاکە هۆی ئەنتۆلۆجی ڕۆمان دۆزینەوەی ئەو شتەیە کە تەنها ڕۆمان دەتوانێت بیدۆزێتەوە. ڕۆمانێك کە بەشێکی نەناسراوی بوون نەدۆزێتەوە، نائەخلاقیە. ناسین، تاکە پەیامی ئەخلاقی ڕۆمانە.

ئەوەش بڵێم: ڕۆمان دەستکەوتێکی ئەورووپییە، دۆزینەوەکانی چەند بەزمانی جیاجیا ئەنجامدرابن، سەر بەهەموو ئەورووپان، ئەم "زنجیرە دۆزینەوانە" (وەك کۆی ئەوەی نوسراوە)، مێژوی ڕۆمانی ئەورووپی پێکدەهێنێت. تەنها لەم دیدە بان نەتەوەییەوەیە کە بەهای بەرهەمێك (واتە دامێنی دۆزینەوەکانی) دەتوانرێت بەتەواوی ببینرێت و تێیبگەین.

## 3

کاتێك سیستەمی کۆنی بەهاکان کە چاکە و خراپەی لەیەك جیادەکردەوە و بەهەر شتێك مانای تایبەت بەخۆی دەدا، بە ئارامی لە شانۆکە دەچووە دەرێ، دۆنکیشۆت لە خانوەکەی هاتەدەرێ و چیدی نەیدەتوانی جیهان بناسێتەوە. ئەم جیهانە بێ ئامادەبوونی هێزێکی میتافیزیکی، لەناکاو لەناو ئاڵۆزیەکی ترسناکدا ڕۆدەچوو. تاکە هەقیقەتێکی میتافیزیکی وەك سەدان هەقیقەتی ڕێژەیی لێدەهات کە مرۆڤەکان رویان تێکردن. بەمشێوەیە جیهانی سەردەمی تازە و ڕۆمان کە وێنە و نمونەیەکی ئەو جیهانە بوو، لەدایکبوو.

منی بیرکەرەوە، وەك دیکارت، بەبناغەی هەموو شتێك دانان، وبەمشێوەیە لەبەرامبەر جیهاندا بەتەنها مانەوە، دیدێکە کە هێگڵ بەهەق ناوی ناوە دیدێکی قارەمانانە.

جیهان وەك سرڤانتس بەدیاردەیەکی دولایەنە ببینین، لەبری روبەروبونەوە لەگەڵ تاکە هەقیقەتی رەهادا، بەناچار روبەڕوبونەوە لەگەڵ کۆمەڵێك هەقیقەتی ڕێژەیی ناکۆك بەیەکدا (ئەو هەقیقەتە گونجێنراوە لە "منە" وێناییەکاندا کە بە کەسایەتێکان ناودەبرێن) و لێرەوە "عەقڵی گومانـاوی لە یەقینـدا" بەتاکە یەقین زانین، هەموو ئەمانە پێویستی بە دەسەڵاتێکی بەهەمان ئەندازە مەزن هەیە.

چەمکی ڕۆمانی مەزنی سرڤانتس چیە؟ نوسنیگەلێکی زۆر لەمبارەیەوە هەیە. هەندێك بڕوایان وایە لەم ڕۆمانەدا ڕەخنەی عەقڵباوەڕیانە لە ئایدیالیزمی ئاڵۆزی دۆنکیشۆت دەبینن. هەندێکی دی ستایشکردنی هەمان ئایدیالیزم دەبینن. ئەم دوو تەفسیرە هەردوکیان هەڵەن، چونکە بناغەی ڕۆمان لەبری پرسیار، بە هەڵوێستوەرگرتنی ئەخلاقی دەزانن.

مرۆڤ ئارەزومەندی جیهانێکە کە تیایدا چاکە و خراپە بەئاشکرا قابلیی دیاریکردن بن، چونکە لە مرۆڤدا ئارەزوییەکی خودی و سەرکەش بۆ داوەریکردن بەر لە تێگەیشتن

هەیە. لەسەر بناغەی ئەم ئارەزووە، بیروڕاکان و ئایدۆلۆژیەکان دروستبوون. ئەم بیروڕا و ئایدۆلۆژیانە تەنها کاتێك دەتوانن لەگەڵ ڕۆماندا ئاشتببنەوە کە زمانی ڕێژەگەری و دوو شێوە هەڵسەنگاندنی ڕۆمان، لەبری دەربڕینی بڕاوە و دۆگمای خۆیان بەکاربهێنن. لەدیدی ئەوانە راستی تەنها لای یەك کەسە، یا ئاناکارنینا قوربانی پیاوێکی ستەمکار و تەسکبینە، یان کارنینا قوربانی ژنێکی نائەخلاقی:یا ك بێگوناهەو دادگایەکی نادادپەروەر مەحکومی دەکات، یان لە رای دادگادا نادادپەروەری رەها هەیە و ك تاوانبارە.

لەمباوەڕەدا بە "یا ئەم یان ئەو"، نەتوانینی سەلماندنی ڕێژەیبوونی بنەڕەتی شتەکانی مرۆڤ شاراوەیە. بەهۆی ئەم نەتوانینەوە قبوڵکردن و دەرکی عەقڵی ڕۆمان (کە هەمان عەقڵی گومان لە یەقیندایە)، ئاسان نیە.

## 4

دۆنکیشۆت رووی لە دنیایەك کرد کە لەبەرامبەریدا بە بەرفراوانی دەرکەوتبوو. دۆنکیشۆت دەیتوانی بە ئازادانە بچێتە ناو ئەم دنیایەوە و هەرکاتێکیش ویستی بگەڕێتەوە ماڵەوە. یەکەم ڕۆمانە ئەوروپیەکان بریتیە لە سەفەرگەلێك بەناو سەرتاسەری جیهاندا، کە بێسنور دەردەکەوێت. لە سەرەتای ڕۆمانەکەی دیدرۆدا بەناوی "ژاکی قەزاو قەدەری" لەناکاو لەنیوەی ڕێدا روبەڕووی دوو پاڵەوان دەبینەوە، بێئەوەی دیاربێت لەکوێوە دێن و بۆ کوێ دەچن. ئەوان لە زەمانێکدان کە سەرەتا و کۆتایی نیە، لە فەزایەکدا کە سنورێك ناناسێت، لەنێوان ئەوروپادا کە ئایندەی هەرگیز تەواو نابێت.

نیو سەدە پاش دیدرۆ لە بەرهەمەکانی بەلزاکدا، ئاسۆی دوردەست، وەك دیمەنی پشت تەلارە تازەکان کە بریتیە لە کۆمەڵێك دەزگای کۆمەڵایەتی (پۆلیس، دادگا، ناوەندەکانی مەسەلە داراییەکان و گروپە خراپەکارەکان، سوپا، دەوڵەت) دیارنەماوە. لە سەردەمی بالزاکدا چیدی هیچ پاشماوەیەکی ئاسودەگی سەرخۆشانەی سەردەمی سرڤانتس نابینرێت. زەمەن سواری شەمەنەفەرێك بووە کە ناویانناوە مێژوو. سواربوونی ئەم شەمەنەفەرە ئاسانە، بەڵام دابەزین لێی ئەستەمە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هێشتا ئەم شەمەنەفەرە کاریگەرییەکی ترسناکی نیە، بەڵکو خاوەن هێزی ڕاکێشانیشەو مژدەی روداوگەلێك بە موسافیرەکانی دەدات کە پایە و پلە لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

دیسان پاشتر لەدیدی ئیما بۆڤاریدا ئاسۆ بەئەندازەیەك تەسکدەبێتەوە کە لە حەوشەیەکی داخراو دەچێت. روداوەکان لەودیو حەوشە داخراوەکەوە ڕوودەدەن و دەردی غوربەت تەحەمول نەکراو دەبێت. لە گوزەرانی بێزارکەری ڕۆژانەدا، خەون و خەیاڵەکان گرنگی پەیدا دەکەن. بێکۆتایی لەدەستچوویی جیهانی دەرەوە، جێگەی خۆی بە بێکۆتایی ڕۆح دەدات. ئەو خەیاڵە مەزنەی کە بڕوای بە یەکتایی جێنەگرەوەی تاك هەیە، و یەکێکە لە جوانترین خەیاڵە ئەوروپیەکان، دەپشکوێت.

بەڵام لە ساتەوەختێکدا کە مێژوو یان ئەو شتەی لێی ماوەتەوە – واتە هێزی بان مرۆیی کۆمەڵگایەکی فرە توانا- بەسەر مرۆڤدا زاڵدەبێت، خەیاڵ لەبارەی بێکۆتایی ڕۆحەوە ئەفسونی خۆی لەدەستدەدات. ئەوەی مێژوو مژدەی بە مرۆڤ دەدات، چیدی پلەیەکی بڵند نیە، بەڵکو دواجار کاری روپێوانە (مساح). چی لەدەست ك لەبەرامبەر دادگا، ك لەبەرامبەر کۆشکدا دێت؟ کارێکی ئەوتۆی لەدەستنایەت. ئایا ك دەتوانێت وەك ئیما بۆڤاری خۆی بە

خەیاڵ بسپێرێت؟ نا، ئەو داوەی زنجیرەی روداوەکان دەیخاتە سەر ڕێی، سەخت و ترسناکەو هەموو ئەندێشە و هەستەکانی ك بۆ لای خۆی رادەکێشێت: ك تەنها دەتوانێت بیر لە دادگا و کاری رۆپێوانەکەی بکاتەوە. بێکۆتایی رۆح، ئەگەر بونیشی هەبێت، بووە بە ریخۆڵە کوێرەیەکی بێسود بۆ مرۆڤ.

## 5

ڕێگای رۆمان وەك دیاردەیەکی مێژوویی، هاوتەریب لەگەڵ سەردەمی تازەدا وێنە دەکرێت. ئەگەر بۆ بینینی ئاوڕ لەدواوە بدەمەوە، بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر کورت و داخراو دێتە بەرچاو. ئایا ئەوە خودی دۆنکیشۆت نیە کە پاش سێ سەدە، لە جلوبەرگی رۆپێودا گەڕاوەتەوە بۆ لادێ؟ دۆنکیشۆت لە رابردودا بۆ هەڵبژاردنی روداوەکانی کەوتبووە رێ، بەڵام هەنوکە لە لادێیەکدا کە کەوتۆتە خوار "کۆشك"ەوە، چیدی مافی هەڵبژاردنی نیە: ك بەهۆی هەڵەیەکەوە لە پەروەندەکەیدا لەگەڵ دەزگایەکی بەڕێوەبەرایەتیدا توشی بگرەوبێنەیەکی ناسك دەبێت. پاش سێ سەدە چی بەسەر روداو – واتە یەکەم ناوەڕۆکی مەزنی رۆماندا– هاتووە؟ ئایا روداو گۆڕاوە بۆ نیمچە روداو؟ مانای ئەم قسەیە چیە؟ ئایا ڕێگای رۆمان بەجۆرێك دژایەتی داخراوە؟

بەڵێ دەکرێ وا بیر بکرێتەوە. نەك تەنها یەکجۆر دژایەتی، بەڵکو چەندان جۆری دژایەتی. "شوایك، سەربازی دڵپاك" رەنگە دوا رۆمانی مەزنی خەڵکپەسەند بێت. ئایا جێی سەرسوڕمان نیە ئەم رۆمانە کۆمیدیە لە هەمانکاتدا رۆمانێك بێت لەبارەی جەنگەوە کە روداوەکانی لەنێوان سوپا و بەرەکانی جەنگدا روودەدات؟ ئەگەر جەنگ و دەرئەنجامە ترسناکەکانی، بوون بە بابەتێکی پێکەناوی، کەوابوو چی بەسەر جەنگ و دەرئەنجامەکانیدا هاتووە؟

لە بەرهەمەکانی هۆمیرۆس و تۆلستۆیدا، جەنگ مانایەکی شایەنی تێگەیشتنی هەبوو: تاکەکان لەپێناوی هیلنی جوان یا روسیادا دەجەنگان. شوایك و هاوڕێکانی نازانن بۆچی بۆ بەرەکانی جەنگ دەچن. ئەوەی لەمەش ناڕاحەتکەرترە، ئەوەیە هیچ حەزیشیان لەمکارە نیە.

بەڵام ئەگەر لەپێناوی هیلینی جوان یا نیشتیمانی دایکدا نەبێت، کەوابوو بزوێنەرەکەی چیە؟ ئایا تەنها لەبەر دەسەڵاتە کە دەیەوێت خۆی وەك دەسەڵات سەقامگیر بکات؟ ئایا ئەمە "خواستی ئیرادەیە" کە پاشتر هایدگەر قسەی لەبارەوە دەکات؟ لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئایا ئەم دەسەڵاتخوازیە بەردەوام بزوێنەری هەموو جەنگەکان نەبووە؟ بێگومان هەمیشە بووە. بەڵام ئەمجارە دەسەڵاتخوازی لە بەرهەمەکانی هاشکدا هیچ بەهانەیەکی عەقڵانی نیە. هیچکەس باوەڕ بەقسە بێ سەروبەرەکانی پڕوپاگەندەکان ناکات. تەنانەت ئەو کەسانەش کە دایانهێناون. ماهیەتی دەسەڵات روتە، بەهەمان ئەو روتیەی لە رۆمانەکانی کافکادا هەیە. لەراستیدا دادگا هیچ سودێك لە لە سێدارەدانی ك وەرناگرێت، وەك چۆن کۆشك هیچ سودێك لە ئازاردانی رۆپێو نابینێت. بۆچی ئەڵمانیا لەرابردودا و روسیا لە هەنوکەدا، خوازیاری باڵادەستین بەسەر جیهاندا؟ لەبەرئەوەی سامانێکی زۆرتر بەدەست بێنن؟ بۆئەوەی خۆشبەختتر بن؟ نا. دەستدرێژیکاری دەسەڵات، بەتەواوی بێ دیدە و هیچ پاڵنەرێکی نیە و تەنها بەدوای خواستی خودی خۆیەتی، رەگەزێکی راستەوخۆ ناعەقڵانیە.

لێرەوە کافکا و هاشک ئێمە روبەروی ئەم دژایەتیە بێکۆتاییە دەکەنەوە: بەدرێژایی سەردەمی تازە عەقڵی دیکارتی هەموو ئەو بەهایانەی بەمیرات لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە بۆی مابۆوە، یەك لەدوای یەك هەرس دەکات. بەڵام لە سەردەمی سەرکەوتنی تەواو و کامڵی عەقڵدا، ئەم رەگەزە ناعەقڵیە پەتیەیە (دەسەڵات تەنها بەدوای خواستی خۆیەوە) کە بەسەر شانۆی جیهاندا زاڵدەبێت. چونکە چیدی هیچ بەهایەکی قبوڵکراو لەلای هەموانەوە نیە کە رێگری لێبکات.

ئەم دژایەتیە کە لە کتێبی "زیندە خەونەکان"ی هرمان بلۆخدا بەشێوەیەکی مامۆستایانە رونکراوەتەوە، یەکێکە لەو دژایەتیانەی دەمەوێت ناوی "کۆتاییانەی" لێبنێم. دژایەتیگەلێکی دیش هەن. بۆ نمونە سەردەمی تازە خەونی مرۆڤایەتیەکی لەسەردا بوو کە گەرچی بەهۆی شارستانێتی جیاوە لەیەك جیاواز بوون، بەڵام رۆژێك بە یەکێتی دەگەیشت، و لەگەڵ یەکێتیشدا بە ئاشتی هەمیشەیی دەگەیشت. ئەمرۆ مێژووی گۆی زەوی، دواجار هەمەکیەکی پێکەوە بەستراوی بەرهەمهێناوە، بەڵام ئەوە جەنگی دینامیکی و هەمیشەییە کە خەونی دێرینەی یەکێتی مرۆڤایەتی بەدیهێناوە و پاراستووە. یەکێتی مرۆڤ بەمانای ئەوەیە هیچ کەس رێگەی راکردنی بۆ جێگەیەك نیە.

## 6

ئەو کۆنفرانسانەی کە تیایدا هۆسرەل باسی قەیرانی ئەوروپا و ئەگەری لەناوچونی مرۆڤایەتی ئەوروپی دەکرد، وەسیەتنامە فەلسەفیەکەی بوو. هۆسرەل ئەم کۆنفرانسانەی لە دوو پایتەختی ئەوروپای ناوەندیدا گرت. ئەم رێکەوتە خاوەن مانایەکی قوڵە: لەراستیدا لەناو هەمان ئەم ئەوروپای ناوەندیەدایە کە رۆژئاوا توانی بۆ یەکەمجار لەمێژووی هاوچەرخیدا، مەرگی رۆژئاوا بەچاوی خۆی ببینێت. ئەمەش ئەگەر وردتر بڵێین، کاتێك بوو کە بەراکێشانی ڤارشۆ، بۆدابست و پراگ لە ئیمپراتۆری رۆسدا، جیابونەوەی پارچەیەکی بوونی خۆی بینی. ئەم بەدبەختیە جەنگی جیهانی یەکەم بەباری هێنا. ئەم جەنگە کە ئیمپراتۆری هابسبۆرگ دەستی پێکردبوو، بووە هۆی لەناوچوونی هەمان ئەم ئیمپراتۆریەتە و ئەوروپای بێتوانکراوی، بۆ هەمیشە ناهاوسەنگ کرد.




ئەو دوا قوناغە ئارامانەی کە تیایدا مرۆڤ تەنها دەرگیری دێوەکانی رۆحی خۆی بوو، واتە قۆناغی جۆیس و پرۆست، کۆتایی پێهاتبوو. لە رۆمانەکانی کافکا، هاشك، مۆزیل و برۆخدا، دێوەکە لە دەرەوە سەری دەردەهێنا، دێوێك کە بە مێژوو ناودەبرێت. مێژوو چیدی هاوشێوەی شەمەنەفەری ریسکخوازەکان نیە، مێژوو ناشەخسی، قایلی حکومەتنەکردن، حسابنەکراو و نامەفهومە و هیچ رێگەی

دەربازبونێك لێی نیە. ئەمە ساتەوەختێکە کە (بەیانی جەنگی جیهانی 1914) کە گروپی رۆماننوسانی ئەوروپای ناوەندی "دژایەتە کۆتاییەکانی سەردەمی تازەیان بینی و هەستیان پێکرد و تێیگەیشتن.

بەلاَم نابێت رۆمانەکانیان وەك پێشبینی کۆمەلاَیەتی و سیاسی، وەك نمونەیەکی زووی دیدی جۆرج ئۆرێل تەماشابکەین. ئەوەی ئۆرێل بە ئێمەی دەلَێت دەکرێ بەهەمان شێوە (یان زۆر باشتر لەو) لە گوتار یان کەشکۆلَێکدا بگوترێت. لەبری ئەمە ئەم رۆماننوسانە ئەوەی کە بە وتەی بڕۆخ "تەنها رۆمان دەتوانێت بیدۆزێتەوە"، دەدۆزنەوە. ئەوان پیشانی دەدەن کە چۆن لە سەردەمی "دژایەتیە کۆتاییەکاندا" هەموو وتەزاکانی بوون لەناکاو مانای خۆیان دەگۆڕن، ئەگەر ئازادی کاری کەسێکی وەك ك، بەتەواوی بێمانا بێت، ئەوا "روداو" بەچ مانایەك دەبێت؟ ئەگەر رۆشنبیرانی رۆمانی "مرۆڤی بێ خەسلَەت" لەبارەی رودانی جەنگێکەوە کە بەیانی ژیانیان بە با دەدات، بچوکترین گومان بەدلَیاندا نەیەت، ئاینده چ مانایەکی دەبێت؟ ئەگەر هۆگۆنۆ لە رۆمانی بلۆخدا نەك هەر لەتاوانێك کە کردویێتی پەشیمان نەبێت، بەلَکو فەرامۆشیشی بکات، چەمکی تاوان چی لێدێت؟ و ئەگەر تەنها رۆمانی مەزنی کۆمیدی ئەم قۆناغە، واتە رۆمانی هاشك، جەنگ بکاتە بابەتی خۆی، کەوابوو چی بەسەر رۆمانی کۆمیدیدا هاتووە.؟ ئەگەر ك تەنانەت لە پێخەفی عەشقبازیدا هەرگیز بێ ئامادەبووی دوو نێرراوی کۆشك نەبێت، کەوابوو جیاوازی نێوان "ژیانی تایبەتی" و "ژیانی گشتی" لەچیدایە؟ لەم حالَەتەشدا ئیدی "تەنیایی" چ مانایەکی هەیە؟ ئایا وەك ویستویانە باوەڕ بەوە بکەین کە "تەنیایی" بارێکی قورس، دلَەڕاوکێ و نەفرینە،

یا بە پێچەوانەوە گرتنەبەهاترین بەهرەیەکە کە کۆمەلَگا بە ئامادەبوونی بەردەوامی خۆی، لەحالَەتی لەناوبردنیدایە؟.

قۆناغەکانی مێژوویی رۆمان، زۆر دورودرێژن (ئەم قۆناغانە پەیوەندیان بە گۆڕانە تێپەڕەکانی مۆدەکانەوە نیە)، و ئەم یان ئەو رەهەندەی بوون کە رۆمان بە گرنگیپێدانی تاوتوێیدەکات، دەستنیشانیان دەکات. بەمشێوەیە توانا شاراوەکانی دۆزینەوەکەی فلۆبێر لەبارەی رەهەندەکانی ژیانی رۆژانەوە، تەنها حەفتا سالَ دوای ئەوە لەبەرهەمە مەزنەکەی جیمس جۆیسدا، پەروەردە دەکرێن. بەبڕوای من تا کۆتایهاتنی قۆناغێك کە گروپی رۆماننوسانی ئەوروپای ناوەندی لە پەنجا سالَی پێشدا دەستیان پێکرد (قۆناغی دژایەتیە کۆتاییەکان)، هێشتا زۆری ماوە.

## 7

لە دێر زەمانەوە لەبارەی کۆتایهاتنی تەمەنی رۆمانەوە، زۆر قسەیان کردووە، بەتایبەتی فۆتۆریستەکان، سۆریالیزمەکان و بەگشتی هەموو ئاڤانگاردەکان.

ئەوان بڕوایان وابوو رۆمان لە رێی پێشکەوتندا لەپێناوی ئایندەیەکی لەبنەڕەتدا نوێ، لە بەرژەوەندی هونەرێك کە هیچ لێکچونێکی لەگەلَ ئەوەدا نیە کە پێشتر هەبووە، لەناودەچێت. رۆمانیش وەك فەقیری، چینە فەرمانڕەواکان، مۆدێلە کۆنەکانی ئۆتۆمبیل یان کلاوە درێژەکان، بەناوی دادپەروەری مێژووییەوە لەگۆڕ دەنرێت.

لێرەوە ئەگەر سرڤانتس بونیادنەری سەردەمی تازەیە، ئەنجامی میراتەکەی مانایەکی زیاتر لە قۆناغێکی سادەی مێژووی شێوازە ئەدەبیەکاندا هەبێت، ئەوا لەراستیدا ئەنجامی میراتەکەی سرڤانتس دەبێت کۆتایی سەردەمی

تـازە راگەیـەنێت. لێرەوەیـە بـە بـڕوای مـن ئـەو زەردەخەنە خۆبەگەورەزانەی کە بەهۆیەوە باسی مـەرگی رۆمـان دەکـەن، پـوچ و سـاوێلکانەیە. ئەگـەر دەڵـێن پـوچ و ساوێلکانەیە، لەبەرئـەوەی مـن پێـشتر مـەرگی رۆمـان، کـوژرانی رۆمـانم (بەدەســـتی قەدەغەکردنـــەکان، سانـــسۆر، ســـەرکوتی ئایـــدۆلۆژی) لـــە جیهانێکـــدا کـــە بەشـێکی گـەورەی ژیـانم تیایـدا بردۆتـە سـەرو بەگـــشتیش ناوینـــاوە تۆتالیتـــار، بینیـــوە و بەهـەموو بونمـەوە هەسـتم پێکـردووە. ئەوکاتـە بـوو کـە زۆر بـەروونی ئاشـکرا بـوو رۆمـان وەك نمونەیـەکی ئـەم جیهانـە کـە لەسـەر بناغـەی ڕێژەگـەری و دوولایـەنی دیـاردە مرۆییـەکان راوەســـتاوە، لەگـــەڵ جیهـــانی تۆتالیتـــاردا ناگونجێـــت. ئـــەم نەگونجانـــە قـــوڵترە لـــەو نەگونجانـەی نـەیاری سیاسـی لـە کارمەنـدی ئاسـایش و خـەباتگێڕێکی ڕێگـەی مافـەکانی مرۆڤ لە ئەشکەنجەدەرێك جیادەکاتەوە. چونکە ئەم نەگونجانە نەك تەنها سیاسی یان ئەخلاقیە، بەڵکو رووی لە "کۆی بوونی" ئێمەیە. ئەمە بەو مانایەیـە کـە ئـەو دنیایـەی لەسـەر بناغـەی هەقیقـەتی یـەکتا راوەسـتاوە، و دنیـای دوو لایـەنی و ڕێـژەیی رۆمـان، هەریـەکێکیان لـە کەرەسـەیەکی تـەواو جیـاواز دروسـتبوون. هەقیقـەتی تۆتالیتـار، وتـەزاکانی ڕێژەگـەری و گومان و پرسیار نەفی دەکات و لێرەوە هـەرگیز ناتوانێت لەگەڵ ئەو شتەدا کە من ناوی دەنێم "رۆحی رۆمان"، ئاشتبێتەوە.

بـەڵام مەگـەر راسـت نیـە کـە لـە رۆسـیای کۆمۆنیستدا سەدان و هەزاران رۆمان بە تیراژی زۆر و بـــە ســـەرکەوتویەکی زۆرەوە، چـــاپ دەکـرێن؟ بێگومـان، بـەڵام ئـەم رۆمانانـە چیدی درێژە بە کرانەوەی بوون نادەن و هیچ بەشێکی تـازەی بـوون نادۆزنـەوە، بـەڵکو تـەنها ئـەو شـتانەی کـە پێـشتر گـوتراوە، دەسـەلمێنن. لەمـەش سـەروتر هـۆی بـوونی ئـەم رۆمانانـە، شـکۆیان و سـودمەندیان بـۆ ئـەو کۆمەڵگایـەی تیایـدا نوسـراون، دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەلماندنی ئەوەی وتـراوە (و ئـەوەی دەبـێ بگوترێت). ئـەم رۆمانانـــە لەبەرئـــەوەی چـــیدی هـــیچ شـــتێك نادۆزنـەوە، هـیچ بەشداریەکیان لـە "بـەردەوامی دۆزینەوەکاندا" نیە کە من ناوی دەنێم مێـژووی رۆمـان. ئەم رۆمانانـە لـە دەرەوەی ئـەم مێـژوەن، یـــان باشـــترە بڵـــێین "رۆمانگـــەلێکن پـــاش مێژووی رۆمان".

نزیکـەی نیـو سـەدەیە مێـژووی رۆمـان لـە ئیمپراتۆری روسیادا راوەستاوە. ئەگـەر سـەرنج لـە مـەزنی رۆمـانی روس لـە گوگوڵـەوە تـا بیلـی بدەین، ئەوا ئەم راوەستانە دەبێت بە روداوێکی مـەزن بـزانین. کـەوابوو مـەرگی رۆمـان بڕوایـەکی کەشـخە نیـە، ئێمـە پێـشتر شـایەتی ئـەم مەرگـە بـووین و هەنوکـەش دەزانـین رۆمـان "چـۆن" دەمرێـــت: رۆمـــان وون نابێـــت، بـــەڵکو لەمێـــژووی خـــۆی دەچـــێتە دەرەوە. کـــەوابوو مـەرگی رۆمـان بـەئارامی و بێئـەوەی سـەرنج رابکێشێت و بیٚ ئەوەی ریسوایی دروستبکات، روودەدات.

## 8

بەڵام ئایا رۆمان بەپێی لۆژیکی تایبەتی و دەرونی خۆی، بە کۆتایی ڕێگەکەی ناگات؟ ئایا رۆمـــان تـــا هەنوکـــە لـــە هـــەموو تواناکـــان، ناســـینەکانو شـــێوەکانی خـــۆی ســـودی وەرنەگرتووە؟ بیستومە کە مێژووی رۆمانیان بە کـانزای خـەڵوز بـەراوردکردووە کـە زەخیرەکـانی لەمێـژە کۆتـایی پێهـاتووە. بـەڵام ئایـا مێـژووی رۆمان زۆرتر لە گۆڕستانی هەڵە لەدەستچوەکان و بانگەوازە گویٚ لێنەگیراوەکان ناچێت؟ من لە بەرامبـــەر چـــوار بانگـــەوازدا هەســـتیاریەکی تایبەتیم هەیە.

بەبڕوای من "بانگەوازی گەمە"- "تریسترام شاندی"-بەرهەمی لارنس ئشترن و "ژاکی قەزاو قەدەری" بەرهەمی دیدرۆ، لە گەورەترین ڕۆمانەکانی سەدەی هەژدەن، ڕۆمانگەلێك کە وەك گەمەیەکی شکۆمەند پێشکەش دەکرێن. ئەم دوو ڕۆمانە دوو لوتکەی ئازادئەندێشین کە تا هەنوکە هیچ ڕۆمانێك پێینەگەیشتووە و لەمەودواش پێیناگات. ڕۆمانەکانی دوایی خۆیان بەتوندی بە پێویستی هەقیقەتنمایی، بە دیکۆری واقعبینانە و بە ڕەچاوکردنی وردی قۆناغە زەمەنیەکان بەستەوە. ڕۆمان توانا شاراوەکانی ناو ئەم دوو شاکارەی لەدەستدا، تواناگەلێك کە دەیتوانی ڕەوتی گۆڕانێکی تری جیاواز لەوەی ئەمڕۆ دەیناسین، بۆ ڕۆمان دروستبکات (بەڵێ ئێمە دەتوانین مێژوویەکی دی بۆ ڕۆمانی ئەوروپا وێنا بکەین).

" بانگەوازی خەون" – خەیاڵی خەولێکەوتوی سەدەی نۆزدەهەم، لەناکاو بەهۆی فرانز کافکاوە لەخەو هەڵسا. کافکا کارێکی ئەنجامدا کە سوریالیزمەکانی پاش ئەو دەیانویست ئەنجامی بدەن و نەیانتوانی، واتە تێکئالانی خەون و واقع. لەراستیدا ئەم بەرزفڕینە ستاتیکای دێرینەی ڕۆمانە کە پێشتر نۆڤالیس پەی پێبردبوو، بەلام پێویستی بە هونەرێکی کیمیاگەری هەبوو کە تەنیا کافکا توانی نزیك سەد ساڵ دوایی "بیدۆزێتەوە". ئەم دۆزینەوە مەزنە بەرلەوەی دەرئەنجامی گۆڕانێك بێت، سەرەتای پەیبردن بەو خاڵەیە کە ڕۆمان بوارێکە کە تیایدا خەیاڵ وەك خەون دەتوانێت هاژەی تیا بکات و خۆی لە ناچاری بەروکەش چارەهەڵنەگری هەقیقەتنمایی ڕزگاربکات.

"بانگەوازی ئەندێشە" – مۆزیل و بڕۆخ هۆشمەندیەکی مەزن و درەخشانیان خستەناو بواری ڕۆمانەوە. ئەم کارەش نەك بۆ گۆڕینی ڕۆمان بە فەلسەفە، بەڵکو بۆ ئەوەبوو هەموو هۆکارە عەقڵی و ناعەقڵیەکانی، ڕوایتگەریانە و بیرگەریانە کە توانای ڕونکردنەوەی بونی مرۆڤیان هەیە، سازوئامادەبکەن و ڕۆمان وەك مەزنترین پێکهاتەی زیهنی لێبکەن. ئایا ئەمکارە بەرجەستەیەی مۆزیل و بڕۆخ کۆتایی مێژووی ڕۆمانە، یان بانگەشەیە بۆ سەفەرێکی دورودرێژ؟

"بانگەوازی زەمان" قۆناغی "دژایەتیە کۆتاییەکانی" ڕۆماننوس دەوروژێنێت بۆئەوەی مەسەلەی زەمەن ئیدی بە بابەتی یادەوەری تایبەتی، بەشێوازی مارسل پرۆست، سنوردار نەبێت، بەڵکو بیکات بە مەتەڵی زەمەنی کۆیی، زەمەنی ئەوروپا، ئەوروپایەك کە بۆ سەیرکردنی رابردووی خۆی، بۆ هەڵسەنگاندن و کۆکردنەوەی ژیانی خود، بۆ تێگەیشتن لە مێژووی خۆی دەگەڕێتەوە بۆ دواوە، وەك پیرەمێردێك کە بە نیگایەك ژیانی رابردوی خۆی بەسەردەکاتەوە. ئارەزوو بۆ تێپەڕاندنی سنورە ناپایەدارەکانی ژیانی تاکەکەسی، کە ڕۆمان تائەوکاتە لە چوارچێوەیدا مابۆوە، و هێنانە ناوەوەی چەندین قۆناغی مێژوویی بۆ ناو فەزاکەی (کارێك کە ئەراگۆن و فوئنتس پێشتر بۆ بەدیهاتنی هەوڵیاندابوو) لێرەوە سەرچاوە دەگرێت.

بەلام من نامەوێت پێشبینی ڕێگەکانی ئایندەی ڕۆمان-کە هیچ لەبارەیەوە نازانم- بکەم، تەنها حەزدەکەم ئەوە بڵێم: ئەگەر بەڕاستی ڕۆمان دەبێت لەناوبچێت، لەبەرئەوە نیە کە هێزەکەی تەواو بووە، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە ڕۆمان لە جیهانێکدا دەژی کە چیدی موڵکی ئەو نیە.

## 9

## سەقامگیرکردنی یەکێتی مێژوویی گۆی

زەوی، ئـەم خەونـەی مرۆڤایـەتی کـە خوداوەنـد ڕێگـەی بـە بـەدیهاتنی دا، هـاوڕێی پرۆسـەیەکی کورتکـەرەوەی سـەرگێژکەر بـووە. ئـەوە ڕاسـتە مۆریانەکانی کورتکەرەوە بەردەوام ژیانی مرۆڤ ئــەجوون: وەك چـــۆن گـــەورەترین عەشـــق، دەگۆڕێـــت بـــۆ کۆمـــەڵێك یـــادەوەری بـــێ درەوشـــانەوە. بـــەڵام خەســـڵەتی کۆمـــەڵگای هاوچەرخ بەشێوەیەکی ترسناك، ئەو بەدبەختیە سەقامگیر دەکات: ژیانی مرۆڤ کورتدەبێتـەوە بـۆ دەورە کۆمەڵایەتیەکـەی، مێـژووی نەتەوەیـەك دەگەڕێنرێتـەوە بـۆ چـەند ڕوداوێـك و ئـەمیش کورتدەبێتەوە بۆ تەفسیرێکی بەدنیەتانـە، ژیـانی کۆمەڵایـەتی بـۆ خـەباتی سیاسـی و خـەباتی سیاسـیش بـۆ ڕووبەڕووبونـەوەی دوو دەسـەڵاتی گـــەورەی جیهـــانی کورتدەبێتـــەوە. مـــرۆڤ لـە"گێـژاوی ڕاسـتەقینەی کورتکردنـەوەدا" گرفتـارە، گێـژاوێك کـە تیایـدا "ژیانگـا" کـە هوسرەل قسەی لەبارەوە دەکرد، بەناچار تاریك دادێـــت و بـــوونی بەدەســـتی فەرامۆشـــی دەسپێرێت.

بەڵێ ئەگەر هۆی ئەنتۆلۆجی ڕۆمان ئەوەبێت کە "ژیانگا" بەردەوام ڕوناکبکاتـەوە و ئێمـە لـە بەرامبـەر "فەرامۆشـی بـوون"دا بپارێزێـت، ئایـا بـوونی ڕۆمـان لـەمڕۆدا لەهـەموو شـتێکی دی زەروری تر نیە؟

بـەبڕوای مـن وایـە...بـەڵام بەدبەختانـە مۆریانـەکانی کورتکردنـەوە، ڕۆمـانیش دەجـون، ئەو مۆریانانەی نەك تـەنیا لەچەمکی جیهانـەوە، بـەڵکو لـە چـەمکی بەرهـەمی نوسـەرانیش کەمدەکەنەوە. ڕۆمان (وەك سەرتاسـەری کلتـور) بەشـێوەیەکی ڕوو لـەزیاد کەوتۆتـە دەسـت دەزگاکـانی ڕاگەیاندنـەوە، ئـەم دەزگایانـە کـە هۆکاری یەکێتی بەخشی مێژوویی گۆی زەویـن، پرۆســەی کورتکردنـــەوە پەرەپێـــدەدەن و دەستنیـشانی ئاراسـتەکەی دەکـەن. دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن هـەمان سـادەکاری و کلێـشانەی کـە بەئاسـانی لای خـەڵکی، لای هـەموان و لای کـۆی مرۆڤایـەتی قبوڵـدەکرێت، پەخشدەکەنەوە. هـیچ گرنگیـەکی ئەوتۆشـی نیـە کـە لـە ئۆرگانـە جیاوازەکانیـەوە، بەرژەوەنـدی سیاسـی جیـاواز دەرکـەوێت. لەپشت ئـەم جیاوازیـە ڕوکەشیەوە، ڕۆحیەتێکی هاوبەش باڵادەستە. ئەوەنـدە بەسـە پـــەڕەی هەفتەنامـــە سیاســـیە ئـــەوروپی و ئەمەریکیـەکان، چ ڕاسـت چ چـەپ، لـە تـایمزەوە بیگرە تا شپیگل هەڵدەینەوە، بۆئەوەی تێبگـەین هـەر هـەموویان دیـدێکی یەکسانیان بـۆ ژیـان هەیـە. ئـەم دیـدە لـە ڕێکخـستنی و ڕیزبەنـدی یەکسانی پێرستکاری بابەتـەکان، لـە سـەردێرە لێکچووەکان، لە شێوازە ڕۆژنامەییە لێکچووەکان، لە کۆمەڵە زمانی لێکچوو و لە شێوازی لێکچوو، لـە سـەلیقە هونەریـە لێکـچووەکان و لـە زنجـیرە پلەی ئەوانەی بە بڕوای ئەوان گرنگ و ئەوانـەی بـە بڕوایـان بێنرخـە، ئاشـکرا دەبێـت. ئـەم ڕۆحیەتە هاوبەشەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن کە لە پـــشت جیـــاوازی سیاســـیانەوە ئامادەیـــە، ڕۆحیـەتی زەمـەنی ئێمەیـە. بـەبڕوای مـن ئـەم ڕۆحیەتە لە ڕۆحیەتی ڕۆمان جیاوازە.

ڕۆحی ڕۆمان، ڕۆحی ئاڵۆزیە. هـەر ڕۆمانێك بەخوێنەر دەڵێن: "شتەکان ئاڵۆزترە لـەوەی تـۆ بـیری لێدەکەیتـەوە". ئەمـە هەقیقـەتی نـەمری ڕۆمانە، گەرچی لە هەراوهوریای وەڵامە سادەو خێراکانـــدا کـــە پـــێش پرســـیار دەکـــەون و دەیسڕنەوە، زۆر بەکەمی بەرگوێ دەکەوێت. لـە دیـدی ڕۆحـی سـەردەمی ئێمـەوە ئانـا کارنینـا لەسەر هەقە، و عەقڵانیەتی کۆنی سرڤانتس کە لـەبارەی ئەسـتەمی زانـین و لـەبارەی هەقیقـەتی نـــەدۆزراوە، قـــسەمان بـــۆ دەکـــات، چـــیدی دەستوپێگیر و بێ سودە.

ڕۆحـــی ڕۆمـــان ڕۆحـــی بەردەوامیـــە. هـــەر بەرهەمێك وەڵامێکە بۆ بەرهەمێکی پێشوتر، هەر

بەرهـەمێك سـەرجەم ئـەزمونی پێـشوی ڕۆمـانی لەناوخۆیـدا هـەڵگرتووە. بـەڵام ڕۆحـی زەمـەنی ئێمــە ڕووی لــە هــەواڵ و ڕوداوەكــانی ڕۆژە، هەواڵگـەلێك كـە هێنـدە پەرشـوبڵاو و زۆرن كـە ڕابــردوو لــە ئاســۆی ئێمــە دەكەنــە دەرەوە و زەمــەنیش كورتدەكەنــەوە بــۆ ســاتەوەختی هەنوكـە. ڕۆمـان وەك بەشـێكی ئـەم سیـستەمە، چیدی "بەرهەمێكی" نەمر نیە (شتێك كە دەبێت بەردەوام بێت و ڕابردوو بە ئایندەوە ببەستێت)، بەڵكو ڕوداوێكی باوی ڕۆژە، و وەك ڕوداوەكانی دیش، جوڵەیەكی بێئەنجام.

**10**

ئایــا ئەمــە بــەمانای ئەوەیــە ڕۆمــان لەجیهانێكـدا (كـە چـیدی مـوڵكی ئـەو نیـە" لەناودەچێت؟ ئایا ڕۆمان دەهێڵێت ئەوروپا لە "فەرامۆشـی بـوون"دا ڕۆچـێت؟ ئایـا ئـەوەی دەمێنێتـەوە تـەنها زۆر بڵێـی بێكۆتـایی قەڵـەم بەدەستان، تـەنیا "ڕۆمانـەكانی پـاش مێـژوویی ڕۆمـان" دەبێـت؟ مـن نـازانم! تـەنها ئـەوە دەزانم ڕۆمان چیدی ناتوانێت لەگەڵ ڕۆحی زەمەندا بە ئاشتی و خۆشیەوە بژی. ئەگەر ڕۆمـان بیـەوێت درێژە بە دۆزینەوەی ئەو شتانە بدات كە هێشتا نەدۆزراونەتــەوە، ئەگــەر بیــەوێت هێـشتا وەك ڕۆمــان "پێــشبكەوێت"، هــیچ چــارێكی نیــە جگـە لـەوەی ڕێگـەیـەكی جیاواز لـە پێشكەوتنی جیهان بگرێت.

ئاڤانگاردەكـان كـە ئارەزویـەكی تونـدیان بـۆ هاوئاهـەنگبوون لەگـەڵ ئایندەدا هـەبوو، خـاوەن دیــدێكی دی بــوون. هونەرمەنــدان ئاڤانگــارد، بەرهەمگـەلێكیان داهێنـا كـە گـەر ڕاسـتان بوێـت بوێرانـە، ئەسـتەم، هەژێنـەر و جـەنجاڵی بـوون. بـەڵام ئـەوان ئـەم بەرهەمانـەیان بـەو یەقینـەوە داهێنـا كـە "ڕۆحـی زەمـەن" لەگـەڵ ئەواندایـە و بەیانی هەق بەوان دەدات.

لە ڕابردودا منیش ئایندەم بە تەنها دادوەری توانـای بەرهـەم و كارەكانمـان دەزانـی. دواتـر تێگەیشتم كە موغازەلـەكردنی ئاینـدە، بەدترین شــێوەی سازشــكاری و ڕوپامــایكردنێكی زەبونانەیــە لەبەرابـەر (هێزێكـی) بـەهێزتر لـە خـوددا. چـونكە ئاینـدە هەمیـشە بـەهێزترە لـە ئێـستا. لەڕاسـتیدا ئـەوە ئایندەیـە كـە لـەبارەی ئێمـەوە داوەری دەكـات، و بێگومـان بـێ هـیچ سەلاحیەتێكیش.

بەڵام ئەگەر من ئایندە بە خاوەن بەها نازانم، كــەوابوو دەبێــت بەچــیەوە وابەســتە بم؟ بــە نیشتیمان؟ بە خەڵك؟ بە تاكەكەس؟ وەڵامی من بەهــەمان ئەنــدازە كــە كۆمیدیــە، بــەڵام ڕاستگۆیانەیە: من وابەستە بەهیچ شتێكەوە نیم جگە لە میراتی بێ ڕێزكراوی سرڤانس.

**سەرچاوە:**

وەرگێڕانـی فەسـلی یەكـەمی كتێبـی: میـلان كونـدرا: هونـەری ڕۆمـان. ت: دكـتر همـایون پـور. تهـران. نـشر گفتار. چاپ دوم 1367.

SARDAM No. 56 2008

# پرسیاری فەلسەفی لە گوتاری گێڕانەوەدا

## سەرەتایەکی تیۆریی دەربارەی فەلسەفەی ژانری رۆمان

د. شاهۆ سەعید

ئەم باسە چەند پرسیارێك دەوروژێنێ سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان گوتاری فەلسەفی و گوتاری گێڕانەوە *Narrative Discourse*؟ دەربارەی ئاستەکانی بەیەکگەیشتن و لێکترازان لەنێوان هەردوو گوتاردا؟ دەپرسین: داخۆ دەکرێ لە دیدێکی بەراوردکاری ساناوە پەنجە بخەینە سەر توخمە سەرەکییەکانی ئەو پەیوەندییە؟ یان پێویستمان بە نزیککارییەکی تر هەیە بۆ دۆزینەوەی دەقئاوێزان و پەیڤین لەنێوان ئاستە مەعریفی و ئیستاتیکییە هاوبەشەکانی هەردوو کایەکەدا؟

پاش دەرکەوتنی رۆمان، وەك ژانرێکی مۆدێرنی گێڕانەوە، ئەم پرسیارانە لە هەموو کات زیاتر، لەنێوان رەخنەگران و تیۆرسازانی ئەدەبدا، بایەخیان پەیداکردو مشتومڕی جدییان لەسەر کرا؟ هەموو پرسیارەکان لە پرسیارێکی مەرکەزیدا چڕ بوونەوە کە داخۆ چ جیاوازییەك لەنێوان رۆمان و ژانرە کۆنەکانی گێڕانەوە، وەك داستان و ئەفسانە و چیرۆکە میللییەکاندا هەیە؟ ئایا جیاوازییەکە تەنها پەیوەندیی بە تەلاری فۆرمسازی و ستایلی نوسین و گوزارشتەوە هەیە..، یان دەرکەوتنی رۆمان هاوشانی دابڕانێك بوو لە هوشیاریی فەلسەفیدا سەبارەت بە پێگەی مرۆڤ، وەك خودێکی بیرکەرەوەی گەڕیدە لە جیهان و ژینگەیەکی نوێدا، کە پێویستی بە ئەزموونکردنی نوێ هەبوو..، مرۆڤێك گومانی پەیداکرد سەبارەت بە دید و بۆچوونە کۆنەکان و درز کەوتە قەناعەتە لاهوتی و کۆمەڵایەتییە پێشوەخت و جێگیرەکانی؟

بە دەربڕینێکی تر: ئایا رۆمان درێژبوونەوەی ژانرە کۆنەکانی گێڕانەوەیە؟ ئایا لە دەرکەوتنی رۆماندا تەنها وەرچەرخانێکی فۆرمئامێزی مێژوویی بەدیدەکرێ، وەرچەرخانێك لە گێڕانەوەی زارەکیی کۆنەوە بۆ گێڕانەوەی نوسراو و چاپکراو لە چاخی نوێدا؟ یان لەو دەرکەوتنەدا هەست بە ئاستێکی قووڵی بیرکردنەوەش دەکرێ، جۆرێکی تر لە پرسیارو

نیگەرانی مرۆڤی نوێ لەدایکدەبێ، کە لە دەرەوەی چێژی گشتی، لە دەرەوەی بیرکردنەوەی یەکرەنگی کۆمینیتییە داخراوەکان، سەرهەڵدەدا؟

ئەم کێشەیە بۆتە هەوێنی چەندین تیۆرەی ئەدەبی سەبارەت بە سەرهەڵدان و پێکهاتەی ستراکتوریی رۆمان. لەنێو تیۆرییە تەقلیدییەکاندا دوانیان لە هەموویان دیارترن، یەکەمیان ژانری رۆمان وەك درێژبوونەوەیەکی سروشتی و مێژوویی ئەدەبی داستانئامێز تەماشا دەکا، بەو پێیەی ژانرە ئەدەبییەکان هاوشانی کۆمەڵگا مرۆییەکان لە گەشەکردن و وەرچەرخاندان، هەموو گۆڕانێکیش لە ژێرخان و هەلومەرجی مادیدا رەنگدانەوەی راستەوخۆی لەسەر داهێنانی رەمزیی مرۆڤەکان دەبێ. جۆرج لۆکاش، کە یەکێکە لە تیۆرسازانی ئەم تیۆرەیە، پێیوایە رۆمانیش هەر داستانە، بەڵام داستانی مرۆڤی چاخی نوێیە، یان وردتر داستانی چینی بۆرجوایە. چونکە لای وی بەرهەمی ئەدەبی وەك بەشێکی دانەبڕاو لە کۆی گەشەی کۆمەڵایەتی تەماشادەکرێ. (جورج لوكاش، الأدب والفلسفة والوعي الطبقي. ت: هنرييت عبودي. ط1“ بيروت: دار الطليعة، 1980، ص76. وكذلك: حنا عبود، من تاريخ الرواية. دمشق: إتحاد كتاب العرب، 2002، ص13). لە بەرامبەرادا تیۆرەیەکی فۆرمالیستی هەیە کە پەیوەندیی دیالیکتیکی نێوان واقعی مێژوویی و بەرهەمی ئەدەبی ناسەلمێنێ، واتە پێیوایە مەرج نیە لەنێوان گەشەی بنیاتی کۆمەڵایەتی و گەشەی بنیاتی ئەدەبیدا پەیوەندی و ئەزموون گۆڕینەوە هەبێ. ئەرکی رەخنەگر، بەپێی ئەم تیۆرییە، بریتییە لە خوێندنەوەی بنیاتی دەق لە رێگەی توخمە ستراکتورییە پێکهێنەرە ناوەکیەکانەوە بەدوور لە کایە هاوسێکانی وەك مێژوو، فەلسەفە، کۆمەڵناسی و زانستە مرۆییەکان بەگشتی. ئەم تیۆریایە بایەخێکی ئەوتۆ نادا بە مێژووی کولتوری و ژینگەی تایبەتی نوسەر، بەڵکو تەنها لەکۆی یاسا ستراکتورییە داخراوەکان، وەك بنیاتێکی دیاریکراو، لە کۆنتێکستی شوێن و کاتدا، دەڕوانێتە قەوارەی نوسەر. واتە لەگەڵ لەدایکبوونی دەقدا نوسەر، وەك بونەوەرێکی مرۆیی، لە دەق دەترازێ و دەقیش لای خۆیەوە دەبێتە بنیاتێکی رەمزیی کە لە دەرەوەی مێژووی سیاسی و کولتوری و فەلسەفەی نوسەر هەناسە دەدا. جاکۆبسن، وەك تیۆرسازێکی ئەم تیۆریایە، دەڵێ: ئامانجی زانستی ئەدەب بریتی نیە لە ناسینی ئەدەب لە پەیوەندیدا بە کایە هاوسێکانیەوە بەگشتی، بەڵکو بریتییە لە ناسینی ئەو وزەیەی کە ئەدەب لە قەوارەیەکی ئاساییەوە دەکاتە قەوارەیەکی ئەدەبی، واتە ناسینی ئەو توخمە ستراکتورییە پێکهێنەرانەی کە پێناسی شیعریی یان ئەدەبی دەبەخشنە دەق (د. صلاح فضل، نظرية البنائية في النقد الأدبي. ط3“ بغداد: دار الشؤون الثقافية العامة، 1987، ص60، 267-268).

لە بەرامبەر بالادەستیی ئەم دوو تیۆریا ئەدەبییەدا، کە یەکەمیان زیاتر بایەخ بە سۆسیۆلۆجیای دەق و دووەمیان پێ لەسەر بنیاتی ناوەکی دەق دادەگرێ، چەند میتۆدێکی نوێ لەدایکبوون بۆ بەقسەهێنانی ناوچە شاراوەکانی دەقی ئەدەبی، بەتایبەتی دەقی رۆمان، وەك بوارێکی پەیڤینئامێزی کراوە، کە هەڵگری چەندین خوێندنەوەی جیاوازە و دژی هەر سادەکردنەوە و خوێندنەوەیەکی تاکڕەهەندە. رەخنەگرو فەیلەسوفی روسی میخائیل باختین دیارترین تیۆرسازی ئەم مەیدانەیە، کە هەوڵی داوە میتۆدە زمانەوانی و فینۆمینۆلۆجی و سۆسیۆلۆجیەکان لێك موتوربە بکا. (تزفيتان تودوروف، نقد النقد، ت: د.

سامي سويدان، مر: د. ليليان سويدان. ط2" بغداد: دار الشؤون الثقافية العامة، 1986، ص83). مەبەستی باختین دۆزینەوەی رەگەزی پەیڤینە *Dialogue* لە دەقی ئەدەبیدا، بەتایبەتی لە رۆماندا، کە ناکرێ لە بنیاتو یاسای پێشوەختدا لە چوارچێوە بدرێ، چونکە هەمیشە لە دۆخی بوونگۆڕکێ (صیرورە)دایەو هەمیشە لە دۆخی پەیڤینی ناوەکیو پەیڤینی دەرەکیدایە لەگەڵ ژانرو کایەو مەعریفە جیاوازەکاندا.

رۆمان، لای باختین، لەوە ئاڵۆزترو هەستیارترە کە لە پێناسەیەکی گشتیدا کورت بکرێتەوە، یان وەك ئەڵقەیەکی گەشەی مێژویی چەشنە هونەریو ئەدەبیەکان تەماشا بکرێ، یان لە بنیاتێکی فۆرمالیستی داخراودا بەند بکرێ.

چونکە سەرهەڵدانی رۆمان تەنها دابڕانێکی ئیستاتیکیی لەنێو داهێنانە هونەریەکاندا دروست نەکرد، بەڵکو داهێنانێکی ئەپستمۆلۆجیی لەنێو فیکری مرۆییشدا ئەفراند، جۆرێکی تری لە چێژو پرسیار هێنایە ئاراوە کە لێکدراوترو قووڵتر بوون.

لە رەخنەگرتنی تیۆرەی یەکەمدا باختین رای وایە وێناکردنی رۆمان وەك ئەڵقەیەك لە ئەڵقەکانی گەشەی مێژوویی ئەدەب، وەك بەشێك لە درێژبوونەوەی ژانرە کۆنەکانی گێڕانەوە، لە بابەتی داستانو حیکایەتی میللی..، هەوڵێکە بۆ ساناکردنەوەی ئەو ژانرەی کە لە هەناویدا زۆربەی ژانرو کایە مەعریفیو فیکریەکان وێنەو ئەزموون دەگۆڕنەوە.



دیستۆیفسکی

(تودوروف، میخائیل باختین: المبدأ الحواري، ص163). گەر قسەشمان لە رۆمان بێ وەك ئەڵقەی گەشەکردنی داهێنانە مرۆییەکان، ئەوا لەبەرتر وایە وەك ئەڵقەی گەشەکردنی ئەندێشەو پەیڤینی فیکری مرۆڤ لێی بڕوانین، چونکە بنیاتی واتاو فرەدەنگی لە رۆماندا زیاتر لە پەیڤینی فەلسەفی کۆن دەچێ نەك بنیاتی تاك دەنگی داستانو حیکایەتە میللییە کۆنەکان، کە توانای بیرکردنەوەو دایەلۆگیان لە وەرگر دەسەندەوەو ملکەچی مەرجەعیەتێکی باویان دەکرد. هەربۆیە باختین پێیوایە رۆمان هونەرێکی نوێ نیەو رەگوڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆ پەیڤینی فەلسەفی، یان وەك دەڵێ "لە چاخی کۆندا پەیڤینە سوکراتیەکان رۆمانی سەردەمی خۆیان بوون" (هـ، س، ل164). باختین فەلسەفەی "هیگڵ"یش رەخنەدەکا، کە ئەم تیۆریایە سەبارەت بە گەشەی دیالیکتیکی داهێنانی مرۆیی پشتی پێبەستووە. بەڕای هیگڵ مێژوو، تاك دەنگو خۆبەخۆ، لە پەیڤینێکی ناوەکیی دیالکتیکیی نێوان جومگەکانیدا، رێ دەکا..، ئەو کاروانەی مێژوو ملکەچی رۆحێکی میتافیزیکییە، کە وردە.. وردەو قۆناغ بەقۆناغ، گەشە دەکاو خۆی پتر دەناسێ تا دەگاتە دوا قۆناغی رەهایی.

*(Paul Trejo, Summary of Hegl's "Philosophy of Mind". 1993. p.1-2.*

*http://eserver.org/philosophy/hegel-summary.html<5/30/2005).*

بەڵام باختین ئەم دیدەی هیگڵ بۆ حیکایەتی تاك دەنگ و تاك سیناریۆی مێژوو ڕەخنە دەکا، بە لۆجیکی ڕۆمانی فرەدەنگ و پەیڤینئامێز ڕەخنە لە میتۆدی ساناکردنەوەی مێژوو دەگرێ، نمونەی ڕۆمانەکانی دوستۆیڤسکی دێنێتەوە کە جیهانێکی جیاواز لە جیهانی هیگڵ وێنادەکەن، جیهانێك تیایدا هەقیقەت دابەشدەبێ بەسەر دەنگە جیاوازەکاندا، ڕۆحی هیگڵ "وەك ڕۆحێکی تاکرەو کە لە بوونگۆڕکێدایە، ڕۆحێکە لەڕووی ئۆرگانیکییەوە نامۆیە بە ڕۆحی دوستۆیڤسکی، چونکە جیهانی دوستۆیڤسکی هەمەلایەنترو قووڵترە".

(میخائیل باختین: المبدأ الحواري، ص192).

لە ڕەخنەکردنی تیۆرەی دووەمدا، کە پاشتر دەبێتە هەوێنی میتۆدی بنیاتگەری لە ئەدەبدا، باختین بەپێچەوانەی شوێنکەوتوانی ئەو تیۆرەیەوە ئاماژەدەکا بەوەی کە پێداگرتن لەسەر بنیاتی فۆرمالیستی دەق بەجیا لە ڕەهەندە مێژوویی و فەلسەفی و ئایدیۆلۆجیەکان خوێندنەوەیەکی تاکڕەهەند دێنێتە ئاراوە کە خۆی لەخۆیدا دەبێتە ئیستاتیکایەکی ئایدیۆلۆجیی داخراو بەدەر لە ڕوخسارە جیاوازو هەمیشە تازەو کراوەکانی دەق. بەبڕوای وی فۆرمالیستەکان بەهەڵەدا چوون کاتێ لێکۆڵینەوە لە ئەدەب دادەماڵن لە لێکۆڵینەوەی هونەرو جوانناسی بەگشتی وەك لقێکی دایکی هەموو زانستەکان کە فەلسەفەیە، چونکە پەنابردن بۆ میتۆدی پۆزەتیفیستی بەمەبەستی پەرتکردنی کایە مرۆییەکان و خۆدزینەوە لە کاریگەریی فەلسەفەو ئیستاتیکا لەسەر داهێنانی مرۆیی تایبەتمەندییان پێنابەخشێ و ناتوانن خۆیان بکەنە ڕکابەری ڕەخنەگرە خاوەن میتۆدە کراوەکان، بەڵکو بەپێچەوانەوە زیاتر گۆشەگیریان دەکاو دەیانخاتە سێبەرەوە. (هـ، س، ل80).

تیۆریاکەی باختین پەنجە دەخاتە سەر ئاستە پەیڤینئامێزەکانی دەقی ئەدەبی بەگشتی و دەقی ڕۆمان بەتایبەتی، وەك بەرجەستەبوونێکی باڵای بەیەکداچوونی دەق دەڕوانێتە ڕۆمان، کە دواتر دەبێتە هەوێنی تیۆرەی دەقئاوێزان ***Intertextuality*** لە ڕەخنەدا بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لە ئاستەکانی تێکڕژانی نێوان کایە ئەدەبی و کولتورییە جیاوازەکان. هەمان تیۆرە بەدیوە فینۆمینۆلۆجییەکەیدا لەگەڵ فەلسەفەی جوانناسیی بوونخوازیدا یەکدەگرێتەوە کە بڕوای بەمانا شاراوەکانی دەق هەیە کاتێ دەبێتە جێژوانی بەیەکگەیشتنی هەموو مانا جیاوازەکان و دەرفەت دەڕەخسێنێ بۆ مرۆڤی داهێنەرو خوێنەر تا باڵاترین وێنەی ئازادیی مرۆیی پراکتیزە بکەن. لە ڕۆماندا ئاستە تێکڕژاوەکانی داهێنان، دیدو دەنگە جیاوازەکان، ستایلە جۆراوجۆرەکان، بەشێوەیەکی ئیستاتیکی بەرجەستەدەبن...، ژانرێکی فرە ڕەگ و فرە موتوربەیە، کە لەڕووی ستراکتورو ڕەهەندە ڕەمزییەکانەوە، لەسەر پێوەرێکی پێشوەخت ناگیرسێتەوە. ڕۆمان چەقی بەیەکگەیشتنی ستایلە جیاوازەکانە لەسەر ئاستی تەلاری ستراکتوری، هەروەك چۆن تیشکۆی بریسکانەوەی دیدە فەلسەفییەکانە لەسەر ئاستی جیهانبینی، واتە ناکرێ ڕۆمان وەك بنیاتێکی بێگیان لە دەرەوەی مێژووی بزۆرك تەماشا بکرێ، هەروەك چۆن ناکرێ وەك ئایدیۆلۆجیای چینێکی دیاریکراو بێتە هەژماردن.

بۆ سەلماندنی ئەم گریمانەیە ئاماژە بە چەند نمونەیەکی ڕۆمان دەدەین، لە چەند قۆناغێکی

مێژویی جیاوازدا، لە سەردەمی سەرهەڵدانیەوە لە چاخی مۆدێرندا تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان. دەبینین نمونەکان دەچنە دۆخی ئەزموونگۆڕینەوەو دایەلۆگەوە لەگەڵ دیدی فەلسەفی و ڕەوتە زانستی و ئایدیۆلۆجی و میتافیزیکییەکاندا. دەبینین جێگیرنەبوون و نەگیرسانەوەی نمونەکانی ڕۆمان، چ لەسەر ئاستی واتا و چ لەسەر ئاستی فۆرم و تیشکۆی گێڕانەوەو ستایڵی ڕۆماننوسە جیاوازەکان..، هاوشانی دایەلۆگ و ململانێی نێوان ڕێچکە فەلسەفییە جیاوازەکان و تێکەڵبوونی چەقە فیکرییە جیاوازەکانە.

## ئەقڵ، جیهان، نیگانما، ئاستە جیاوازەکانی تیشکۆی گێڕانەوەو بیرکردنەوە لەنێوان ڕۆمان و فەلسەفەدا:

ڕۆمان لە سەردەمێکدا دەرکەوت کە ململانێی نێوان هەردوو قوتابخانەی ئەقڵانییەت و ئەزمونگەری لە سەرەتای دەرکەوتنیدا بوو، زۆربەی ڕێچکە فەلسەفییەکانی چاخی مۆدێرن لە مناڵدانی ئەو دوو قوتابخانەیەوە هاتنەدەرێ. لەو دەمەدا بەهۆی پێکدادانی بەها نوێیەکان و بەها کۆنەکان، ژینگەی کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و سیاسیی ئەوروپا لە دۆخی ژانێکی گەورەدا بوو، ڕۆمان ئەو داهێنانە ئەدەبییە بوو کە هێڵە گشتییەکانی ئەو ژانەی لەسەر لاپەڕەکانی چڕدەکردەوە. لە ڕۆماندا تیشکۆی حیکایەتخوانی گۆڕانێکی گەورەی بەخۆوە بینی و لە دەسەڵاتی گوتاری ڕەسمی، ئاینی، سیاسی و کۆمەلایەتییەوە وەرچەرخا بۆ تیشکۆی هەڵقوڵاوی دیدی مرۆڤی تاك، کە سەرلەنوێ لە جیهانێکی نوێدا خۆی دۆزییەوە.

بەگوێرەی پێناسەی نەریتیی، ڕۆمان بریتیە لە ئەدەبێکی گێڕانەوەئامێزی خەیاڵی بۆ وێناکردنی دیمەنگەلێك کە لە ژیانی واقعییەوە وەردەگیردرێن، لە بنیاتێکی چنراو و ستراکتورێکی لێکدراودا.

*(Jeremy Hawthorn، Studying the Novel: An Introduction. London-New York: Arnold،1989. p.1).*

لەم پێناسەیەدا ئەوە دەردەکەوێ کە ڕۆمان ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان کۆن و تازە، بنیاتی خەیاڵی و بنیاتی تێکڕژاوە، هەروەها هەڵگری خەسڵەتەکانی چاخی کۆن و خەسڵەتەکانی چاخی نوێیە. بەڵام بەگەڕخستنی ئیلیمێنتی خەیاڵ لە ڕۆماندا جیاوازە لە بەگەڕخستنی هەمان ئیلیمێنت لە ژانرە کۆنەکانی وەك داستان و ئەدەبی میللی. چونکە ئەو هوشیارییەی کە ڕۆمانی بەرهەم هێنا هەمان ئەو هوشیارییە بوو کە دژی خەیاڵی پەتی و ئەفسانەو خورافاتی چاخەکانی ناوەڕاست وەستایەوە. واتە لە ڕۆماندا خەیاڵی مرۆڤی مۆدێرن دەچێ بەگژ خەیاڵی مرۆڤی کۆندا، خەیاڵی کەشف و خەونی ئەزموونکردنی توانا ئەقڵییەکان لە لایەن تاکەکانەوە بەرەنگاری خەیاڵێك دەبێتەوە کە گیرۆدەی نەریت و یاسا کۆمەلایەتییە جێگیرەکان و فەنتازیای لەبەر یەك کۆپیکراوی تاکەکانە.

ڕۆمان ئەو ژانرە ئەدەبییە بوو کە گوزارشتی لەم ڕێچکە فەلسەفییە کرد، بۆ بەرجەستەکردنی توانای تاك لە داهێنان و خۆگونجاندن لەگەڵ شتە نوێیەکاندا. هەر لەبەر ئەم هۆیە ڕۆمان ناونرا، کە وەك لە فەرهەنگی ئۆکسفۆردا هاتووە ئاماژە نوێبوونەوەو نوێخوازی دەکا. ( *A. S. Hornby، Oxford Advanced Learners Dictionary of Current English، 2002، p. 867*). بەپێچەوانەی ژانرە ئەدەبییە کۆنەکانەوە،

که هەروەك "ئێیان وات" دەڵێ روانگەی گشتیی کولتوریی باوی بەرجەستەکردووە، بەگوێرەی ئەو یاسایەی کە پێیوایە "خۆگونجاندن لەگەڵ نەریتی باودا سەنگی مەحەکی هەقیقەتە". (إيان وات، ص12). "ئارنۆڵد کاتل" دەرکەوتنی رۆمان دەبەستێتەوە بە گۆڕانە سیاسیو کۆمەڵایەتیو فیکرییەکانی پاش شۆڕشی ئینگلیزی لە سەدەی حەڤدەهەمدا. ( Dennis Walder، The Realist Novel. New York: Routledge، 1995. p207.).

فەلسەفەی رۆمان زادەی زەرورەتی گۆڕانکاری بوو لە تیشکۆی کۆمەڵایەتیی باڵادەستدا، تیشکۆیەك کە لەدەرەوە وەك ئیرادەیەکی دەستەجەمعی ئاراستەدەکرا بە تیشکۆیەك کە مرۆڤی تاك بەئیرادەی خۆی بەرهەمی دەهێنا. واتە وەرچەرخانێك رووی دا لە باڵادەستیی گوتاری رەسمییەوە بۆ گوتاری مرۆڤی تاك، کە گوزارشت لە ئەزموونو خولیای تایبەتی خۆی دەکا لەئاست ئەو کولتورە نەریتییەی کە کەمبایەخانە تەماشای تاكو فەلسەفەو ستایڵی تاك دەکا سەبارەت بە شێوازی بیرکردنەوەو گوزارشتکردن.

پەنابردن بۆ پەیوەندیی سەبەبی لەنێوان بەشو نەسکە جیاوازەکانی رۆماندا، بەدوایەکداهاتنی دیمەنە زەینییەکانو بیرۆکە جیاوازو دژەکان، هاوزەمان بوو لەگەڵ کەشفکردنی بەهای کاتو شوێن وەك دوو چەمكو دوو کێشەی فەلسەفی، هاوکات بوو لەگەڵ دۆزینەوەی بەهای جیهان وەك رووبەرێك کە چەندین ناوچەی نەدۆزراوەی لەخۆدەگرتو پێویستیان بە ئەزموونکردنو تەیکردنو رسککردن بوو. رۆمان بووە ئەو داهێنانەی کە لە یەك کاتدا بایەخی دوو لایەنەی (خودو بابەت)ی دۆزییەوە. بایەخی خودێکی بیرکەرەوە کە "دیکارت" جەختی لەسەر توانا ئەقڵییەکانی دەکردەوە، لەگەڵ بابەتێکی دەرەکی کە فەیلەسوفە ئەزموونگەرەکان پێیان لەسەر زەرورەتی کەشفکردنو ئەزمونکردنی دەکردەوە. ئیدی رۆمان بووە خاوەن تیشکۆیەکی ئیمپیریی بابەتی لەپاڵ تیشکۆیەکی ئەقڵییدا کە لە ئەزموونێکی ئەدەبییەوە بۆ ئەزموونێکی تر، لە رۆماننوسێکەوە بۆ رۆماننوسێکی دی، گۆڕانی بەسەر دەهات.

لە رێگەی بەگەڕخستنی ئیلیمێنتی "کات"ەوە، وەك کێشەیەکی زانستیو فەلسەفی، وێنەی کەسایەتیو قارەمانی چیرۆکیش گۆڕانی ریشەیی بەسەر هات. چونکە چیتر ئەو جیهانەی کە مرۆڤ ئەزموونی دەکردو ناوچە پەنهانەکانی کەشف دەکرد جیهانێکی جێگیر نەبوو، بەڵکو لە دۆخی بوونگۆڕکێی بەردەوامدا بوو. مرۆڤ رەهەندی زەمەنیی خۆی کەشفکرد کە لە تازەبوونەوەو گۆڕانی بەردەوامدا بوو، پاش ئەوەی هەر ئەو مرۆڤە بەپێی عەقیدەی کۆمەڵایەتیو ئاینیی کۆن ملکەچی زەمەنێکی دەرەکیی قەدەریی بوو. ئەم دۆخە کەسایەتییەکی لە رۆماندا دروستکرد کە وەك کەسایەتی ناو حیکایەتی کۆن خاوەن شوناسێکی جێگیرو نەگۆڕ نەبوو، بەڵکو خاوەن رەهەندێکی بزۆكو گەشەکردوو بوو لەناو کاتو مێژوودا، هەروەها لەناو بنیاتی زەمەنی دەقی رۆماندا کە بەسەر دیمەنو نەسکە جیاوازەکاندا دابەش دەبوو، کەسایەتیو شوناسی مرۆڤیش بەپێی ئەو دەلالەتە نوێیانەی ناو کات گۆڕانی بەسەر دەهات. لەڕووی هونەرییەوە دوو رەهەندی کات دۆزرانەوە: کاتی حیکایەتو کاتی گێڕانەوە. فەیلەسوفی ئینگلیزی جۆن لۆك (1632–1704) شوناسی تاکەکەس دەبەستێتەوە بە توانای هەستکردن بە رەوتو درێژبوونەوەی کات. فەیلەسوفێکی ئینگلیزیی

تـر كـه دێڤید هیـوم (1711–1776)ـه بۆچوونێكی هاوشێوەی هەیە كاتێ دەڵێ: "گەر ئێمە خاوەنی یادەوەری نەبین ناتوانین ببینە خاوەنی بیرۆكەی هۆكخوازیی (السببیە)، هەروەها ناتوانین لە زنجیرەی هۆكارو ئەنجامەكان بگەین كە كەسایەتیو خودی ئێمە پێكدێنن". (ایان وات، ظهور الروایة الإنكلیزیة، ص21).

رۆمان ئەو داهێنانە بوو كە ئەو دیدە فەلسەفییەی لە هەردوو تیشكۆی ئەقڵانیو ئەزموونگەریدا بەرجەستەكرد، یادەوەریی كردە بزوێنەری ئیلیمێنتی كات بۆ چنینی دیمەنەكانی رۆمان. ئەم دیدە مەعریفیو ئیستاتیكییە نوێیە بۆ ژیان هوشیارییەكی دوو لایەنەی دروستكرد بەرامبەر خودی بیركەرەوە، كە فەیلەسوفە ئەقڵانییەكان تیۆریزەیان بۆ دەكرد..، لەگەڵ جیهانو بابەتی ئەمپێریی، كە بیریارە ئەزموونگەرەكان جەختیان لەسەر بایەخی ئەزموونكردنی دەكردەوە.




ئەو گۆڕانە فیكریو ئیستاتیكییە لە یەك كاتدا لە فەلسەفەو رۆمانیشدا رەنگی دایەوە. زۆربەی فەیلەسوفە ئەزمونگەرەكانی ئینگلتەرا وەك فرانسیس بیكۆن (1561–1626)و تۆماس هۆبس (1588–1679)و جۆن لۆك..، لەپاڵ زۆربەی رۆماننوسە ئینگلیزەكانی وەك دانیاڵ دیڤۆ (1660–1730)، ساموێل ریچاردسۆن (1689–1761)و هینری فیلینگ (1707–1754) بانگەوازیان بۆ ئازادیی تاكەكەس دەكرد لە فیكرو سیاسەتو تیۆرەی مەعرفیدا. بیكۆن بڕوای بە واڵاكردنی ئاسۆ نوێیەكانی تیۆرەی سۆسیۆلۆجی بوو لەڕێگەی پێڕەوكردنی میتۆدێكی سۆراخكارییەوە *Induction Method* بۆ لێكۆڵینەوە لەبارەی وردەكارییەكانی ژیانی كۆمەڵایەتیو ژیانی تایبەتی تاكەكان. هەرچی هۆبس–ە پێیوابوو ئەو سەرقاڵی چارەسەركردنی بابەتێكە كە پێشتر بە شێوەیەكی راست چارەسەر نەكراوە، بۆ ئەو مەبەستە تیۆرەیەكی سیاسیو ئەخلاقیی بنیات نا سەبارەت بە پێكهاتەی خودگەریی–سایكۆلۆجیی تاك. (إیان وات، ظهور الروایة الانكلیزیة، ص72–73).

ئەو بایەخ بەخشینە بە تاك لە رۆمانەكانی ئەو سەردەمەدا رەنگی دایەوە، ئیدی تاكەكەس بووە بوونەوەرێك كە خۆی مێژووی خۆی بنیات دەنا. لە رۆمانی "رۆبنسۆن كرۆزۆ"دا ئەم وێنەیەی مرۆڤ بەرجەستەدەبێ، كاتێ قارەمانی رۆمانەكە بە تەنها بەرەنگاری سروشتو كێشەو مەترسییەكانی دەبێتەوەو هەوڵ دەدا لای خۆیەوە، لەڕێگەی هەڵەو ئەزموونەكانیەوە، چارەسەری كێشەكانی بكاو چاوەڕوانی فریادڕەسێكی غەیبیو دەرەكی ناكا تا رزگاری بكا. (***Jeremy Hawthorn***، ***Studying the Novel. P.8***). ئەمە لە كاتێكدا قارەمان لە ئەفسانەو داستانە كۆنەكاندا رادەستی چارەنوسی خۆی دەبوو، چارەنوسێك كە پێشوەخت لەلایەن وەرگرو جەماوەرەوە چاوەڕوانكراو بوو، ئەڵبەتە گەمەی رێكەوتو

پەیــدابوونی لــەناکاوی هێــزە غەیبییــەکانیش ڕۆڵــی یەکلاکــەرەوەیان هــەبوو لــە دیــاریکردنی کۆتایی ئەو کارانەدا.

بــەڵام پــەرگیری لــە پێڕەوکردنــی هــەردوو تیــشکۆی ئــەقڵی و ئەزمونگــەری لــە فەلــسەفەو ئەدەبدا پەرچــەکرداری لــە هــەردوو بوارەکــەدا لێکەوتەوە. لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمدا چــەند ڕێــچکەیەکی ئیــشراقی و ئیزۆتریــك سـەریانهەڵدا کـە *Illuminism & Esoteric* بانگــەوازیان بــۆ هەســت و ســۆزو نیگانمــای ڕاســتەوخۆ *Intuition* کــرد، ئــەو ڕێــچکانە گەڕانــەوە بــۆ لایــەنی مێــژویی چــەپێنراوی کولتــوری چــاخی ناوەڕاســت، وەك مــەیلکردنی ئەفــــسانە و نۆســــتالیژاو خۆشەویــــستیی ڕۆمــانتیکی و قارەمــانێتی ســنور بــەزێن. تێــزە فیکری و ئیستاتیکیەکانی هەموو ئەو ڕیچکانە ڕەنگدانــەوەیان لەســـەر داهێنـــانی ئـــەدەبی و هونــەری و بەتایبــەتیش لەســـەر دنیــابینیی ڕۆماننوسەکان هەبوو.

لەســــەر ئاســــتی فەلــــسەفی بیریــــارە ئایدیالیــستو ڕۆمانتیکیــەکانی وەك فیختــە (1762-1814)، هــــــیگڵ (1770-1831)، شــیلینگ (1775-1854) و جــان جــاك ڕۆســۆ (1712-1778) نوێنەرایــــــــەتی ئــــــــەو پەرچەکردارەیان دەکرد، کـە دەنگدانـەوەی لای خانمە ڕۆماننوسەکانی ئەو دەمە هەبوو، وەك: جین ئۆستن (1775-1817) کە لە ڕۆمانەکانیدا چــەندین جیهــانی کۆمەڵایــەتی و کەســایەتی زینــدوو وێنادەکــا. ئــان ڕادکلیــف (1764-1832) کە لە ڕۆمانەکانیدا دیمەنگەلی ئاڵۆزو پڕ گرێ و فەنتازی و ترسناك دەخاتەڕوو. هەر لەو دەمــــەدا مــــۆدێلی ڕۆمــــانی گۆتیــــك *gothic* سەریهەڵدا، کە لە سروتی تەلارسازیی گۆتییەوە ئیلهامی وەردەگرت کە مۆدێلێکی بیناسازیی چــاخەکانی ناوەڕاســت بــوو. (دیفیــد بــنتر، "الرومانسية"، الأدب والنقد والتاريخ الأدبي، ت: د.عبـد الحميـد شـيحة. المجلـس الأعلـى للثقافة، 1999. ص228-229. وكذلك هامش المترجــم، ص228). لــە ئــەڵمانیاش بیریــارو ڕۆماننوسـێکی وەك یۆهــان گۆتــە نوێنەرایــەتی ئەو ڕەوتــە نوێیــەی دەکـرد، چ لــە ســەر ئاســتی فیکـری فەلـسەفی و چ لەسـەر ئاسـتی داهێنـانی ئیــستاتیکی. هــەمان دەقئــاوێزانی فیکــری و ئیستاتیکی لای چەند ڕۆماننوسێکی تری وەك: واڵتەر سکۆت، ئەلفرێد دۆفێنی، فیکتۆر هۆگۆو ئەلکساندەر دۆماس-یش بەدی دەکرێ.

### ململانێی زانست و میتافیزیك، پــەیڤین و ململانێــی تیــشکۆی گێڕانــەوە لــە ڕۆماندا:

لـە ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدەهـەم بـەدواوە بیروبــــاوەڕە باوەکــــان دەربــــارەی چــــەمکی هەقیقـەت و شـوناس و پێگـەی مـرۆڤ لـە بناغـەوە هەڵتەکی. ئەمانوێل کانت (1724-1804) ئەو فەیلەسـوفە بـوو کـە لەسـەر ئاسـتی تیـۆریی و فیکریی ڕێگەی بۆ ئەو وەرچەرخانە خۆش کرد، ئەو لە یـەك کاتدا ڕەخنـەی لـە لۆجیکی هـەردوو قوتابخانــەی ئــەقڵانیی ماتمــاتیکیی پــەتی و قوتابخانــەی ئیمپێریــی زانــستیش گــرت، دادگایــــەکی فەلــــسەفی بــــۆ ڕەخنــــەکردن و پێداچــوونەوە بــە حوکمــەکانی ئەقڵــدا دانــا، بەهــەمان شـێوە باسـی لـە بـەهرە جیاوازەکـانی ئـەقڵی مـرۆڤ گـرت کـە بـەگوێرەی کۆنتێکـستی مەعریفی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و ئیستاتیکی گۆڕانی بەسەر دێ.

هاوکـات ئـەدیب و ڕۆماننوسـەکانیش کەوتنـە دادگاییکردنی ستایلی باوی نوسین و دنیـابینی بــاو ســەبارەت بــە مــرۆڤ و کێــشە دەروونــی و کۆمەڵایەتیـەکانی مـرۆڤ. ئـەدیب و هونەرمەنـدان

هەوڵیاندا خۆیان لەگەڵ فەلسەفەی نوێی بوونی مرۆیی بگونجێنن، کە زانایان و بیریارانی وەك داروین، مارکس و نیچەو کەسانێکی تر نوێنەرایەتییان دەکرد. لێرەدا چەند نمونەیەکی زۆر کورت و گشتی لەیەك کاتدا دەهێنینەوە: ئەگەر وێنەی باو دەربارەی مرۆڤ بەر لە داروین بریتی بووبێ لەو بوونەوەرە باڵایەی کە لە بەهەشتەوە دابەزیوەتە سەر زەوی، ئەوا دوای دەرچوونی کتێبی (بنەمای جۆرەکان *The Origins of species*، *1859*) ئەو غرورە مێژوییەی مرۆڤ بریندا بوو. ئەگەر تێگەیشتنی باو لە مێژوو بەر لە مارکس بریتی بووبێ لەو شتەی کە دەشێ مرۆڤ هەندێ جار رۆڵێکی چالاکی تێدا ببینێت، ئەوا لەدوای دەرچوونی کتێبی (سەرمایە- بەشی یەکەم*Das Kapital*، *1867*) مێژوو تارادەیەکی زۆر بووە پەرچەکردار لەئاست گۆڕانە ئابوریەکاندا. ئەگەر تێگەیشتنی باو دەربارەی رەفتاری مرۆیی بەر لە فرۆید پشت ئەستور بووبێ بەو گریمانەیەی پێیوایە مرۆڤ هوشیارە دەربارەی خودی خۆی و ئامادەییە زەینیەکانی، ئەوا هەردوو کتێبی (شیکردنەوەی خەونەکان *The Interpretation of Dreams*، *1900*، زانستی گشتی نەخۆشیە دەرونیەکان *The Psychopathology of Everyday Life*، *1901*) و کتێبەکانی تری فرۆید بۆچونێکی جارسکاریان پێشکەشکرد بەوەی مرۆڤ تەنها هۆکارە دەرەکیەکانی رەفتاری خۆی دەناسێ، بەڵام کەسایەتی راستەقینەی خۆی ناناسێ کە لە هەرێمی نائاگاییدایە. پاشان ئەگەر تێگەیشتنی باو دەربارەی ئاکار بەر لە نیچە بریتی بووبێ لەو یاسا رەگداکوتیوەی کە گومان هەڵناگرێ، یاسایەك بڕوای بە هێزێکی سەربەخۆ هەیە لە دەرەوەی قەوارەی مرۆڤ و قابیلی لەناوچوون نیە، ئەوا لەدوای هەردوو کتێبی (زەردەشت ئاوهای گوت *Thus Spake Zarathust*، *1883-1885* ، زانستی شاد *The Gay Science*، *1882*) ئاکار بووە ئەو پێداویستییەی کە مرۆڤ بۆ بەرژەوەندیی خۆی دروستی کردووەو مانای پێبەخشیوە. (الأدب و النقد و التاريخ الأدبي، تـأليف: مجموعة من الكتاب. ت: د. عبدالحميد شيحة. المجلس الأعلى للثقافة، 1999، ص257).


چارلس داروین

هونەری رۆمان دنیابینی قوولترو چنینی ئاڵۆزتری بەخۆوە بینی، بەتایبەتی سەبارەت بە هوشیاریی تاکەکەس لەئاست خۆی و ژینگەکەیدا، هەروەها لەئاست ململانێی نێوان هێزە ئەقڵی و خۆڕسکییەکانی ناو ناخی تاکدا کە کۆدڕیی لە کەسایەتی مرۆڤی هاوچەرخدا دروستکرد. تەنانەت چیتر رۆماننوسێکی ریالستیی وەك گۆستاف فلوبێر (1821)یش ژیانی بەو شێوەیە نەدەبینی، کە ئەدیبە ریالیستییە نەریتیەکان کۆپییان دەکردەوە، واقع لای وی لێوانلێو بوو لە ئاڵۆزی و لایەنی نەدۆزراوە، کە چاویلکەی واقعی ئاسایی پەی پێ نەدەبرد. (جیرار جینیت، خطاب الحكاية، ص201).

فیدۆر دیستۆفیسکی (1821–1881) وەك رۆماننوسێك کەوتە دادگاییکردنی ناخی مرۆڤو شۆڕشێکی فیکریو ئیستاتیکیی ئەوتۆی بەرپاکرد کە میخائیل باختین بە شۆڕشی فیزیای رێژەگەری دەیشوبهێنێ لە فەلسەفەی زانستدا. بۆ نمونە لە رۆمانی (تاوانو سزا)دا پەیڤینێکی سەخت بەدی دەکرێ لەنێوان هاندەرە غەریزیو مۆتیڤە ئەقڵییەکانو هێزە پێکداهەڵپڕژاوەکانی ناو ناخی مرۆڤدا. (میخائیل باختین: المبدأ الحواري، ص41).

هێڵە گشتییەکانی فەلسەفەی نیچەش سەبارەت بە ئاکار لە کاری ئەدەبیی رۆماننوسە مۆدێرنیستەکاندا بەدی دەکرێ. تۆماس مان ئەوە ئاشارێتەوە کە لە نوسینی هەندێ لە رۆمانە بەناوبانگەکانیدا، وەك "مەرگێك لە ڤێنیسیا"و "کێوی ئەفسوون"، بەر لەوەی سوودی لە ئەزموونی واقع وەرگرتبێ سوودی لە کتێبی "لەدایکبوونی تراجیدیا"ی نیچە وەرگرتووە. (فرانز کونا، "الروایة ذات الوجهین"، الحداثة، ج2، بغداد: دار المأمون، 1990، ص195). هەستکردن بە رەهەندی نیهلیستی جیهان لە رۆمانەکانی ڤرجینا وۆلف (1882–1941)و جۆزیف کۆنراد (1857–1924)یشدا بەدی دەکرێ، کە تیایاندا هێزێکی ترسناكو رەوتێکی سۆزداریی رمێنەر ژیانی بەڕێوەدەبا. (فرانز کونا، "الروایة ذات الوجهین"، ص 186).

رۆماننوسی فەرەنسی مارسیل برۆست (1871–1922)و رۆماننوسی ئینگلیزی جێمس جۆیس (1822–1941) ئەوانیش ئەو دوو رۆماننوسەی چاخی مۆدێرنن کە دیدێکی فەلسەفی قووڵ لە کارەکانیاندا بەدی دەکرێ. یەکەمیان لە رۆمانی "گەڕان بەدوای سەردەمی بەسەرچوو"دا تیشکۆی فەلسەفیی بێرگسۆنی بەگەڕدەخاو جیهانێك وێنادەکا کە تیایدا مرۆڤ، لە چرکەساتە دەگمەنەکاندا، دەتوانێ رابردوو یان بەشێك لە رابردوو زیندووبکاتەوە. رابردوو بۆ کەسی ئاسایی بەشێکە لە یادەوەریی کە زۆر بەخێرایی بە زەیندا دەگوزەرێو وندەبێ، بەڵام بۆ هونەرمەند رابردوو لە بەرامەی سیمبوڵەکاندا هەڵدەگیرێو پەخشدەبێتەوە، پاشان لەناو وشەکاندا بەزیندوویی هەڵدەگیردرێ. (فلیجر ومالکم برادبري، "الروایة الإنطوائیة"..، ص132). هەرچی جێمس جۆیسە لە رۆمانی "یۆلیسێس"دا باس لە "کات" دەکا وەك تەڵەزگەو کێشەی مرۆڤی مۆدێرن، مرۆڤێك کە هەست بە پەیوەندیی مەبەستگەری نێوان قۆناغەکانی زەمەنی مرۆیی لەدەستدەدا، ئەو زەمەنەی کە لە خەیاڵدانی مرۆڤداو لەژێر کاریگەریی عەقیدەی ئاینییدا خۆی لە سێکوچکەی (بەهەشت– کەوتنەخوارەوە– گەڕانەوە)دا دەبینێتەوە. خولیای گەڕانەوە لای مرۆڤی مۆدێرن، خولیای گەڕانەوەی قارەمانو فریادڕەس، گەڕانەوەی مرۆڤ بۆ بەهەشت پاش غەزەبی یەزدان، گەڕانەوەی دۆخی مرۆیی بۆ رێگە راستەکەی خولیایەکی موژدەبەخشە کە هەمیشە لە خەیاڵدانی مرۆڤدا ئامادەیی هەیە. بەڵام لە رۆمانەکەی جۆیسدا مرۆڤ ئەو خۆشبینیو خولیا موژدەبەخشە لەدەستدەدا، خەونی گەڕانەوە لای وی دەبزرکێ، هەربۆیە هەوڵی درێژکردنەوەی کات دەدا کە بەرەو ئاسۆیەکی لیڵو نادیار پەلدەهاوێ. زانای ئەفسانەناس "مێرسیا ئیلیاد" پێی وایە کێشەی سەرەکیی ئەم رۆمانە بریتییە لە سۆزو نۆستۆلۆجیای گەڕانەوە بۆ ئەفسانەی دووبارەبوونەوەی زەمەنی، لەوێشەوە بۆ رەتکردنەوەی خودی زەمەن. (مایکل هولنكتن، ل179). لەڕووی فەلسەفییشەوە بێرگسۆن لە کتێبی "مادەو یادەوەری"دا ئاماژە بۆ ئەم تەڵەزگەیە دەکاو جەخت دەکاتەوە کە رابردوو

مێژووییەکی مردوو نیە لای مرۆڤ، بەڵکو کاریگەریی لەسەر دروستکردنی ئێستا هەیە، "ئێستا"ش ئەو خاڵە ماتماتیکییە نیە کە بە شوێن بپێورێ، بەڵکو دۆخی بەردەوامییەکی زیندووە کە چرکەکانی تێکدەڕژێن، "ئایندەو رابردوو هەمیشە هاوسێی "ئێستا"ن، چونکە "ئێستا" لە راستیدا پەیبردنە بە رابردووی راستەوخۆ لەتەك دیاریکردنی داهاتوویەك کە لە پەیدابوونی بەردەوامدایە". (دونالد فانغر، "مدينة الرواية الروسية الحديثة"، الحداثة، ج2، ص223-224).

## پرسیار دەربارەی چارەنوسی مرۆڤو راڤەو رێژەگەری،

## لە تیۆرەی رۆمانی پابەندبوونەوە بۆ تیۆرەی هەڵوەشاندنەوەو لێك-موتوربەکردن:

هەمیشە پرسیارەکان دەربارەی بوون، نیگەرانیی مرۆیی، ئازادی، چارەنوسی جیهانو هەڵوێستی مرۆڤ لە ئاستیدا، پرسیاری فەلسەفیو میتافیزیکی بوون. بەڵام لە سەدەی بیستەمدا، کاتێ مرۆڤایەتی دووچاری دوو جەنگی جیهانیی ترسناك بۆوە، کاتێ چارەنوسی گۆی زەوی کەوتە بەر مەترسیی لەناوچوونەوە..، ئەو پرسیارانە بوونە پرسیاری راستەقینەی هەر مرۆڤێکی ئاساییو پشکێکی گەورەیان لە ئەدەبو هونەردا پەیداکرد. بوونگەری وەك رێچکەیەکی فەلسەفیو ئەدەبی بایەخێکی گەورەی لەو دەمەدا پەیداکرد، چونکە پێی وابوو کێشەی مرۆڤ هەمیشە تێگەیشتن بووە لە ژیان، بەوەش لە دوورەوە تەماشای بوونی کردووەو زۆرجاریش حوکمەکانی بەهەڵەیدا بردووە. واتە پێویستە مرۆڤ بوون بژی بەر لەوەی لێی تێبگا، چونکە جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان بوون وەك "وێنەیەکی ئەبستراکت"و بوون وەك "هەقیقەتێك کە تیای دەژین". رەنگدانەوەی بوونگەری لە ئەدەبدا زۆر خێرا بوو، چونکە راستەوخۆ لەلایەن فەیلەسوفەکانیەوە تەرجەمەکرا بۆ زمانی ئەدەب. جان پۆڵ سارتەر (1905-1980) لە رۆمانو شانۆگەریەکانیدا (هێڵنج، رێگاکانی ئازادی، مێش، دەستە چەپەڵەکان..) ئەو دیدە فەلسەفییانە بەرجەستەدەکا کە مرۆڤ دەگەیەننە ئازادی، جەخت لەسەر ئەرکی کۆمەڵایەتی ئەدەبو بەرپرسیارێتی ئەدیب دەکا لە ململانێو شەڕدا لەپێناو رەهابوونی ئیرادەو بووندا. ئەلبێرت کامۆ (1913-1960) لە هەردوو رۆمانی "نامۆ، تاعون"دا باس لە بایەخی شۆڕشو یاخیبوونو بێهوودەیی دەکا لە ژیانی مرۆییدا. (د. زكريا ابراهيم، فلسفة الفن في الفكر المعاصر. مكتبة مصر، ص247، 214، 215).

رۆمان لای وی تەنها چالاکییەکی خەیاڵی نیە بۆ وێناکردنی هەڵوێستەکان، بەڵکو پێویستە وەك چالاکییەکی کردەیی درێژ ببێتەوە بۆ بەخشینی یەکێتیو هارمۆنی بە واقع کە خۆی لە بنەڕەتدا وانییەو بەڵکو پڕە لە بێهوودەیی کە مرۆڤ بەرگەی ناگرێ. بۆ ئەوەی مرۆڤ بەرەنگاری بێهوودەیی ژیان ببێتەوە، نابێ لە رەتکردنەوەی عەبەسەوە دەست پێبکا، بەڵکو دەبێ لە رەتکردنەوەی خودی ژیانەوە دەست پێبکا، چونکە عەبەس هۆکار نیە بەڵکو ئەنجامە.

رۆمانی بوونخوازیی دژی ئەو مۆدێلەی رۆمانی چاخی مۆدێرن بوو کە فەلسەفەی مرۆڤی بەجۆرێك دەخستەگەڕ کە تەنها فەیلەسوفو رەخنەگران لێیتێدەگەشتنو رۆژ بەڕۆژ نوخبەوی ترو ئۆرستۆکراتی تر دەبۆوە. تیۆرسازانی رۆمانی مۆدێرن لەناو نوخبەکاندا بەدوای نوخبەی دەستەبژێرتردا دەگەڕان. هەربۆیە بەشێکی زۆری جوانناسانی پاش

تازەگەری، کە سوودیان لە فینۆمینۆلۆجیای بوونخوازیی بینیوەو لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە دەرکەوتن، پێیانوایە پۆست مۆدێرنیزم، لە یەکێك لە دەرکەوتنەکانیدا، شۆڕشی چێژە سادەو خۆڕسكو چەپێنراوەکانی ناخی مرۆڤە دژی لووت بەرزیو بالاخوازیی مۆدێرنیزم کە "ئیمانوێل کانت" لەڕووی فەلسەفییەوە نوێنەرایەتی کردووە.

هەرچەندە سەردەمی مۆدێرنیزم، بەپێوەری چەندایەتی، سەردەمی بەرهەمهێنانی ژمارەیەکی زۆری کاری هونەریو ئەدەبیو دەقی ڕۆمان بوو، بەلام بەپێوەری ئیستاتیکای چێژ سەردەمی دەستپێوەگرتنو سکهەڵگوشین بوو..، جوانی ئەو شتە بوو کە نەدەوترا. لە ڕۆماندا سەردەمی مارسیل برۆستو جەیمس جۆیس بوو کە هەمیشە ڕووبەڕێکیان لەنێوان ئاماژەو واتا، گوزارشتو وێنە، جوانیو چێژدا، دەهێشتەوە. لای هونەرمەندە مۆدێرنیستەکان جوانی هەڵگری مانایەکی پەنهانو هەڵگیردراو بوو کە نەدەبوو بدرکێندرێ، دەبوو هەمیشە سنورێك لەنێوان جوانیو جەماوەرەکەیدا بمێنێتەوە. "کلیمنت گرینبرگ" ***Clement Greenbrg*** لە نوسینێکدا راشکاوانە داخی دڵی خۆی دژی پێوەرەکانی ئیستاتیکیەکانی مۆدێرنیزم دەردەبڕێو دەڵێ: "وایان فێرکردووین کە بەرهەمهێنانی هونەر کارێکی گرانو زەحمەتە، بەلام کێشەی راستەقینە لەوەدایە چێژ وەرگرتنیش لەو هونەرە، لەسایەی مۆدێرنیزمدا، کارێکی سەختترە لە بەرهەمهێنانەکەی. مرۆڤ خوازیاری ئەوە بوو ئەو چێژو خۆشییەی پێبگا کە باشترین کاری هونەری مۆدێرن دەیبەخشێ، بەلام ئەو کارانە هەمیشە لەئاست ناخ و دەروونی مرۆڤەکاندا سەرچاوەی ئاڵۆزی بوون. هونەری مۆدێرن هەمیشە دوژمنی پێوەرەکانی جوانسازی بووەو هەرواش دەمێنێتەوە". (كلمنت جرينبرج ***Clement Greenbrg*** روبرت راي، مابعد الحداثية، ص293).


ئەلبێرت کامۆ

جان فرانسوا ليوتار، وەك فەیلەسوفێکی پۆستمۆدێرن ڕەخنە لە دیدی بالاخوازی ئیستاتیکای مۆدێرنیزم دەگرێ. ڕۆمانی مۆدێرن، بەبڕوای لیوتار، تیۆریزە دەکا بۆ دەستپێوەگرتنی چێژو بەستنەوەی بەئازارەوە، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکە توانای وێناکردنی جوانیی نیەو هەمیشە ڕووبەرێك دەمێنێتەوە کە مرۆڤ ناتوانێ پڕی بکاتەوەو ناتوانێ گوزارشت لەو شتە بکا کە بیری لێدەکاتەوە. لەو بارەیەوە ڕۆمانەکانی مارسیل برۆستو جەیمس جۆیس بەنمونە دێنێتەوە کە ڕەگەزی کاتو تەکنیکەکانی گێڕانەوە لەسەر حسابی خولیایەك بەگەڕدەخەن کە هەرگیز گوزارشتی لێناکرێ. (جان فرانسو ليوتار، "رد على سؤال مابعد الحداثة"، الحداثة ومابعد الحداثة، تحرير: بيتر بروكر، ت: د. عبدالوهاب علوب، مر: د. جابر عصفور. أبوظبي: المجمع الثقافي، 1995، ص226).

وەرچــــەرخانی ئیـــــستاتیکای پۆســـــت مـــۆدێرنیزم وەرچـــەرخانێکە لــــە هونــــەری ئەبـستراکتەوە بـۆ هونـەری چـێژ، لـە ڕۆمانـە ئالۆزەکانی ئەدیبی فەرەنسی "ئالان ڕۆب گریێ" وە بــۆ چــیرۆکە چێژبەخــشەکانی ئــەدیبی ئەرجەنتینی "لویس بۆرخیس". واتە گەڕانەوە بۆ ئەو شتانەی کە قوتدانیان ئاسانە، یان گەر قــسەیەك لــە فرۆیــد قەرزبکــەین دەڵــێین: ئیستاتیکای پۆست مۆدێرن گەڕانەوەیە بۆ دیوە چـەپێنراوەکەی مـــۆدێرنیزم، گەڕانـــەوە بـــۆ کولتـوری جـەماوەری و زەوق بزوانـدن لـەڕێگای خـەیاڵ و ئەفـسانە، فیلمـی کـارتۆن، چـیرۆکی پۆلیـسی، ڕۆمـانی زانـستی، بەختگرتنـــەوە و پێشبینیی بورجەکان، گۆرانی و ئاوازی خێراو ئامــادەکردنی کــاری هونــەری بەرۆحیــەتێکی منداڵانە لە قوتوو شتە فڕێدراوەکان. مۆدێرنیزم بڕوای بە سەرکوتکردنی چێژە سادەکانی مرۆڤ هـەبوو، خـەڵکانێکی زۆر دڕۆیـان لەگـەڵ خۆیـان دەکرد و زۆریـان لـەخۆیان دەکرد کە بیسەلمێنن خاوەن هەستیاریی ئیستاتیکیی بەرزن و چێژ لە جوانییـە سـادەکان وەرنـاگرن، نـەبادا تۆمـەتی میللـی بـوون و نەخوێنـدەوارییان بدرێتـەپاڵ. بـــەڵام پۆســـت مـــۆدێرنیزم چرکەســـاتی ئاشـتبوونەوەیە لەگـەڵ هونـەری پـۆپ و سـەمای وەحـشیی خێڵـە سـەرەتاییەکان و یـاخیبوون لـە قەیـدو مەرجـەکانی نوخبـەی مۆدێرنیـست و نزیککەوتنەوە لـەکانگای لـەزەت و تێکشکاندنی یاساغە کولتوریەکان.

لە شارستانیەتی ئەمڕۆدا، کە "ڕۆلان بارت" بە (شارستانیەتی وێنە) نـاوی دەبا، چـەقەکان بـەژمارەی وێنـەکان زیـاددەبن و زاووزێ دەکـەن. لـە شارسـتانیەتی وێنـەدا، وێنـەکان بەشێوەیەك پەرشـدەبنەوە کـە ژێـدەرێك بـۆ چـەقی ڕەسـەن نامێنێتـەوە. ژانرە ئەدەبییـەکان پـەیتا پـەیتا لـە ئامـــاژەی بیـــستراو و زمانـــەوانیی پـــەتی دووردەکەونــەوە و زۆرتــر پــەنا بــۆ وێنــاکردن و بەگەڕخــستنی ئامــاژە وێنەییــە مەجازیــەکان دەبەن. "بارت" پێیوایە لە هەموو دەقێکی نوێدا "بارگەیـەکی ڕمێنـەر هەیـە بۆ هەڵوەشـاندنەوەی سنوری تەقلیدیی نێوان ژانرەکانی وەك ڕۆمان و چـامەی شـیعریی و وتـار لەلایـەك و، کایـە مەعریفییە مرۆییەکانی وەك ئەدەب و فەلسەفە و ئابوری لەلایەکی ترەوە".

*(Michael Payne, Reading Knowledge: An Introduction to Barthes، Foucault, and Althusser. Malden: Blackwell, 1997, p.4).*

"بارت" خۆی لە کتێبی ***S/Z*** ئەو ستراتیجە پێڕەودەکـا، دەقێـك پێـشکەشدەکا تێکەڵـە لـە شـیکردنەوەی ڕەخنـەیی، گێڕانـەوەی ڕۆمـان، ئاوێتــەکردنی ســتایلی دابەشــکردنی وێنــە بەستایلی دابەشکاری لـە کـاری موزیکـدا. ئـەو کـارە لـە پرۆسـەی تۆمـارکردنی نـوێی دەنـگ دەچـێ، دەنگدانـەوە ***reverberation*** تێکـەڵ بـە خاوکردنـەوە ***delay***، چڕکردنەوە ***compression*** تێکەڵ بە کۆرسی دەستەجەمعی ***chorusing***، ئامـاژە موزیکییـە جێگیرەکـان ئاوێتـەی ئامـاژە دووبارەکـــان ***Straight*** دەبـــن..، ســـەرەنجام هـەموویان بەناویەکـدا تێدەپـەڕن و بەرهـەمێکی ئیـستاتیکی فـرە ژانـر دروسـتدەکەن. لـەڕووی نــــاوەرۆکی فیکـــری و ئیستاتیکیـــــشەوە پۆســـت مـــۆدێرنیزم تێکەڵێکـــە لـــە دوو پرۆسـە: فیکـر لـە چوارچێوەیەکی ئیستاتیکیدا پێشکەش دەکا و هونـەریش لـە چوارچێوەیەکی فیکریـــــدا. ســـــەرەنجام دەقـــــی دووڕەگ و فـرەڕەگ و لێـك-موتوربـەکراو ***hybrid text*** لەدایکـــــدەبێ..، دەلالـــــەتی ڕۆشـــــنبیری نــوێ، لــە ڕێگــای کــارلێکی ڕەگــەزەکان و شــیکردنەوەیانەوە دێتــەبوون. (ڕوبــرت ڕاي، ص298-300).

## گرنگترین سەرچاوەو ژێدەر، جگە لەو ڕۆمانانەی کە ئاماژەیان پێدراوە:

- برادبلي، مالكم وجيمس ماكفارلن، الحداثة، ج2، بغداد: دار المأمون، 1990.

- تزفيتان تودوروف، نقد النقد، ت: د. سامي سويدان، مر: د. ليليان سويدان. ط2" بغداد: دار الشؤون الثقافية العامة، 1986.

- جان فرانسو ليوتار، "رد على سؤال مابعد الحداثة"، الحداثة ومابعد الحداثة، تحرير: بيتر بروكر، ت: د. عبدالوهاب علوب، مر: د. جابر عصفور. أبوظبي: المجمع الثقافي، 1995.

- جيرار جينيت، خطاب الحكاية، ت: محمد معتصم وآخرون، ط2، المجلس الأعلى للثقافة، 2000.

- د. زكريا ابراهيم، فلسفة الفن في الفكر المعاصر، مكتبة مصر، بدون.

- د. صلاح فضل، نظرية البنائية في النقد الأدبي. ط3" بغداد: دار الشؤون الثقافية العامة، 1987.

- طائفة من الكتاب، الأدب والنقد والتاريخ الأدبي، ت: د.عبد الحميد شيحة. المجلس الأعلى للثقافة، 1999.

- لوكاش، جورج، الأدب والفلسفة والوعي الطبقي. ت: هنرييت عبودي. ط1" بيروت: دار الطليعة، 1980، ص76. وكذلك: حنا عبود، من تاريخ الرواية. دمشق: إتحاد كتاب العرب.

- وات، إيان، ظهور الرواية الإنكليزية، ت: د. يوئيل يوسف عزيز، منشورات دا الجاحظ، بغداد، 1980.

- *Paul Trejo، Summary of Hegl's "Philosophy of Mind". 1993. p.1-2.*

- *http://eserver.org/philosophy/hegel-summary.html<5/30/2005.*

- *Jeremy Hawthorn، Studying the Novel: An Introduction. London-New York: Arnold،1989. p.1.*

- *A. S. Hornby، Oxford Advanced Learners Dictionary of Current English، 2002، p. 867*.

- *Dennis Walder، The Realist Novel. New York: Routledge،1995.*

- *Michael Payne، Reading Knowledge: An Introduction to Barthes، Foucault، and Althusser. Malden: Blackwell،1997.*

- مۆدێرنیزم وەك ڕێچكەیەكی ئەدەبی، ن: دیڤید برۆكس، و. لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید، سەردەم، ژ: 35، 2004.

- شارستانیەتی وێنە لە ئیمپریشینیزمەوە بۆ سینەما، د. شاهۆ سەعید، سەردەم، ژ: 54، 2008.



# مۆزیکی کوردستان

دیتەر کریستین سین

لە فارسییەوە: محەمەد حەمە باقی

**بەرایی:**

ئەم وتارە لە بنەڕەتدا بە زمانی ئینگلیزی نووسراوەو دواتر لەلایەن (نتالی چوبین)ەوە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی فارسی و لە ژمارە (7)ی گۆڤاری وەرزانەی (ماهور)دا بڵاوکراوەتەوە، کە گۆڤارێکی تایبەت بە مۆزیکەو دەزگای (ماهور) لە تاران دەریدەکات.

نووسەری وتارەکە: پرۆفیسۆر کریستین، بەبنەچە خەڵکی ئەڵمانیایە و پاشان لە (بنکەی مۆزیکی میللەتان)ی زانکۆی (کۆلۆمبیا)ی ئەمەریکا ــ نیویۆرک بۆتە مامۆستا. ناوبراو (وەك لە پاشکۆی ئەم وەرگێڕانەدا، ئاماژە بە پێناسەی کارەکانی کراوە)[1]، کوردناسێکی بە بڕشت و پڕ کارە و نزیکەی (50 پەنجا) ساڵێك، لەگەڵ بواردا بە گشتی و مۆزیکی کوردیدا بە تایبەتی، کاری ئەکادیمی و مەیدانیی زۆری کردووە و سەردانی گەلێ ناوچەی باکوور و خۆرهەڵاتی کوردستانی کردووە.

مۆزیکی کوردی، کە چەندان کوردناسی وەك ئەم نووسەرە (کریستین سین)ی، بەخۆیەوە دڵبەستە کردووە، دێرینە و ڕێز و پلەو پایەیەکی باڵای لە کۆمەڵی کوردەواریدا هەیە و هێشتا بە ئەندازەی ئەم پلە و پایەیە لای مۆزیکزانانی کوردەوە کاری زانستانە و مەیدانیی لەمجۆرەی کەم لەسەر کراوەو بە گوێرەی پێویست، نهێنییەکانی ئەو تەمەنە درێژ و بەشکۆیەی، نەپشکێنراون و نەبینراونەتەوە.. لە کاتێکدا ئەم نووسەرە، بەدەم پشکنین و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیانەیەوە گەیشتۆتە ئەوەی بزانێ، کە مۆزیك لە کۆمەڵی کوردیدا، بە ڕادەیەك ڕێز و پلە و پایە و زەبری لەسەر هەست و ڕۆحی مرۆڤی کورد هەیە، بۆ زۆر لەو تەنگژە و کێشە و بەستێنە دژوار و پڕ چەلەمانەی لەناو خێڵ و هۆزەکاندا دەقەومێن و دەرەقەتی چارەسەری و یەکلایی کردنەوەی نایەن، بەرەو ڕووی هونەرمەندانی مۆزیك و

ستڕانبێژانی لێهاتووی خۆیانی دەکەنەوەو ئەوسا ئەم هونەرمەندانەی موزیك و ستران، لە ڕێگەی کۆڕی کێبەرکێی هونەرییەوە، کە تیایدا بەهرەی دەنگ و موزیکژەنی داهێنانی هونەرییانەوە، بڕیار لەسەر ئاکامی کێبەرکێیەکە دەدات، ئەو لایەنەی لە باری هونەرییەوە سەردەکەوێ لایەنەکانی تر بۆڕ دەدات، مەرجەکانی خۆی، بۆ لایەنەکەی تر دیاری دەکات و ئەویش بێ هیچ ئەملاولاو سێ و دوویەك، مەرجەکان بە سەرۆك هۆزەکانیان دەگەیەنن و پەسەندی دەکەن و ئەم پەسەند کردن و ڕازیبوونەش، دەکەنە کۆڕی شایی و زەماوەندی خۆشیی و یەکتر ئاشت کردنەوەو بەمجۆرە کێشەکان یەکلایی دەکەنەوە.

ڕەنگە بەهۆی ئەم خۆشەویستییەی کە کوردان سەبارەت بە موزیك هەیانە، لە خەڵکانی تر زیاتر دڵبەستەی موزیك بووبن. کوردستان پانتاییەکی کوێستانییە، کەوتۆتە خۆرئاوای ئاسیاوە. ڕووبەرەکەی بە قەرایی ڕووبەری بەریتانیا دەبێت و پارچەکانیشی بەهۆی ئەو سنوورانەی ئێستای تورکیا، عێراق، ئێران، ئەرمینیا لێك جیاکراونەتەوە.

بڕبڕەی پشتی کوردستان بریتییە لە زنجیرە کێوەکانی تەورۆسی خۆرئاوای تورکیا و زنجیرە چیاکانی زاگرۆسی باکووری خۆرئاوای ئێران. بەڵام ئەو پانتاییەی کە کوردان لەسەری دەژین، لە چیاکانی تەورۆس تێدەپەڕێت و بەشێکی زۆری خۆرهەڵاتی تورکیاش دەگرێتەوەو لەگەڵ باکووری سوریا و باکووری میزوپۆتامیادا لە عێراق تێکەڵ دەبێتەوە. ژمارەیەکی زۆری کوردان، لە ئەنجامی ئەو ڕاگواستنەی کە لە سەدەی شازدەیەمدا ڕوویداوە، لە دەرەوەی کوردستان و بەتایبەتیش لە پارێزگەی (خۆراسان)ی ئێران دەژین. یەکێك لە ئەنجامگەلی ئەو پێشکەوتنە سیاسی و ئابوورییەی لە سەدەی بیستەمدا ڕوویداوە، بۆتە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەکی بەرچاو لە کوردەکان جا بە خۆشی بووبێت یان بە زۆر لە بەشەکانی خۆرهەڵاتی تورکیاوە بەرەو خۆرئاوا بەتایبەتیش ناوچەی ئەستەموول و ژمارەیەکیش لە سەرانسەری کوردستانەوە، بەرەو وڵاتانی جیاجیای ئەوروپا، کۆچ بکەن.

ئاماری دانیشتووانی کوردستان ــ ئەو خەڵکەی کە خۆیان بە کورد و جیاواز لە نەتەوەکانی تری وەك: تورك، عەرەب، ئەرمەن دەزانن ـ بیست تا سی ملیۆن مەزەندە کراوە. زمانەکەیان بە یەکێك لە زمانەکانی خۆرئاوای ئێرانی دەژمێردرێت، کە لە سێ زاراوەی ئاشکرادا لێك جیا دەکرێتەوە: سۆرانی لە باشوور و باشووری خۆرئاوا، کرمانجی لە کوردستانی ناوەندی و زازایی لە باکووری خۆرئاوا.

بەشێکی زۆری کورد، بە تایبەتی پیاوانیان، چەند زمانێك دەزانن و لە پاڵ زمانی نەتەوەیی ئەو دەوڵەتانەی تیایدا دەژین، بە دوو، یان سێ زاراوەی کوردیش دەئاخێون.

ڕەچەڵەکی نەتەوەیی کورد، هێشتا جێی مشتومڕە. ئەو چەمکەی سەبارەت بە کاردۆخییەکان، کە (گزینەفۆن) باسیان دەکات، ئاخۆ پێشینەی ئەم کوردانەی ئێستا بن، یان هیچ نەبێ یەکێك لە پێشینەکانیان بووبن! ئەمە تا ئێستاش بابەتێکە، لێکۆڵینەوەی زیاتر هەڵدەگرێ.. ڕەنگە ئەو کوردانەی ئەمڕۆ، لە ئەنجامی تێکەڵەیەکی ئەو کۆمەڵگایانە بن، کە لە هەزاران ساڵ لەمەوبەرەوە، لە خۆرئاوای ئاسیادا ژیاون. جیاوازیگەلی ناوچەیی لە تایبەتمەندیی و شێوازەکانی ژیانیاندا، بە

درێـــــژایی مێـــــژوو پـــــارێزراون و بـــــەرەو گەشەکردنیش چوون.

بە درێـژایی ئـەو مێژووەی کە زانـراوە، هـەتا سەدەی بیستەمیش، بەو هۆیـەوە کە نـەتوانراوە دەسـت بەسـەر نیـشتمانی شـاخاوایی کوردانـدا بگـیرێ، بۆیـە ئەمـە بۆتـە هۆیـەك، بـۆ پاراسـتنی خۆیـان لــە بەرامبــەر ســەرلەبەری هێزەکــانی دیکـەدا. لـە سـەدەی حەوتەمـدا، ئیـسلام لـە کوردسـتاندا بڵاوبـووەوە. بـەڵام هـەتا سـەدەی پازدەیـەمیش تەشـەنەی نـەکردووەو تـەواو سـەرنەکەوتووە. لـە سـەدەی سـیازدەیەمدا هێرشـی (مـەغۆل) کوردستانیـشی گرتـەوە. لـە سـەدەی پازدەیەمـدا ئیمپراتۆریـەتی (عوسمانی)یش هەر بە (ناو)، دەسـەڵاتی بەسـەر کوردسـتاندا پەیـداکردو سـنوورێکی لەگـەڵ ئیمپراتۆریـەتی ئێرانـدا دامەزرانـد، کـە ئـەو سنوورە بە ناوەڕاستی کوردستاندا تێدەپەڕی. بـەمجۆرە میرنـشینەکانی کـورد، وەك: بادینـان، جولەمێرگ و هەکاری، هەتا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیـەمیش هـەر بەسـەربەخۆیی مانـەوە[2]. تەنانـەت لـە کۆتـایی سـەدەی بیستەمیـشدا، نـە کۆمـاری تورکیـا و نـە دەوڵـەتی عێـراق، نـەیانتوانیوە دەسـەڵاتی تـەواوی خۆیـان بەسـەر چیاکانی کوردستاندا بگرن.

ئـەم وتـارە لـە بـارەی موزیکەوەیـە، کـە وەك دەربڕینێـك لـە هـەموو هـەڵس و کـەوت و ئاکـاری کوردانـدا لـە هـەموو جێگەیەك هەیـە. بـەڵام مەڵبەنـدە سەرەکییەکەی، لـە ناوچـە گوندنـشینەکانی ناوەنـدی کوردستاندایە.

## ئامێرەکانی موزیك

بـێ هـیچ سـێ و دوویـەك، دەنگـی مـرۆڤ لـە کوردستاندا، وەك بەرزترین کەرەسەی دەربڕینی موزیـك دێتـە ئـەژمار. بـۆ ئـەوەش چـۆنایەتی دەنـگ، لـەکاتی دەربڕینـدا، لەگـەڵ پـەیامی سـتاتیکی هـەموو سترانـچڕێکدا، چ ئـافرەت، چ پیـاو، چ سـترانبێژانی ناشـی و نیوەکـار، یـان سترانبێژانی ناو زەماوەندا، هاوئاهەنگ بێت، بە هەستیارییەوە دەردەبڕدرێت.

دەنـگ، دەبـێ ناسـك و دڵنـشین بێـت. بـەڵام لەهەمان کاتیشدا دەبێ بەهێز بێت و بەرزیی و نزمیـی هـەتا پانتـایی میلـۆدی و پـەردە و ژێیەکانی قورگ بە بەریانەوە هـەبێ، هەڵکشێ. لـە ڕاسـتیدا ئەوانـەی ئاوازگـەلی بەسـەرهات و گێرانـــەوەو ســـترانی هەڵپـــەڕکێ دەچـــڕن، هەوڵدەدەن لەگەڵ یەکتریـدا، نـەك هـەر لـە بـورای نـاوەڕۆك و شـێوازی کارەکانیـەوە، بـەڵکو لـە بـورای کـۆنترۆڵکردن و هەڵکـشان و کرانـەوەی دەنـگ و تایبەتمەندییەکانییـەوە، بـە هـۆی بەرینایی نزمیـی و بـەرزیی دەنگیانـەوە، هـەتا ئەوپەڕی توانایان، ئەوانیتر لە مەیدان بۆڕ بدەن.

ژمارەی ئامێرەکانی موزیك، بە مانـای واژەی موزیـك، لـەناو کوردانـدا زۆرنـین و بـەکارهێنانی ئـەم سـازانەش، بـە گـوێرەی پێویـست و ئاسـتی کۆمەڵایەتییە.

تەپڵ ـ ی بازنـەیی ــ کە لـە بازنەیەکی خـڕو کەوانـەیی دروسـت کـراون و پێـستی بـزن، یـان مـەڕیان بەسـەرەوەیە ــ، وەك: ئێربـان، بێنـدێر، دەف، دەفـە، یـان: دایـرە، بـەناوبانگن. تـەپڵی بازنـــەیی لـــە دیـــوی ناوەوەیانـــدا ئەڵقـــەی مەعدەنییان پێوەیە، لە هەنـدێ ناوچەشدا ئـەم سـازانەی ئـەم ئەڵقانـەیان پێـوە نـەبێ. لەلایـەن ئافرەتـان و پیاوانـەوە بـۆ هاوئاهـەنگییکردن لەگەڵ گۆرانی هەڵپەڕکێدا بەکاردەهێنرێن.

تـەپڵێکی تـر، کـە زۆر بـە کـاردەهێنرێ: دەهۆڵ، یـان تەپڵـێکی بازنەییـە، کە بازنەکـەی لـەهی دەف بـەرینترە و سـەروبنی بازنەکـەش، چەرمیان بەسەردا کێشراوە و تایبەتن بە دەهۆڵ ژەن و تەپڵ کوتی لێهاتووە وە، کە (موتریب)یان

پێدەڵێن. (ئەمەش لە واژەی موتریب ـــ عەرەبی وەرگیراوەو بە مانای ئەو کەسەی خۆشیی و شادی دەسازێنێ). ئەم موتریبانە زۆربەیان وەك قەرەج (کەمینەیەکی جیاوازن) ناسراون، کە بە گشتی لە شارەکان، یان ئاقارو پەراوێزی شارەکاندا دەژین و لە جەژن و بۆنەکاندا، لە گوندانـدا بانگ دەکرێن. ئەم موتریبانە، لای جوتیاران و گوندنشینانی کوردەوە، وەك کەرەسەیەکی سەرەکی زەماوەند سەیر دەکرێن، بەلام وەك سازێکی ناکوردی سەیری سازەکانیان دەکرێت. دەهۆڵ (باولی تورکی، طبلای عەرەبی) بریتییە: لە لوولەیەکی بازنەیی خڕ، کە هەردوو سەری بە چەرمی قایم داپۆشراوە و بە ـــ کەمە ـــ و تۆقی داریـن ڕێکخراوە و بۆ ئەوەش چەرمەکەی کێشی ببێت و سفت ڕابوەستێت، تۆقەکان بە گوریس لێك شەتەك دراون. دەهۆڵ کوت لە کاتی ژەنیندا، تەپڵەکە بەلاریی لە پێش خۆیەوە دادەنێ و دارێکی ئەستوور، بە دەستی ڕاستیو شوڵێکی باریکیش بە دەستی چەپیەوە دەگرێتو لە هەردوو لای چەرمینی دەهۆڵەکە دەدات.

دەهۆڵ هەمیشە لەگەڵ یەك، یان دوو ساز، لە سازی وەك: زوڕنا، یان: سێز (زوڕنای تورکی، مزمار ـــ ی عەرەبی) دەژەنرێت. ئەم سازە دوو زمانەیە بەلای زۆرەوە لە داری ـــ توو ـــ دروست دەکرێت و شێوەیەکی خڕی درێژ و زارکێکی کراوەو هەراوی هەیە و لەسەر باری درێژییەکەیدا، کونێکی گەورەو حەوت کونی بچووکی تێدایە، کە کونە گەورەکە بە پەنجەی گەورەو حەوت کونەکەی دیکە، پەنجەکانی دوو دەستی ژەنیاریان لەسەر دێت و دەچێت.

ئەو بەشەی دەچێتە ناو زاری زوڕنا ژەنەکەوە، پارچە ئاسنێکە لە دوو زمانۆکە پێکهاتووە و لە ناو پەلکۆکەیەکدایە، کە لە کاتی ژەنیندا دەکەوێتە ناو لێوەکانی ژەنیارەوەو لەناو سازەکەدا پەیت کراوە. دوو زمانۆکەکە لەناو زاری ژەنیاردا توانای لەرینەوەی ئازادیان هەیە و گوشاری لێوەکانیان بەسەردا دەسەپێنرێت. پشوو خواردنەوەی ژەنیار لەکاتی ژەنیندا، دەوری سەرەکی دەگێڕێت.

سازەکانی (نای)، کە زاریان کراوەیە و پێیان دەوترێ: بلول، بلوێر، شەش، یان حەوت کونیان لەپێشەوە بۆ قامکەکان و کونێکی گەورەشیان بۆ پەنجە گەورە، لەبەرامبەر، شەش، یان حەوت کونەکەدا تێدا دروست کراوە. زۆربەی ئەم سازانە، لە دار دروست دەکرێن و لە کوردستانی ناوەنیدا بە درێژایی (**80**) سانتی مەترن. ئەمانە زارکێکی لە شێوەی هەرمێیان بۆ دروست کراوە. لەم شێوە (نای)یەش لە لوولەی کانزایی ـــ مەعدەنی دروست دەکرێن. لە ڕۆژئاوای ئێران ـــ خۆرهەلاتی کوردستان ـــ دا بلوێری (ئاسن، شمشاڵ) برەویان هەیە. ئەمجۆرە (نای)یانە زیاتر خەڵکی بۆ خۆ خلافاندن و بەتایبەتیش شوان بەکاری دەهێنن.

کلارنێتی دوو دانەیی ـــ دوو زەلە، یان: دوونای، دۆب (وەرگیراو لە ـــ دوو دووك ـــ ی تورکی)، یان زیمەرە (وەرگیراوە لە زوممار ـــ ی عەرەبی)، لە دوو قامیش (زەل)، یان ئێسکی باڵندە دروست کراوە، کە لە پاڵ یەکترەوە لێك هەڵبەستراون و هەر کامێکیان شەش کونیان بۆ قامکەکان و کونێکیشیان بۆ پەنجە گەورە تێدایە و هەردووکیان زارکێکیان بۆ فوو پێداکردن بۆ دروست کراوە. ئەم سازانە بەلای زۆرەوە گوندنشینەکان (نەك موتریبەکان) بۆ گەرم کردنی کۆڕی هەڵپەڕکێ دەیانژەنن.

لای کورد، ئامێری ژێداریش هەن. ئەگەرچی ئەم ئامێرانە زیاتر لە کەش و هەوای شارەکاندا بەکاردەبرێن. بەلام ئەم ئامێرانە یان

پەیوەندییان بە کەش و هەوای (شار) کلتوورێکی نەتەوەیی تایبەتەوە هەیە، یان هەر لەناو ئەو کلتوورانەوە سەریان هەڵداوە.

سازی کەوانیش: ڕێچکێك، یان کەمانچە، بەلای زۆرەوە لەلایەن موتریبی لێهاتووەوە دەژەنرێت و وەك سازگەلی ئێرانی، هاوناوەکەی خۆیەتی، بەربەت ـــ ی دەسك درێژیش: تەموورە، ئەندازەو قەوارەی جیاوازیان لە: تورکیا، سوریا و باکووری عێراقدا بەرچاو دەکەون و وەك سازی تورکیان. بەربەتی دەسك درێژ: تەموورە ـــ ش، کە لە ئامێرە پیرۆزەکانی پێڕەوانی (ئەهلی هەق)ی خۆرئاوای ئێرانن، زۆرتر بۆ ئەو بۆنانە بەکار دەهێنرێن، کە لە نەریتی شارنیشینی دێرینەی ئێرانەوە هاتوون.

## فۆڕمەکانی موزیکی ڕەسەنی کوردی

فرە ڕەنگیی کلتووری ــ مێژوویی کورد، لە کارەکانی موزیکدا ڕەنگی دەداتەوە، کە لە هەر ناوچەیەکدا و لای هەر گروپێکی جیاوازی ناوچەکەیدا، هەست بە جیاوازییەکی ئاشکرا دەکرێت. ژمارەی فۆڕمەگەلی موزیکی ڕەسەنی کوردی ـــ ئەو شێوازەی کە کوردان بەهی خۆیانی دەزانن و لە هەموو کوردستاندا تایبەتمەندی وەك یەکیان هەیە ـــ زۆر کەمن. گرنگترین فۆڕمەکانی ئەو موزیکە، ئاوازی بەسەرهات و گێڕانەوە و سترانگەلی هەڵپەڕکێ ـ یە. ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بێت، کە گەلێك لە ژەنیارانی ئاوازگەلی بەسەرهات و گێڕانەوە، بۆ هەموو شوێنەکان، لە گەڕاندان و سترانی هەڵپەڕکێش وەك برەودارترین نموونەکانی ئاکاری دەربڕینانەی ناو خەڵك بەهەند وەردەگیرێن. لەو کاتەشەوە کە بەرنامەکانی کوردی لە ڕادیۆی ئەرمەنستانی سۆڤیەت و باکووری عێراق، لەدوا دواییەکانی ساڵی (1930) و لە ئێران لە ساڵی (1950)وە، دەستیان بە پەخشکردنەوە کردووە. تەوەری سەرەکی بەرنامەکانیان بریتی بووە لە ئاوازی گێڕانەوە (ڕیوایەت) و سترانگەلی هەڵپەڕکێ.

## ئاوازگەلی بەسەرهات و گێڕانەوە ( ڕیوایەت )

گوێگرتن بۆ گێڕانەوەی بەسەرهات و ڕووداوگەلی مێژوویی، بەلای سەرلەبەری کوردانی شاری و گوندنشینانیشەوە، ئەزموونێکە لەناخەوە گوێی بۆ شل دەکەن و بە جۆرێك دەیانهەژێنێ، کە مانای (کوردبوون) یان لا دەژێنێتەوە. ڕەنگە هۆی ئەم وابەستەبوونەشیان بەم ڕووداوانەوە، بیرهێنانەوەو گەڕانەوەیان بێت بۆ (خێڵ)، یان بۆ (بنەماڵە)و ڕابووردوویان، کە پەیوەندییان بەو ڕووداوانەوە هەبووبێ.

گێڕانەوە، هەمیشە لەبەرامبەر بینەراندا، وەك نواندنێکە و توانایەکی یەکجار باڵای دەوێ، کە گرنگترینیان بریتییە لە بیرەوەرییەکی بەهێز، بۆ لە بیرمانەوەی ناوەکان. بەشەکانی بەسەرهات و ڕووداوەکان و زەمینەی مێژوویش، شەقڵێك بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە دەدات، کە لە ڕێگەی دەربڕینی موزیکی و دەقە پەخشان ئامێزەکە و توانای پاراستنی یەك شێوازە ئاوازی زۆر دەستەمۆ و کۆنترۆڵکراو و جەخت کردنەوە لەسەر ناوەڕۆکێکی دراماتیکی، کە بە یارمەتی و لە ڕێگەی ئاکار و هەڵس و کەوتی گوێگر و جووڵەی جەستەیەوە دەردەکەوێ، دەسەڵاتێکی بنەڕەتین، بەرامبەر حاڵ و هەوا و باری ڕۆحیی گوێگر و هەڵبژاردنی بابەت و شێوازی نواندنێکی گونجاو، بۆ جێگە و هەلومەرجی لەبار، ئەو سترانەچڕە دەگمەنانەی خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانەن، ڕێزێکی زۆریان لێ دەگیرێ و

ناوبانگێکی بەربڵاویان دەبێ، بە تایبەتی پێش پەیدابوونی ڕادیۆ و ئامێری تۆمارکردن، ناوبانگیان تا شوێنانی زۆر دوور بڕی دەکرد. گۆرانیبێژە گەورەکانی ڕابووردوو، لەناو نەوەکانی داهاتووشدا لەبیر نەدەکران و بەرهەمە تۆمارکراوەکانیان ـــ ئەوانەی پێش دەیەی پەنجاکان ـــ بەبێ گوێدانە چۆنیەتی دەنگیشیان، وەك سەرمایە و گەنجینەیەك دەپارێزران.

گێڕانەوە، دەتوانێ ڕوخساری حیکایەت، یان چیرۆك و ستران بەخۆیەوە بگرێ، کە لەوێدا پەخشانی زارەکی، یان: پەخشانی ئاواز ئامێز ئاوێتە دەکرێت. ئەو بەسەرهات و گێڕانەوانەی شیعری کێش و سەرواداریان هەبێ، (بەیت)یان پێ دەوترێ. ئەو ئاوازانەی سەروەر گێڕانەوەن، بەسەر سێ جۆردا دابەشدەکرێن، کە لە ڕێگەی کەسایەتی گشتی ناوەڕۆکیانەوە، لەیەکتر جیادەکرێنەوە: سترانی پاڵەوانێتی و قارەمانێتی تایبەت بە پیاو، بەسەرهاتی تایبەت بە ئەوینی ئافرەتێکەوە و بابەتگەلی تر، کە زۆربەیان ئایینی و ئەفسانەیین.

## سترانی قارەمانێتی

گۆرانی قارەمانێتی، باسی نەبەردی پیاوانەو لە هەمان گێڕانەوەشدا، هوندێ باسی مێژوویی، ئازایەتی، قارەمانێتی، ڕاستگۆییش دەکات، کە ئاکامەکانی ئەمانەش، هەموویان بە باری تێکشکان و تراژیکیدا دەشکێنەوە، ئەم گێڕانەوەو بەسەرهاتانە، زۆرتر هەر باسی ئەو بابەتانە دەکەن، کە بەلای کوردانەوە بایەخ و بەهایان هەیە، بە تایبەتیش بایەخی پیاوانەیان. ئەمجۆرە سترانە پاڵەوانیانە، کە شیعر ئامێز و لەو شێوازانەن، دەتوانرێ لە خزمەتی فەرمانڕەوایەتی و بەڕێوەبردن و نواندنی ناسنامەی دەستە و خێڵێکدا، یان دڵخۆشکردنی کۆمەڵە خەڵکێکدا بن، کە بە هەرەوەز خەریکی ئەنجامدانی کارێکن. بەڵام لەژیانی گوندنشینان و تا ڕادەیەکی کەمتریش لەژیانی شارنشینیاندا، بەلای زۆرەوە لە خزمەتی هەمەجۆرە کاری کۆمەڵایەتیشدابن.

لە کوردستانی ناوەندیدا، ئەگەر سترانچڕێکی ناودار تێدا هەڵبکەوێ، کە گۆرانی قارەمانێتی بزانێ، ئەوا (شایەر، یان لاوژە بێژ)، ئەرکێکی گرانی بەرزکردنەوەی پلەو پایەی ئاغا و کوێخا، یان سەرۆك هۆزەکەی لە ئەستۆ دەبێ. چونکە هەر کاتێ میوانێکی تایبەت و گرنگ، ڕوویان تێدەکات، ئیتر لاوژەبێژ دەسترانبێژی دەکات و بەسەرهات و کاری قارەمانانەی پێشینانیان دەگێڕێتەوە و ستایشێکی دەسەڵات و لێهاتوویی خۆیان دەکات و پیایاندا هەڵدەڵێ لە شادی زەماوەندیشدا دەتوانێ ببێتە نوێنەری سەرۆکی خێڵەکەیان. لەکاتی دروست بوونی کێشە و ناکۆکی نێوان خێڵەکانیشدا، کە خەریکە بگاتە ڕادەی بە یەکدا هەڵپڕژان و ڕووبەڕووبوونەوەی سەخت و دژوار، کێبەرکێیەکی شایان، لە نێوان سترانچڕانی ئەو خێڵانەدا دروست دەبێ، کە هەریەکەیان وەك پێشەنگی لایەنە بەگژچووەکاندا، دەتوانن ڕۆڵی هێورکردنەوەو ڕووبەڕووبوونەوەکان و تەنانەت دانوستاندنی ڕاستەوخۆی نێوان لایەنەکانیش ببینن.

## دیمەنی یەکەم

حوزەیرانی (1965.ز) لە هەواری هاوینەی هۆزی (گێودان)، لە دوو هۆبەدا ڕەشماڵ هەڵدرابوون و مەودایەکیشیان بۆ هاتووچۆی خەڵك و ڕێبواران لە نێوان هۆبەکاندا هێشتبۆوەوە. ڕەنگی لەوەڕ، بەرەو قاوەیی ـــ زەرد دەچووەوە. ئیتر کاتی ئەوە هاتووە خێڵ ڕووەو لەوەڕگەیەکی بەرزتر هەڵکشێن و ئەوێ

بکەنە هەوار. بەڵام کەس ئامادەی بەڕێکەوتن نییە و هەست بە نێوان گرژییەکی بەرچاویش دەکرا. ئافرەتان، وەك کاری ئاساییان، سەرقاڵی ڕستن، یان (کەرە) گرتنن، لە مەشکی پڕ ماستدا ـ کە بە سێپاوە هەڵواسراون یان نانکردن و چێشت لێنانن ـ هەمووشیان خۆیان لەناو ڕەشماڵەکان ون کردووە. پیاوانیشیان بە ڕیز لە دەوری ئەو ڕەشماڵە گەورەیە ڕاوەستاون، کە بۆ مێوان تەرخان کراوەو لەوانی تر جیایە و هەمووشیان چەکەکانی خۆیان: دەمانچە، یان: تفەنگی نیوە ئوتۆماتیك، خەنجەری کوردییان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتووەو گوێیان بۆ دەنگێك شل کردووە، کە لەناو ئەم دوو ریزە ڕەشماڵەوە دەبیسترێ. لەناو ڕەشماڵێکدا، ریش چەرمووانی هۆزی گێودان و هۆزی هەرکی کۆبوونەتەوە.. هۆزێکی تری نیمچە کۆچەریی، کە لەوەرگەکەیان لەسەرووتری ئەمانەوەیەو بۆ ئەوەی بە لەوەرگەکەی خۆی بگات، دەبێ رەوەو پاتاڵەکانی بەناو زەوی و قەڵەمڕەوی گێودانەکاندا تێپەڕێنێت، داواکاریی زۆر، لەسەر لەوەرگەکانەو هەر بەرەو زیادبوونیش دەچێ. گێودانەکانیش بۆ تێپەڕین بە ناویاندا، داوای پارەیەکی زۆرتر دەکەن و دانوستاندنیش چەندان سەعات دەخایەنێ.

لە ڕەشماڵی دووەمدا، شایەرانی هەرکی و گێودان، لە کێبەرکێیەکی نایابدا تێدەکۆشن تا هەر بە ئاواز و گۆرانی، یەکتر بۆر بدەن و تا ئەوپەڕی پەردە بڵندەکانی قوڕگیان دەنگ هەڵبڕن. بەسەرهاتی دوور و درێژیش دەهۆننەوەو بیسەرانیان لە پیاوانی هەردوو هۆزەکە، جڵەوکێشی خۆیان دەکەن. کاتێکیش کە خەریکە دەنگی (ڕەمەزان)ی شایەری سەرۆك هۆزی گێودان ماندوو ببێت، ریش چەرمووانی هەردوو هۆزەکە، بۆ ناو ڕەشماڵی سترانچڕان دێن، کە دیارە دانوستاندنی ئەوان (سەرانی هەردوو هۆز) هیچی لێ شین نەبووەو بە بنبەست گەیشتوون، ئەوسا ناچار تێکەڵ پۆلی بیسەرانی لاوژەبێژان دەبن. کاتێکیش دەنگی (ڕەمەزان) بەرەو پاشەکشە و داشکان دێت و بەرامبەرەکەشی سەرکەوتووانە هەر تێدەچریکێنێ، ئیتر هەردوو سەرۆك هۆزەکە هەڵدەستنە سەرپێ و باوەش بەیەکدا دەکەن و بەمەش قریوەو هەلهەلەو هاواری شادی و خۆشی بەرز دەبێتەوەو ئافرەتان لە ڕەشماڵانەوە دەردەپەڕن. ئیتر ریزی گەرمی هەڵپەڕکێ دادەمەزرێ و "هەروەك زەماوەندی بووك گواستنەوەی لێ دێت"، لە ئاکامدا هەردوو لاوژە بێژەکە بە پێکهاتنێك گەیشتوون، کە سەرانی هۆزەکان نەیانتوانیبوو بیگەنێ.

## بەسەرهات و چیرۆکی ئەوینداری

ئەم چیرۆك و بەسەرهاتانەی دڵداری، کە پێی دەڵێن (هەژی کردن)[3]، هەمیشە بە چیرۆکێکی ئافرەتێك دەست پێدەکات، کە دەبێتە ڕەگەزی سەرەکی گێڕانەوەکە و جیاوازیی لەگەڵ سترانی تری عاشقانەدا، ئەوەیە کە سەرئەنجامەکانیان تراژیدی و خەماوییە، بە شێوەیەکی لابەلاو پەراوێزانە، بە جوانییەکانی ئافرەتدا هەڵدەڵێ. ئەم بەسەرهاتانە، لەڕووی ناوەڕۆك و شێوازی موزیکەوە، ئاستەمە لە سترانگەلی قارەمانێتی جیابکرێنەوە، مەگەر هەر ئەو کەسانە بتوانن جیای بکەنەوە، کە دەزانن و لێی تێدەگەن و دەستنیشانی ئەم بەسەرهاتانە بکەن و لە ناوەڕۆکەکەی بگەن.

## بەیت: شیعر سەروادار

لە بارێکدا کە وتمان ئەو دوو شێوە ئاوازەی پێشتر باسمان لێکردن، بە شێوازی گێڕانەوەو پیادەکردنیاندا، وەك میلۆدییەکی ـ ڕیتمێکی

پەخشان ئامێزن، بەڵام جۆری سێیەم، یان: (بەیت)، لە چوارچێوەی سەرواداردا پێشکەش دەکرێن ئەم شیعرە چیرۆك ئاوێتانە، بەلای زۆرەوە ناوەڕۆکێکی ئاینیی و ئەفسانەیی (نەك مێژوویی) یان هەیە و بەهۆی بەیتبێژی ناشی و نیوە لێهاتوو و دەرویشی گەڕۆك و شایەر (موتریب) و موزیکژەنی لێهاتووەوە (کە وەك ژەنیاری کورد بە ئەژمار نایەن) دەبژێرێن.

ناوەڕۆکی ئەم بەیتانە، وەك مێژوو، ناوچە، خێڵ، یان سەردەمێکی دیاری کراوی ئەم دواییانەی کورد، نایەنە ئەژمار. ئەم بەیتانە، کوردانەترین ئەدەبی زارەکی کوردی پێکدەهێنن.

گۆرانی ئەویندارییی، کە بە تایبەتی لە باکووری خۆرئاوای ئێران، بە لاوك، حەیران و قەتار بە ناوبانگن، بەر لە (دەق)، جەخت لەسەر مەشقی میلۆدیك دەکاتەوە. ئەم سترانانە دەشێ بە تەنیا سازێك، لە پۆلە سازی (نای)یش پیادە بکرێن.

## هەڵپەڕکێ: گۆڤەند

(هەڵپەڕکێ)یش کە لەنێوان کوردانداا، لە هەموو جێگەیەك (و لای کەسانی تریش)برەوی هەیە و لەلایەن گروپێکەوە ساز دەکرێ، قسە و باسێکی فراوان هەڵدەگرێ، هەڵپەڕکێ وەك چالاکییەکی کۆمەڵایەتی، هەمیشە لەگەڵ دەنگی (موزیك)دا سەروپێوەندی هەبووە. بەڵام سەرباری بزووتن و جووڵەی ڕێك و پێك و هاوئاهەنگیی بەشداران، جۆری ریزبوونی گونجاو و شێوەی جل و بەرگ و دەقی ئاشکرای سترانەکە، پێوەندی هاومانایانەی لەگەڵ میلۆدییەکان و پیادەکردنی، بە موزیکەوە، هەموو ئەمانە بەسەریەکەوە پێکەوە، هەڵپەڕکێیەکە تەواو دەکەن.. لەهەر هەڵپەڕینێکیشدا، بەشداران جۆرێك لەو هەڵپەڕینە هەڵدەبژێرن، کە خۆیان دەیانەوێ لەگەڵ سەمای تاکە کەسی، یان دەستە جەمعیدا بگونجێ.

سەبارەت بەو جووڵانەوانەی پێوەندییان بە (دەنگ)ەوە هەیە، سێ جۆر هەڵپەڕکێ هەیە:

لە جۆری یەکەمدا: دوو دەستە، کە لە دوو، سێ ئافرەت، یان دوو پیاو پێکدێت، بەلای زۆرەوە میلۆدییەکی کورت هەڵدەبژێرن، کە چەندان جار بە دوای یەکدا دووپاتە دەکرێتەوە. سەماکاران شان بە شانی یەکتر دەوەستن و دەستی یەکتر دەگرن و شانیان لە شانی یەکتر دەدەن و ریزەکەی خۆشیان تێك نادەن و لەجێی خۆیاندا پێیان دەبزوێنن. دەقی ئەم سترانانە، شیعری سەروادارن و هەر نیوە بەیتێکیش دوو جار دەوترێتەوە. ئەم هەڵپەڕینانە، کە بە شێوەی (هێڵ)ن، جۆریان زۆرە و لەگەڵ گۆرانی دا، بە شێوەی: ئانتی فۆناڵ (پرسیار و وەڵام لە نێوان دوو دەستەی هاوگۆرانی دا) ساز دەکرێن و هەر یەکێکیشیان ناوی تایبەتی خۆیان هەیە و بە زاراوە ناسییەکی دەوڵەمەندەوە، باسی گەلێك شت دەکەن، وەك: بزواندنی جەستە و لەش، جوڵاندنی شان، مەچەك، دەست، شێوەی هەنگاو هەڵهێنانەوە، نواندنی جەستە و لەش و لار، شوێنی سەرهەڵدانی کەلام، یان ئەو جێگەیەی هەڵپەڕینەکەی تێدا دەکرێ.. لەو نواندنە هەڵبژێراوەدا، سەماکار ـ گۆرانیبێژیش چەندان سترانی تایبەت بە هەڵپەڕکێ، بە ناوی تایبەتی خۆیانەوە دەگەیەنن، ئەو بینەرەی لە دەرەوەی گەڕی هەڵپەڕینەکەوە، چاودێری دەکات، ئەگەر نتوانێ پێ بە پێی شیعری سترانەکان، تێکەڵ بە هەڵپەڕینەکە ببێ، گومانی ئەوە دەکات کە هەڵپەڕینەکە، هەر یەك جۆر بووەو ئەو جۆرەش، بۆ ماوەیەکی درێژ دووبارە بۆتەوە. چونکە لە ڕواڵەتدا هیچ شتێك ئاڵوگۆڕی نەکردووەو:

جولاّنەوەکان، ڕیتم، خێرایی و ڕووخساری هەموو سەماکارانیش، وەك خۆیان ماونەتەوە. لەکاتێکدا سەماکاران، شەش، یان حەوت جۆر سەمایان کردووە، کە لە ڕوانگەی خودی خۆشیانەوە لێکتر جیاوازن. لەبەر ئەوەی دەق و ناوی سترانەکانیش لەیەکتر جیاوازن.

لە جۆری دووەمدا: سترانبێژێك ڕابەرایەتی ئەوانی تر دەکات ــ بەلای زۆرەوە دەستەیەکی تری هەڵپەڕکێکارانن ــ کە وەك هەڵپەڕینی جۆری دووەم ڕیز دەبن و هاوکات بە دەم هەڵپەڕینیشەوە وەلامی گۆرانیبێژەکەش دەدەنەوە. ئەم هەڵپەڕێنەی جۆری دووەم، لە بەشی کوردستانی عێراق، خۆشییەکی تایبەتی هەیە.

جۆری سێیەم: موزیکژەنان، موزیك بۆ ریزێکی سەماکاران دەژەنن، کە لە شێوەی بازنەیەکی تەواو کراوەدا هەڵدەپەڕێ و ڕابەری هەڵپەڕینەکەش (سەرچۆپی کێش)، دەسرۆکەیەکی بچووکی بە دەستەوە گرتووەو ڕای دەوەشێنێ.

ئامێرەکانی موزیك کە لەم هەڵپەڕینەدا بەشداری دەکەن، دەهۆڵێك و زوڕنایەك و جاری واش دەبێ لە دوو تەپڵ پێکدێت و بەلای زۆریشەوە خودی شایەر و موتریبەکان، ئەم ئامێرانە دەژەنن. بەلام لە هەندێ ناوچەدا، لە بری زوڕنا، دووزەلەیەك بەکاردەهێنن.. ئەو ئاوازانەی کە ئەم ئامێرانە دەیانژەنن، زۆرتر هەر ئەو ئاوازانەن، کە لەناو خۆدا بە گۆرانی هەڵپەڕکێ ناسراون. هەر چەندە واش دەبێ سەماکاران لەسەر ئەوە هاوڕانەبن، کە ئامێری موزیکەکە، کام گۆرانی لێ دەدات.

هەست کردن بە ئاوێتە بوونی ئەو میلۆدییانەی ئەم سازانە، لەگەڵ دەقی ئاوازەکاندا دەیانژەنن، ئەوە دەسەلمێنێ کە موزیکی کوردی، بنەمایەکی ئاوازیی هەیە.

ئەم شێوازە هەڵپەڕینەی جۆری سێیەم، لەناو هەموو گرووپێکی نەتەوەیی باکووری خۆرئاوای ئاسیادا، هاوبەش و ڕایەڵ و تار و پۆیەکی نزیکی لەگەڵ موزیکزانانی لێهاتووی (ناخێڵ)ەکاندا هەیە.

هەڵپەڕکێش وەك پیادەکردنی ئاوازگەلی بەسەرهات و گێڕانەوە، ڕۆڵێکی گرنگی کۆمەلایەتییانەی لەناو گوندنشینان و شاری و تاراوگە نشینەکانیشدا هەیە و دیارترین ڕۆڵیشیان لە بۆنەکانی شایی و زەماوەندا دەبینرێن.

**دیمەنی دووەم:**

حوزەیرانی (1965.ز) ــ لەسەر بەرزایی کوێستانە بڵندەکانی کوردستانی ناوەندی، کە بەسەر رووباری (زێ)دا دەینواڕی، هەواری هاوینەی هۆزی (مام خۆران)، کە هۆزێکی ئارامو داساکاوە، بە جموجوولێکی پڕ لە ژاوەژاو کەوتووە. میوانێکی زۆر لە دوورەوە هاتوون. چەند پەزێکیان سەر بڕیوە. دوکەڵی خۆراك ئامادەکردن و گۆشت برژاندن و کەباب سازکردن، وەك هەور بەرز دەبێتەوەو دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا دەبیسترێ.

دوو ڕۆژە، بازنەیەکی کراوەو ئازاد، لە سەماکارانی هەڵپەڕکێ، لەگەڵ دوو ژەنیاردا، کە بە پارە گیراون، لەچەقی زەماوەندەکەدان. ئەڵقەی زەماوەندەکە وەك مارێك بە دەووری هۆبە ڕەشماڵەکاندا دەسووڕێتەوەو هەر کەسێکیش حەز بکات هەڵپەڕێ، دەتوانێ تێکەڵی گەڕی زەماوەندەکە ببێت ــ هەر لە میوانەوە تا خانەخوێ، بەلای زۆریشەوە پیاوانو هەندێ جاریش ئەڵقەیەك لە ئافرەتان، لە نێوانیاندایە. گۆوەندەکە بە دەهۆڵ و زوڕنا،

یـان (سـەمای تـەپڵ)، هـەموویانی بـە مەبەسـتی بەشداریکردن لە ئاهـەنگی زەماوەندی پیاوێکی (مـام خـۆران)ی و ئـافرەتێکی (گێـودان)یـدا، لـە دەوری خـۆی گردکردونەتـەوە.. شـەویش، دوای نـانی شـێوان، لـە ژووری میـوان، کـە گـەورەترین ڕەشماڵە، سازە کەوانەییەکەی خـۆی: (ڕیچەك)، بـە دەسـتەوە دەگـرێ و بـە گـەورە میوانـان و سەرانی هۆزەکەدا هەڵدەڵێ و پاشان هـەموویان سـەر گـەرمی گێڕانـەوەی چیرۆك و بەسـەرهاتی ئەویـنداری و جەنگەکانی کوردستانی ناوەندی دەکـا. سـەر لـە بـەیانی ڕۆژی دواتـر، شـایەر (موتریـب) بـە سـورای ئەسـپەوە، ڕابەرایـەتی کەژاوەیـەك دەکـات، کـە بـۆ گواسـتنەوەی بـووك بەڕێکەوتووە. ئەم سەفەرە، کە بە سورای ئەسپ دەبـێ، شـەش سـەعاتێك دەخایـەنێ و بـە هەڵمـەتێکی هەمەلایەنە، بۆ سـەر هـەواری ماڵی بووکێ و تەقەی تفەنگ و قریوەو هاوار و هـەرای پیاوانەوەیە، دوایی دێت. تا ئەو کاتەش کە ئەو تۆزوخـۆڵ غوبـارەی بەرزبۆتـەوە، دەنیـشێتەوە، هـــەردوو بنەماڵـــەی بـــووك و زاواش ئـــارام بوونەتـەوە.. پیـاوانی هـەردوو هۆزەکـە ریـز دەبەسـتن و دەسـت و پەنجـەیان تونـد لەیـەکتر دەئـاڵێنن و شانەکانیـشیان لەیـەك گیردەکـەن و لەسـەرخۆ لەگـەڵ سـۆزی دەنگـی بـە نـۆرەی چـاکترین گۆرانیبێژانـدا، بـە جووڵـە و بـزووتن دەکـەون. ئافرەتـانیش چـەند ئەڵقەیـەکی تـری هەڵپـــەرکێ پێکـــدێنن. هـــەواری هـــۆزە سـەرکەوتووەکە، سـیخناخە لـە چـەندین پـۆلی جیاجیای هەڵپـەڕکێکاران و هەریەکەشیان بـەو پـــەڕی ڕێـــزەوە، لێزانیـــی هۆزەکـــەی خۆیـــان نیشان دەدات.

دوای تاوێـــك، ســـەرلەنوێ ژەنیـــاران بـــۆ خۆشـیی خەڵکەکـە، دەسـت بـە دەهـۆڵ کوتـان و زوڕنـا ژەنـدن دەکەنـەوە. لـەم سـەروبەندەدا، بنەماڵـەی بووك و دۆستانیان، دەکەونە چڕینی سترانی تایبەت بە زەماوەند: (نەرینیك)، کە لـەم ڕێوڕەسمـــەدا نیـــشانەیەکی ئـــەم قۆناغـــەی زەماوەندەکەیە.

ڕۆژی دواتـر، کەژاوەیـەك لەگـەڵ بووکـدا بەڕێدەکـەوێ، کـە سـورای ئەسـپ دەکـرێ و تارایـەکی سـەوزی وەك نیـشانەی دەسـکەوت بەسـەردا دەدرێ و موزیـك ژەنـانیش، بـەدەم موزیـك ژەندنـەوە، ئـاپۆڕەی دەدەن و بـەرەو هـەواری مـاڵی زاوای دەبـن و لەگـەڵ سـەمای موزیـك ئـامێز و گـۆرانی چـڕینی ئاینییـەوە (بەسـەر سـەری زاوادا)و پاشـان شـادکردنی بەشـداران لەلایـەن موزیکـژەنانی لێهـاتووەوە، ئاهەنگی زەماوەندەکە، هەر بەوجۆرەی دەستی پێکردبوو، دوایی دێت.

ئـــەم کارانـــەش کـــە خـــەڵك لـــە دەوری خۆیـان خڕدەکەنـەوە، بـۆ هـەر قۆنـاغ و هـەر هەنگاوێکی، شێوازی موزیك و سەمای تایبەتی خۆیان هەیە.

### فۆڕمەکانی موزیکی ناوچەیی

هەنـدێ فـۆڕمی مـوزیکی، پێوەنـدییان بـە کاروبـاری ناومـاڵ و بۆنـە و نـەریتی ئافرەتـانی ناوچـەکانەوە هەیـە. بـە واتـا: هـەر تـەنیا لـە ناوچەیەکی جوگرافیایی دیاریکراودا ناسراون و کاریـان پێـدەکرێ. لـەناو ئـەو فۆڕمانەشـدا دەتوانین ئاماژە بە: لای لایە، گۆرانی کارکردن، گـۆرانی گۆوەنـد ـــ کـە بەشـێکن لـە نـەریتی زەماوەند و شایی ـ بکەین:

### لای لایە

لـە کوردسـتانی ناوەندیـدا: لای لایـە، واتـا: نـەرینیك، لەلایـەن ئافرەتـان و بـە زاری داخـراو و دەنگێکی نەرمـەوە، بۆ ئارام کردنەوەی منداڵان دەچـــڕدرێ. ئـــەم گۆرانییانـــە بـــەلای زۆرەوە لەلایـــەن تاکـــە کەســـەوە، تـــەنیا و تـــەنیا بـــۆ

زارۆكـــان دەبێـــژرێ. ئـــەم واژەی (نـــەرینیك)ە، بـــۆ هەنـــدێ نـــاوی گۆوەنـــد و زەماوەنـــدیش دانراوە.

## گۆرانی كاركردن

كاری هەرەوەز و بە كۆمەڵ و تایبەتیش ئەو كارانـەی كـە بـۆ ئەنجامـدانیان، پێویـست بكـا چەند كەسێك تیایـدا هاوكـاری و هاوئاهـەنگی بكـەن، لـەناو كوردەواریـدا، لـە هـەموو شـتێك لەپێـشترە، بـە تایبـەتیش كـە پەیوەنـدی بـە كۆكردنـەوەی خلـە و خـەرمان و ئامـادەكردنی كەرەسەی خۆراكەوە هەبێ.

دروێنەكردن بە داس، ئاوازی هـەرەوەز و بە كۆمەڵی دەوێت. لـە كوردسـتانی ناوەندیـدا، كە ئـافرەت مەشـكەی پـڕ لـە ماسـت، بـە سـێپاوە هەڵدەواسن و ڕایدەژەنن، تا (كـەرە)ی لـیٚ بگـرن، بەلای كەمەوە پێویستی بە دوو ئافرەت هەیـەو دەبێ بە جۆرێكیش كار بكـەن، كە هاوئاهەنگی لەگەڵ یەكتردابكەن. ئەم كارەش زۆرتر موزیكای ئاوێتەیـــە.. لـــە بـــاكووری عێراقیـــشدا، لـــەو شـــوێنانەی زۆرتـــر جووتیـــارانی لـــیٚ دەژیـــن، گەنمـــــەكوتاو، یەكێكـــــە لـــــە خۆراكـــــە ســــــەرەكییەكانیان. دوو ســـــیٚ پیـــــاوی بـــەهێز، بـــەردەوام بـــە كـــوتكی داریـــن، گـــەنم لـــەناو جـــۆنی دا، دەكـــوتن و بـــە دەمیـــشیەوە جـــۆرە ســـترانێك دەچـــڕن، كـــە بەڕســـتەی كـــورت و تایبەتەوەیـــە. بەمـــەش جـــۆرە ڕیـــتم و بزووتنەوەیـــەك بـــەم كـــارە ســـەختە دەبەخشێ.

لـەكاتی (لبـاد) چێكردنیـشدا، سـترانێكی تایبـەت بـەو كـارە هەیـە. زۆربـەی كارەكـانی تـــریش، وەك: جـــووتكردن و زەوی كـــێڵان، گـــۆزەودیزە لـــە قـــوڕ و هـــەڕ دروســـتكردن و نموونـەكانیان، بـۆ سترانـچڕینی ئـاوازی تاكـە كەسی، بەدەرفەت دەژمێردرێ.

## گۆرانی زەماوەند

لە كوردستانی ناوەندیدا، ئەو گۆرانییانـەی كە بەشێوەیەكی گشتی (نەرینیك: ئەم زاراوەیە بـۆ لای لایـەش بـەكاری دەهێـنن) یـان شـەش بەنـدیی یـان پێـدەڵێن، وەك بەشـێك لـە بۆنـە و داب و نـــەریتی بـــووك گواســـتنەوەدا، لەلایـــەن خزمانی نزیكی بووك و زاواوە دەوترێن. قۆناغە جیاجیـــاو جۆربـــەجۆرەكانی نـــەریتی بـــووك گواســـتنەوە، ســـترانی تایبـــەتییان هەیـــە. بـــۆ نموونـە: سێركە زاوا (لەسـەر زاوا)، دەبـیٚ هـەر ئـەو كاتـە بـووترێ كـە بـووك بـۆ مـاڵی زاوا دەگەیـــەنرێ و بـــۆ یەكـــەمجار بـــووك و زاوا لـــە تەنیـشت یـەكترەوە دادەنیـشن، لەسـەر لەبـەری ئـەو كارانەشـدا، كـە لـە دوو دەسـتە پێكـدێت، دوو، یان سیٚ گۆرانیبێـژ (هـەموویان پیـاو بن، یـان ئـافرەت)، بـە نـۆرە گـۆرانی دەچڕن. بەنـدی هەڵبەســـتەكان كـــورتن و كێـــشیش ئـــازادە و میلۆدیش پێویستی بە دەنگێكە، كە پانتایی و بەرینایییەكی بەربڵاوی دەویٚ.

## پەراوێزەكان:

1–ئەم پێناسـەیە، بـە سوپاسـەوە لەلایـەن هـاوڕێی نووسەر: كاك (ئازاد حەمە شەریف)ەوە بۆ ئەم مەبەستە، لـە ئەنتەرنێتـــەوە گواســـتراوەتەوەو بـــۆمی تەرجەمـــە كردووە.

2–هەڵبەتـە جگـە لـەو دوو میرنـشینەی كـورد، كـە نووسەر ناویان دێنیٚ، میرنشینەكانی تری وەك: بۆتـان، سۆران، بابان، ئەردەڵان.. هـەمان چارەنووسیان تـا ئـەو قۆناغە مێژووییە هەبوو.

3–لە دەقەكەدا: هەجیكردن نووسرابوو.

## سەرچاوەكان:

فصلنامەی موسیقی ماهور، شماره (27، ص51 ــ ص62).

**ئەو سەرچاوانەی کە نووسەر بۆ ئەم وتارە کەڵکی لیٚ وەرگرتوون:**


***Blum, Stephen, and A, Hassanpour***

"1995 ***the morning of frccdom Rose Up: Kurdish Popular Song and Exigencics***

***Bruinessen, Martin van***

1992 ***Agha, sheikh, and state: the social and political strures of Kurdistan. London Zed***.

***Charistensen,Dieter***

" 1962 ***Kurdische brautlieder aus bilayer Hakkair.Sud – Ost turkci***" ***Journal of the lntreenational Folk music coundil 13; - 72***.

"1963 ***Tansilaeder der Hakkarai – kurend". Jahrbuch fur Musikalische Volks – und Volkerkumde 1: 11 – 47***.

''1963 ***Kurdish folk music from westem lran . New york: Ethnic folkways library FE 3103. (LP disk)***.

"1975 ***Musical Style and Social Context in Kurdish Songs". Asian Music 6: 1-6 Kkendal. Nezan***.

***1*** 979***: Kurdish Music and Dance. " World of Music : 19 – 23 Kurdistan***.

1974/ 1989 ***Unesco Collection Audivis D 8023. Compact disk***.

***Penwer, Swan***

1989 ***Chants du Kurdistan . Audiuis B6145 . Compact disk. --- Dotman CD – 28 (1985 – 1994), Le Dilbere CD – 32 (1989 – 1996), Ya star CD – 15. (1995). Ses plak yapim (Istanbul)***.



***Dieter Christensen***

**بنکەی موزیکی میللەتان**

***Center for Ethnomusicology MC 1815***

***Dodge*** 606

***Columbia University*** **زانکۆی کۆلۆمبیا**

***New York N10027*** **نیورۆك**


***Education***: **پلەکانی خوێندن**

53 – 1950***Staaliche Jochschule fur Musik, Berlin/Germany. Violoncello; diploma***

**ئـەکادیمیای دەوڵـەتی** 1950 **ـــ** 1953 **بـۆ موزیك/بەرلین ـ ئەڵمانیا. بڕوانامە لە (ڤیۆلین چەلۆ)**

57 – 1953***Freie Universitat Berlin. Musicology (comparative musicology and historical musicology) and Anthropolgy***"

1953 **ـ** 57 **زانکۆی ئازاد لە بەرلین/زانستی موزیك (موزیکی بەراوردکاری و زانستی موزیکی مێژوویی)و زانستی ئەنسرۆپۆجیا**

***Ph.d. (magna cum laude); Influential teachers: Kurt Reinhard, H.H. Drager (musicology); Richard Thurnwald, s. Westphal – Hellbusch (anthropology***)

**دکتـۆرا (پـسپۆری سـەرەکی) (زانـستی موزیـك و ئەنسرۆپۆلۆجیا)**

***SCHOLARLY PUBLICATIONS***

**بڵاوکراوە زانستیەکان**

1959***Notizen zur Kurdischen Topferei. Baessler – Archiv, N.F.7:351 – 59 .(with nerthus Christensen)***

**(بەئەڵمانی)**1959 **چەند سەرنجێك لەبارەی سواڵەتکاری کوردی**

1961***a Kurdische Brautlieder aus dem Vilaytet Hakkaei, Turkei. Journal of the International folk Music Council 13: 70 – 72***

**گـۆرانی زەماوەنـدی کـوردی لـە ویلایـەتی هـەکاری ـــ خـوارووی ڕۆژهـەڵاتی تورکیـا.** 1961 **( بە ئەڵمانی)**

1963*Tanzlieder der Hakkari – Kurden. Jahrbuch fur musikalische Volks – und Volkrekund 1;11 – 47*.

1963گۆرانییەکانی شایی کوردەکانی هەکاری (بە ئەڵمانی)

1965*a Kurdish folk music from Western Iran. (notes). New York: Ethnic Folkways Library FE 3103, 19pp*.

1965گـۆرانی میللـی کـوردی لـە ڕۆژاوای ئێـران بە(ئینگلیزی)

1967*a Die Musik der Kurden. Mitteihmgen der Berliner Gesellschaft fur Anthropologie, Ethnologie, und Urgeschichte 1;113 – 19*.

1967موزیکی کوردان (بە ئەڵمانی)

1967*d (Review of) Celila Celil, Kurdskie Narodnye Pesin (Kurdish Folk songs). Moskva:Izdatel'stvo Muzyka*,

1965 *Jurnal of the Intaernational Folk Music Council 19;131-32*.

1965(خـستنە ڕووی کتـێبی) جـەلیلی جـەلیل (گۆرانی میللی کوردی) (بە ئینگلیزی)

1968 *b Volks – und Hochkunst in der Vokalmusik der Kurden. In:Volks – und Hochkunst in Dichtung und Music. Tagungsbericht Colloquium Univ, Saarbeucken 1966. Witterschlick bei Boon. Pp. 128 – 31*.

1968 هونـەری میللـی و هونـەری بـەرز لـە مـوزیکی ژێداری کوردی دا. (بە ئەڵمانی)

1975 *a Ein Tanzlied der Hkkaei – Kurden und seine Varianten. Baessler – Aechiv 23;195 – 215* .

1975گۆرانیـــەکی شـــایی کـــوردانی هـــەکاری و جۆرەکانی (بە ئەڵمانی)

1975 ***b Musical style and social context in Kurdish songs. Asian Music 6:1-6***

شـێوازی مـوزیکی و چوارچـێوەی کۆمەڵایـەتی لـە گۆرانی کوردی دا (بە ئینگلیزی)

1978 *a Kurdisk Musik. Solmann's Musiklexicon*.

موزیکی کوردی (بە ئەڵمانی).

1996 ***c Hkkari Kurtlerinin dans sarkilari. DANS MUZIK KULTUR (Istanbul) 62:245 – 280***.

1996 کلتووری گۆرانی شایی هەکاری (بە تورکی)

2001*c Kurdish Music New Grove 2nd ed, vol, 14, pp. 36 – 41*.

**1978**موزیکی کوردی (بە ئینگلیزی)

2002***b Kurdistan. Garland Encyclopaedia of world Music, vol.6,pp,739 – 52***

.کوردستان (بە ئینگلیزی)

2002 ***d Bati Iranda Kurt Halk muzigi. In Mehmet Bayrak, Kurt Muzigi, Danslari ve Sarkilari, Ankara:Ozge. Vol. 1, pp. 101 – 107***.

2002 ***e Kurtlerin Muziginde Folklor ve Yuksek Medeniyet. In Mehmet Bayrak, Kurt Muzigi, Danslari ve Sarkilari***.

***Ankara: Ozge. Vol. 1,pp. 127 – 130 .2002f***

# بونیادو شێوەکانی چیرۆکی درێژ

ئۆیسن وارن

لە فارسییەوە: مستەفا زاهیدی

تیۆری و رەخنەی رۆمان لە باری چییەتی و چۆنیەتیەوە لە بەراورد لەگەڵ تیۆری و رەخنەی شیعردا تەمەنێکی کورتتری هەیە. هۆکارەکەشی وەك هەمیشە دەگەڕێتەوە بۆ کۆن بوونی شیعرو تازەبوونی رۆمان بە بەراورد لەگەڵ شیعردا. بەڵام وەها بەڵگاندنێك زۆر روون دەرناکەوێ. رۆمان وەك ژانرێکی هونەری وەك ئەوەی لە زمانی ئاڵمانیدا باوە، رەنگە شێوەیەك بێت لە هەڵبەستراو *(Dichtung)* و بە مانا تەواوەکەی، بە هەڵهێنجانێکی مۆدێرن لە شیعری "ئێتمێك" دەژمێردرێ. ئەم شێوە شیعرە، وێڕای شانۆ یەکێکە لە دوو شێوەی گرنگی ئەدەبی. هۆی وەها هەڵهێنجانێ، رەنگە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە رۆمان ئاوێتەیەکی جێگەی سەرنجی هەیە لەگەڵ لایەنە سەرقاڵکەر و کات بەسەربردندا و هاوکاتیش وەك هونەرێکی ناجیددی لە واقیعەکە دوور دەکەوێتەوە. چونکە لە شان رۆمانە گەورەکاندا، بەردەوام بەرهەمگەلێکی دەستکرد و بێهێز، بڵاودەبنەوە. روانگەی باو و پەسەندی ئەمریکاییەکان بانگەشەی ئەوە دەکات کە خوێندنەوەی ئەو بەرهەمانەی کە چیرۆك نین، بۆ فێربوون بەکەڵکە و خوێندنەوەی چیرۆك، کارێکی زیانبەخش و لە کۆتاییدا جۆرێ زیادەڕۆیی تاکە کەسیە و هیچ شتێکی لێ ناکەوێتەوە جگە لە رووهێنان بە خوێندنەوەی رۆمانە رەخنەگرانەکانی نووسەرانێکی وەك جیمز لاول و ماتیۆ ئارنۆڵد.

رەنگە دیدێکی هەڵەمان بەرامبەر بە رۆمان ببێ. واتە بە بابەتێکی دیکۆمێنتی یان دەربڕینی رووداوێکی مێژوویی بزانین، وەك ئەوەی لەبەر لێڵییەك کە لە رۆماندا هەیە، هەندێ جار بە گێڕانەوەی چیرۆکێکی راستەقینەو هەڵهێنجانێکی مێژوویی لە ژیان و سەردەمانێکی تایبەتی ئەو چیرۆکە دەزانرێ. بەڵام ئەدەبیات دەبێ هەموو کات سەرنج راکێش بێت و بونیادێکی هەبێ، ئامانجێکی ئیستاتیکایی بگرێتە بەر، بە شێوەیەکی روون و بە شێوەیەکی کامڵ پێوەندی لۆژیکی رووداوەکان و کاریگەرییەکانی بخاتە روو و پێوەندیە دیار و عەقڵ برەکانی بپارێزێ. ئەم پەیوەندیانە فرەچەشنن: رۆمان دەتوانێ رۆح بە ژیاندا بکات ، بیکات بە شتێکی گاڵتەجاڕ یان

وێنایەکی ناکۆک و جیاواز لە ژیان بدات بە دەستەوە. بۆ ئەوەی لە پەیوەندیەکانی بەرهەمێکی تایبەت لەگەڵ ژیان بگەین دەبێ بگەین بە زانستێکی سەربەخۆ دەربارەی ئەدەبیات.

ئەرەستۆ شیعری (لە دیدی ئەوەوە، ئیپیك و شانۆ) بە فەلسەفە نزیکتر دەزانی تا بە مێژوو. ئەم گریمانەیە بەهایەکی هەرمانی هەیە و بەپێی راستیگەلێکی بەڵگەدار، لەوانە وردەکاریە تایبەتەکانی کات و شوێن دارێژراوە. هەروەها دەربڕی راستیگەلێکی فەلسەفی گریمانەیی، پێشنیارکار و گشتیە. لە دیدی "مێژوویی" و "فەلسەفی"یەوە، ئەدەبی گێرانەوە جۆرێ درۆیە. وشەی "چیرۆك" هێشتا بەبیرهێنەرەوەی هەمان تیۆری دوژمنکارانە و کۆنی ئەفلاتوونە بەرامبەر بە ئەدەبیات، کە فیلیپ سیدنی و دکتۆر سامویێل جانسۆن جەخت دەکەنە سەر ئەم شتە و دەڵێن ئەدەبیات بەم مانایە هیچ کات دەرخەری واقیع نەبووە. ئەوان هێشتا پشتیوانی دەکەن لە هەمان روانگەی دوژمنکارانەی سەرلێشێوێن. ئەم بۆچوونە دەبێ بەهۆی نیگەرانیی رۆماننووسەکان، چون نووسەر بە باشی دەزانێ کە چیرۆك، کەمتر لە حەقیقەت سەرسامی پێوەیە و زیاتر لە حەقیقەت دەرخەری خودی حەقیقەتە.

ویلسۆن فالت دەربارەی وەسفی دانیەل دێفۆ لە کارەکتەری خاتوو "ویل" و خاتوو "بارگریو" بە ستایشەوە دەڵێ:

"هەموو شتێکی چیرۆك راستە جگە لە گشتییەتەکەی. دەبێ ئەوە بزانن کە "دێفۆ" بە چ دژواریەکەوە چیرۆکەکە دەباتە بەرەوە بۆ ئەوەی خوێنەر، لە وەها گشتیەتێك دردۆنگ بێت. چیرۆك لە زمانی ژنی سێهەم، هاورێی کۆنی خاتوو "بارگریو" کە هەندێ خووی وەك ئەو دوو ژنەی تر دەچێ، دەگێردرێتەوە..."

ماریان مۆرد دەڵێ:

"شیعر دەبێ بە هۆی ئەوەی لە باخە خەیاڵییەکاندا کە پڕە لە بۆقی راستەقینە بگەڕێین و کونج کۆڵی بکەین."

چیرۆکی خەیاڵی لەبەر بەوێنا کێشانی تەمومژاویی واقیع و کاریگەریەك کە لەسەر خوێنەر هەیەتی، بەوەی کە قانعی بکات لە ژیان وەرگیراوە، پێویست نیە دەربڕی راست بوونی بارودۆخەکان، وردەکاریەکان یان شێوەی باوی ژیان بێ. بەپێی ئەم پێوەرانە نووسەرانێکی وەك ویلیام دین هاولز یان گونفراید کلێر، کتێبەکانی ئودیپ رێکسن، هاملێت و مۆبی دیك بە سووك تەماشا دەکەن. ئەو وێکچوونانەی کە لە وردەکارییەکانی بەرهەمدا هەیە وەك چەشەیەك، سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ و دەیخاتە بارودۆخێکی عەقڵ نەبڕ و جێ ئەگەرەوە کە بە شوێن رەوتی "لە حەقیقەتەوە تا واقیع" لە ماناگەلێکی قووڵتردا لەچاو ئەو ناوەڕۆکەی کە بارودۆخی راستەقینە بە وێنا دەکێشن، بگەڕێ.

ریالیسم و ناتۆرالیسم لە شانۆ و رۆماندا، وەك ستایلەکانی رۆمانتیسم یان سورریالیسم، بە شێوەیەکی ئەدەبی یان هونەری نهێنیە فەلسەفییە ئەدەبیەکان بە یارمەتی ستایلە هونەری و ئەدەبیەکان دەردەکەون. لێرەدا ناکۆکی تەنها لە نێوان واقیع و وەهمدا نیە، بەڵکوو جیاوازی لە هەڵهێنجانە جیاوازەکان لە واقیع و ئەو جیاکاریانە لە شێوە جۆراوجۆرەکانی ئیبهام (*mystification*)دا دەردەکەون.

پێوەندی نێوان ژیان و چیرۆك چیە؟ وەڵامی کلاسیك یان نیئۆکلاسیك بەم پرسیارە دەتوانێ ئەمە بێ کە چیرۆك، دەرخوری سووکی دنیایی (موولێر وبالزاك و...) و بێوەفایی تیپێکی کچان (شالیر و باوەگۆریۆ)یە. ئەگەر وابێ ئاخۆ وەها پۆلێن بەندیەکی دیاریکراو گریمانە

کۆمەڵناسانەکان ناگرێتەوە؟ وەڵامێکی تریش بۆ پرسیاری یەکەم هەیە. ئێمە، دەبێ ئەوە بڵێین هونەر گەورەیی و کەماڵ دەبەخشێ بە ژیان. بێگومان هونەرێك بەم ستایلە بوونی هەیە، بەڵام تەنیا ستایلێکە و ناتوانێ لە مانای راستەقینەکەیدا هونەر بێت. بەمەشەوە، هونەر بە گشتی بە خستنە رووی فاکتۆری جوانیناسانە و لە رێگای شکڵ بەخشین بە رووداوەکان و هەڵبژاردنی شێوەیەك دەربڕینی تایبەت، رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ کێشەگەلێك کە ئەزموون کردن یان تەنانەت دیتنی لە ژیانی رۆژانەماندا دڵتەزێنە، دەکات بە شتێکی دڵخوازو لە هەمان حاڵیشدا وابێ کە توانای رووبەڕوو بوونەوەمان لەگەڵیان ببێ. رەنگە بوترێ چیرۆك تەنها کێشەیەکی مێژوویی دەگێڕێتەوە یان وێنا و سەرچەشنێکە لە ئولگوو کێشە کۆمەڵایەتیەکان. ئەو چیرۆکانە هەن کە هەڵگری وەها روانگەیەکن، وەك کورتە چیرۆکەکانی "کێشەی پرد" یان "رێو رەسمی ناشتنی پەیکەرساز" بەرهەمی ویلا کاترا[1].

بەڵام رۆماننووس کەمتر دەپەرژێتە سەر کێشە، پێرسۆناژ یان رووداوێکی تایبەت. ئەو زیاتر بیر لە خولقاندنی جیهانێکی گەورە دەکاتەوە. هەموو رۆماننووسانی گەورە وەها دنیایەکیان هەیە. هەندێ جار ئەم جیهانە، جیهانێکە وەك ویلایەت و شارە کەنیسەییەکانی ئانتۆنی ترالۆپ و هەروەها ناوچەی "وێسکێس" (ناوچەیەك لە باشووری بریتانیا کە سەر بە قوتابخانەی ئەنگلاساکسۆنن) کە تۆماس هاردی لە یەکێك لە چیرۆکەکانیدا ئاماژەی پێ دەکات و کوت‌ومت وەك هەندێ لە شوێنە جوگرافیاییەکانی گۆی زەوی دەچێ بەڵام هەندێجار -وەك بەرهەمەکانی ئالن پۆ- شتەکە بەم شێوەیە نیە. قەڵا ترسێنەرەکانی لە ئاڵمان یان وێرجینیا نین، بەڵکوو لە دەروونی خۆیدان. جیهانی چارلز دیکێنز دەتوانین بە لەندەن بناسینەوە. جیهانی کافکا لە رووی پراگی کۆنەوە. ئەم دوو جیهانە هەردووکیان دنیایەکن تەواو گشتی و پڕن لە داهێنان. کەسایەتییەکانی دیکێنز و شوێنگەکانی کافکا بە رادەیەك راستەقینە، عەینی و ناسین هەڵگرن، گەڕان بەشوێن شوناسیاندا شتێکی بێهوودەیە.

دیسمۆند مەك کارتی دەڵێ:

"ئەندێشەکانی جۆرج مویریت، جۆزف کۆنردا، هێنری جیمز و تۆماس هارۆی، هەرکامەیان وەك بڵق گەلێکی رەنگاورەنگ دەچن کە لە شوێن کاتی بەربلاودا رەها کرابێتن. ئەوان مرۆڤگەلێك وەسف دەکەن هەرچەن لە هەندێ بوارەوە وەك مرۆڤە راستەقینەکان دەچن، بەڵام هەر لەو جیهانە تایبەتەی خۆیاندایە بە کەماڵ دەگەن."

ئەو هەروەتر دەڵێ:

"دۆخی کەسایەتییەك کە لە جیهانی خەیاڵی خۆیەوە بەرەو جیهانێکی تر کۆچ دەکات، لەبەرچاو بگرن. ئەگەر کەسێتی پلاسنیف بگوێزرێتەوە بۆ چیرۆکی "قاپی زێڕین" کەسێتییەکە دەڕووخێ، گوناهی نەبەخشراوی نووسەرێ دەگەڕێتەوە بۆ ناکارمە بوونی لە گەیشتن بە یەکدەستی و سەقامگیریی لە شێوەی دەربڕیندا."

جیهانی رۆماننووس کە هەمان نموونەی بونیادی یان ئۆرگانیزمانەیە و بریتیە لە *Pilot*، کەسێتیەکان، شوێن و کات، جیهان بینی و "شێوەی دەربڕین و ستایل" و ئەمانە هەمان ئەو شتانەن کە ئێمە لە کاتی هەڵسەنگاندنی رۆمان لەگەڵ پێوەرەکانی ژیان یان ناسینی لایەنە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیەکان، دەبێ بە وردی لێیان بکۆڵینەوە. گرنگی بەراوردکردنی بەرهەم لەگەڵ ژیان یان "واقیع" کە بە بەراورد کردنی راستی و دروستی وردەکاریەکانی دەردەکەوێ، شتێ نییە جگە لە دادوەری کردن دەربارەی لایەنە ئەخلاقیەکانی. بۆ وێنە دەکرێ

ئاماژە بدرێ بە سیستەمی سانسۆری شاری بۆستۆن کە ڕۆمانێك لەبەر لابردنی وشە سێکسیەکان یان وشە کفرئاوییەکان بە وردی دەپشکێنن. لە بەراورد بەو جیهانەی کە تێیدایین و ئەزموونی دەکەین، بەردەوام دەخوازین ڕەخنە لە جیهانی ناواقیعی چیرۆك بگرین، چونکە ئاڵۆزیەکان و تێك چڕژاوی جیهانی ئێمە کەمترە لە جیهانی ڕۆماننووس. ئێمە بە چیرۆکنووسەکان دەڵێین "گەورە" ئەگەر جیهانی ئەو هەڵگری هەموو ئەو هۆکارانە بێت کە ئێمە بۆ ڕوانگە و باوەڕی خۆمان بە پێویستی دەزانین، هەرچەند ئەو جیهانە جیاواز بێت لەگەڵ پێوەرەکانی ئێمەدا. تەنانەت ئەگەر ئەم ڕوانگەیەش بەرتەسك بێت، بەڵام بە مەبەستی قووڵبوونەوە و بە سەنتەر کردنی هۆکارەکانی سەرەوە گرنگی هەیە. ڕێز گرتن لە چیرۆکنووس، گرێ دراوە بە پێوەرەکان و چۆنیەتی دەربڕینیان کە لە دیدی ئێمەدا وەك ڕوانگەی مرۆڤێکی کامڵ دەردەکەون.

بە بەکاربردنی وشەی "دنیا" مانایەکی گشتیتر لە جیهان بە زەینی ئینساندا دێت. بەڵام زاراوەی "ئەدەبی گێڕانەوە" یان باشتر بڵێم "گێڕانەوە" زیاتر سەرنجمان بۆ ڕۆمان و بەردەوام بوونی ڕادەکێشێ. چیرۆك *(Story)* لە وشەی *(History)*ەوە وەرگیراوە. ئەم باسە لە کتێبی "بەڵگە مێژووییەکانی بارست شایر[2]"دا باس کراوە. ئەدەبیات بە زۆری بە هونەری کات (جیاواز لە شێوەکاری، پەیکەرسازی و...) دەژمێردرێ. شیعری مودێرن هەوڵیان ئەوەیە لە وەستانی بیرمەندانە کە هەمان "ڕەنگدانەوەی دەروونی خۆیان"ە، دوور بکەونەوە، بەڵام وەك جۆزێف فرانك دەڵێت هونەری ڕۆماننووسی مودێرن (ئیۆلین، نایت ڤوود، خاتوو دال ڤی) لە هەوڵی دووبارە نواندنی دەروونی شاعیرانەدان. "دووبارە نواندنی خود" ئەم پرسە سەرنجمان بەرەو پرسێکی گرنگی کلتووری ڕادەکێشێ. چیرۆکە کۆنەکان یان چیرۆکە حەماسیەکان و ڕۆمان لە زەمانێکی دیاریکراودا ڕوو دەدەن. لە ڕابردوودا، زەمانی باو بۆ ڕووداوە حەماسیەکان، ساڵێك بوو. لە بەشێکی زۆر لە ڕۆمانە گەورەکاندا، مرۆڤەکان لەدایك دەبن. تەنانەت دەرخەری گۆڕانێکی گەورەی کۆمەڵایەتین (وەك ڕۆمانەکانی فورسایت ساگا و شەڕ و ئاشتی) یان ئەوەیە سووڕی ژیانی بنەماڵەیی پێشکەوتن بە خۆیەوە دەبینێ یان تووشی وەستاوی و شکست دەبێ (وەك ڕۆمانی بادن برۆکس[3]). ڕۆمان دەبێ لایەنی کات زۆر بە هەند وەربگرێ.

لەو ڕۆمانانەدا کە کەسایەتیەکانی کەسانێکی بەرەڵا و تەمەڵن، بەردەوامی ڕۆمان بەشێوەیەکی هێڵیە، واتە یەکەم جار ڕووداوێ ڕوودەدات، دواتر ڕووداوێکی تر. هەرکام لە ڕووداوەکان لە ڕاستیدا دەکرێ حەکایەت و چیرۆکێکی جیاواز بێت، کە لە ڕێگای پاڵەوانی چیرۆکەوە پێکەوە گرێ دەدرێن. ئەو ڕۆمانانەی کە لایەنی فەلسەفیان هەیە، دەپەرژێنە سەر هۆکار و هۆکردەکانی (علت و معلول) ڕووداوەکان. ئەم چەشنە ڕۆمانانە دەریدەخەن کەسایەتییەکان لە ماوەیەکی زەمانیدا و لە ژێر کاریگەری ڕووداوەکان، ناحەز و خراپتر، یان ئەوەی کە تووشی گۆڕان دەبن. ئەگەری ئەوە هەیە لە گەڵاڵەی چیرۆکدا، لەبەر تێپەڕ بوونی زەمان، ڕووداوێکی زۆر گرینگ ڕوو بدات. بارودۆخی سەرەتای چیرۆك لەگەڵ ڕووداوە کۆتاییەکاندا بە تەواوی جیاوازن.

بۆ دەربڕینی چیرۆکێ، نووسەر دەبێ بیر لە چۆنییەتی ڕوودانی ڕووداوەکان بکاتەوە نەك ئەنجامەکانی. هەردەم خوێنەرێ بووە یان دەبێ کە بپەرژێتە سەر (چۆنییەتی شکڵ گرتن)ی چیرۆك. بەڵام خوێنەرێ کە تەنها ئەنجام و کۆتایی ڕۆمانە ناودارەکانی سەدەی نۆزدەهەم

پەسەند دەکات، بێگومان خوێنەرێکی باشی چیرۆك نیە، چونکە چیرۆك (رەوت)ێکە، رەوتێك لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی. فەیلەسووف و ئەخلاق گەراکانی وەك رالف.و.ئێمرسۆن وادیارە، رووداني رووداوێکی رووت، رووداوێکی دەرەکی یان رووداوێ لە درێژەی زەماندا، بە دیاردەیەکی ناواقیع دەزانن. ئەوان هێنانی مێژوو لە رۆماندا بە بابەتێکی راست نازانن. ئەوان پێیان وایە مێژوو، دەرکەوتەی ئاشکرای خودی راستیەکانە لە رەوتی رۆماندا. لەحاڵێکدا رۆمان وەسفی گێرانەوەی مێژووییەکی خەیاڵاوییە.

دەبێ وشەی "رەوایی" شی بکرێتەوە، چونکە ئەم سیفەتە بۆ چیرۆکە خەیاڵییەکان بەکار دەبرێت و جیاوازیەکانی چیرۆکی بونیادگەرا لەگەڵ وتەزای شانۆ دەخاتە روو. دەتوانین چیرۆك بەپێی جوولە شانۆییەکان بگێرینەوە، یان لەلایەن یەکێك، نەقاڵەکانی[4] چیرۆکە حەماسیەکان بۆ دیتران بوترێتەوە. شاعیرێکی حەماسیش چیرۆکەکەی لە زمان یەکەم کەسی تاکەوە دەگێرێتەوە و دەتوانێ وەك جان میلۆت حاڵەتێکی لیریکی پێ ببەخشێ. رۆماننووسەکانی سەدەی نۆزدەهەم هەرچەند لە یەکەم کەسی تاك کەڵکیان وەرنەدەگرت، بەڵام کەڵکیان لە ئەنجامە حەماسیەکانی لێکدانەوە و تەفسیر و گشتێتی خوازی، بابەت، واتە ئەو شتەی بە "وتارگەرایی" ناویان لێ دەبرد وەردەگرت. بەڵام دەرکەوتەی سەرەکی "رۆمان" لە گشتگیر بوونیدایە: دیمەنەکان بە یارمەتی ئاخاوتن (کە دەتوانرێ نمایش بکرێت) و وێرای وردەکاریە بچووکەکان لەوەی خەریکە روودەدات لە چیرۆکدا جێ دەگرنەوە.

لە ئەدەبی ئینگلیزیدا دوو جۆر گێرانەوە هەیە کە بریتین لە "رۆمان" و "رۆمانس". کلارا ریۆ ساڵی 1785 بەم شێوە پێناسەیان دەکات:

"رۆمان وێنایەکە لە ژیانی راستەقینە. لە دۆخەکانی و هەروەها ئەو سەردەمانە کە بەرهەم، تێیدا نووسراوە. رۆمانس بە زمانێکی سادە شتێك دەگێرێتەوە کە هیچ کات روو نادات و ئەگەری رووداانیشی نیە."

"رۆمانس، واقیعیە. رۆمانس بەرهەمێکی شاعیرانە یان حەماسیە کە دەبێ وەك "ئوستوورەکان" ناوی لێببەین. ئان رادکلیف، سێر والتر سکات و ناتانیل هاوسۆرن نووسەری رۆمانسن. فانی بێرنی، جین ئۆستین، ئانتۆنی ترالۆپ و جۆرج گیسینگ بە رۆماننووس دەژمێردرێن. ئەم دوو شێوە گێرانەوە گرنگە لە راستیدا لە "نەسری رەوایی"ەوە سەرچاوەیان گرتووە: رۆمان، رەگەکەی لە شێوە نووسینی ئەدەبیەکان و ئەو گێرانەوانەدایە کە خەیاڵاوی نین، شێوەگەلێکی وەك نامە نووسین، رۆژنامەنووسی، ئۆتۆبیۆگرافی، بیۆگرافی نووسین یان مێژوو و مێژوو نووسین. رۆمان هەموو ئەم شێوازانە تێپەر دەکات بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی بێ بەڵگە قسەکەی دەربڕێ. لە باری فۆرمەوە جەخت دەکاتەوە لەسەر دەربڕینی وردی (رووداوەکان). لە لایەکی ترەوە رۆمانس وەك درێژەدەری وتەزا حەماسیەکان و درێژەدەری "رۆمانس"ی سەدەکانی ناوەڕاست، رەنگە کەمتەرخەم بێت بەوەی وردەکاریەکان وەك خۆی (بۆ وێنە ئافراندنی دووبارەی ئاخاوتنێکی تاکەکەسی بەشێوەی دیالۆگ) بخاتە روو. روو بکاتە راستیەکی سەرتر و دەروونناسییەکی قووڵتر. وەك ئەوەی هاوسۆرن دەڵێت: "کە نووسەرێ بە بەرهەمەکەی خۆی دەڵێ رۆمانس زۆر کەم دەتوانێ ئیدیعایەکی ببێ لەسەر ستایل و بابەتێتی (موضوعیت) بەرهەمەکەی...". ئەگەر وەها رۆمانسێ سەر بە رابردوو بێت، بڕیار نیە کە ئەو رابردووە بە وردەکاریەکانیەوە بە وێنا بکێشێ، بەڵکوو رێگای دروست- وەك ئەوەی هاوسۆرن لە

شـوێنێکی تـر باسـی دەکـات- ئەوەیـە دەبـێ "هـەڵگری جـۆرێ دەربڕینـی شـاعیرانە... و بەرتەسك بێت و جەخت بکاتەوە لەسەر واقیع گەرایی رووت".

رەخنـەی راڤـەیی رۆمـان بـە زۆری سـێ هۆکـاری بنـەڕەتی لـە بونیـادی رۆمـان جیـا دەکاتـەوە: *Pilot*، کاراکتـەر و بەسـتێن (کـات و شـوێن). دوایـین هۆکـار لـە هەنـدێ لـە تیۆریـە ئەدەبیـە نوێکانـدا بـە شـێوەی سـیمبۆلیك بـە "فـەزا" یـان "دۆخ" ناوەکـەی گـۆڕاوە. پێویـست بە وتن ناکات کە هەرکام لەم هۆکارە بونیادیانە پێشتر لە لایەن کەسانی ترەوە ناسراون: هێنری جیمز لـە وتارەکەیـدا "هونـەری چیرۆکنووسـین" دەپرسێ: "مەگەر مانای کاراکتـەر شتێکە جگە لە دوا ئامانجی رووداو؟ مەگەر رووداو جیاوازە لە بەوێنا کێشانی کاراکتەر؟"

بە بونیادی گێڕانەوەیی شانۆنامە، حەکایەت یـان رۆمـان دەوتـرێ "گەڵاڵـە" یـان (*Pilot*) و رەنگـە ئـەم زاراوەیـە بپـارێزرێ. بـەڵام دەبـێ بـە ماناگـەلێکی بـەربڵاوتر بـەکارببرێ بـۆ ئـەوەی بەرهەمـەکانی چیخۆف، فلۆبێر، هێنـری جیمـز، ویکلـی کالینـد و ئادگـار ئـالن پـۆش بگرێتـەوە: نابێ بەرتەسك بکرێتـەوە بە گەڵاڵەیەکی بچووك وەك چیرۆکی "کالـب ویلیـامز" بەرهـەمی ویلیـام گۆدوین. ئێمە باس لە "گەڵاڵە"کانی سادەتر و ئاڵۆزتر، رۆمانتیك یان راستەقینە دەکەین. لەم سـەردەمی گواسـتنەوە و گۆڕانـەدا، رەنگـە رۆمـاننووس لـە هـەردوو شـێوازەکە کـەڵك وەربگـرێ، لـە حاڵێکـدا تەمـەنی یـەکیان بەسـەر چـووبێ. رۆمانـەکانی هاوسـۆرن دوای "داخـی سەرشۆڕی" وادیارە "گەڵاڵەیەکی" کرچوکاڵ و ئـاڵۆز و کۆنیـان هەیـە. ئەمـە لـە حاڵێکدایـە "گەڵاڵـە"کـان هەرچـەند بـە بنەڕەتـدا سـادەترن بـەڵام فرەچەشنیەکی "ریالیستی" زیاتر کـەڵك وەردەگرن. چارلز دیکنز لە دوایین رۆمانەکانیدا بەشێوەیەکی وریایانە و لە رووی زانستەوە روو دێنێتـە "گەڵاڵـە"ی ئـاڵۆز کـە رەنگـە لەگـەڵ نـاوەرۆکی راستەقینە و ناوەنـدی رۆمانـدا یـەك نەگرنەوە. بەشی سێهەمی رۆمانی "هاك فین" بە بەراورد بە بەشەکانی تری کتێب رەوتێکی روو لە نزمی هەیە و وادیارە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هـەوڵی رۆماننووس بۆ خولقانـدنی شـێوەیەکی تایبـەت لـە "گەڵاڵـە". "گەڵاڵـە" راسـتەقینەکەی سـەرەتا بـە شـێوەیەکی سـەرکەوتووانە دەڕواتـە پـێش و حاڵـەتێکی ئوسـتوورەیی هەیـە، چـوار هـەڵاتوو کە لەبەر هۆکاری جۆراوجۆر کۆمـەڵگا بەجێـدێڵن لـە بەلەمێکـدا یـەك دەگرنـەوە و بـەو بەلەمە لە چۆمێك دەپەڕنەوە. ئەم بابەتە یـەکێك لە کۆنترین و پەرگیرترین "گەڵاڵەکانی" چیرۆکی سەفەرە لە دەریا و وشکانی. لە بەرهەمگەلێکی وەك هاك فین، موبی دیك، سەفەری عیبادەتکەر، دۆن کیشۆت و هێشووی تووڕەییدا ئەم چەشنە گەڵاڵانە دەبینرێ. زۆربەی کات دەبێ هەموو ئەو "گەڵاڵانە" بدەینە بەر باس کە باس لە بابەتی ناکۆك دەکەن (مرۆڤ لە بەرامبەر سروشتدا، مرۆڤ لە بەرامبەر مرۆڤدا، مرۆڤ لە شەڕ لەگەڵ خۆیدا). بـەڵام پێویـست ناکـات -وەك گەڵاڵـە- "نـاکۆکی"ش بـە شـێوەی گـشتیتر بدەینـە بـەر بـاس. "نـاکۆکی" وتەزایـەکی "دراماتیکـە" و هۆکارە دژ بە یەکەکان کە زۆربەی کات هێزێکی یەکسانیان هەیـە، دەخاتـە بەرامبـەر یـەکترەوە، دەپەرژێتـە سـەر کـردار و پەرچـەکرداری پووچەڵکەر. بەمەشەوە، هەن ئەو گەڵاڵانەی کە بە شێوەیەکی کورت و لە شوێنی خۆیدا باسیان لێبکرێ وەك گەڵاڵەی تایبـەت بـە شـوێن کـەوتنی یاسایی یان نایاسایی کە لە رۆمانەکانی کالب ویلیـامز، داخـی سەرشـۆڕی، تـاوان و سـزا یـان دادگایی کافکادا بوونیان هەیە.

*Pilot* (یـان بونیـادی گێڕانـەوەی چیرۆك) لـە بونیـادی بـچووکتر (ئیپیـزۆد، رووداو) پێـك هـاتووە. ئـەو گەڵاڵانـەی کـە لـە بونیـادی بـەربڵاوترو گـشتیتر پێـك هـاتوون (تراژیـدی،

شيعرى حەماسى، رۆمان) لە پرۆسە مێژوويیەكاندا لە شكڵە سادەكانى جۆك، شۆخى، وتە نەستەقەكان، چيرۆكە راستەقينەكان، ناوەرۆكى نامە كۆنەكانەوە وەرگيراون. گەڵاڵەى شانۆنامە يان رۆمان (بونيادێكە لە بونيادە جياوازەكان).

فۆرماليستە رووسيەكان و فۆرم خوازى ئاڵمانى ويليام ديبيلوس وشەى "هاندەر" بە وشەيەكى گونجاو دەزانێ بۆ سەرجەم پاژەكانى گەڵاڵەى رۆمان. وشەى "هاندەر" كە لەلايەن مێژوونووسەكانەوە بەكاردەبرێ، لە بنەمادا لە زمانى فۆلكلۆريستە فەنلاندييەكان وەرگيراوە كە دەستيان دەدايە شيتەڵ كردن و لێكدانەوەى چيرۆكە فۆلكلۆريى و ئەفسانەييەكان. بەشێ لە بەرهەمە نووسراوەكانى ئەدەبيات دەپەرژێنە سەر بابەتى "هەڵە لە شوناسى مرۆڤدا" (كۆميدياى هەڵەكان). زەماوەندى لاو لەگەڵ پيردا (ژانويە و مەى) ئەمەگناسى كچەكان بەرامبەر بە باوكيان (شالير، باوە گۆريۆ) گەڕانى كوڕ بۆ دۆزينەوەى باوكى (ئۆليس و ئۆديسە).

ئەوەى كە ئێمە پێى دەڵێين نووسينى رۆمان، ئاڵمانى و رووسيەكان پێى دەڵێن "هاندەر"ى رۆمان نووسين. رەنگە زاراوەى ***Composition*** لەبەر مانا دوانەيەكەى هاتبێتە زمانى ئينگليزيەوە كە هەم بە ماناى نووسينى چيرۆكى ميتۆدمەند دێ، هەم بە ماناى تێمى دەروونناسى كۆمەلايەتى يان تيۆرى فەلسەفى رەفتارە مرۆڤانەكان كە پێى دەوترێ تيۆرى هۆكرد (عليت).

سێر والتر سكات دەڵێ:

جياوازى نێوان چيرۆكى راستەقينە و خەياڵى لەوەدايە كە چيرۆكى راستەقينە بە شێوەيەكى ئاڵۆز پێوەندى نێوان هۆكارەكانى رووداو دەخاتە روو، لەحاڵێكدا لە چيرۆكى خەياڵيدا ئەوە ئەركى نووسەرە وەلامدەرەوەى هەموو شتەكان بێت.

پێكهاتە و سەرنج راكێشى (بە مانا بەربلاوەكەى) رۆمان گرێ دراوە بە شێوەى گێڕانەوە: هەڵسەنگاندنى "رووداو" بردنە پێشى چيرۆك و ئامرازى پێويست كە هاوسەنگى و هاوئاهەنگى ديمەنەكان يان رووداوى شانۆيى بۆ خستنە روو يان گێڕانەوەى راستەوخۆ يان هەردووكيان بۆ كورت بێژى (ئيجان) و ريزى رووداوەكان دەگرێتەوە. هاندەرەكان و توخمە پێويستيەكانى چيرۆك، كارەكتەرى تايبەت بە خۆيان دەخولقێنن. رۆمانسى گوتيك[5] هەڵگرى ئەم تايبەتمەنديەيە، رۆمانى واقيع گەراش هەروا. ديبليوس بە شێوەى بەردەوام "رياليسمى" چارلز ديكنز بە وتەزايەكى دوور لە واقيع دەزانێ و بە رۆمانى واقيع گەراى ناو لێ نابات، بەڵكوو باس لەوە دەكات كە توخمەكانى سەر بە هاندەرەكانى ميلۆدراماى كۆنن: پياوێ كە بە مردوو وێنا دەكرێ، هەمديسان دەگەڕێتەوە بۆ جيهانى زيندووەكان، منداڵێ سەرەنجام باوكى دەدۆزێتەوە، يان پياوێكى بەخشندە و دەست ئاوەڵا بە جينايەتكار دەردەچێ. لە بەرهەمێكى ئەدەبى_هونەريدا "هاندەر" دەبێ پەرە بە هەڵهێنجان لە واقيع بدات و پێوەرى جوانى ناسى بەرهەم ئەمەيە. هاندەرى "راستەقينە"ش بە توخمێكى جوانيناسى دەژمێردرێ. ئەم تايبەتمەنديە تەنانەت لە هونەردا، گرنگيەكى زۆرترى هەيە.

فۆرماليستە رووسيەكان "فەبل[6] ***(Fable)*** " بە دواى يەكداهاتنى كۆمەڵێ رووداوى بە رێكەوت و كاتى دەزانن كە چيرۆكەكەى لە "بابەت"ەوە سەرچاوە دەگرێ و رەنگە بكرێ بە "بونيادى گێڕانەوە" لە قەڵەم بدرێ. (فەبل) كۆيەكە لە هەموو هاندەرەكان، لەحاڵێكدا "بابەت" بە ماناى بەدەستەوەدانى بە ئەنقەست و هونەرمەندانەى هاندەرەكان دێت (زۆربەى كاتيش جياوازە). لەو بەرهەمانەى كە

بەم شێوەیە نووسراوە، بە دوای یەکدا هاتنی ڕووداوەکان بەپێی ستایلی بەرهەم دەگۆڕدرێ: دەستپێکردنی چیرۆك لە ناوەڕاستەوە، وەك "ئۆدیسە" و "بارنابای رووج"[7]، یان ڕەوتی بزووتنی ڕووداو بەرەو پێش و دواوە وەك ڕۆمانی "ئابسالوم، ئابسالوم"ی ویلیام فاکنەر. ڕۆمانێکی تری فاکنەر "وەك ئەوەی خەریکم دەمرم" لە لایەن تاکەکانی بنەماڵەوە کە خەریکن تەرمی دایکیان بەرەو گۆڕستان دەبەن، بە نۆبە دەگێڕدرێتەوە. (فەبل) هەڵهێنجانێکی زەینییە لە "کەرەسە سەرەتاییەکان"ی چیرۆك (ئەزموونە تاکەکەسییەکان و خوێندنەوەکانی نووسەر و...) یان باشتر بڵێین ڕامانێکی وردتر لە ڕوانگەی گێڕانەوەدا.

کات لە فەبلدا پێوەندی هەیە لەگەڵ ڕەوتی کاتی چیرۆك، لە حاڵێکدا لە ڕۆماندا کات بە پێی دەڕواتە پێش. هاوئاهەنگی هەیە لەگەڵ ماوەی خوێندنەوە و "کاتی سەرەکی ئەزموون" و لە لایەن ڕۆماننووسەوە کۆنترۆڵ دەکرێ. ڕەنگە بە چەند ڕستە ڕووداوەکانی چەند ساڵ بێنێتە نووسین، بەڵام دوو بەشی درێژی ڕۆمانەکە تەرخان بکات بۆ سەما یان میوانیەك.

سادەترین شێوەی هێنانی کاراکتەر، ناولێنانیەتی. هەر چەشنە "ناولێنانێك" لە ڕاستیدا، چەشنێکە لە گیان بەخشین و فەردیەت دان بە کەسێك. ناولێنانی توانجیانە و کۆددار تایبەتە بە کۆمیدیەکانی سەدەی هەژدەیەم. کارەکتەرەکانی هێنری فیلدینگ بە ناوەکانی ئال ڤۆرسی، تواکیوم، ویت ڤوود، خاتوو مال پراپ، سێر بینجامین باخ بایت، بە کاریگەری لە بەرهەمەکانی بێن جانسۆن، جان بۆنیان و ئیدمۆند سپێنسێر و زۆر کەسی تردا خولقێندراون. ئەزموونی وشیارانەتر لە ناولێنانەدا بەپێی تۆن ومانا تایبەتیەکانە. ڕۆماننووسانێکی وەك دیکنز، هێنری جیمز، بالزاك و گوگول لەم کارەدا زۆر سەرکەوتوون. ئەوان ناوی تایبەتیان دەنا لە کارەکتەرەکانیان: پکس نیف، پامبل چووك، ڕۆزا داراتل (تێکەڵێکە لە "دارات" بەمانای تیری فڕێ دراوو "ستارتل" بە مانای فڕێ دان و بازدان)، ئاغا و خاتوو مێردێرتۆن (مێردێر بە مانای تاوان + ستۆنی هارت بە مانای دڵڕەق). کارەکتەرەکانی هێرمان ملویل بە ناوەکانی ئاهب و ئیشمایل پێمان دەڵێن لە ئەدەبیاتدا جێگا بۆ زۆر کار هەیە و دەکرێ زۆر کار بکرێت. لێرەدا کەڵك لە "ئینجیل" وەرگیراوە بۆ ناولێنانی کارەکتەرەکان.

شێوەکانی خولقانی کارەکتەر، جیاواز و زۆرن. ڕۆماننووسە کۆنەکان وەك سێروالتر سکات کەسێتی چیرۆکەکەیان لە پەڕەگرافێکدا بە خستنە ڕووی چۆنیەتی باری جەستەیی، ئەخلاقی و دەروونیەکانی شی دەکەنەوە. بەڵام ئەم شێوە ڕەنگە دابەزێ تا ئاستی نازناو یان ناو لێنانێك، نازناو یان ناو لێنانیش ڕەنگە بگۆڕدرێ بۆ شێوەیەك جووڵە و دەرکەوتنی پانتۆمیم وەك حاڵەت، فیگۆر و قسە کردن. لە بەرهەمەکانی دیکنزدا هەرکە کارەکتەرێ دەردەکەوێ، وەها حاڵەتێك و پێناسە و مۆرکێك بەکار دەبرێ. خاتوو گاهیچ "هەردەم بیر لە کەسێك دەکاتەوە کە لە هەمووان پیرترە". یووریاهیپ بە زۆری وشەی "ئامبل" وەك وشەیەك کە لەسەر زاریەتی بەردەوام بەکار دەهێنێ و دەستەکانی بەشێوەیەکی تایبەت دەجووڵێنێ. هاورسۆنە دەستکرد و دەرەوشاوەکانی وێسترڤۆلت، هێنری جیمز لە ڕۆمانی "قاپی زێڕین"دا کەسێتیەکی هەیە کە لە کاتی دیتنی کارەکتەرەکانی تردا لە زاراوەی سیمبولیك کەڵك وەردەگرێ.

کارەکتەرەکان ڕەنگە نەگۆڕ یان بەردەوام لە جووڵە و گۆڕاندا بن. چەشنی بەردەوام لە گۆڕان بوون لە ڕۆمانی "شەڕ و ئاشتی"دا دەبینین.

ئـەم شـێوە کارەکتــەرە لەبــەر گــۆڕانی لەگــەڵ کـات زۆر گونجـاو نیـە بـۆ شـانۆ ببرێتـە کـار. لـە شـانۆدا (بـۆ وێنـە کارەکـانی ئیبسن[8]) شـێوەی خولقــان و کەســێتی بەخــشین بــە کارەکتـــەر شــێوەیەکی بەرەبەرەییـــە[9]. ڕۆمـــان دەتوانـــێ شـێوەی گـۆڕانی کارەکتـەر بـە وێنـا بکێـشێ، کارەکتـەری (فێلـت) "سـادە و یـەک لایەنـە" تـا ڕادەیـــەک ئـــەوە دەخاتـــە ڕوو کـــە نـــەگۆڕە و کەسێتیەکی تایبەتی هەیە. ئەم کارەکتەرە یـەک ڕووە. هـــەر ئـــەم ســـادە بوونـــەی پێناســـەی جـۆرێکی دیـاریکراو و زەق لـە پێرسـۆناژەکانی کۆمەڵـــە. کارەکتـــەری لـــەم چەشـــنە ڕەنگـــە کاریکـــاتۆر یـــان هـــەڵهێنجانێکی زەینـــی و ئیدیالیستی بن. لە شانۆی کلاسیکدا (بۆ وێنـە بەرهەمەکانی ڕاسین) کارەکتەری سەرەکی، وەها تایبەتمەندیـــەکی هەیـــە. کارەکتـــەرە بـــزۆز (گـشتی و چـەن لایەنـە) وەک هـەر کەسـێتیەکی بــزۆز و لــە گــۆڕان پێویــستیان بــە جــەخت کردنـەوەی شـوێن کـاتێکی زۆرتـر هەیـە. ئـەم کەسێتیە زۆربەی کات سەرنجی بگێڕەوە بۆ لای خــۆی ڕادەکێــشێ. بەمەشــەوە زۆربــەی جــار پێوەنـدی دەبـێ لەگـەڵ ڕەفتـار و کارەکتـەری (فێلـت) و کەسـەکانی تـر و تەنانـەت ئەنـدامانی گرووپی کوڕ (لە شانۆی ـــم)).

پێوەندیـەکی ئاشـکرا و ڕوون هەیـە لـە نێـوان خولقـــانی کارەکتـــەر (بەشـــێوەی ئـــەدەبی) و کارەکتەرناسـی. تیـپ ناسـی کارەکتـەرەکان کـە بەشـــێکیان بـــە شـــێوەکانی بـــاوی ئـــەدەبی و بەشـــێکی تریـــان گرێـــدراون بـــە لێکۆڵینـــەوە خەڵکناســـیەکانەوە لـــە ڕۆمانـــدا کـــەڵکیان لێ وەردەگـیردرێ. لـە ئـەدەبی گێڕانـەوەی سـەدەی نـۆزدەی ئـەمریکا و بـەریتانیادا ئێمـە لەگـەڵ ژنـانو پیـاوانێکی سـپی پێـست و مـوو ڕەش (هیس کلیف، ئاغای ڕووچستەر، بێکی شارپ، مەگی تۆلیۆر، زینووبیا، میریام، لێ جیا) و کاڵ (ژنـانێکی وەک ئامیلیـا سـێرلی، لووسـی دیـن، هیلـدا، پریـسلا،فووب لێـدی ڕوونـا) ڕووبـەڕوو دەبینـەوە. ژنـانی کـاڵی کابـان، ئـارام بـەڵام بـە سـەقام و لـە دڵـەوە نـزیکن. ژنـانی مـوو ڕەش، نـا ئارام، تووڕە و پڕ نهێنـی، سـەرنج ڕاکێش و لـە هــەمان حاڵــدا بــاوەڕ پێنــەکراون. لــە ڕوانگــەی ئانگلۆساکـسۆنیەوە، ئـەم تایبەتمەندیانـە لـە کارەکتـەرە ڕۆژهـەڵاتی، جوولەکـە و سپانیایی و ئیتالیاییەکاندا دەبیندرێ.

ڕۆمـــان وەک شـــانۆ لەبـــەر فرەچەشـــنی و جۆراوجۆر بوونی، ژمارەیەکی زۆر کارەکتـەرمان پـێ دەناسـێنێ و لەگـەڵ قارەمـانی ژن و پیـاو، کارەکتـــەری خـــراپ و پێرســـۆناژی دیـــاریکراو (هـــەروەها کارەکتـــەری پێکـــەنین هێنـــەر یـــان کۆمێدی) ڕووبەڕووین. ئەم پێرسۆناژانە بـریتین لە لاوەکان یان کەسانی پیر و سادە وەک دایک و باوک، پووری زەماوەند نەکردوو، ژنێکی پیر کـە ســـەرقاڵی پـــەروەردەکردنی کـــچەکانە و... . هونەری شانۆ لە دەورانی دەسەڵاتداریێتی زمانی لاتینـــدا (بەرهەمگـــەلێکی وەک پلۆتـــووس و ترێنس، کۆمێدیی دلارتـە، جانسۆن و مـوولێر) لە تیپـە دیـاریکراو و باوەکـانی سـەردەمی خـۆی وەک "ســـەربازی درۆزن و خـــۆ بـــە زل زان" باوکێکی ڕەزیل و مشت قووچاو و خزمـەتکاری ئـــازا، کـــەڵکی وەردەگـــرت. بـــەڵام گـــەورە ڕۆماننووســـانی وەک دیکنـــز، تیپـــی کەســـێتی شـــانۆنامە و ڕۆمانـــەکانی ســـەدەی هەژدەیـــەم پەسەند دەکا و لە بەرهەمەکانی خۆیدا کـەڵکیان لێ وەردەگرێت. ئەو دوو تیپ کارەکتـەر بـە ئێمـە دەناسـێنێ: تـاقمێکی گـەنج و بێخانـە و لانـە و کەسـانێکی ڕۆیـایی و خەیاڵپڵاوکـەر (وەک تـام نیچ لە ڕۆمانی چازلویت[10]).

بـــــەپێی پێـــــوەرە خەڵکناســـــی و کۆمەڵایەتیـــەکانی تایبـــەت بـــە تیـــپ ناســـی کارەکتـــەرەکان و وەک ئـــەوەی دەربـــارەی ژنـــانی کاڵ و موو ڕەش ئاماژەی پێدرا، ئۆلگووە دیار و کاریگـــەرەکانی هـــەردوو تیپەکـــە، لـــە ڕۆمانـــدا

کەڵکی لێ وەردەگیردرێ کە بە بێ کەڵك وەرگرتن لە راستیە دیکۆمێنتیەکان، بە ئێمە ناسێندراون. ئەم کارەکتەرانە بە زۆری رەگەکەیان لە باو و باپیرە مێژووییە ئەدەبییەکانی کۆن و قارەمانانی دڵرەش و شەیتانی -وەك ژنانی فێڵباز- دایە کە ماریۆ پراز لە کتێبی "ئازاری رۆمانتیك"دا ئاماژەی پێدەدا.

لەبەرچاو گرتنی شوێن و کات (بەستێن) وەك پێوەری ئەدەبی بۆ وەسفی رووداوە تایبەتەکانی بەرهەم، یەکەم روانین جیاوازی نێوان چیرۆك و شانۆ دەخاتە روو. بەڵام دواتر ئەم بەراوردکردنە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە مێژووییەکان. بۆ لەبەرچاو گرتنی کات و شوێنی رۆمان یان شانۆ دەبێ سەرەتا لەوە بگەین کە ئاخۆ بەرهەمی مەبەست، رۆمانتیکە یان ریالیست (ئەدەبیاتی سەدەی نۆزدەهەم)، یان ئەوەی ستایلێکی گشتی و جیهانگیر دەگرێتەوە. لە شانۆدا ئەگەری ئەوە هەیە (بەستێن) لە رێگای دەربڕینی زارەکی (بەرهەمەکانی شکسپیر) یان بە کەڵك وەرگرتن لە فەرمانی شانۆ بۆ دیکۆراسۆرەکان دەرك بکرێ. هەندێ لە دیمەنە شانۆییەکانی شکسپیر ناکرێ سەر بە شوێنێکی تایبەت بزانرێن. بەڵام وەسفی بەستێن (کات و شوێن) لە سنووری رۆماندا، زۆر فرەچەشن و جۆراوجۆرن. جین ئۆستین وەك فیلدینگ و سمۆڵت بەندەر دەپەرژێتە سەر وەسفی دۆخە ناوخۆیی یان دەرەکیەکان. هێنری جیمز لە یەکەم بەرهەمدا لە ژێر کاریگەری بالزاکدایە. خانوو و دیمەنەکانی شوێن بە وردەکاری تەواوەوەشی دەکاتەوە. بەڵام لە رۆمانەکانی تریدا تەنها لە رێگای دۆخە سیمبۆلیکەکانی دیمەنەوە، هەموو هەستی شاراوەی خۆی لەواندا دەردەبڕێ.

ئامانجی وەسفی رۆمانتیك، بونیادنان و خولقانی دۆخە. گەڵاڵە *(Pilot)* و کارەکتەر بە کەڵك وەرگرتن لە فەزای چیرۆك و رادەی کاریگەری وەرگرتن شکڵ دەگرن. لەم بارەوە دەکرێ ئاماژە بدەین بە بەرهەمەکانی ئان رادکلیف و ئێدگار ئالن پۆ. وەسفی ناتورالیستی، روانگەیەکی دیکۆمێنتیە بۆ واقیع کە کەوتۆتە ناو تۆرێ لە "ئیهام[11]"ەوە (بەرهەمەکانی دێفۆ، جاناتان سویفت، ئیمیل زۆلا).

بەستێن بە مانایەکی تر هەمان ژینگەیە. ژینگە دەتوانێ ئاماژە یان سیمایەکی خوازەیی بێت لە کارەکتەرەکان. خانووی مرۆڤێ، درێژەی ژیانی ئەوە، کە نووسەر وەسفی دەکات. لە راستیدا لەو رێگاوە بەشێك لە تایبەتمەندییەکانی کارەکتەر دەخاتە روو. وەسفی تەواوی بالزاك لە خانووی"گراندە"ی رەزیل و مشت قووچاو یان لێکدانەوەی تەواوی پانسیۆنی[12] "واکۆر" شتێکی لەخۆڕا نیە و ئەم شوێنانە تایبەتمەندیی خاوەنەکەیان دەخەنە روو. ئەو شوێنانە وەك شوێن کاتی چیرۆك کاریگەرییان هەیە لەسەر خاوەنەکەیان. ترسی بۆرژوازی بەرچاوتەنگ لە پانسیۆن، پەرچەکرداری ترسێنەری "راستیناك" و "واترین"ی لێ دەکەوێتەوە. لە هەمان حاڵدا سووك بوونی باوە گۆریۆ دژ بە گەورەیی و سەربەرزی بە وێنا دەکێشێ.

ئەگەری ئەوە هەیە "بەستێن" دەربڕی ئارەزووە مرۆڤانەکانە و ئەگەر (بەستێن) راستەقینە و ناتورالیستی بێت، وێنایەکی عەینیمان بۆ دەخاتە روو. هێنری فرێدریك ئامیل دەڵێ: "وەسفی دیمەن، لە راستیدا حاڵەتێکە لە زەینی مرۆڤ." پێوەندیەکی نزیك هەیە لە نێوان مرۆڤ و سروشتدا کە تەنها رۆمانتیکەکان دەرکی پێ دەکەن. پاڵەوانێکی تووڕە و تۆفانی لە ناو تۆفانە هێرشبەرەکانی ژیان دێتە دەر و دەبێ بە کارەکتەرێکی دڵپاك کە شەیدای دەروەشاوەیی و تیشکی خۆرە.

"بەستێن" دەکرێ وێنایەکی بە ئەنقەست و ژینگەیی بێت لەگەڵ هۆکردی فیزیکی یان کۆمەڵایەتی، ئەو شتەی کە تا رادەیەکی زۆر لە دەرەوەی ئیختیاری تاکەوەیە و ناتوانێ کۆنترۆڵی بە سەریەوە بێت. بەستێنی لەم چەشنە رەنگە لە کەسێتی ئێدگان هیت، یەکێك لە کارەکتەرەکانی تۆماس هاردی یان زنیت کارەکتەری "سێنکلایەر لوئیز" رەنگ بداتەوە. گەورە شارەکانی (پاریس، لەندەن، نیویۆرك) لە زۆربەی رۆمانە مودێرنەکاندا دەرخەری کەسێتی کارەکتەرەکانە.

چیرۆك دەکرێ لە رێگای نامە یان گۆڤارەوە بگێڕدرێتەوە و یان بەپێی حەکایەتێکی کورت و راستەقینە شکڵ بگرێ. چوارچێوە (دارێژگە)ی چیرۆك کە کۆمەڵێ چیرۆکی تر لەخۆ دەگرێ لە باری مێژووییەوە، پردێکە لە نێوان کورتە چیرۆك و رۆماندا. لە رۆمانی "دێکامرۆن"دا کورتە چیرۆکەکان بە لەبەرچاو گرتنی ناوەرۆکەکەیان پێکەوە بەکار هێنراون. "حەکایەتەکانی کانتێربۆری" لە ئاوێتە کردنی بابەت (زەماوەند) بە شێوەیەکی هەرە گەش لە رێگای بە کارەکتەر کردنی بگێڕەوە لە حەکایەتدا و ئامادەیی ئەو کارەکتەرانەی لە باری دەروونی و کۆمەڵایەتیەوە ناکۆکن، پێك هاتووە. ئەم چەشنە رۆمانە کە لە راستیدا حەکایەتی حەکایەتەکانی چەشنێ رۆمانتیك بوونیشی تێدایە، لەوانە "حەکایەتەکانی رێبواری" بەرهەمی "واشینگتن ئیرۆینگ" و "حەکایەتی برایانی سراپیۆن" بەرهەمی ئی.تی.ئەی، هافمەن. "مێکووتی وێڵ" وەك رۆمانێکی سەردەمی گۆتیك، بەرهەمێکی سەیر دیارە، چونکە نووسەر کۆمەڵێ حەکایەتی سەرنج راکێش و سەیر و جیاوازی تەنها لەبەر تۆقێنەر بوونیان بە شێوەیەکی پەرت و بڵاو پێکەوە هێناوە.

بەکارهێنانێکی تری کورتە چیرۆك کە چیتر ئەمڕۆکە بەکار نابرێ، هێنانیەتی لە رۆماندا (وەك حەکایەتی "پیاوێك لەسەر تەپۆڵکەکە" لە رۆمانی "تام جۆنز" و حەکایەتی "دانپێنانەکانی رۆحێکی جوان" لە رۆمانی ویلهێلم می شێر"). ئەم کارە بە ئاسانکاری بۆ پڕکردنەوەی قەبارەی بەرهەم و هەوڵدان بۆ چەشنێ داهێنان دەزانرێ. کۆتایی هێنان بە چیرۆك لە رۆمانی سێ لایەنی سەردەمی ویکتۆریا باشتر لە کۆتایی هاتنی ئەم دوو بەرهەمە خۆی دەرخست. لە رۆمانی ناوبراودا دوو یان سێ گەڵاڵە بە ریز دەڕۆنە پێشەوە (بە دەوری ناوەندێتی باب ترا) و لە کۆتاییدا پێکەوە گرێ دەدرێن. گەڵاڵە چەند لایەنەکان، لە سەر دەستی نووسەرەکانی سەردەمی ئیلیزابێتدا زۆربەی کات بە شێوەیەکی زۆر باش بەکار دەهێنران. گەڵاڵەیەك هاوکات و هاوئاهەنگ لەگەڵ گەڵاڵەیەکی تر (بۆ وێنە لە شالیردا) بە جووڵە دەردێ یان لە هەمان حاڵدا وەك هۆکارێکی "هێورکەر و کۆمیك" یان سەرقاڵکەر دەردەکەوێ. کەوابوو هەرکام لە گەڵاڵەکانی دەبێ بەهۆی زەق بوونەوەی گەڵاڵەکەی تر.

گێڕانەوەی چیرۆك لە زمانی یەکەم کەسی تاکەوە، شێوەیەکە بۆ هەڵسەنگاندنی تاك لە بەرامبەر ئەوانی تردا. لێرەدا نابێ بە هەڵە لامان وابێ بگێڕەوە خودی نووسەرە. گێڕانەوەی چیرۆك لە زمان یەکەم کەسی تاکەوە، ئامانج و کاریگەریی جیاوازی لێدەکەوێتەوە. هەندێ جار مەبەست لە هەڵبژاردنی ئەم چەشنە بگێڕەوە ئەوەیە کە لە تووڕەیی و دوگم بوونی بگێڕەوە کەم بکرێتەوە و لە چاو کارەکتەرەکانی تر "واقعیتر" بێتە بەرچاو (بۆ وێنە دەیوید کاپرفیلد). لە لایەکی ترەوە کارەکتەرەکانی تر وەك مۆل فلاندەر و هاك فین لە گێڕانەوەی چیرۆکەکانیاندا خۆیان دەوری بنچینەییان هەیە. لە چیرۆکی "ماڵی ئاشر" بەرهەمی ئێدگار

ئالن پۆ دا، بگێڕەوەی یەکەم کەسی تاك دەبێ بە هۆی ئەوەی خوێنەر خۆی لەگەڵ هاوڕێی بێ لایەنی "ئاشەر" نزیك ببینێ، بەڵام لە رووداوی کۆتاییدا، خۆی لەو بەدوور دەبینێ. بەڵام لە چیرۆکەکانی "لی جیا"، "بێرنیس"، "دڵی حەکایەت بێژ"، کارەکتەری سەرەکی چیرۆك، نەخۆشێکی دەروونیە و خۆی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە. بگێڕەوە کە ئێمە پێمان خۆش نیە هەست بە نزیکایەتی بکەین لەگەڵی، خەریکی دانپێدانانە و کەسێتی خۆی بەو شتەی کە دەری دەبڕێ و لەگەڵ چۆنیەتی دەربڕیندا، بۆ ئێمە دەخاتە روو.

بیچم گرتنی چیرۆك زۆر سەیرە. هەندێ لە چیرۆکەکان بەوپەڕی دژوارییەوە بیچمیان گرتووە (قەڵاکانی ئۆترانۆد، داخی سەرشۆڕی، جووڵەی پێچ). چیرۆك، بە تایبەتمەندی تایبەت بە خۆیەوە لە نووسەر و خوێنەرەکەی جیا دەبێتەوە. ئەم تایبەتمەندیە دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی نووسینی بەرهەم. شێوەی گێڕانەوەی چیرۆك جۆرێکە وەك ئەوەی کەسی دووهەم بۆ کەسی یەکەمی دەگێڕێتەوە یان کەسی دووهەم بۆ کەسی یەکەمی نووسیوە و لەودا رەنگە ژیانی تراژیکی کەسی سێهەم هاتبێتە نووسین. بگێڕەوە یەکەم کەسەکانی ئێدگار ئالن پۆ لە رێگای مۆنۆلۆگەکانەوە باری دەروونی خۆیان دەردەبڕن (وەك چیرۆکی ئامۆنتیلادۆ[13]). هەندێ جار ئەم مۆنۆلۆگانە، دان پێنانی نووسراوەیی رۆحێکی نائارامە و هەندێ جار رێگایەکە بۆ سووك کردنی باری دەروونی (لە چیرۆکی دڵی حەکایەت بێژدا).

ئەم گریمانانە، زۆربەی کات روون و ئاشکرا نیە: ئاخۆ لە چیرۆکی "لی جیا"دا لەگەڵ بگێڕەوەیەکدا رووبەڕوو دەبینەوە کە لەبەر خۆیەوە قسە دەکا یان لە رێگای گێڕانەوەی چیرۆکەکەیەوە هەست و ترسەکەی تازە دەکاتەوە؟

کێشەی سەرەکی گێڕانەوەی چیرۆك دەگەڕێتەوە بۆ پێوەندی نووسەر لەگەڵ بەرهەمەکەیدا. لە "شانۆنامە"دا نووسەر نادیارە، ئەو لە پشتەوەی بەرهەمەکەیەوە، شاراوە و نادیارە، بەڵام لە شیعری حەماسی-داستانیدا (نووسەر) هەموو شتێ لەگەڵ هەڵهێنجانی خۆی لە چیرۆك، وەك نەقاڵێکی کارامە بە شێوەی "جیاواز لەگەڵ دیالۆگ" دەیانگێڕێتەوە. رۆماننووس دەتوانێ چیرۆکەکەی بەبێ ئەوەی بیروبۆچوونی خۆی تێدا رەنگ بداتەوە بگێڕێتەوە. ئەو دەتوانێ چیرۆکەکەی لە زمانی سێهەم کەسی تاکەوە وەك "زانای گشت" بنووسێ. ئەمە شێوەیەکی باو و سروشتی گێڕانەوەی چیرۆکە. نووسەر لە تەنیشت بەرهەمەکەیدا ئامادەیی هەیە، وەك ئاخێوەرێ کە لەگەڵ باسەکەیدا سلایدی رۆشن یان فیلمی دیکۆمێنتی نمایش بکرێ.

بۆ پشت کردن لە شێوەی باوی بەشدار بوون لە بەرهەم، کە لە چیرۆکی هەڵبەستراو *(Dichtung)*، ئێمێکدا روو دەدا، دوو رێگا هەیە: یەکەم رێگا ئەوەی کە رەنگە پێی بوترێ رێکاری رۆمانتیك-توانج ئامێژ، توانای دەوری بگێڕەوە زیاتر دەخاتە روو و وەك کەش و هەوای ناکۆك لەگەڵ هەر چەشنە وەهمێکی شیمانەیی وایە کە لای وابێ چیرۆك لە راستیدا جۆرێ "ژیان"ە نەك "هونەر". ئەم روانگە جەخت دەکاتەوە لەسەر کارەکتەری ئەدەبی خولقاو لە رۆماندا. داهێنەری ئەم تیۆریە "لاورۆنس سترن" بوو کە بە نووسینی رۆمانی "تریسترام شاندی"[14] ئەم تیۆریەی هێنایە گۆڕێ. دواتر ژان پۆل ریشتەر و لۆدویگ تیك لە ئاڵمانیا و وای. ویڵتمەن و نیکۆلای گۆگۆل لە رووسیە بوون بە پێڕەوکەری ئەم تیۆریە. رەنگە بکرێ رۆمانی "تریسترام شاندی" بە رۆمانێ بزانین دەربارەی رۆماننووسین و هەروەها رۆمانی "ئەوانەی پارەی تەزویر لێ دەدەن"[15]

بەرهــەمی ئانــدرە گایــد و بەرهــەمی هاوشــێوەی "پــوان دەری پــوان"[16]. ڤیلیــام مــیکس پــیس تاکری" بە نووسینی رۆمانی "بازاڕی فریو"[17] بــاس لــەوە دەکــات کــە کارەکتــەرەکانی تــەنها بووکــە شووشــە و دەســتکردی ئــەون. ئــەم بابەتــە بێگومــان ئــەم تیۆریــە ئەدەبیــەمان بــەبیر دێنێتەوە: "ئەدەب دەبێ ئەوە بزانێ شتێ نیە جیاواز لە ئەدەب."

لە دژایەتی ئەم تیۆریەدا، رۆمانی "عەینی"و "دراماتیك" هەیــە کــە بــۆ یەکــەم جــار لــە لایــەن ئۆتۆ لۆدویگ لە ئاڵمان و فلۆبەر و مۆپاسان لە فەرانسە و هێنری جەیمز لە بەریتانیا کەوتۆتە بەر باس و پێشنیاردان. لایەنگرانی ئەم ستایلە، ئــەو رەخنــەگر و هونەرمەندانــەن کــە تــەنها وەك شــێوەیەکی هونــەری چــاو لــە رۆمــان دەکــەن (تیۆریــەکی دەمارگرژانــە کــە پەســەندکردنی پێویستیەك نیە کە نەکرێ لەبەرچاو نەگیردرێ). ئەم ستایلە لە کتێبی "فەننی چیرۆك نووسین" لە نووسینی پێرسی لۆبۆك بەشێوەیەکی جێی ستایش و بە هەڵهێنجانێکی شاعیرانە و لەسەر بنــەمای راڤــەی کردەیــی و تیــۆریکی هێنــری جــەیمز لەســەر رۆمــان، بــە تێــر و تەســەلی شــی کراوەتەوە.

بــەکارهێنانی وشــەی "عــەینی" دەربــارەی رۆمان وا پێدەچێ هــەروەك وشــەی "دراماتیك" رەنگــە بــە مانــای "دیــالۆگ" یــان "رووداو" و "رەفتــار" مانــا بکرێــتەوە. هەرچــەند بێگومــان شانۆیی سەرچاوەی هەموو ئەم جووڵانە بووە. ئتۆلـودویگ تیۆریــە ئەدەبیــەکانی خــۆی بــەپێی تیــۆری دیکنــز دارشــت. دیکنــزیش ئولگــووی رەفتاری کارەکتەرەکانی کە بەشێوەی زۆر جوان پێناســەی دەکــردن، لــە میلۆدرامــا و شــانۆنامە کۆمیدیــەکانی ســەدەی هەژدەیــەم وەرگرتبــوو. ئــەو لــەباتی ئــەوەی قــسەمان لەگــەڵ بکــات هــــەموو شــــت نیــــشان دەدات. رۆماننووســــە نوێکـــــانیش وەك چـــــۆن هێنـــــری جـــــەیمز کاریگــەری لــە ئیپــسن وەرگرتــووە، لــە بەرهەمــە شــانۆییە ســەرکەوتوو و میتۆدمەنــدەکان کــەڵك وەردەگرن.

"عــەینی" بــوونی ستــایلی رۆمــان نابــێ بــەو مانایە بێت کە بەرتەسك بکرێتەوە بە دیالۆگ و شێوازی راپۆرتیانەی رەفتاری "پێرسۆناژەکان" (چیرۆکی "سەردەمی هەژاری" بەرهــەمی هێنــری جــەیمز و "بکوژەکــان" بەرهــەمی هــەمینگوای). ئــەم چەشــنە بەرتەســك کردنەوانــە، بەرهەمەکــە دەخاتە پێشبڕکێیەکی راستەوخۆ و نابەرابەرەوە لەگــەڵ شــانۆیی. ســەرکەوتوویی رۆمــان لــە خــستنە رووی ژیــانی روحــی و دەروونیدایــە. ئەمە ئەو شتەیە کە شانۆیی بۆ پێشکەشکردنی، پێویستی بە هەوڵێکی تاقەت پڕووکێن هەیە. لە پێویــستیەکانی ئــەم چەشــنە رۆمانانــە، نادیــار بــوونی ئــیرادی و ئامــادە نــەبوونی "نووســەری زانای گشت"ە لە بەرهەمدا. لەباتی ئەمە، لێرەدا بە شێوەیەکی کۆنترۆڵکراو تەنها "روانگەیەکی بگێڕەوە" دەبینین لە چیرۆکدا. هێنـری جەیمز و پێرسی لۆبوك، رۆمانەکەیان هــەر بــەو شێوەیەی کە دەیخەنە بەر دەستی ئێمە، بەڕێز بە شێوەی "دیمــــەن" و "درامــــا" دەبیــــنن و مەبەســــتیان ئەوەیــــە کــــە کارەکتــــەرەکان بەشــــێوەی خــــۆ وشــیارانە رووداوەکــان بگێڕنــەوە (لــە سنووری رووداوەکاندا یان لە دەرەوەی ئەو سنوورەدا) و ئەمــە بــە خــاڵی جیــاوازی نێــوان رۆمــان و شــانۆ دەزانن کە لانیکەم بەشێکی بە شێوەی دیالۆگەو لــە هەنــدێ رووەوە ئیپیــسۆد یــان خــەونێکی گرنگمان پێ نیشان دەدات. ئەم دیمەنە بەڕادەی هــــەمان دیمــــەن کــــە لــــە شــــانۆییدا هەمانــــە "عــەینی"یە. جیاوازیەکــەی تــەنیا لەوەدایــە کــە عــەینی بوونەکــەی لــە واقیعــی زەینــی یــەکێ لــە کاراکتــەرەکان (مــادام بــواری یــان ستریــچێر)ەوە سەرچــاوە دەگــرێ. لەحاڵێکـدا عــەینی بــوونی "شانۆیی" گرێدراوە بــە ئاخــاوتن و رەفتــارەوە. ئــەم تیۆریــە بــە جیاکردنــەوەی بەشــێك لــە

"روانگەی بگێڕەوە" (بۆ نموونە لە چیرۆكی "قاپی زێڕین"دا وەها روانگەیەك لە پرێنس دەگوازرێتەوە بۆ پرینسێس) بەدی دێ بەو مەرجەی بە شێوەی ڕێكوپێك بڕواتە پێش. هەروەها ئەم هەلە بۆ نووسەر دەرەخسێ، كە كەڵك لە كارەكتەر بگرێت لە سنووری رۆماندا و لەگەڵ نووسەرێكدا كە دەڵێی چیرۆكەكەی بۆ دیتران دەگێڕێتەوە (كارەكتەری مارلۆ لە رۆمانی "گەنجێتی" بەرهەمی كۆنراد) یان بە ئاگاداری لە پرسەكان هەموو شت روون دەبینێ (كارەكتەری ستریچێر لە رۆمانی "باڵیۆزەكان"دا) جیاوازی نەبێ. لێرەدا جەخت دەكرێتەوە لەسەر عەینی بوونی "تایبەت بە خودی" رۆمان. ئەگەر بڕیارە نووسەر بە جێگای "توانەوە" لە رۆماندا، خۆشی ئامادەیی ببێ، دەبێ كەسێتی خۆی تا ئاستی كارەكتەرەكانی تر بێنێتە خوار.

مەرجی شێوەی "عەینی" ئامادە بوونە لە كاتدا، خوێنەر لە ڕێگای ڕەوتی ڕووداوەكانی چیرۆكەوە، لەگەڵ كارەكتەرەكانی دەژی، دەبێ توخی "كورت بێژی" تا ئەو شوێنەی كە ئەگەری هەیە وەك تەواوكەری "دیمەن" و "شانۆیی" بەكار ببرێ (لە شانۆییدا نابێ مەودایەكی زیاتر لە پێنج رۆژی بكەوێتە نێوان دیمەنی یەكەم و دووهەم). بەڵام ئەم كاتانە دەبێ كەمتر ببنەوە. لە رۆماننووسی سەردەمی ویكتۆریادا ڕووداوە یەك لە دوای یەكەكان وەك كار، زەماوەند، مردنی كارەكتەری سەرەكی لە یەك بەشدا كورت دەكرایەوە. هێنری جەیمز، ویلیام دین هاوڵز و نووسەرە هاوچەرخەكانیان كۆتاییان بەم شێوە نووسینە هێنا كە لایان وابوو هەڵەیەكی هونەرییە. بەپێی تیۆری "عەینی بوون"ی رۆمان، نووسەر نابێ پێشبینی ئەو شتە بكات كە بڕیارە روو بدات. ئەو دەبێ چارتی زەینی خۆی وەها بخاتە بەردەستی ئێمە كە لە هەر ساتێكدا تەنها بتوانین ڕستەیەكی ببینین. "رامۆن فێرناندز" جیاكاری دەكات لە نێوان "وەسف كردن"، واتە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوەی كە ڕوویداوە و بەپێی یاسای شیكردنەوە و لێكدانەوە دێتە گێڕانەوە، لەگەڵ رۆمان. چونكە رۆمان ئەو ڕووداوانە دێنێتە "دووبارە خولقان" كە لە ژیاندا ڕوویانداوە.

رۆمانی ریالیستی لە باری ستایل و تایبەتمەندییەوە، لە زمانی ئاڵمانیدا پێی دەوترێ "وتە روونەكان" و لە زمانی فەرانسەدا (بە بۆچوونی ئاڵبێرت تیبۆدێت) "شێوەی ناڕاستەوخۆی دەربڕین" و بە وتەی ئیدمۆند دووجارین "ئاخاوتنی ناوەكی" ناوی دەركردووە.

لە زمانی ئینگلیزیدا دەستەواژەی "لێشاوی خۆ وشیاری" كە دەدرێتە پاڵ ویلیام جەیمز، بۆ وەسفی رۆمان، وەسفێكی لاواز و گشتییە.

دووجارین پێی دەڵێ "ئاخاوتنی دەروونی"، ئەمە ئاسانكارییەكە بۆ "پێوەندی ڕاستەوخۆی خوێنەر لەگەڵ ژیانی دەروونی كارەكتەردا، بەبێ ئەوەی لەلایەن نووسەرەوە لە هەوڵدان بۆ شیكردنەوە و تەفسیری ڕووداوەكاندا وەستانێك پێش بێت) و هەروەها وەك ئامرازێ بۆ "دەربڕینی تایبەتیترین بیركردنەوەكان كە لە هەموو شت نزیكترە بە خودی نائاگا" كەڵكی لێ وەردەگیردرێ. "پیرسی لۆبوك" دەڵێ هێنری جەیمز لە رۆمانی "باڵیۆزەكان"دا چیرۆكی زەینی "ستریچێر" (كارەكتەری رۆمانی ناوبراو) ناگێڕێتەوە، بەڵكوو تێدەكۆشێ چیرۆكەكە بۆ خۆی هەموو شت دەببڕێ. ئەو تەنها ڕووداوەكان دراماتیزە دەكات. ئەگەر بمانەوێ بگەڕێینەوە بۆ مێژووی ئەم چەشنە تەكنیكە ئەدەبییە و ئامادەبوونیان لە ئەدەبدا، دەبێ سەرەتا ئەم شێوە ئەدەبییە لە مۆنۆلۆگە زەینییەكانی كارەكتەرەكانی "شكسپیەر"دا

بدۆزینەوە. "لاوریش ستێرن" کە "جان لووکە" بانگهێشت دەکات بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ جیاوازیەکان، نموونەیەکی ترە لەم چەشنە ئەدەبە. "راڤەی زەینی"، کورت کردنەوەی بیرکردنەوە و هەستی کارەکتەرەکان لەلایەن نووسەرەوە، نموونەی سێهەمی ئەم چەشنەیە. هەڵهێنجانی ئێمە لە هۆکاری سێهەم کە سەر بە "جیهان"ی چیرۆکە (گەڵاڵە، کارەکتەر، بەستێن)، بە زۆری لە رۆمانەوە سەرچاوەی گرتووە، بەڵام دەبێ بزانین شانۆیش دەگرێتەوە وەك بەرهەمێکی ئەدەبی. هۆکاری چوارەم و دوایین هۆکار "مانا میتافیزیکیەکان"ی بەرهەمە کە ئێمە هەروەك "کاردانەوە و پەرچەکردارەکانمان بەرامبەر بە ژیان" لە "جیهان" و بابەتە ناوکۆییەکاندا کورتمان کردۆتەوە. بەڵام ئەم فرەمانا بوونە، دواتر دەبێ بەهۆی ئەوەی کاتی هەڵسەنگاندنەوەی بەرهەم، وردبین تر بین.

## پەراوێزەکان:

1–بەشێك لە چیرۆکەکانی حەسەن قزڵجی لە کتێبی "پێکەنینی گەدا" لەم چەشنە چیرۆکانەن کە گەورەترین کێشەیان خستنە بەر باسی کێشەیەکی کۆمەڵایەتیە و ئەمە هەمان روانگەیە کە گرێ دەدرێتەوە بە ئەدەبی دەربەستەوە. (و.ك)

2–*Barestshire*

3–*budden brooks*

4–نەقاڵ ئەو کەسەیە کە لە قاوەخانەکاندا یان لە شەونشینیەکاندا چیرۆکە حەماسیەکان دەگێڕێتەوە، وەك چیرۆکەکانی رۆستەم و سۆهراب، خورشیدی خاوەر و زۆر چیرۆکی تر، کە ئێستا ئەم چەشنە گێڕانەوەیە نەماوە. (و.ك)

5–گوتیك *(goth)* خێڵێکی کۆنی ئاڵمانی، *(gothic)* تایبەت بە گوتیەکان و زمانەکەیان. (و.ك)

6–فەبل *(Fable)* ئەفسانە یان ئەو چیرۆکەی لە زمانی گیاندارەوە دەگێڕدرێتەوە یان دەنووسرێ. دەتوانین نموونەی ئەم چەشنە ژانێرە ئاماژە بکەین بە کلیلە و دەمنە. (و.ك)

7–*Barnaby rudge*

8–شانۆنامەنووسی نۆروێژی

9–مەبەست ئەوەیە لە درێژایی شانۆدا بەرەبەرە کەسایەتی کارەکتەر دەردەکەوێ و بینەر یان خوێنەر لە کەسێتیەکەی دەگا. (و.ك)

10–*chuzzlewit*

11–سەنعەتێکی ئەدەبیە و بە مانای کەوتنە ناو وەهم و گومانەوە.

12–پانسیۆن *(Pension)* میوانخانە و شوێنێ کە خواردن و شوێنی خەو بدەن بە کەسێك و کرێی خواردن و ژوورەکەی بە شێوەی مانگانە لێ بستێنن.

13–*Amontillado*

14–*Thristram shandy*

15–*les faux- Mannayeurs*

16–*point counter point*

17–*Vanity Fair*

## سەرچاوە:

گۆڤاری بیدار ژمارە 7

# شاژنی تاوان

## وتووێژی شوشا گاپی لەگەڵ پی.دی. جێمز

لە فارسییەوە: دڵشاد خۆشناو

پی.دی.جێمز، یەکێکە لە بەرجەستەترین و خۆشەویسترین نووسەرانی بەریتانیا، ئەو ماوەیەکی زۆرە کە بە (شاژنی تاوان) ناسراوە و بە پێشڕەوی ڕۆماننووسەکانی دەقی پۆلیسی دەژمێردرێت، خوێنەری زۆر و فراوانیشی لە دەرەوەی سنوری ئەو دەقەوە هەیە، ڕەخنەگرانی چاپەمەنییە ئەدەبییەکان، وەکو تایمز لیتری ساپلیمنت[1] و لیتری ریڤیو[2]، دەستخۆشیان لە کارەکانی کردووە.



پی دی جێمز

جێمز لە ساڵی 1920 لە ئۆکسفۆرد لە دایک بووە، لە ئامادەیی کچان لە کیمبریج خوێندویەتی، تەمەنی یانزە ساڵان بوو کە ماڵیان هاتە ئەم شارە لە شانزە ساڵیدا دوای وازهێنانی لە قوتابخانە، دەستی بەکارکردن کرد و لە ساڵی 1941 لەگەڵ دکتۆر کانر بنتری وایت[3] زەماوەندی کرد و بەرهەمی ئەو زەماوەندەش دوو کچ بەناوەکانی کیلر و جیسن، هاوسەرەکەی لە شەڕی جیهانی دووەم تووشی گرفتی دەروونی بوو و ئیتر توانای کارکردنی نەما. جێمز ناچار بوو کە ژیانی خۆی و خێزانەکەی دابین بکات. ئەو سەرەتا کەوتە کارکردن لە دەزگای خزمەتگوزاری تەندروستی و پاشان چوە وەزارەتی ناوخۆی بەریتانیا و سەرەنجام لەم وەزارەتەدا گەیشتە پۆستێکی بەرز لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس. لە ساڵی 1962، لە

تەمەنی 42 ساڵیدا، یەکەمین ڕۆمانی خۆی بەناونیشانی (دەموچاوی داپۆشە[4]) بڵاوکردەوە.

دوای ئەوە، لەماوەی نزیکەی سێ دەیە چالاکی پیشەیی لە زەمینەی نووسیندا، یانزە ڕۆمانی تری نووسی، بوە جێگای دەستخۆشی ڕەخنەگران، خۆشەویستیەکەشی ڕۆژبەڕۆژ زۆرتر بوو. جێمز بە هەشتەمین ڕۆمانی (خوێنی بێگوناه[5]) گەیشتە لوتکەی ناوبانگ، ئەو ڕۆمانە لەلیستی کتێبە پڕ فرۆشەکانی ئەمریکا لە ڕیزی یەکەم بوو، سەروەت و سامانێکی باش و ناوبانگێکی جیهانی بۆ هێنا، تا ئەمڕۆکە، زیاتر لە دەملیۆن دانە لە کتێبەکانی، لە وڵاتە یەکگرتووەکان فرۆشراوە، بەردەوام بۆ ڕیکلامی ڕۆمانەکانی و کۆڕگرتن دەچێتە دەرەوەی ئەمریکا.

یەکەمین ڕۆمانی (ڕۆمانی باو[6]) ی جێمز بەناونیشانی (منداڵانی مرۆڤەکان[7])یش سەرکەوتنێکی باشی بەدەستهێنا، ئەم ڕۆمانە چیرۆکێکی ئەخلاقی و ئاینیدە بینیانەی هەیە کە لە ساڵی 2007 لە بەریتانیا ڕودەدات. سێزدەمین و نوێترین ڕۆمانی ئەو، (گوناهی یەکەمین[8]) لە لەندەن و لە دونیای چاپەمەنی ڕوودەدات، قارەمانی ئەو ڕوداوە (ئادام دڵگلیش[9])ە کە بەناوبانگترین لێکۆڵەرەوەی پۆلیسە دوای شەرلوك هۆلمز، کە قارەمانی زۆرینەی ڕۆمانەکانی پێشتری جێمزیش بووە.

لە 1987، خەڵاتی خەنجەری ئەڵماس نیشانی کارتیەی پێشکەش کرا لە بەرانبەر تەمەنێك چالاکی ئەدەبی، هەروەها خەنجەری زیوینی ئەنجومەنی تاواننووسانی پێ بەخشرا بۆ چوارەمین ڕۆمانی بەناوی (هێلانەیەك بۆ بولبول[10]) و لە وڵاتە یەکگرتووەکانیش خەڵاتی ئدگار ئالن پۆی وەرگرت بۆ هەمان ڕۆمان و ڕۆمانی (پیشەیەکی نەگونجاو بۆ ژنێك[11])، تائێستا هەشت لە ڕۆمانەکانی جێمز بوونەتە زنجیرەی تەلەفزیۆنی، ئەو لە ئەندامانی (کۆلێژی داونینگ[12])ی زانکۆی کیمبریج. لە چوار زانکۆ بڕوانامەی شانازی وەرگرتووە، ئەندامی ئەنجومەنی سەڵتەنەتی ئەدەبیاتی بەریتانیایە، لەگەڵ ئەوانەشدا جێمز سەرۆکی دەستەی ئەدەبیاتی ئەنجومەنی هونەر و ئەندامی ئەنجومەنی بەڕێوەبەرانی (بی.بی.سی)ش بوە. لە 1991 نازناوی (بارونس)ی پێ بەخشرا و ئێستاش بەناونیشانی بارونس جێمز لە هلند پارك لە ئەنجومەنی پیرانی بەریتانیا کورسی هەیە.

پی.دی.جێمز لە ماڵە دێرین و جوانەکەی لە ناوچەی (هلند پارك)ی لەندەن دەژی و ئەو چاوپێکەوتنە لە نیسانی 1994 لە هەمان ماڵ ئەنجام دراوە.

ژووری دانیشتنی ماڵەکەی مۆبل و قەنەفەی تێدایە و ئاوێنەی زێڕین پەیکەرەکانی ستافوردشایر، کتێبخانەیەکی جوان بە کۆمەڵە کتێبێکی جوانی بەرگکراوی وەکو زنجیرە کتێبی (دادگایە گرنگەکانی بەریتانیا) کە بەوتەی خۆی (ئەفسونکەرن).

* * * *

**شوشا گاپی**

ئێوە نووسینتان دوای چل ساڵی دەست پێکردووە، لەگەڵ ئەوەش دەڵێن هەمیشە حەزتان کردووە ببنە نووسەر، ئەوەت لە کوێوە دەزانی و چۆن دەتەویست ببیتە نووسەر؟

**پی.دی.جێمز**

پێموایە لە سەرەتاوە ئەمەم دەزانی، لە منداڵیەوە ڕاهاتبووم چیرۆکی خەیاڵیم بۆ خوشك و برا بچووکەکانم دەگێڕایەوە. کارێکی تریشم دەکرد کە بیستومە نووسەرانی تریش ئەنجامیان دەدا، لە زەینمدا، خۆم بە شێوەی کەسی سێیەم وەسف

دەکـرد: (ئـەو قژەکـەی شـانە کـردوو دەموچـاوی شوشت، دوایی جلی خـەوتنی پۆشـی..) وەك بڵێی لە دەرەوەی خۆم وەستاوم و سەیری خۆم دەکرد، نازانم ئەو بابەتـە چ گرنگیـەکی هەیـە یـان نـا، بـەڵام پێموایـە کـەم تـا زۆر لەوکاتـەی تێگەیـشتم کتێـب چییە، حەزم دەکرد ببمە نووسەر.

**شوشا گاپی**

دایـك و باوکیـشت حـەزیان لـە ئـەدەبیات بـوو؟ زۆر کتێبتـان دەخوێنـدەوە؟ چ کتێبکتـان لـە ماڵـدا هەبوو؟

**پی.دی.جێمز**

ئێمـە سـێ منـداڵ بـووین مـن لـە هـەموویان گـەورەتر بـووم، بـاوکم کارمەنـدی مامناوەنـدی بەڕێوەبەرایـەتی دارایـی بـوو. زەماوەنـدی دایـك و باوکم هێندە سەرکەوتوو نەبوو، پێموابوو یەکێك لە هۆیـەکانیش جیـاوازی زۆری کەسـایەتیان بـوو، باوکم کەسێکی کینەلەدڵ نەبوو، زۆر بەهۆش و بێ هەست، دایکم خوێنگـەرم و دەمـدەمی و بـەردەوام کەم هۆشتربوو لە باوکم، کە منداڵبووین، لە باوکم دەترسـام، وابـزانم خووشـك و براکەشـم دەترسـان، بـەڵام کـە وەناوکـەوت، کـەم کـەم ڕێـزم پەیـداکرد بـۆ جـوامێری و هـۆش و قۆشمەچـیەتیەکەی. وابـزانم هەم لە دایکم و هـەم لـە باوکم هەندێ تایبەتمەندیم بۆ ماوەتەوە، هەردووکیان بە عەشقەوە باس دەکەم، دایك و باوکم هـیچ کامیـان، نـە دەیاننووسـی و نـە حەزیان لە ئەدەبیات بوو، بەڵام خۆشحاڵ دەبوون لە سەرکەوتنی من.

**شوشا گاپی**

لـە قوتابخانـە چیت دەخوێنـد؟ زۆر حـەزت لـە وانەی زمان و ئەدەبیاتی ئینگلیزی بوو؟

**پی.دی.جێمز**

بەڵێ، من لـە سیستمی پـەروەردەی میری و لە دواناوەندییـەکی کـۆن لـە کیمـبریج خوێندومـە، ئەوکاتە ئاستی خوێندنی میری زۆر بەرز بوو، بەڵام لـە شـانزە ساڵی ناچار بووم واز لـە خوێنـدن بێنم، چـونکە زانکـۆ بـە خـۆڕایی نـەبوو و ماڵـەوەشمان نەیانـدەتوانی خـەرجی زانکۆم بـۆ بـدەن، زۆر حـەزم دەکرد بچومایە زانکۆ، بەڵام پێموایە ئەگـەر چوبام دەبومـە نووسـەرێکی باشـتر، بـەڵکو لەوانەیـە بەپێـچەوانەوە، کـاتێ بـیر لـە ڕابـردوو دەکەمـەوە، هەست دەکەم من کەسێکی خۆشبەخت بووم، ئێمـە مامۆسـتای بـاش و دڵسۆزمان هـەبوو کـە عاشـقی کیمبریج بوون، چونکە شارێکی زۆرجوان و شوێنی سەرنجڕاکێـشی زۆری تێدایـە، و لـەو شـارەدا ماونەتەوە، ئەو ژنانە تەنیا بەهۆی کوژرانی پیاوان لە شـەڕی جیهانی یەکەم شویان نـەکردبوو، تـەنیا یـەکێکیان شـوی کردبوو کـە ئـەویش بێوەژن بـوو، هـەموو خۆشەویستییەکیان بۆ ئێمـە بـوو، ئێمـەیان خۆشدەویست. کاتێ من وازم لە قوتابخانە هێنا، لە دەرچـوانی زانکـۆی ئێـستا پـتر بەرهەمـەکانی شکسپیر و شاعیرە گەورەکانی ترم خوێندەبووەوە. سـەیرم دێـت کـە خوێندنـەوەی ئـەوان، بـە بـەراورد لەگەڵ ئێمە، زۆرکەم و سنوردارە.

**شوشا گاپی**

ڕۆمان چی؟ ڕۆمانی گەورەشت خوێندبووەوە؟

**پی.دی.جێمز**

ئێمـە لـە ماڵـەوە زۆر کتێبمـان نـەبوو، هەربۆیـە، مـن زۆربـەی کتێبـەکانم لـە کتێبخانـەی گـشتی کیمـبریج دەخواسـت، زۆر دەمخوێنـدەوە– لـە چیرۆکە پڕ ڕووداوەکانەوە بگرە تا بەرهەمەکانی جین ئاستن، هێشتا تەمەنێکی وام نەبوو کە عاشقی ئـەو بـووم، هەرچـەند نووسـینەکانی ئـەو کەسـانی بـە تەمـەنتر پەسـەندی دەکـەن. یـەکێك لـە یەکـەمین کتێبی کە من پێم خۆش بوو، کتێبـی (دوعـا) بوو، زمانـە جوانەکـەیم حـەز لێبـوو، هـەروەها ئـەو کەشـوهەوایە مێـژوو و بـێ کاتیـەی لـە کتێبەدا هەبوو.

**شوشا گاپی**

بەشـــێوەیەکی دیـــاریکراو چ شـــتێك لـــە نووســـینەکانی جـــین ئاســـتن ســـەرنجی تـــۆی ڕادەکێشا؟

**پی.دی.جێمز**

تـــەنزەکانی و زاڵبونەکـــەی بەســـەر پێکهاتـــەی چـــیرۆك. کاردانـــەوەی مـــرۆڤ بـــۆ چـــیرۆك، وەکـــو هەڵویستی ئـەو بـوو لەگـەڵ مـرۆڤ. ئەگـەر لـە منـت دەپرسی کـام تایبەتمەندی کەسێك بەتایبەتی بۆم ســـــەرنجڕاکێش بـــــوو، ڕەنگـــــە دەمگـــــوت، جوامێرییەکـەی، یـان تـەنز، یـان هۆشمەندیەکـەی. لەبارەی جین ئاستن، شێواز و تەنز جێگای سەرنجم بوون، واتە شێوەی ئەو لە دروستکردنی جیهانێکی زۆر جیاواز کە تێیدا هەست بە خۆشی دەکەم، من ناوی ئەوم بۆ کچی دووەمم هەڵبژارد، کە لە یەکێك لە چـڕترین بۆمبارانـەکانی لەنـدەن لـە دایـك بـوو، لـە نەخۆشـخانەی لـە دایکبـوونی کـوین شـارلوت[13]، چـــوبومە ژێرزەمینـــی ئاپارتمـــانێکی گـــەڕەکی هەمپـستید[14]، وامـدەزانی ژێــر زەمــین ئەمینــە. دەنگی بۆمبارەنەکانم دەبیست کە بەسەر سەرماندا دەڕۆیـــشتن و دەنگـــی دژە هەواییەکانیـــشمان دەبیست کە بۆ تەقاندنەوەی بۆمبەکان دەهاوێژران. مـــن بـــۆ ســـەدەمین جـــار کتێبـــی جـــین ئاســـتنم دەخوێندەوە!

**شوشا گاپی**

نووســـــینەکانی (جـــــۆرج ئلیـــــۆت) شـــــت دەخوێندەوە؟ بەهەمان تامەزرۆییەوە؟

**پی.دی.جێمز**

نووسینەکانی ئـەوم دواتـر خوێنـدەوە، منـیش وەکو زۆربەی خەڵك، پێمولیە میدل مارچ یـەکێك لـە گرنگترین ڕۆمـانی ئینگلیزییـە، بـەڵام هێنـدەی جین ئاسـتن حـەزم لـە جـۆرج ئلیـۆت نییـە، کتێبـەکانی دیکنـــزم خوێندۆتـــەوە و هەســـتم بـــە زیرەکـــی و شایـــستەیی ئـــەو کـــردووە، بـــەڵام دیکنـــز خۆشەویستترین نووسـەر نییـە لای من، بەڕای من، زۆر لـە کەسـایەتییە ژنـەکانی ئـەو سـەرنەکەوتوون، کاریکاتۆرەکـــــانی شـــــەڕانین – بێـــــڕەحم، سەیروسـەمەرە– ناڕەسـەن بـەڵام واقیعـی نـین. ئـەو وردەکارییە لە دروستکردنی کەسایەتی، بۆ نموونە لـــە نووســـینەکانی ترالـــوپ[15] دەبینیـــت، لـــە چیرۆکەکانی دیکنز بوونیان نییە درك وەسفکردنی ترالوپ لە ژنان سەیرە، هەرکاتێك جین ئاستن باسی دوو پیـاو دەکـات لـە کـاتی قسەکردندا، ژنێکـیش هەیە، حەتمەن وای بیرکردۆتەوە ئەگەر وانەبێت، لە ســـــنوری ئەزموونەکـــــەی دەردەچـــــێت. لـــــە نووسـینەکانی ترالـوپ، بەپێـچەوانەوە، وتوێـژی جۆراوجۆر لەناو ژناندا هەیە– بۆ نموونە لە نێوان ئـالیس ڤیواسـور[16] و لیـدی گلنکـورا پالیـسر لـە کتێبی[17] (ئایا دەتوانی بیبوری)– بێ ئەوەی هیچ پیاوێـــك هـــەبێت، ئـــەو وتوێژانـــەش زۆر بـــاش دەردەچـوێنێت. بەدڵنیاییـەوە ئـەو پیـاوە سـادە و بەڕواڵـەت عەبووسـە، زانیارییـەکی سـەیری لـەبارەی دەروونناسی ژنانەوە هەبوو.

**شوشا گاپی**

ترالـــوپ بۆتـــە یـــەکێك لـــە قارەمانـــەکانی فیمینیـستەکان، بەتایبـەتی بـەهۆی کتێبـی (بـەم شێوەیەی کە ئەمڕۆ دەژین[18])، تێیدا پێش خەڵکی تر باسی مافی ژنان دەکات.

**پی.دی.جێمز**

مـــن لـــە کلاوڕۆژنـــەی مەســـەلەکانی ڕۆژ ســـەیری کتێبـــەکان دەکـــەم، ئـــەوکارە ئـــەوان ناشـــیرین نیـــشان دەدات، بـــەڵام ئـــەو کتێبـــەی بەتایبـــەتی ڕۆمـــانی ســـەردەمە. کەســـایەتیە ســـەرەکیەکەی جۆرێـــك ڕابـــیرت مەکـــسول[19]، دیۆیکە، ترالوپ ژیانی ژنان کاتێك وەسف دەکات کـە شـوکردن تاکـە ئەگـەر بـوو بـۆ دابینکردنـی ئاسودەیی خودی.

**شوشا گاپی**

بەرهەمی ڕۆماننووسەکانی وڵاتانی تریشت دەخوێندەوە؟ ڕووسە گەورەکان، فەرەنسییەکان؟

**پی.دی.جێمز**

کتێبە گرنگەکانیانم خوێندونەتەوە، شەڕوئاشتی، ئاناکارنین، کاتم لە بەردەستدا نەبوو وەکو پێویست بەرهەمی هاوزمانەکانم بخوێنمەوە، چونکە دوای وازهێنانم لە خوێندن دەستم بە کارکردن کرد و بەردەوامیش هەر کارم دەکرد، بەرهەمی هەندێ لە ڕۆماننووسە ئەمریکیەکانیشم خوێندۆتەوە: هێمنگوای، میترجرالد، جان ئاوهان و پۆلیسی نووسانی وەکو دشیل هیت و ڕاسمك دۆناڵد، بەڕای من پۆلیسی نووسەکانی ئەمریکی، کاریگەرییەکی زۆریان هەبووە نەك تەنیا لەسەر ئەو جۆرە ژانرە، بەڵکو لەسەر ڕەوتی گشتی ڕۆمان.

**شوشا گاپی**

بە چ شێوەیەك؟

**پی.دی.جێمز**

لە ڕێگای توانایی زمانەکەیان و بەکارهێنانی داهێنەرانەیان – قسەی سەرزاران، تانە و تەشەرەکان. شێوازێکی تایبەتە، کاری کردۆتە سەر ڕۆمانی باوی ئەمریکایش.

**شوشا گاپی**

ئێستا دەگەینە ئەو ژانرەی کە بۆخۆت هەڵبژاردووە، بەو هۆیەوە ئەوت هەڵبژارد کە دەتزانی توانات بەسەریدا هەیە؟

**پی.دی.جێمز**

من جیاوازییەك نابینم لە نێوان ڕۆمانی پۆلیسی و ڕۆمانی بەناو جدی و ئەدەبی یان ئەوانی تر، پێمواییە بتوانین بڵێین (ڕۆمانی باو) بەڵام پێش ئەوە بڕیار بدەم کە ڕۆمانی پۆلیسی بنووسم، هێندە دوودڵ نەبووم، چونکە خۆم زۆر چێژم وەردەگرت لە خوێندنەوەی ئەو جۆرە ڕۆمانانە و هەستم دەکرد ڕەنگە لەو کارەدا سەرکەوتوو بم، لەبەرئەوەی کە چیرۆکی پۆلیسی ژانرێکی وابوو کە خەڵك حەزی لێیان بوو، زۆرتر ئەگەری ئەوە هەبوو بۆ بڵاوکردنەوە وەریبگرن، حەزم نەدەکرد بە گوێرەی ئەزموونی تاڵی ژیانی خۆم، ژیاننامەی خۆم بنووسم، ئەویش ئەگەرێکی تربوو بۆ یەکەمین هەوڵدانم، دوو هۆکاری تریش هەبوو، یەکەم حەزم لە چیرۆکێکە کە پێکهاتەی هەبێت، چیرۆکێك سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی هەبێت. حەزدەکەم ڕۆمان پرۆسەی گێڕانەوە، ڕیتم و کردنەوەی گرێی هەبێت کە ڕۆمانی پۆلیسی هەیەتی، دووەم، وەك ئەنجام ویستم ببمە نووسەر کە هەموو تەمەنم حەزم لێی بوو. باوەڕم وابوو کە نووسینی ڕۆمانی پۆلیسی خۆڕاهێنانێکی زۆرباش بێت بۆ نووسینی ڕۆمانی جدی، چونکە زۆر بەئاسانی دەتوانرێت ڕۆمانێکی پۆلیسی خراپ بنووسرێت، بەڵام نووسینی چیرۆکی پۆلیسی باش کارێکی سەختە، زۆر شت دەبێ لە هەشتا یا نەوەد هەزار وشە جێ بکەیتەوە و بیگونجێنێت– نە تەنیا دروستکردنی مەتەڵ، بەڵکو دروستکردنی کەشوهەوا، کات و شوێن، کەسایەتییەکان، کاتێ کە ڕۆمانی یەکەمم پێشوازییەکی باشی لێکرا، درێژەم بە نووسین دا، بەو ئەنجامە گەیشتم کە دەتوانم لە چوارچێوە و سنور و ڕێساکانی ئەو ژانرە بمێنمەوە، لە هەمان کاتیشدا، دەتوانین نووسەرێکی جدی بین و واقیعەت لەبارەی ژن و پیاوەکان و پەیوەندییەکانیان و ئەو کۆمەڵگایەی کە تێیدا دەژین، دەربڕین.

**شوشا گاپی**

ئالن ڕوب گرێی کاتێ باسی بۆرخیس دەکات، هەموو ڕۆمانە گەورەکانی لە (تاوان و سزا) بگرە تا (ژالوزی[20]) ڕوب گریێ خۆی، چیرۆکی پۆلیسین، تۆ لەگەڵ ئەو ڕایەدایت؟

**پی.دی.جێمز**

تا ئێستا بەم شێوەیە لەبارەیەوە بیرم نەکردبوەوە، بەڵام ئێستاکە ئاماژەت پێکرد، پێموایە تاڕادەیەك ڕاست بێت، تێڕوانینێکی جوانە. بەو هۆیە ڕەنگە ڕاست بێت کە ڕۆمان فۆرمێکی دەستکردە، بەتایبەتی ڕۆمانی پۆلیسی، چونکە نووسەر ناچارە ڕوداوەکان هەڵبژێرێت بە جۆرێك ڕێکیان بخات، و سود لە ئەزموونی خۆی وەربگرێت بۆ ئاوڕدانەوە لە واقیعیەت. گرێ کردنەوە تایبەتمەندی هەردوو ژانرەکەیە. بۆ نموونە (ئیما)ی جین ئاستن ڕۆمانێکی پۆلیسی بێ وێنەیە، تێیدا پەیوەندی مرۆڤەکان بە شێوەیەکی زۆر هۆشمەندانە گونجێنراوە. بۆ نموونە فرانك چەرچیل لە کاتێکدا دێتە هایبری، بەدزییەوە بۆتە دەزگیرانی جین فیرفکس. جین پیانۆیەکی پێویستە، فرانك بۆ قژ تاشین دەچێتە لەندەن، دوای چەند ڕۆژێك بە پیانۆوە دەگەڕێتەوە، ئەم ڕۆمانە پڕە لەو جۆرە سەرەداوانە لەبارەی واقیعیەتی پەیوەندییەکان، لەم کتێبەدا باسی کوشتن و مردن ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا، ڕۆمانەکە فریودان و ئاشکرایە.

**شوشا گاپی**

بەم شێوەیە، پێناسەی ڕۆمانی پۆلیسی لەڕادەبەدەر گشتی دەبێت، ئەوەی من لەو چەمکە تێگەیشتووم، ژانرێکی تایبەتە بە ڕێسا و یاسای خۆی، پێویستی بە توانایەکی تایبەت و پێکهاتەی زەینی دیاریکراویش هەیە، بەگشتی لاشەیەك هەیە و ئەو لاشەیە لە هەلومەرجێکی گوماناوی دۆزراوەتەوە و ڕۆمانەکە ئەو نهێنیانە ئاشکرا دەکات. هەموو ئەوانە کەمێك سەیرو ناماقوڵ دێنە بەرچاو، لەگەڵ ئەوەشدا، زۆربەی نووسەرانی ڕۆمانی پۆلیسی کە من بینیومن عەقڵیان هیچ کەموکوڕییەکی نییە! ئەزموونی پیشەیی ئێوە لە دەزگای تەندروستی کاریگەری هەبووە لەسەر هەڵبژاردنی مەتەریالی کارەکەتان؟

**پی.دی.جێمز**

نە، من ڕووبەڕووی لاشە نەدەبوومەوە، چونکە بەرپرسی کارگێڕی بووم، کارمەندی نووسینگە بووم نەك دکتۆر و پەرستار، بەڵام لە منداڵیەوە مەسەلەی مەرگ سەرنجی ڕادەکێشام، سیحری لێ دەکردم، کاتێ کە شیعری منداڵانەی (هامپتی دامپتی)م دەبیست کە دانیشتبووم لەسەر دیوار، بەخۆمم دەگوت: (خۆی کەوت یان پاڵیان پێوەنا؟) بەڵام مۆڵەت بدە بابچینە سەر ئەوەی یەکەم گوتت، ئەوەی کە ڕۆمانی پۆلیسی پێویستی بە لاشەیەك هەیە، پێموایە پێویست بێت هەروا بێت، بۆ نموونە لە ڕۆمانی (شەوی دەعوەت[21]) نووسینی دوروتی ئێڵ. سایرز هیچ لاشەیەك نییە، بەڵام ڕاست دەکەیت، ئەم شێوەیەش زۆرکەمە، بەشێوەیەکی گشتی، تەوەرەی چیرۆکی مردنێکی گوماناوییە کە کاریگەرییەکی سۆزداری زیاتری پێ دەبەخشێت. (کێ قارەمانەکەی کوشت) بەگشتی کاریگەری زۆرترە لەوەی کە (کێ ئەنگوستیلە ئەڵماسەکەی دزی؟) ڕەنگە ئەوانەی کە ئەو چیرۆکانە دەنووسن وەکو مرۆڤ حەزیان لە مەسەلەی مردن بێت و هەست بکەن کە بە چیرۆك کردن و بە عەقڵانیکردنی مردن و گۆڕینی مردن بۆ مەتەڵ، دەتوانن ترسی ئەزەلی خۆیان لە مردن و توندوتیژی کەم بکەنەوە.

**شوشا گاپی**

یەکەم لاشە دەدۆزیتەوە، دوایی چیرۆکەکەی لەبارەوە دەنووسیت؟

**پی.دی.جێمز**

نەخێر هەرچەندە ئەوە شێوازێکی کارە، ئەو لاشەیە کێیە؟[22] نووسینی دروتی ئێڵ سایزر، بەلاشەیەکی ڕووت دەستی پێدەکرد کە عەینەکێکی

باریکی لە چاو بوو. یەکێك لە کتێبەکانی من، (هێلانەیەك بۆ بولبول)یش بە بیرۆکەیەکی دیار بۆ کوشتنی مرۆڤێك دەست پێدەکات، ئەو بیرۆکەیە ئەو کاتە هاتە زەینم کە نەخۆش بووم، لەو بۆرییەی کە چوبووە ناو گەدەمەوە خواردنیان پێدەگەیاندم، بیرم کردەوە لەوەی بۆ کوشتن سوود لەو شێوازە وەربگیرێت، دەکرێت لە جیاتی شیر ژەهر بخرێتە بۆرییەکەوە، هەر ئەو کارەشم کرد، هەڵبەتە لە چیرۆکەکەدا! بەڵام ئەوەی کە خەیاڵم دەخاتەکار بەگشتی کات و شوێنی چیرۆکە.

**شوشا گاپی**

کات و شوێن چۆن دەردەچوێنیت؟ ڕێکەوتە، یان پێکهاتەی خەیاڵی خۆتە؟ پێش هاتوە وەکو دەرهێنەرانی سینەما بچیت شوێنەکان ببینیت کە دەتەوێت ڕوداوی چیرۆکەکەی تێدا دروست بکەیت؟

**پی.دی.جێمز**

هیچ کات بە وشیارییەوە لە دوای ناگەڕێم، هیچ کات باوەڕم وا نەبووە لەگەڵ تەواوکردنی کتێبێك یەکسەر دەست بەکتێبی تر بکەم. چاوەڕوانی ئیلهام دەکەم، هەرچەندە درەنگیش بۆم بێت. هەڵبەتە زەین و خەیاڵم والا دەکەم بۆ ئیلهام، بەڵام ناچم لەوبەر و لەمبەر بەدوای شوێندا بگەڕێم تا زەمینەی چیرۆکم بۆ بڕەخسێنێت، هەمیشە بە ڕێکەوتە، بۆ نموونە (فێڵەکان و ئارەزووەکان[23]) لە کەناری خۆرهەڵاتی بەریتانیا ڕودەدات، چوبوومە یەکێك لە پارێزگاکانی باشوری بەریتانیا و ڕۆژێك لە کەنار وەستابووم تەماشای دەریای سارد و پڕ شەپۆلی باکورم دەکرد، دوو بەلەمم بینی لەنگەریان گرتبوو، وەستابوون و چەند تۆڕێکی ماسیگریان بڵاوکردبووەوە تا وشك بێتەوە، بیرم لەوە کردەوە ئەگەر سەد ساڵیش لێرە وەستابام هەر ئەو شتەم دەبینی: بەلەمەکان، تۆڕەکانی ماسیگری، هێڵی کەناری، دوایی تەماشی باکورم کرد، بینای ساردو بێ گیانی بنکەیەکی ناڤۆکیم بینی سێبەرەکەی کەوتبووە سەر تەواوی ئەو دەوروبەرە، کەوتمە بیری ئەو کۆڵانە وێرانانەی لەو هەرێمەدا بینیبووم و سیمبۆلی ئیمانێك بوون لە کاتی لەناوچووندا، ئاشە باییە کۆنەکان کە کردبوویانن بە ماڵ، هەموو دروستکراوی ئەمڕۆیی لەگەڵ ئەو دیمەنە بێ زەینە دژایەتیەکی توندیان هەبوو، بڕیارمدا شوێنی کتێبی دواترم هەرێمی دووری کەناری خۆرهەڵاتی بەریتانیا بێت، لە تەنیشت بنکەیەکی ناڤۆکی و باسی هەندێك مەسەلەی ناڤۆکیش بکەم، هەڵقوڵانی ئیلهام ساتێکی زۆر وروژێنەری هەیە، چونکە ئەو کاتە دەزانم کتێبێك لە گۆڕێدایە، جا نووسینەکەی هەر چەندە درێژە بکێشێت.

**شوشا گاپی**

هەندێ لە ڕۆماننووسان و شانۆنامەنووسان، دان بەوە دەنێن لە دروستکردنی بیرۆکەی چیرۆك تووشی گرفت دەبن، لەبیرمە (تۆم ئستاپرد[24]) کاتێك دانی بەو مەسەلەیەدا نا، زۆرکەس بەیەکجاری پەشیمان دەبنەوە کە سکێچی چیرۆك و ڕۆمانێك دەنووسن کە هیچ ڕوداوێکی تایبەت تێیدا ڕوونادات، لە چیرۆکی پۆلیسی، سکێچی چیرۆك لە هەموو شتێك گرنگترە، دوای ئەوەی کە کات و شوێنی ڕۆمانەکەت دۆزییەوە، سکێچی چیرۆك چۆن دروست دەکەیت؟ یەکسەر دەست بە نووسین دەکەیت؟

**پی.دی.جێمز**

نەخێر، لانی کەم چەند مانگێك درێژە دەکێشێت، بە ڕای من، زۆر کەس نازانن چۆن سکێچی چیرۆکێك دروست بکەن، ئیتر ناتوانن چیرۆکەکە بنووسن. هەندێ نووسەر دەتوانن ئەو کارە بکەن، بەڵام نایانەوێت بیکەن. حەزدەکەن جیاوازیان هەبێت، بەڵام لە نەریتی ئەدەبیاتی چیرۆکی ئینگلیزی دەمارێکی ڕیوایی بەهێز هەیە، هەموو ڕۆماننووسە گەورەکانمان لە ڕابردوودا

وەفایان بۆ ئەو نەریتە هەبووە، لەبارەی خۆمەوە، لەو باوەڕەدام کە سکێچی چیرۆك زەرورییە، هەرچەندە کە نووسینی کتێب بەبێ بیرۆکە و سکێچیش کارێکی زەحمەت نییە. لە دەیەی1930، واتە لە سەردەمی زێڕینی چیرۆکی پۆلیسی بیرۆکەی چیرۆك لە هەموو شتێك گرنگتر بوو، لە ڕاستیدا خەڵك حەزیان دەکرد نوێگەری لە بیرۆکە و شێوازی چیرۆکدا بکەیت، کوشتنی کەسێك بە تەنیا قەبوڵ نەدەکرا، حەتمەن دەبوایە بە جۆرێك هۆشمەندی کەموێنە دروست کرابایە، لەوکاتەدا لاشەکانیان لە ژورێك دەدۆزییەوە کە دەرگاو پەنجەرەکانی قوفڵ کرابوون لە کاتێکدا شوێنەواری ترس و تۆقاندن لە دەموچاویاندا دیاربوو، لەبارەی ئاجاتا کریستی، نوێگەری لە بیرۆکە و سکێچی چیرۆك لە هەموو شتێك گرنگتر بوو، هیچ کەسێك بەدوای وردەکاری لە دروستکردنی کەسایەتی و ئامانج و نووسین تێڕوانینی نەبوو. کەم تا زۆر لە جۆرێك شارەزایی ئەدەبی دەچوو، ئەمڕۆ نزیکتر بووینەوە لە ڕۆمانی (مەتەڵ)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستمان بە بیرۆکەی چیرۆك هەیە، گەڵاڵەکردنی بیرۆکەی چیرۆك و پەروەردەکردنی و دەرچواندنی کەسایەتییەکان بۆ من هەر هێندە درێژە دەکێشێت کە نووسینی کتێب درێژە دەکێشێت. هەندێ جار زیاتریش، بەم شێوەیە کاتێ زەمینەی کتێب لە زەینمدا ئامادە بێت، دەست دەکەم بە دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤەکان- هەمیشەش هەر وا بووە- پاش هەموو شتێك دەچمە سەر سەرەداوەکان. لەکاتی نووسینی (فێڵەکان و ئارەزووەکان) پانزە دەفتەری یاداشتم هەبوو، دەگەڕامەوە سەر دیمەنی یەکەم لەبارەی ئاسمان، دیمەن، بیناسازی بیناکان، خەڵکی ئەو هەرێمەو... یاداشتم دەنووسین، شتێکی سەیرە. هەست دەکەم کەسایەتیەکانی چیرۆك، پێشتر لە هێڵێك دان کە لە دەرەوەی دەستەڵاتی منن، کاری من بە درێژایی چەندین مانگ کە خەریکی نووسینی چیرۆکەکەم لەگەڵیاندا پەیوەندی دروست دەکەم تا لەگەڵ تایبەتمەندیەکانیان ئاشنا ببم.

**شوشا گاپی**

هەر بەم هۆیەوەیە کە ڕۆماننووسان دەڵێن، نازانین کۆتایی ڕۆمانەکەمان بە کوێ دەگات، بەڵام لە ڕۆمانی پۆلیسیدا ناچاری، دەبێ کۆتاییەکەی بزانیت، چونکە کۆتایی ڕۆمان- واتە هەمان لاشە- کە لەسەرەتاوە هەیە.

**پی.دی.جێمز**

وایە، بەڵام جیاوازی هەیە لە نێوان ڕۆمانی تاواننووسین و ڕۆمانی پۆلیسی، ڕۆمانی پۆلیسی فۆرمێکی زۆر ڕێکخراوی هەیە، چونکە بۆ زانینی مەتەڵەکە بە نیشانە و سەرەداوی مەنتیقی بەستراوەتەوە. ڕێگاچارەتان دەبێ مەنتیقی بێت، هەربۆیە ناچاریت کۆتایی ڕۆمانەکە لە سەرەتادا بزانیت.

**شوشا گاپی**

دەتوانیت لەبارەی جیاوازی نێوان ڕۆمانی پۆلیسی و ڕۆمانی تاوانی ڕوونکردنەوەی پتر بدەیت؟ مەگەر لەهەردوو شێوەکەدا تاوانێك، کوشتنێك ڕوونادات؟

**پی.دی.جێمز**

ڕۆمانی تاوانی، بوارێکی بەرفراوان دەگرێتەوە، لە مەسەلەی سەلمێندراو و خۆشەویستانەی ئاجاتا کریستی و گوندی ئینگلیزی بچووکی بگرە- بە هەبوونی نرخی تاوانێکی بەرزتر لە مامناوەندەکەی، هیچ کات کاری بێگوناهی خۆی لە دەست نادات... تا بەرهەمی ویلکی کالینز[25] و ترالوپ (ئەڵماسەکانی یوستیس[26]) دیکنز (مەتەڵی ئدوین درود[27]) و گراهام گرین، تا ڕۆمانەکانی سیخوڕی و تاوان و سزای برایانی

کارامازۆڤ دۆستۆفیسکی. بەم شێوەیە، ڕۆمانی پۆلیسی لە ڕوانگەی من یەکێکە لە جۆرەکانی ڕۆمانی تاوانی، ئەمریکیەکان پێی دەڵێن (ڕۆمانی مەتەڵ) کە بەڕای من وەسفکردنێکی گونجاوە. لە ڕۆمانی تاوانیدا ڕەنگە بزانیت بکوژەکە کێیە، بەڵام لەزەتی چیرۆکەکە لەوەدایە کە ئایا ئەو تاوانبارە دەگیرێت یان نا، هەروەها کاریگەری ئەو تاوانە لەسەر ئەو، لەسەر خەڵکانی دەوروبەر و ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژێیت. دەکرێ بڵێین (بەردی برایتین[28])ی گراهام گرین ڕۆمانێکی تاوانییە، بەڵام هیچ مەتەڵێکی تێدانییە، بابەتی ئەو کتێبە پەیوەندی (پینکی[29])یە لەگەڵ خۆشەویستەکەی، لایەنە ئاینییەکەی ئەو مەسەلە. هەربۆیە چیرۆکی پۆلیسی سنووردارترە.

**شوشا گاپی**

کاتێ دەست بەنووسینی چیرۆك دەکەیت، بەشێوەیەکی ڕێکوپێك لە سەرەتا تا کۆتایی دەینووسیت؟ یان سەرەتا دیمەنی تاوانەکە دەنووسیت؟

**پی.دی.جێمز**

جیاوازی هەیە، هەندێجار سەرەتا دیمەنە گرنگ و دیارەکان دەنووسم، پاشان ئەوانی تر، پاراستنی بەردەوامی ڕەنگە ببێتە هۆی زەحمەت، بەڵام من بەگشتی باش دەریدەچوێنم.

**شوشا گاپی**

ئێستا دێینە سەر کەسایەتی سەرەکی، واتە پۆلیسی لێکۆڵەر، ئەو لە چەند ڕۆمانی تۆدا یەك لە دوای یەك وەدیاردەکەوێت، ئەوە بابەتی کارەکە تاڕادەیەك ئاسان دەکات، چونکە دوای ئەوەی کە ئەوت دروست کرد، دەتوانیت پیر بوون و گۆڕان و عاشق بوونیشی ببینیت. لێکۆڵەری تۆ لێکۆڵەر ئادام دلگلیش لە سکوتلەندایە. ئەوت لە کوێوە هێناوە؟ ناوەکەت لەکوێ هێنا؟ ئەو کۆپیەکی نێر نییە لە خۆت؟

**پی.دی.جێمز**

مامۆستای زمان و ئەدەبی ئینگلیزیم ژنێکی سکوتلاندی بوو بەناوی میزی دڵگلیش. بەدوای ناوێکدا دەگەڕام کە زۆر سەیر و سەمەرە نەبێت، لە هەمان کاتیشدا زۆریش ئاسایی نەیەتە بەرچاو، سەیر لەوەدابوو من ناوی خۆیم ناوە ئادام لە کاتێکدا کە چەندین ساڵ دواتر مامۆستاکەم گوتی من باوکم ناوی ئادام بووە، بەڵام پێموانییە کۆپی نێری من بێت. بێ دڵەڕاوکێ ئەو چەند تایبەتمەندییەکی هەیە کە من لە مرۆڤەکاندا پشتگیری دەکەم، چونکە کاتێك مرۆڤ کەسایەتیەك دروست دەکات و بڕیارە بەردەوام لە کتێبەکانیدا دەربکەوێت، دەبێ خۆشی بوێت و بتوانێت چەندین ساڵ لەگەڵیدا بژێت، ڕۆمانەکانی دەیەی1930 بۆ هەموومان وانەیەکی پەنداوییە: ئاجاتا کریستی بە دڵنیاییەوە پەشیمان بوو لە دروستکردنی ئەو بەلجیکییە لاواز و ئادگار وردە سمێڵ ڕۆنکراوە، بەڵام نەیدەتوانی لێی ڕزگار بێت.

(دوروتی ئێل سایرز)یش هەر ئەو گرفتەی لەگەڵ (پیتر ویمزی) هەبو کە یەکەمین جار لە ڕۆمانی (ئەو لاشەیە کێیە؟) لە ڕۆڵی لاوێکی خۆشگوزەران و کۆمەڵایەتی دەرکەوت، بەڵام لە (شەوی دەعەوەت) ئەو دەبینین لە دەستەیەکی جیاواز دا لە ڕۆڵی لۆرد پیتر ویمزی، هەربۆیە بیرم لەوە کردەوە کەسایەتیەك دروست بکەم کە ڕێزم هەبێت بۆ تایبەتمەندییەکانی، تایبەتمەندییەکانی وەکو بەخشندەیی و میهرەبانی و هۆشمەندی.

**شوشا گاپی**

بەمانایەکی تر، هەر ئەو تایبەتمەندییەی کە هەموو کەس دەڵێ هەمە! بەڵام

ڕۆژێـــك دڵگلیـــشت لابـــردووە و ژنێکـــی لێکۆڵـەرت هێناوەتـە نـاو چـیرۆکەکانت بـەناوی کوردلیا گری[30]. واتە شەپۆلی فیمینستی ڕۆمانی پۆلیسشی گرتەوە؟

پی.دی.جێمز

نـەخێر، زەروورەتـی ئـەو چیرۆکە تایبەتـە وای پێویـست دەکـرد، دەمویـست ڕووداوەکـانی ئـەو کتێبە لـە کیمبریج ڕووبدات کە زۆریش حەزم لێی بــوو. خوێنــدکارێك بەشــێوەیەکی زۆر خــراپ و بێرەحمانــە کوژرابــوو، لــە خۆکــوژی دەچــوو، پێویــستی بــە لێکۆڵەرەوەیــەکی لاو هــەبوو، لــەناکاو کەوتمــە ئــەو بــیرەی بــۆ ئــەو پۆلیــسە لێکۆڵەرە ژن نەبێت، ئەوەی کە ئەو بیرانە چۆن دێنە زەینـی مـرۆ، ئـەوەش مەتەڵێکـە، کوردلیـا جـوان و ئــازاو باوەڕبەخۆیــە. دەزگایــەکی وێرانــی لــە ســەرۆکەکەیەوە بــۆ بــەجێماوە، خــۆی دەبــێ ئــاوەدانی بکاتــەوە، ناونیــشانی ڕۆمانەکــەم هــەر لــەوەوە سەرچـاوەی گرتــووە (پیــشەیەکی نــەگونجاو بــۆ ژنێــك) یەکــەمین کــار کــە دێتــە بەردەســـتی. دۆســـێی مردنـــی کـــوڕی زانایـــەکی بەرجەســـتەی کیمبریجـــە، دەســـتەی پێداچـــوونەوە ڕای خـــۆی داوە کـــە کێـــشەکە خۆکوشـتنە، بـەڵام بـاوك هەسـت دەکـات کوشـتن - بووە و دەیەوێت تێبگات، بەم جۆرەیە کە کوردلیا دێتــە نـاو مەسـەلەکە و تێـدەگات کـە خۆکوشـتن ساختەیە و مردنی ئەو گەنجە لە ڕاستیدا کوشتن بووە نەك خۆکوشتن.

شوشا گاپی

چـەند پۆلیـسێکی لێکۆڵـەری ژنـی بـەناوبانگ بەتایبـەتی لـە ئـەمریکا هـەن، ئـەوان بـە پێچەوانەی خاتو مارپۆلی ئاجاتا کریستی، پۆلیسی بە تـەکنیك نـین، زۆر پیــشەیین- چـەکدارن، خـواردنی ئامـادە دەخـۆن و کابـانیش نـین- بـە کـورتی هێنــدە تایبەتمەندی ژنانەیان نییە!

پی.دی.جێمز

بـەڵێ وایـە، بەتایبـەتی لـە نووسـینی ژنـە ئەمریکییەکان ڕووبەڕووی پۆلیسی ژن دەبینەوە کە پیشەیین، ئەوان لە جیهانێکی توندوتیژ کاردەکەن، هـەروەکو پیاوەکـان چەکدارن، بـەڵام لـە مەملەکـەتی ئێمەدا، پۆلیسی تایبەت مۆڵـەتی هـەڵگرتنی چەکی نییـە، بەهـەرحاڵ کوردلیـا کەسـایەتیەکی کـۆنترە، بیست ساڵ دەبێت لەسەر کاغەز دروستم کردووە. لە نووسینەکانی دەشیل هـەمیت و ریمۆنـد چندلر، لێکۆڵەر کەسێکی گۆشەگیرە، بەگشتی دژی پۆلیس کاردەکـات، لـە ڕاسـتیدا، لەلایـەن پۆلیسەکانیشەوە ترسـی هەیـە هـەروەك لای تاوانبارەکـان، چـونکە ئەگـەر پـۆلیس کارەکـەی پەسـەند نـەکات، ڕەنگـە کارەکـەی لـە دەسـت بـدات، بـەڵام لـە کتێبەکەمـدا واقیعی نەبوو کوردلیا لێکۆڵـەرێکی تایبـەتی بێـت و مۆڵەتی هەڵگرتنی حەوتخۆری هەبێت.

شوشا گاپی

بــەڕای تــۆ، دیارکــەوتنی لێکۆڵــەرەوەی ژن پەیوەندی بە فیمینیزمەوە نییە؟

پی.دی.جێمز

ڕەنگـە واش بێـت، بـەڵام لەلایـەکی تـریش ئـەو ڕۆمانانــە ڕیالیـستین و لێکۆڵـەری تایبــەت دەبـێ پیـــشەیی بێـــت تابتوانێـــت لـــەو کۆمەڵگایـــەدا بەسەرکەوتویی چالاکی ئەنجام بدات.

شوشا گاپی

وەك ئــەوەی خۆتــان دەڵــێن، ســەربە نــەوەی کۆنترن، خۆت بە فیمینیست دەزانیت؟

پی.دی.جێمز

بـەڵێ، ئەگـەر ڕاسـتیت دەوێ... فیمینیـزم تـەنیا ناوێکە و هیچی تر، من تا ئەو شوێنە فیمینیستم کە داوای ئـەوە دەکـەم، بـە یەکسانی ڕەفتـار لەگـەڵ ژن بکرێــت، هــەروەها پۆســتی یەکــسان، موچــەی یەکسان، کۆمەڵگایەکی بنیاتنراو بەیەکسانی زیاتر،

زۆریش هاوڕەگەزەکانی خۆمم خۆشدەوێن، بەڵام بەڕای من ئەمڕۆکە هەندێ لە فیمینستەکان توندڕەون و دژی پیاون، دڵیشیان خۆش نییە بەوەی ژنن. ئەو مەسەلەیەش بۆ من هەرس ناکرێت، ڕاستیەکەی ئەوەیە بۆ هەندێك کێشەی بنەڕەتی هیچ ڕێگاچارەیەکی ئاسان بوونی نییە، ئێمە لەلایەن بایۆلۆژیەوە وا دروست بووین کە منداڵمان ببێت، و منداڵان زۆر پێویستیان بەئێمە دەبێت، بەتایبەتی کاتێ کە بچوکن، لە هەلومەرجی یەکسان لەگەڵ پیاوان، ئەو مەسەلەیە کارکردن بۆ ژنان زۆر زەحمەت دەکات، سەیر ئەوەیە ئەمڕۆ ژیانی ژنان، بە بەراورد لەگەڵ دایکان و داپیرانمان زۆر زەحمەتترە، هەرچەندە یەکسانی ڕەگەزەکان زیاترە. جاران ژنان بنەماڵەی زۆر گەورە و دایەنی زۆرباش و جێگای متمانەیان هەبوو، ئەمڕۆکە ئێمە کۆمەکی وامان نییە، و دەرگاکانی کار و پیشەش ئەو کاتە کراوەیە بۆ ژنان، زۆر زەحمەتە بەبێ زیان گەیشتن بەمنداڵ بتوانێت کار بکات. لە ئەنجامدا ژنان هەم لەلایەن فیزیکی، هەم لەلایەن سۆزدارییەوە لە ژێر گوشارن، کەسێك دەبێت ماڵ بەڕێوە ببات، ژنیش کۆڵەکەی ماڵە، هەرچەندە مێردەکەی زۆر باش بێت و بەشێکی کارەکانی ماڵەوە بگرێتە ئەستۆ، لەوانەیە ناچاربن شتێك هەڵبژێرن کە بەدڵیان نەبێت، ناچار بن واز لە کارەکەیان بێنن، چەند ساڵێك لە ماڵەوە بمێننەوە تا منداڵەکان بگەیەننە تەمەنی قوتابخانە، زۆرجار ئەو بەناو سەربەخۆییە واتاکەی لەوەدایە کە تۆ پارە دەدەی بەکەسێکی تر تا کارەکەت بۆ ئەنجام بدات، دەچیت کار دەکەیت تا پارە پەیدا بکەیت و مووچەی ئەو ژنە بدەیت کە ئاگای لە منداڵەکەتە و بەخێوی دەکات، ئەو لە جیاتی تۆ چێژ لەو منداڵانە وەردەگرێت.

**شوشا گاپی**

لە کەشی هەندێ لە دەزگاکان کە لەسەر پاراستنی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی بنیاتنراون، وەکو ئەو زانکۆیانەی زۆرجار کۆڕیان تێدا دەگێڕێت، دەربڕینی ئەم جۆرە تێڕوانینانە سەخت نییە؟

**پی.دی.جێمز**

ماوەیەك لەمەوبەر، چووبومە کۆلێژی سامیرویل[31] لە ئۆکسفۆرد، لە ئاودەستەکانی ئەوێ چەند ڕیکلامێکم بینی لەبارەی هێڵەکانی ڕاوێژکاری تەلەفۆنی بۆ فلان و فیسار بابەت، بۆ ڕێگەپێگرتن و دەستدرێژی و... ئەو ژنە بێ هاوتایانەم بیرکەوتنەوە، لە دەرچوانی یەکەمین خولی زانکۆدا بوون و وێنەکانیان لەوێدا بە دیوارەوە هەڵواسراوە، بەخۆم گوت ژیان بۆ ئەوانیش هەرگیز ئاسان نەبوە، بەڵام ئەگەر ئەمڕۆ دەگەڕانەوە، حەتمەن لە بینینی ئەو کۆمەڵگایەی ئێمە تێیدا دەژین دڵیان دەتۆقی، بە بڕوای من، پاراستنی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی لە زمانێدا دەکرێ جۆرە فاشیزمیەکی زمانی بێت، و لەرزین دەخاتە پشتی کەسانی نەوەی من کە لەگەڵ فاشیزمدا جەنگاون، تاکە ڕێگەی کاردانەوە ئەوەیە بەیانیان لەخەو هەڵدەستن پێش نانی بەیانی، ڕۆژتان بە گوتنی چوار یا پێنج شتی پێچەوانەی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی دەست پێبکەن!

**شوشا گاپی**

بگەڕێینەوە سەر کارتان، پێش ئەوەی خۆتان دەست بە نووسین بکەن، کاری کام لە ڕۆماننووسەکانی ژانری پۆلیسیت زۆرتر پەسەند دەکرد؟

**پی.دی.جێمز**

نووسینی ژنانی نووسەری ژانری پۆلیسیم پتر دەخوێندەوە: دوروتی ئێل سایزر، نائیۆ مارش[32]، ژوزفین تی[33]، هەموو ژنانی پۆلیسی نووس. ئەم ڕۆژانە زۆر ڕۆمانی تاوان ناخوێنمەوە، حەزم لە کتێبی ترە.

**شوشا گاپی**

هاوچەرخەکان چی؟ بۆ نموونە ڕۆت ڕندل[34] و لاوترەکان کە هەندێکیان سەرکەوتوو بوون؟

**پی.دی.جێمز**

حەزم لەوانە، ڕوت ڕندل چیرۆکی پۆلیسی بەناوی خۆی و چیرۆکی تاوانی بەناو خوازراوی باربارا واین دەنووسێت، بەڕای من چیرۆکە تاوانییەکانی زۆرباشن، من زیاتر ئەوان پەسەند دەکەم.

**شوشا گاپی**

تائێرە ئاماژەتان بە زۆر نووسەر کردووە– ئاجاتا کریستی، دوروتی ئیل سایرز، هەمیت، چندلر.. دەمەوێت لە بارەی دووکەس لە گەورەترین نووسەرانی ئەو ژانرە لە هەموو سەردەمەکان بپرسم، مۆڵەتم بدە بە شرلوك هولمز دەست پێبکەین، لێکۆڵەر سێر ئارتۆر کانون دویل.

**پی.دی.جێمز**

هەموو تاوانی نووسەکان، هەرچەند زۆر بێ ئاگایانە، لە ژێر کاریگەری سێر ئارتۆر کانون دویل بوون، میراتی ئەو بۆ تاوانی نووسەکان بریتی بوو لە: بەهادانان بۆ توانا و لۆژیك، و بیرکردنەوەی ناجێگرانە، توانای چیرۆك گێڕانەوە، توانای دروستکردنی جیهانێکی تایبەت و جیاواز، هەڵبەتە ئەو دروستکەری یەکێك لە یەکەمین لێکۆڵەرەوەکانی بە تەکنیك و بێ دوودڵی و بەناوبانگترینیانە، واتە هەمان شرلوك هولمزی ناودار ڕەنگە گەورەترین خزمەتی ئەو بە تاوانی نووسی ئەوە بوبێت کە خۆشەویستی بەو ژانرە بەخشی، خۆشەویستییەك کە هەرگیز لەناونەچوو.

**شوشا گاپی**

ژۆرژ سیمینون چۆن؟ کتێبەکانی ئەوت زۆر دەخوێندەوە؟

**پی.دی.جێمز**

من زۆر دەستخۆشی لە کاری ئەو دەکەم. سیمینون، بە گوێرەی هەر پێوەرێك بێت، ڕۆماننووسێکی زۆرباشە، توانای درکی تایبەتی هەیە لە دەروونناسی مرۆڤ، بەتایبەت دەروونناسی زەینی تاوانبار، وەکو ڕۆماننووسێکی تاوانی شێوازێکی تاك و تایبەت بەخۆی هەیە، لەو ڕوانگەوەی کە بە گوتەی خۆی پێشتر سکێچی وردی بۆ کتێبەکانی ئامادە نەدەکرد، ناوی کەسایەتیەکانی لەسەر دەفتەری تەلەفۆنی جیهانییەوە هەڵدەبژارد و دواتر ئەوانی دەخستە شوێنی دیاریکراو و وازی لێ دەهێنان تا خۆیان بارودۆخەکان وەدەست بگرن، هەڵبەتە ئەو شێوازە بۆ نووسەری ڕۆمانی پۆلیسی شێوازێکی ماقوڵ نییە، چونکە لە ڕاستیدا لەگەڵ دروستکردنی سەرەداوی ورد، کە پێویستیی سەرەکی و بنەڕەتی پۆلیسییە، بەراورد ناکرێت. بەڕای من، ژۆرژ سیمینون، تاوانی نووس بوو، تاوانی نووسێکی زۆرباش، نەك نووسەری چیرۆکی پۆلیسی.

**شوشا گاپی**

دەڵێن ژنان زۆرباش دەتوانن ڕۆمانی پۆلیسی بنووسن، بەڕای ئێوە هۆیەکەی چییە؟ هەستی بۆنکردنی بە هێزتریان هەیە؟ بۆ وردەکارییەکان هۆشیارترن؟ یانیش هاودڵی زیاتریان هەیە؟

**پی.دی.جێمز**

ئەوە واقیعیەتێکە، ژنان لە نووسینی چیرۆکی پۆلیسی سونەتی، لەگەڵ سەرەداوی ورد هاوتایان نییە، هەرچەندە لە نووسینی ڕۆمانی تاوانی جیدی و بەپەلە و توندوتیژ، تا ئێستاش بەگشتی قەڵەمڕەوی نووسەرانی پیاوە، هێندە سەرکەوتوو نین. یەکێك لە هۆیەکانی سەرکەوتنی ژنان لە نووسینی چیرۆکی پۆلیسی، ڕەنگە دیدی ژنانەمان بێت بۆ وردەکارییەکان، دروستکردنی سەرەداوی پێویست، سەرنجدانە بۆ وردەکاریی ژیانی ڕۆژانە،

جۆرج ئۆروێڵ گوتەنی، کوشتن– واتە هەمان تاوانی بێ هاوتا– دەبێ سۆزی بەهێز بجوڵێنێت، و ئێمەی ژنان زۆرتر حەزمان لەو سۆزەیە تا کەرەستەی شەڕ، لەوانەشە ژنان دەگەنە ئەو ئەنجامەی پێکهاتەی ڕێکوپێکی فۆرم کارامەیە و توانای ئەوەمان پێ دەدات ڕووبەڕووی ڕوداوی ترسناك ببینەوە، ڕوداوێك ڕەنگە لە دەرەوەی سەپاندنی ئەو ژانرە بۆمان ناخۆش بێت.

**شوشا گاپی**

کاتێ یەکەمین ڕۆمانت نووسی، سەیرت پێهات کە بۆ چاپ پەسەندیان کرد؟

**پی.دی.جێمز**

نەخێر، بەڵام زۆر خۆشحاڵ بووم، هەمیشە لە ناخی دڵمەوە دەمزانی ئەگەر بتوانم ئەو کتێبە بنووسم، بەدڵنیاییەوە بڵاو دەبێتەوە. هەربۆیە یەکەمین بڵاوکەرەوەی کە دەستنووسەکەم بۆ نارد واتە فابر و فابر[35]، پەسەندی کرد، لەو کاتە بەدواوە هەر لەگەڵ ئەو دەزگایە کارم کردووە. من شانسم هەبوو، زۆر ڕۆماننووسی باش هەن کە مێـزی کارکردنیان پڕە لە وەرەقەی لێبوردن بۆ چاپ.

**شوشا گاپی**

کەواتە سەرکەوتنی کتێبی یەکەمت بووە هاندەرت بۆ ئەوەی درێژە بەنووسین بدەیت، بەڵام چۆن بوو دوای نووسینی یانزە چیرۆکی پۆلیسی، پار (منداڵەکانی مرۆڤەکان)ت نووسی، کە دەتوانرێت ئەو کتێبە بە حیکایەتێکی ئەخلاقی ئایندەگەرایانە بژمێردرێت؟

**پی.دی.جێمز**

ئەوە وەسفکردنێکی ڕاستە، چونکە من، بەپێچەوانەی تێڕوانینی هەندێ کەس، ئەو بە چیرۆکێکی زانستی خەیاڵی نازانم، مەبەستم نەبوو چیرۆکی ئەخلاقی بنووسم، بەڵام وا دەرچوو، لەم بارەیەوە، هیچ دیمەنێك بەهرەبەخشی چیرۆك نەبوو، بەڵکو ناساندنی کتێبێکی زانستی لە یەکێك لە بڵاوکراوەکان سەرنجی منی ڕاکێشا، بۆ کەم بوونەوەی ژمارەی سپێرمی پیاوانی خۆرئاوایی: پەنجا لە سەد، لەماوەی پەنجا ساڵ، لەو بارەیەوە لەگەڵ چەند زانایەك قسەم کردو و پرسیارم کرد، ئەوانیش دەیانگوت لەوانەیە هۆیەکەی پیسی ژینگە بێت، بەڵام ئەو وتارە ئاماژەی بە هۆکارێکی تر دەکرد: ملیارەها جۆر ژیان، کە هەموویان سەردەمێك لەسەر ئەو خاکەدا دەژیان، ئێستا زۆربەیان لەناوچوون، چارەنووسی جۆری مرۆڤیش هەر لەناوچوونە، ئەو ماوەیەی هاوجۆرەکانمان لەسەر ئەو خاکەدا ژیاون چاوتروکاندنێك زیاتر نەبووە، بۆیە بیرم لەوە کردەوە کە بەریتانیا دوای بیست یان بیست و پێنج ساڵی تر، دوای لەدایکبوونی دوایین منداڵ چۆن دەبێت، ئەوکاتە بیست و پێنج ساڵە کەس دەنگی گریانی منداڵێکی نەبیستووە. دانیشتم و ئەو کتێبەم نووسی، لەو چیرۆکەدا تاوان بوونی هەیە، بەڵام بە چیرۆکی پۆلیسی ئەژمار ناکرێت، وەك ئەوەی کە گوتت، حیکایەتێکی ئەخلاقیە، لەگەڵ هەموو کتێبەکانی ترم زۆر جیاوازی هەیە.

**شوشا گاپی**

گەورەترین گرفتی جیهان زیادبوونی دانیشتوانە، نەك کەمبوونەوەی ژمارەی سپێرمی پیاوانی ڕۆژئاوا، پێتوانییە کەمبوونەوەی ژمارەی سپێرم لەوانەیە بەهرەیەکی تێدا بێت؟

**پی.دی.جێمز**

دەزانم، هیندستان ناتوانێت بەسەر ئەو گرفتەدا زاڵ بێت، دەڵێن چینییەکان خەریکن ژمارەی دانیشتوانیان کۆنترۆڵ دەکەن، بەڵام بەرانبەر چی! لە ئەفریقیا، ئایدز و برسیەتی هۆکاری سەرەکی مردنن، بەڵام لە خۆرئاوا نرخی لە دایکبوون بەرەو

کەمبونەوەیــە، کەواتــە یــان مــرۆڤ خەریکــە لــە زانـستی خـۆی سـوود وەردەگریـت بـۆ کـۆنترۆڵی زیادبوونی، یان ئەوەی هەموو جۆرەکانی ژیان بە نەمان مەحکومن.

**شوشا گاپی**

باســی ڕۆمــانی نوێتــان بکــەن، (یەکــەمین گونــاه) ئـادام دلگلـیش گەڕاوەتـەوە بـەم هۆیـەوە گەڕایتـەوە سـەر ژانـری پێـشتری خـۆت، هەنـدێ لـە ڕەخنـەگران ئـەویان زیـاتر پەسـەند دەکـرد؟ یـان لەوانەیــە هەنــدێك لــە خوێنــەران دەیانەویــست دڵگلیش بگەڕێتەوە؟

**پی.دی.جێمز**

(منـــدالانی مرۆڤـــەکان) پێـــشوازییەکی باشـی لێکـرا و لەلیـستی پـڕ فرۆشـەکان گەیـشتە شەشــەمین کتێــب، بابــەتی دڵگەرمکەریــشیان لــە بــارەوە نووســی، بــەلام خوێنــەران، لــە هــەمان کاتـدا، غـەریبی دڵگلیـشیان کردبوو، هیـوادار بـوون کە ئـەوم تاهەتایـە فـەرامۆش نـەکردبێت، بـەلام بـەو هۆیەوە نەبوو کە ئەوم گەڕاندەوە، ڕووداوەکانی ئەو کتێبــە لــە لەنــدەن ڕوودەدات، لــە جیهــانی بلاوکردنەوەدا.

**شوشا گاپی**

چۆن بوو جیهانی بلاوکردنەوەت کردە زەمینەی ئەو ڕۆمانە؟

**پی.دی.جێمز**

بڕیارمـدا ڕووداوەکـانی ئـەو ڕۆمانـە لـە لەنـدەن، لە کـەناری ڕووبـاری تیمـز و لـە کۆشـکێك کـە شـێوازی بیناسازییەکەی وینیزییە ڕووبدات، بەخۆمم گوت بۆ لە جیهانی بلاوکردنەوەدا نەبێت.

**شوشا گاپی**

دەکرێ ڕوونکردنـەوەی زیاترمـان لـە بـارەی ئـەم کتێبەوە پێ بدەی؟

**پی.دی.جێمز**

ڕووباری تیمـز وەکـو پێکهاتەیـەکی یـەکگرتوو لـە سەرتاســەری ڕۆمانــدا بەردەوامــە، لــەو ڕۆمانەشــدا لێکۆڵەری پیشەیی ژنی من، (کیت میسکین[36]) دێتە یارمــەتی دڵگلــیش، ئــەو یەکــەمین جــار لــە کتێبــی (سروشـــــتی مـــــــردن[37]) وەدەرکـــــــەوت، (هنری پێڤریل[38])ی تازە مردوو، شـەریکەکەی ژان-(فیلیپ ئتین[39]) یش خانەنشین بووە، و ئێستا ژرار، کـــوڕە دڵڕەقەکـــەی ئـــتین ســـەرۆکی دەســـتەی بـــەڕێوەبردن، بەڕێوەبـــەری کـــارگێڕی دەزگایـــە. ئــەو لــە ســەرەتاوە چــەندین دوژمنــی بۆخــۆی دروســت کــردووە کــچێك کــە وازی لێ هێنــاوە، نووســەرێك کــە بەرهەمەکــەی پەســەند نــەکردووە و ســوکایەتی پــێ کــراوە، هاوکارەکـانی و کرێکـارانی پوریـــــل کـــــە ترســـــیان هەیـــــە لـــــە لەدەسـتدانی شـوێنەکانیان. کـاتێ لاشـەکەی ئـەو لەحەوشــەی بیناکــە دەدۆزنــەوە، بــە شــێوەیەکی دڕندانـە کـوژراوە، ژمـارەی گومانلێکراوەکـان بـەهیچ شێوەیەك کەم نییە.

**شوشا گاپی**

بـۆ (یەکـەمین گونـاه)ت هەڵبـژارد؟ ناونیـشانی کتێب بۆتان گرنگە؟

**پی.دی.جێمز**

ناونیـــــشانی کتێـــــب زۆر گرنگـــــی هەیــە و دۆزینــەوەی نــاوی گونجــاو بــۆ کتێــب کــارێکی ســەختە، لــەبارەی منــەوە، ناونیــشانی کتێــب یــان زۆر زوو و بــێ هــیچ گرفتێــك دەدۆزرێتــەوە، یــان زۆر درێــژە دەکێــشێت و بەزەحمەت دەیدۆزمەوە.

**شوشا گاپی**

ئەگەر لە دۆزینەوەی ناونیشان گرفتت هەبێت، کەسـێك یارمـەتیتان دەدات؟ بـۆ نموونـە، ئەوانـەی پێیدادەچنەوە.

**پی.دی.جێمز**

نەخێر، مەگەر لەیەك حاڵەت، (خوێنی بێگوناه) کە یەکەمین ڕۆمانی پڕ فرۆشی من لە ئەمریکا بوو لەبارەی کچێکە کە لە ماڵێك بەخێوکراوە و هەوڵ دەدات دایك و باوکی خۆی بدۆزێتەوە، ناونیشانی یەکەمی ئەو کتێبە (موتوربەی خوێن)بوو، بەڵام زانیمان کە لە ئەمریکا کتێبێك بەو ناونیشانە هەیە، هەڵبەتە لەبارەی ناونیشان مافی نووسەر وجودی نییە، بەڵام باشترە کە خۆمان بپارێزین لە دووپاتکردنەوەی ناونیشان، بڕیارماندا ناوی بگۆڕین. لەوکاتەدا کتێبەکە لە قۆناغی نموونەی چاپی بوو، ئێمەش دەستمان بەتاڵ بوو، جگە لە (موتوربەی خوێنی) شتێکم بەبیردا نەدەهات، بەڵام ئەو ناونیشانە منی بەتەواوی ڕازی نەدەکرد، ئەوکاتە یەکێك لە دۆستانی کاسۆلیکم پێی گوتم ئەگەر شتێك ون بوو لەبەر دەرگای ئەنتۆنی قەدیس دوعا بکە، دەیدۆزییەوە، من کاسۆلیك نیم، بەڵام لە دەرگای ئەنتۆنی قەدیس دوعام کرد، بەیانی ڕۆژی دواتر کە لە خەو هەڵسام، یەکەمین شت کە بەبیرمدا هات (خوێنی بێ گوناه)بوو. کە ناونیشانێکی زۆر باشیشە.

**شوشا گاپی**

ئێستا ئیدی بیرت لە کتێبی دواتر کردۆتەوە؟

**پی.دی.جێمز**

نەخێر هێشتا نا، هەر دیار نییە کتێبێکی وا هەبێت، هەروەك گوتم، نیگەران نیم پەلە ناکەم، بزانم چ شتێك ئیلهامم پێ دەبەخشێت، جارێ خەریکی خوێندنەوەی نموونەی چاپم، دوای ئەوە خەریکی ریکلامی کتێبەکەم دەبم، هەم لێرە و هەم لە وڵاتە یەکگرتووەکان.

**شوشا گاپی**

حەزدەکەم باسی خاڵێکی تر بکەم کە خۆشت پێشتر ئاماژەت پێکرد: کەڵکەڵەی مردن، جگە لە پەیوەندی کارتان، خۆشت حەزت لەو بابەتەیە؟ مەبەستم هەندێك لە خەڵك– لەوانە هەر ئەوەی کە چاوپێکەوتنت لەگەڵ دەکات– هەمیشە بەجۆرێك ئاگاداری بۆ مەرگ دەژیێت، لە حاڵێکدا زۆرکەس بیر لەو شتە ناکەنەوە.

**پی.دی.جێمز**

من هەمیشە مردن لەوبەری ژیان دەبینم، واتە هەمان کەللەسەری ژێرپێست کە بەڕێکەوت ناوی یەکێك لە کتێبەکانمە، مەرگ هەمیشە کەڵکەڵەی من بووە، ئەم ڕۆژانە زۆر بیر لەمەرگی خۆم دەکەمەوە، بەڵام، شکسپیر گوتەنی: (هەمیشە دەبێ ئامادەبین[40]) لە مردن ناترسم، ئەوەی کە لێی دەترسم لەدەستدانی عەقڵ و بێ تواناییە، واتە مردنی هێواش و درێژ و بە ئازار، ئێستا لە حەفتاوچوار ساڵی، ئیدی لە تەمەنی کامڵبوونی کتێبی پیرۆز واتە حەفتا ساڵی تێپەڕیوم، هەست دەکەم خاوەنی بەهرەی تەمەندرێژی بووم، ئەوانە وەکو ئێمە کە لە شەڕی جیهانی دووەم ڕزگارمان بوو، یان مەرگی هاوڕێیان و گەنجانمان بینیوە کە بە شێرپەنجە و سەکتەی دڵ مردون، بەتایبەتی ئاگاداری ئەو بەخت و ئیقباڵەین، باوکم هەمیشە دەیگوت: (ئێستا ئیتر خەریکم بە قەرز دەژیم) من بۆ یەك یەکی ڕۆژەکانی تەمەنم سوپاسگوزارم، بەڵام ژیانم خۆشدەوێت و ئارەزوو دەکەم تا ئەو کاتەی ساغم ماوەیەکی زۆر بژیم.

**شوشا گاپی**

پێموایە تۆ باوەڕدار بیت، بۆیە ڕەنگە باوەڕت بە ژیانی دوای مردن هەبێت؟

**پی.دی.جێمز**

بێ دوودڵی باوەڕم بەخوا هەیە، مەسیحیەکان دەبێ باوەڕیان بە (گەڕانەوەی لەش) هەبێت، بەڵام پێموانییە من باوەڕم بەشتێکی وا هەبێت، ئارەزووم ئەوەیە کە ڕۆح نەمر بێت. ئایدیای

تەناسوخی بودایی بۆم خۆشترە لەوەی بەردەوام خەریکی کامڵ بونین.

**شوشا گاپی**

مەبەستت لە تەناسوخ جۆرێك لە پرۆسەی پاڵاوتنە، بەردەوام کامڵ و کامڵتر دەبین تا دەگەینە نێرڤانا کە فەنابوونێکی ڕووتە، هەرگیز تێنەگەیشتم کوێی ئەو بابەتە خۆش و هێندە سەرنجڕاکێشە، مەبەستم ئەوەیە مەگەر بێ باوەڕەکانیش هەر ئەو باوەڕەیان نییە؟

**پی.دی.جێمز**

زیاتر هیوادارم تەناسوخ بەو مانایە بێت کە ژیانی داهاتوو باشتر و باشتر بێت.

**شوشا گاپی**

بێ گاڵتە، ڕاستیەکەی ئەوەیە ئێمە هیچ نازانین و ناتوانین بیزانین، بەڵام توانای ئەوەمان لەدەستداوە لەگەڵ ئەو ڕازە بژین قەبوڵی بکەین.

**پی.دی.جێمز**

منیش بە تەواوی لەگەڵتام، بەڕای من بڕیار نییە شتێك بزانین، قسەکەی تۆ ڕاستە، ئایین بەبێ هێما و ڕاز و جوانی، هیچە. تەنیا هەستێکی نادیار لە شتێکی پشت ئەو جیهانە هەیە، بەڵام بڕیار نییە لەوە زیاتر شتێك بزانین. من باوەڕم بە ڕزگاریە لە ڕێگای عەشقەوە. ئاینی من ئەوەیە، مەسیحیش بەرەو عەشق ڕێنماییمان دەکات. بەڵام باوەڕم وا نییە مەسیحیەتیش هەموو شتێك بێت، تەنیا لە ڕێگای عیسا مەسیح دەتوانیت بگەیتە خوا، زۆربەی مرۆڤەکانی ئەم زەمینە تەنانەت ناویشیان نەبیستوە! تەکفیری زۆربەی زۆری جۆری مرۆڤ کارێکی ناماقوڵە، ڕەنگە دیدی من بۆ ئەو مەسەلانە سادە بێت، بەڵام بە ڕای من سیستمی ئایینی جۆراوجۆر بەڕێگای هەمەجۆر لەیەك دەچن، هەموو ئەو ڕێگایانە بە لوتکەی چیا کۆتاییان دێت کە خوا لەوێندەرێیە. هەریەك لە ئێمە ڕێگای خۆمان هەڵدەبژێرین. تێڕوانین و ڕێڕەوی ئایینی مەسیحیەت پێکدێنێت، من ئەوم هەڵبژاردووە، بەتەواوی جیاوازە لەگەڵ بوودابیەك یان موسڵمانێك، بەڵام هیوادارم هەموومان لە کۆتاییدا بگەینە ئەوێ.

**شوشا گاپی**

بە یارمەتی، چ کاتێك دەنووسیت؟

**پی.دی.جێمز**

کە تازە دەستم پێکردبوو، زوو لە خەو هەڵدەستام و لە شەشی بەیانی تا هەشتی بەیانی دەمنووسی، چونکە ناچاربووم بچمە ئیش، هەر بەو جۆرە ڕاهاتووم، ئێستاش هەر زوو لە خەو هەڵدەستم و بەیانیان دەنووسم، کاتێ خەریکی نووسینی کتێبم، پێش سەعات حەوت لە خەو هەڵدەستم و دێمە خوارەوە و لە موبەق چایی دروست دەکەم، گوێ لە هەواڵی ڕادیۆ دەگرم و دەچمە حەمام، ئەوکاتە دادەنیشم و دەست بە نووسین دەکەم، دوای چەند سەعاتێك دەبینم ئیتر ناتوانم درێژە بدەم بە نووسین. نزیکەی سەعات دوانزە دەست لە نووسین هەڵدەگرم، دوای ئەوە کارەکانی ترم دەکەم کە کاری ڕۆژانەن.

**شوشا گاپی**

لە کوێ دەنووسیت؟

**پی.دی.جێمز**

جێگایەکی تایبەتم نییە بۆ نووسین، لە ڕاستیدا لە هەموو شوێنێك دەتوانم بنووسم، بەمەرجێك بێدەنگی و ئارامییەکی تەواوم هەبێت، یەکێك لەو شوێنانەی پێم خۆشە ئێرەیە، لە ناندینی ماڵەکەم لە لەندەن، چونکە هەرکاتێك حەزبکەم دەتوانم زۆر بە ئاسانی بچمە حەوشە و هەوایەك هەڵمژم، یان بۆ خۆم قاوە دروست بکەم، لەگەڵ ئەوەشدا مێزی نانخواردن هێندە گەورەیە کە دەتوانم تەواوی یاداشتەکانم و فەرهەنگ و سەرچاوەکانم لەسەریدا

بڵاو بکەمەوە. کاتێ کە خەریکی نووسینی ڕۆمانم، هیچ کات بەبێ دەفتەری یادداشت ناچمە هیچ شوێنێك، دەتوانم وەسفکردنی شوێنەکان، هەستم بەرانبەر ئەو خەڵکانەی کە ڕەنگە بیانبینم، قسەی ئەملاوئەولا یان وەرچەرخانێکی تازە لە بیرۆکەی چیرۆك هەست بکەم، بەپەلە لە دەفتەری یادداشتەکەم تۆماری دەکەم. وام پێ باشترە بەدەست بنووسم . ڕۆژی دواتر بەزەحمەت خۆم دەتوانم بیخوێنمەوە، ئەو کارەی دەیکەم ئەوەیە کە یەکسەر ئەو دەستنووسانە دەگوێزمەوە سەر ڕیکۆردەر و سکرتێرەکەم تایپیان دەکات تا دەقی یەکەم ئامادە بێت. من لە کاتی نووسینی کتێب، بە ڕەوتێکی ڕێکوپێك دەڕۆم، وەکو ئەوەیە خەریکی وێنەگرتنی فیلم بم. لە کۆتاییدا ئەم چیرۆکە کۆدەکەمەوە و دەقەکە دەنێرم بۆ دەزگایەکی پیشەیی پیتچنین، لەوێ ئەوان دەیخەنە سەر دیسك و ئیتر کار تەواو دەبێت.

## پەراوێزەکان:

1-Times Literary Supplement.

2-Literary Review.

3-Dr.Connor Bantry White.

4-Cover Her Face.

5-Innocent Blood.

6-Mainstream novel

ئەم جۆرە ڕۆمانە، لە هەموو جۆرەکانی تری ڕۆمان کە خەڵك پێیان خۆشە وەکو ڕۆمانی مەتەڵ، ڕۆمانسی، یان چیرۆکی زانستی و خەیاڵی جیاوازە. ڕۆمانی شەپۆڵی سەرەکی بە سود وەرگرتن لە شێوازی جۆراوجۆر دەکەوێتە گێڕانەوەی چیرۆکی خۆی، لەبارەی خەڵك و کێشەکانیان، بە بەراورد لەگەڵ ئەو دەقانەی کە لە چوارچێوەیەکی تەسکتر چڕبوونەتەوە، لە لایەن دروستکردنی کەسایەتییەکان قوڵبوونەوەی زیاتری هەیە.

7-Children of Men.

8-Original Sin.

9-Adam Dalgliesh.

10-Shroud for a Nightingale.

11-An Unsuitable Job for a Woman.

12-Downing Collning.

13-Queen Charlotte Maternity Hospital.

14-Hampstead.

15-Anthony Trollope

ڕۆماننووسی بەریتانی (1815–1882) .

16-Alice Vavasor.

17-Lady Glencora Palliser.

18-The Way We Live Naw.

19-Robert Maxwell

بەڕێوەبەری بازرگانی بەریتانی لەدایکبووی چیکسلۆڤاکی کە لە دەیەی هەشتا ئیمپراتۆریەکی ڕاگەیاندنی دامەزراند و چەندین دامەزراوە و بڵاوکراوەی کڕی، دوای مردنە هێمادارەکەی، وەدیارکەوت کە سەدان ملیۆن دۆلاری لە کۆمپانیاکانی و مەسەلەی بیمەکانیانی دزیوە و ئیمپراتۆریەتی خۆی پێ بەرفراوان کردوە، کۆمپانیاکانی ماکسوێل لە 1992 ناچار بوون لە ئەمریکا و بەریتانیا شکستی خۆیان ڕابگەیەنن.

20-Jalousi.

21-Gaudy Night.

22-Whose Body?

23-Devices and Desires.

24-Tom Stoppard

شانۆنامەنووسی بەریتانی لەدایکبووی چیکۆسلۆڤاکیا.

25-Wilkie Collins

نووسەری بەریتانی (1824–1889).

26-The Eustace Diamonds.

27-The Mystery of Edwin Drood.

***28-Brighton.***

***29-Pinki.***

***30-Cordelia Cray.***

***31-Summerville College.***

***32-Nagio Marsh***

**نووسەری رۆمانی پۆلیسی خەڵکی نیوزلەند**(1899–1982).

***33-Josphine Tey***

**ناوی خوازراوی ئلیزابێت مکینتاش**(1897–1952)**تاواننووسی بەریتانی**.

***34-Ruth Rendell***

**لەدایکبووی** 1930 **تاوانینووسی بەریتانی**.

***35-Faber and Fber.***

***36-Kate Miskin.***

***37-A Taste For Death.***

***38-Henry Peverell.***

***39-Jean-Philippe Etienne.***

***40-The Readiness is all***

**لە هامایێتەوە وەرگیراوە**.

## سەرچاوە:

**مژدە دقیقی – رۆیای نوشتن**، 1378.

***The Paris Review 135 Summer 1995***

# گفتوگۆ لەگەڵ جیانی ڤاتیمۆدا

ڕامین جەهانبەگلو

لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

**ڕامین: لە ساڵی 1936دا لە تۆرینۆ لەدایکبوویت، چۆن بوو ڕووت کردە فەلسەفە؟**

جیانی ڤاتیمۆ: لە کاتی دووەمین جەنگی جیهانیدا ماوەیەك لە ئیتالیای باشوور بووم و تا ڕادەیەك لە شەڕەکەوە دوور بووم. کاتێك لە ساڵی 1945 دا گەڕامەوە بۆ تۆرینۆ، تەواو گۆشەگیر بووم. ئەوە بوو باوکم لەسەر قسەی خانمێك کە لە گەڕەکەکەماندا شیرینی دەفرۆشت، منی نارد بۆ قوتابخانەیەکی کڵێسایی، تاببم بە قەشە و منیش بووم بە قدیسێکی بچکۆلە. دواتر بووم بە یەکێك لە سەرکردەکانی بزاڤی کاسۆلیکی لاوو لەو کاتانەدا توانیم کەسانێکی وەکو


جیانی ڤاتیمۆ

ئومبێرتۆ ئیکۆ بناسم. ئیکۆش هەر یەکێك بوو لەو سەرکردانە، بەڵام بە تەمەن ئەو لە من گەورەتر بوو. دوای قۆناغی ئامادەییش هەم بە ئایینەوە وابەستە بووم و هەم بە سیاسەتەوە. چونکە دەبووایە ئەوەم بۆ ڕوون ببووایەتەوە کە ئایا دیموکراسی مەسیحی دەتوانێت لەگەڵ چەپدا یەکبگرێت یان نا؟ ئەمە هەمان ئەو قۆناغەیە کە پێی دەڵێن "گەڕانەوە بۆ چەپ". من خۆم لەگەڵ ئەو یەکگرتنەدا بووم. هەر بۆیە، بە مەبەستی بەیەکەوە گونجاندنی ئایین و سیاسەت بە شێوەیەکی هاوتەریب، ڕووم کردە فەلسەفەو لە زانکۆی تۆرنیۆ بووم بە خوێندکار و لەسەر

دەستی فەیلەسووفە کاسۆلیکەکان دەستم بە خوێندن کرد. تێزێکم دەربارەی ئەرستۆ نووسی. ئەو ڕۆژگارە و بە مەبەستی ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنیتیی لیبرال، لە ناو کاسۆلیکە پێشکەوتووەکاندا، خوێندنی تۆمیزم* بە شێوازی "ژاك مارتن" زۆر باو بوو. منیش زۆر هەواداری "ئەمانوئیل مۆنیە" بووم کە سەرنووسەری گۆڤاری "ئەسپری" بوو و لە تۆرینۆ گروپێکم بە ناوی "گروپی مۆنیە"وە دروست کرد. تا خوێندنی زانکۆشم تەواو کرد، گروپەکە هەر بەردەوام بوو. دوای ئەوە وەکو توێژەرێك لە زانکۆ دەستم بە کارکرد. لە ساڵی 1962 داو بە وەرگرتنی بۆرسی هومبولت بەرەو ئەڵمانیا چووم. لەوێ لەگەڵ گادامێردا دەستم بە خوێندنی فەلسەفەی هایدگەر کرد و یۆرگن هابرماسیشم ناسی. لەگەڵ گادامێردا زۆر دۆست بووین و کتێبی "حەقیقەت و میتۆد"م بۆ ئیتالیایی وەرگێڕا.

**ڕامین: کاریگەریی هێرمنیۆتیکی گادامێری لەسەر کاری فەلسەفیی ئێوە چی بوو؟**

ڤاتیمۆ: گوتم کە تێزێکم دەربارەی ئەرستۆ نووسی، هۆکاری هاندەریشم دۆزینەوەی فەلسەفەیەکی نامۆدێرن و نالیبراڵ و لە هەمانکاتدا نامۆحافەزەکارانە بوو. پاشان سەرقاڵی قوتابخانەی فرانکفۆرت بووم، لەبەرئەوەی بیرمەندانی ئەو قوتابخانەیە، ئادۆرنۆو هۆرکهایمەر، بایەخیان بە "دیالەکتیکی ڕۆشنگەری" دەدا. سەرپەرشتیاری تێزەکەم بڕوای وا بوو کە قوتابخانەی فرانکفۆرت دواکەوتووە.

ئەو دەیوت: "ئەگەر دەتەوێ لە نووسەرێکی دژە مۆدێرن بکۆڵیتەوە، خەریکی نیچە بە!". ئینجا دەستم بە خوێندنی نیچە کرد. لە ساڵی 1961 دا هایدیگەر کتێبە دوو بەرگیەکەی خۆی دەربارەی نیچە بڵاوکردەوە. کتێبەکەی هایدیگەرم خوێندەوەو بووم بە هەواداری هایدیگەر. لە ساڵی 1963 دا کتێبی "بوون، مێژوو و زمان"م دەربارەی هایدیگەر نووسی کە لە ڕاستیدا بە سەرلەنوێ بیناکردنەوەیەکی هزری هایدیگەری قۆناغی دووەم لە قەڵەم دەدرێ. بەم پێیە و لە ژێر کاریگەریی ڕێبازەکەی گادامێردا بوومە کەسێکی هایدگەری نیچەیی. لەگەڵ ئەمەشدا کەم تا زۆر پەیوەندیی خۆم بە هێرمنیۆتیکی گادامێریشەوە پاراست. هەر بە ڕاستی گادامێرم خۆشدەویست و زۆرجار گفتوگۆم لەگەڵدا دەکرد، بەڵام من وامدەبینی کە ئەو بە ڕادەی پێویست ڕایکال نەبوو. هەر بۆ نموونە، لە کتێبی "حەقیقەت و میتۆد"دا ڕستەیەك هاتووە کە لەسەر ئەو ڕستەیە زۆر گفتوگۆمان کرد. ڕستەکە ئەمەیە: "بوون، کە دەکرێ قابیلی تێگەیشتن بێت، زمانە." ئەم ڕستەیە لە زمانی ئەڵمانیدا بە دوو وێرگول (فاریزە) نووسرابوو. بەڵام لە وەرگێڕانە ئیتالیەکەدا بە شێوەیەك نووسرا کە باو بوو. لە ئیتالیەکەدا بەبێ وێرگول وا دەخوێنرایەوە: "بوونێك کە دەکرێ قابیلی تێگەیشتن بێت زمانە." واتە بوونی تریش هەیە. بەڵام ئەگەر بە دوو وێرگول بنووسرێ، وا دەیخوێنینەوە: "بوون زمانە." من بەم شێوازەی وەرگێڕان مانای ڕستەکەم ڕادیکالیزە کرد، و بە نووسینی کتێبێك دەربارەی نیچە بە ناونیشانی "خود و ماسك" لە ساڵی 1969 دا، درێژەم بە هەمان شێوازی ڕادیکاڵ دا. ئەم کتێبە ناسێنەری فەلسەفەی بزاڤی چەپی توندڕەو بوو لە ئیتالیای ئەو ڕۆژگارەدا. تیۆرییەکەی من وا بوو ( کە هەروەکو لە لێکۆڵینەوەکانی کەسانێکی وەکو هێربرت مارکۆزدا سەبارەت بە کۆمۆنیزم لە جۆری (سۆڤێت دەبینین) گرفتەکە لەوەدایە کە مارکسیزمی ڕووسی بایەخی بە نموونە

بـۆرژوا پێـشڕەوەکانی وەکـو نیـچە، ئـازادیی سێکسی یان ئازادیی بیرکردنەوەو بزوتنەوەی کرێکـاریی پێـشەنگ نـەداوە. هـەر بـۆ نموونـە سـەرکردەکانی سـۆڤێت لـە شەسـتەکانی (ی سـەدەی ڕابـردوو)دا بـەردەوام بـە ملوانـە و بۆینباخـەوە دەبینـران، لـە کاتێکـدا سـەرۆکی ئـەمریکا بـە تراکـسوودەوە ڕایـدەکرد. ئەمـە بابەتێکـە تـەواو مایـەی سـەرنجە. بـەمجۆرە بـە خـۆمم وت چـاکتر وایـە خـەریکی ڕاڤـە و شیکردنەوەی فەلسەفەیەکی چەپی توندڕەو بم. لـەو سـەردەمەدا چـەپی تونـدڕەوی ئیتالیـا ئەوەنـدە بایـەخیان بـە فەلـسەفە نـەدەدا، لەبەرئـەوەی زۆر لایـەنگری لۆکـاش بـوون. سەرنووسـەرانی بلاوکراوەی *Il Manifesto* کە لەو کاتـەدا بلاوکراوەی چـەپی توندڕەو بـوو بـە دوای ئازادییەکی ڕەمزی و داهێنانی جۆرێك لە زمـانی ئانارشیـستیەوە بـوون. بـەلام مـن ئـەو کاتانە وای بۆ دەچووم کە دەکرێ تێکەڵەیەك لە مرۆڤی بالای نیمچەیی و مرۆڤی مارکسیانەی لە خۆنامۆ نەبوو بەدەست بهێنین. بەلام لە قۆناغی تیرۆریـزم و لیـوای سـوور لـە ئیتالیـای سـالانی حەفتاکاندا، کۆمەڵێك قوتابیم هەبوون کە لەگەڵ بزووتنـەوەی تیرۆریستیدا هاوکارییـان دەکرد و وا دەهاتنـە بەرچـاوم کـە کەسـانێکی تـەواو پاشکەوتوون. ئەندامی نموونـەیی لیوای سوور کەسێك بوو کە ڕەفتاری خۆی وەکو کرێکارێك لێکـرد و لـە گـەڕەکێکی پـەراوێزخراوی کرێکاراندا نیشتەجێ دەبوو و بۆ ئـەوەی واش پیـشانبدات کـە کرێکـارێکی تـەواوە، هـەموو رۆژێك وەکو کرێکارەکانی تر سەعات پێنجـی بـەیانی لـە خـەو هەڵدەسـتا و دەکەوتـە ڕێ. ئەمجۆرە بنیادەمانە بە زمانێکی وەها لووسـەوە باسی پاشەڕۆژیان دەکرد وەك ئەوەی بەردەوام ئایندەیەکی کراوە بەڕێوە بێت. من زۆر بیرم لە دۆخی ئەمجۆرە کەسانە کردۆتەوە و سەرئەنجام

گەیـشتمە ئـەو ئەنجامـەی کـە ئەسـتەمە خـودی نیـچەیی و شۆڕشـی پرۆلیتـاری پێکـەوە کۆببنەوە. لەبەرئەوەی لە بیرکردنەوەی مارکسدا هەمیـشە ئاشـتیی دیالـەکتیکی هەیـە، بـەو مانایـەی کـە ئێمـە بـە ناچـاری بـەرەو هاوئاهەنگییـەك دەچـین کـە هـەرگیز نـاگۆڕدرێ. خەسـڵەتی دەسـەلاتگەرایانەی بزووتنـەوەی کۆمۆنیـستیش لـەم مەسـەلەیەوە سەرچاوەی گرتووە.

بەم پێیە لە سالانی هەشتاکاندا گۆڕانێك لە هـزری منـدا ڕوویـداو کتـێبی "دیالـەکتیك، جیـاوازی و هـزری کـەمتوانا"م نووسـی. دیالەکتیك لە ناونیشانی کتێبەکەدا ئاماژەیە بۆ دیالەکتیکی مارکسی. جیاوازییش ئاماژەیە بۆ هزری فەرەنسایی دۆلۆز و لیوتار و مەبەست لە هزری کەمتواناش گوێڕاداشتنە بۆ هایدیگەر – واتە پەیبردن بە ئایدیای جیاوازیی ئۆنتۆلۆجی. جیاوازیی ئۆنتۆلۆجی لە ئاخاوتنی نەگەتیڤدا نامێنێت. بە بۆچوونی من پێویستە هایدیگەر بـەو ئامـانج و مەبەسـتە بخوێنرێتـەوە کـە جیاوازیی ئۆنتۆلۆجی لەو شتەدا نامێنێت کە بـوون بـە بـچووککردنەوەی خـۆی لـە توانـای خۆشـی کەمدەکاتـەوە، هـەر لەبـەر ئەمـەش مـن هـزری کـەمتوانام بـۆ ناونیـشانی کتێبەکـە هەڵبـژارد. ئەمـە هـەموو ئـەو خاڵی وەرچەرخانە بوو لە هزری مندا. دەستم کرد بە خوێندنـەوەی کتـێبی "توندوتیـژی و موقـەدەس"ی ڕینیـە جیدار و هەروەها کتێبەکانی نۆربرت ئەلیاس، و لـەوە بـەدوا ئایـدیای بـێ ئیرادەیـیم بـە شـێوازی نیچەیی ڕاڤـە کـرد، لەبەرئـەوەی نیچە مێـژووی خۆرئـاوا بـە نـەمانی وردە وردەی میتافیزیـك دەزانێـت. منـیش بیرم لـەوە کـردەوە فەلـسەفەی مـۆدێرنیتی وەکـو ڕزگـاربوون پیـشانبدەم، بـە شـێوەیەك کـە مـۆدێرنیتی بـچووککردنەوەی دیارینـەکراوی بونیـادە قورسـەکان بێـت (وەکـو

هێزگەرایی و خودئاگایی دیکارتی و جگە لەمانەش). بۆیە من دوای ئەو ئایدیایە کەوتم کە پێویستە فەلسەفە ئۆنتۆلۆجیی هەنووکەیی بێت. فۆکۆش وا بیری دەکردەوە، بەڵام هەرگیز بەو مانایەی کە من مەبەستمە، ئایدیای ئۆنتۆلۆجیی هەنووکەیی بەکارنەهێنا. لەبەرئەوەی میتافیزیکێکمان نییە جێی زانینی بوون و بوون بگرێتەوە، بۆیە ئەوەی هەیە تەنها مێژووی بوون و تێڕامانە دەربارەی مێژووی بوون. کەواتە بۆ پەیبردن بە بوون، بوون ئێمە بەرەو جۆرێك لە بچووککردنەوە پەلکێش دەکات – واتە ئەو ئایدیایەی هایدیگەر کە فەلسەفە ناتوانێت هزر ئامێز بێت. ئەو پەیامەی ئێمەش بەرەو هەندێ هەڵبژاردن لە ئایندەدا دەبات، بزوێنەری پرۆژەیەکی لەمجۆرەیە. کەواتە بەبۆچوونی من بەجێترین لێکدانەوەی مۆدێرنیتی و مێژووی چەمکی بوون هەمان ئەو کەمکردنەوەی هێزەیە. هەر لەم سەروبەندەدا لە ڕێی جیرارەوە دەستم کردەوە بە سەرلەنوێ خوێندنەوەی دەقەکانی ئایینی مەسیحی (کە لە ساڵانی نێوان 1960 و 1970 دا دەسبەرداری بووبووم) و ئەم بیرۆکەیەی قدیس پۆڵسم دۆزییەوە کە دەڵێت: "خوا خۆی بچووك کردەوە تا لە مرۆڤەکان بچێت." خۆی بە شێوەیەك بچووك کردەوە کە قابیلی گەڕانەوە نەبوو – واتە حەقیقەتی بوون بچووك کردنەوەی بوونەوەرەکانە.

ڕستەیەکی ناوازەی هایدیگەرە لە "بوون و زەمەن"دا. لە کۆتایی بەشی یەکەمی کتێبەکەدایە کە دەڵێت:

*"Sein nieth Seiendes, gibtes in sofar wacheit ist wacheit ist nur in sofar Dasein ist"*

ئەگەر سەرنج بدەیت دەبینیت هایدیگەر لە بەشی یەکەمی ئەم ڕستەیەدا دەڵێت– واتە حەقیقەت بوونی بوونەوەرەکان نییە کە لە ئامادەبوونێکی بەئەرزشدا خۆی دەخاتە ڕوو، بەڵکو ئامانج گەیشتنە بە پلەیەك لە ڕۆشنبیری و زانست و دامەزراوەی کۆمەڵایەتی.

**ڕامین: ئەی لەم نێوەدا چی بەسەر ڕاستیدا دێت؟**

ڤاتیمۆ: پرسیارێکی باشە، لەبەرئەوەی دیراسەکردنی نیچە و هایدیگەر منی بەرەو بیرکردنەوە لە ڕاستی برد و ئێستاش سەرقاڵی نووسینی کتێبێکم دەربارەی چەمکی ڕاستی. بۆ نووسینی ئەم کتێبە خۆم بە فەلسەفەی پاش – شیکاریی ئەمریکاییەوە خەریك کرد کە بیرمەندێکی وەکو ماك داڤل ناساندوویەتی. ئەگەر نووسینەکەی ماك داڤل بخوێنیتەوە کە پەیڕەویکاری "کانت"ە، دەبینیت گادامێر ڕاستی دەکرد کە دەیوت: "حەقیقەتی زانستەکان پێدراوێکی بێ نێوەند نییە." دیارە کە پێدراوی بێ نێوەندیش لە بنەڕەتدا پێدراو نییە. بۆ ئەوەی پێدراوێك شێوەیەکی زانستی بەخۆیەوە بگرێت، دەبێ بتوانرێ دەستی تێوەربدرێ تا لەو پارادایمانەدا جێی بێتەوە کە ئەقڵانیەتی کانتی ی پەتی نین، بەڵکو نەریتی زمانی زانستین. من ئەمە زۆر پەسەند دەکەم. چونکە وەکو ئەوە وایە بڵێین لە ڕاستیدا ئەمە کەمکردنەوەی هێزی ئامادەبوونی بێ نێوەندە کە زانستە پۆزەتیڤەکان پێکدێنێت.

**ڕامین: لەم ئۆنتۆلۆجیی ڕاستییەی ئێوەدا، پەیوەندیی نێوان هێز (یا دەسەڵات) و حەقیقەت چۆن دەبینن؟**

ڤاتیمۆ: هەرکاتێ باس لە حەقیقەت دەکرێ ئەو گۆرانییە ئیتالیاییەم بیر دەکەوێتەوە کە دەڵێت: "حەقیقەت ئازارم دەدات." من بیرۆکەی حەقیقەتی بابەتی بەرامبەر بە حەقیقەتی ئینجیلی دادەنێم – ئەوە بەکەڵکی من نایەت کە

شارەزای گریمانەکەی فیساگۆرس بم، مەگەر ئەوەی کە بمەوێ مێزێك دروست بکەم یان ساختومانێك کە سەر لە هەور بدات، بەڵام ئەو بەهایانەی کە بۆ تێگەیشتنیان پێویستم بەم حەقیقەتە ستراتیجییەیە – هەروەکو هابرماس دەڵێت – حەقیقەتی بابەتی نین– کەواتە حەقیقەتی بابەتی تەنها لە سۆنگەی پەیوەستبوونیانەوە بەهێزەوە بچووکدەبێتەوە بۆ ئەم شێوە نەگۆڕە. نیچە لە شوێنێکدا وتوویەتی کە خودئاگایی پێویست نییە تەنها بۆ ئەوانە نەبێت کە فەرمان دەدەن و فەرمان وەردەگرن. ئەمە ئەگەر بە زمانێکی دەزگایی گوزارشتی لێ بکەین وەکو ئەوە وایە بڵێین کە بە تەنها پۆلیس داوای ناسنامە دەکات.

واتە پەیوەندییەك لە نێوان چەمکی میتافیزیکیی حەقیقەتی بابەتی و چەمکی دەسەڵاتدا هەیە. ئەم دەسەڵاتە من لە دەسەڵاتی کڵێساییشدا دەیبینمەوە. هەر لەبەر ئەمەش فەلسەفەکەی من فەلسەفەیەکی دژە کڵێسایییە.

**ڕامین: کەواتە تۆ مەسەلەی ئیمان لە دەرەوەی دەسەڵاتی کڵێسایی دەخەیتە ڕوو؟**

ڤاتیمۆ: بەڵێ، بێگومان. لەبەرئەوەی ئیمان بە جۆرێك لە جۆرەکان لەگەڵ ڕەوتی پەیداکردنی هوشیاریدا ئەزموون دەکرێ. هوشیاری بەوەی کە کەسێك لە دەرەوەی مندا من بانگ دەکات. من باوەڕم بە خودای ئینجیل هەیە، نەك وەك دانەری ئینجیل، بەڵکو وەکو بابەتی ئینجیل. لای من خودای ئینجیل کەسێك نییە لە سەرێکەوە قسە بکات و لە سەرێکی تریشەوە بنووسێت. هەردووکیان یەکێکن. بە تەنها لەم شێوەیەدا ئینجیل نامەعقول نییە. لە ئینجیلەکاندا ڕستەیەك هەیە دەڵێت: "هەرچییەك نووسراوە بە مەبەستی فێربوونی ئێوە نووسراوە." فێربوون لێرەدا زانیاری نییە، واتە ئەوەی کە بزانین خودا چۆنە، بۆ نموونە گەورەیە یان بچووکە! فێربوون بانگهێشتنی ویژدانی ئازادی ئێمەیە. بانگهێشتنی عیشقە. هەمان ئەو شتەیە کە لە زمانی لاتینیدا پێی دەڵێن *La caritas*. قدیس ئۆگەستین لە شوێنێکدا گوتوویەتی: "عاشق بەو ئیدی چی دەکەیت بیکە." ئەمە تاقە حەقیقەتە. باقی شتەکانی تر مشتومڕە لەسەر سەلماندنی ئەوەی ئاخۆ مرۆڤ ئەمەیە یان ئەوەیە. کڵێسا لەسەر ئەم بناغەیە دەیەوێ حوکمی یاسا مەدەنیەکانیش بکات. ئەگەر تەلاق بەشێوەیەکی سروشتی قەدەغەیە، کەواتە دەبێ هەر بە ڕاستیش قەدەغە بێت، بەڵام هەموو ئەمانە یاریی دەسەڵاتن.

**ڕامین: باشە ئەگەر نەتوانین لە کلتوورەکاندا هەندێ بەهای هاوبەشی بابەتی بەدەست بهێنین، ئاخۆ دەتوانین لە ئیماندا ئەوە بدۆزینەوە؟**

ڤاتیمۆ: ئەگەر بمەوێ لە ڕوانگەیەکی فەلسەفییەوە وەڵامت بدەمەوە، کە مافی خۆشمە، دیوە ڕاستەقینەکانی مەسەلەکەت پیشان نادەم. لە تۆ دەپرسم ئایا ئەم یان ئەو کتێبەت خوێندۆتەوە؟

کەواتە دەتوانین بڵێین کە ئەو بەها هاوبەشانەی دەوری هەندێ نۆرمیان داوە، کۆکبوون لەسەر ڕایەك دروست دەکەن.من سەرپشکانە هەندێ لەو نۆرمانە قبووڵ دەکەم، بۆ نموونە مافە سروشتیەکان. بەڵام مافە سروشتیەکان لە هەندێ دۆخدا سروشتین. بۆ نموونە ئەنجامنەدانی هەندێ کار و کردەوە کە لە مافە سروشتیەکاندا شیاو نین و پیشاندەری نۆرمەکانی ڕەفتاری کۆمەڵایەتین. نموونەیەکی تر بهێنینەوە: دروشمی بڵاوکراوەی *Saint Siege* کە ناوی "*Lobservature Romans*"ە ئەمەیە: "هەر کەسە و ماڵی خۆی". زۆر چاکە،

ئەم "خۆیە" لە کوێوە هاتووە؟ ئایا "خۆ"یەکی سروشتی هەیە؟ نەخێر، "خۆم" بە میراتی بۆ ماوەتەوە. ئەگەر دایك و باوکم دزبوو بێتن و پارەیان دزیبێت و لە دایك و باوکی تۆ داراتر بووبن، ئەم داراییە لە ڕێی میراتیەوە دەبێت بە ماڵی من. بەم پێیە شتێك نییە پێی بوترێ عەدالەتی سروشتی. تاقە عەدالەتێك کە قبووڵم بێت ئەوەیە کە لەگەڵ کەسێکدا ڕێك بکەوم ڕێز لە ئازادییەکانی من بگرێت و خۆم قایل بکەم تا ئەو کاتەی ئەو ڕێز لە ئازادییەکانی من دەگرێت هەوڵ بدەم لەگەڵیدا تەباو ڕێککەوتوو بم. ئەمە زیاتر مافی سەلمێنراوە نەك مافی سروشتی. بەڵام نەریتی ئینجیلی بە قووڵی جێی لەناو هزری ئەم مافە سەلمێنراوانەدایە. ڕاستیەکەی تێناگەم چۆن ئاکاری کانتی دەتوانێت فەرمانی عیشق لە ئینجیلەکاندا ئافەرۆز بکات. چۆن دەکرێ ڕێز لەویتر بگرین، بەبێ ئەوەی تەسەوری لە خۆبوردن، واتە چوونە دەرەوەی خودی خۆمان لا هەبێت.

**ڕامین: کەواتە تۆ سەرەڕای ئەوەی ڕەخنە لە مۆدێرنیتی دەگریت، بەڵام باوەڕت بە دیموکراسی هەیە؟**

ڤاتیمۆ: بێگومان. لە مۆدێرنیتیدا، دیموکراسی لەسەر بنەمای ئەو بیرۆکەیە دامەزراوە کە شتێك هەیە پێی دەڵێن مافی سروشتی، لە کاتێکا من دیموکراسی بە پاراستنی ئازادیی ئەویتر دەزانم وەك خودێکی بەرپرسیار. ژیان هەم وەکو مرۆڤێك و هەم وەکو مەسیحییەك. من بیرۆکەی مرۆڤایەتی لە مەسیحیەت جیاناکەمەوە. مەسەلەی بایۆ- ئاکاری بهێنەرە بەرچاوت. تەنانەت گەر بمانەوێ لەڕێی سروشتی مرۆییشەوە مەسەلەکە چارەسەر بێت، دەبێ لە مەسەلەی "لەبار بردن"ەوە دەست پێ بکەین. دەبێ ئەوە بڵێین کە "کۆرپەلە مافی خۆی هەیە." بەڵام یەکسەر بەم قسەیەش ئازادیی دایك پێشێل دەکەیت. چونکە ڕێی لێ دەگریت کۆرپەلەکە لەبار بەرێت. من ناڵێم ژنان هەموو دەبێ مناڵ لەبار بەرن. دەڵێم پێویستە ئەم مەسەلەیە بخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. وەکو مەسەلەی خۆ کوشتن. گەر کەسێك بڵێت نیازی وایە خۆی بکوژێت، یەکسەر ڕێی لێ دەگرین. بەڵام ئەگەر جارێك ڕێمان لێگرت و ئەو دووبارە ویستی خۆی بکوژێتەوە، ئازادە لەوەدا کە بیەوێ خۆی بکوژێت. ئەمە ئازادییەکی بنەڕەتیە. تەنانەت لە بایۆ- ئاکاریدا پێودانی سروشتیمان هەیە. بۆ نموونە ئەگەر لەناوجەرگەی شەقامدا لە پڕێکدا شتێکم بەسەر بێت، تەلەفۆن بۆ دەوڵەت ناکەیت، یەکەمجار تەلەفۆن بۆ خێزانەکەم دەکەیت. لە دۆخە سروشتیەکاندا پێویستە هەندێ ئاست بە ناوی ئازادییەوە بپارێزین.

**ڕامین: ئێوە وەکو بیرمەندێکی پۆستمۆدێرن دەناسن. ئێمە لە ئێراندا بۆ تێگەیشتن لە بابەتی پۆستمۆدێرن، ڕووبەڕووی گیروگرفتی زۆر دەبینەوە. ئێوە چۆن پێناسەی پۆستمۆدێرنیزم دەکەن؟**

ڤاتیمۆ: سەبارەت بە چەمکی مۆدێرنیتی لەگەڵ ئالان تۆریندا گفتوگۆیەکمان هەبوو وا هەست دەکەم هێشتا نەمانتوانیوە وەکو پێویست پێناسەی مۆدێرنیتی بکەین.

ئالان تۆرین وێناکردنێکی مێژوویی بۆ مۆدێرنیتی هەیە.

تۆرین مۆدێرنیتی دەخاتە خانەی سەدەی خودی کانتی و لە خۆ بیرکردنەوەی خودەوە. بەڵام من هەمیشە مۆدێرنیتیم بە چاخی مێژووگەرایی ڕۆشنگەری ناسیوە. دروشمی ڕۆشنگەری ئەمە بوو: "دەبێ مۆدێرن بین.". دەشبێ مۆدێرن بین، لەبەرئەوەی جووڵەی مێژوو بەرەو پێشەوەیە. کەواتە ئەگەر شوێن

پێی ئەم جووڵەیە هەڵنەگریت، بوونت پێویست نییە. بەڵام وا دێتە بەرچاوم کە ڕاستتر وایە باس لە کۆتایی مۆدێرنیتی بکەین. بۆچی مۆدێرنیتی بەرەو کۆتایی دەچێت؟ لەبەرئەوەی کەس باوەڕی بە تاقە جووڵەیەك بۆ مێژوو نەماوە. کەواتە یەك مێژووی مرۆیی نییە، بەڵکو چەند مێژوویەکی مرۆیی هەیە. بەم پێیە لەگەڵ کۆتاییهاتنی ئیمپریالیزم و نەتەوەی بالأدەستدا گەیشتووینەتە کۆتایی وێناکردنی تاقە یەك مێژوو. بەبێ پەرەسەندن و پێشکەوتن شتێك نییە پێی بگوترێ مۆدێرنیتی. من بەمجۆرە پۆستمۆدێرنیزم پێناسە دەکەم. پۆستمۆدێرنیزم بە کۆتایی ڕەهاکان و لەدایکبوونی گفتوگۆ دەزانم.

**ڕامین: بەڵام هەروەکو ژان فرانسوا لیوتار دەڵێت، ئایا دەکرێ پۆستمۆدێرنیزم بشگۆڕێت بۆ ئەودیو گێڕانەوە (یان میتاگێڕانەوە — *Meta narrative*)؟**

ڤاتیمۆ: لەگەڵ لیوتاردا زۆر هاوڕێ بووین و بەردەوام ڕەخنەم لێ دەگرت کە بەڕادەی پێویست بیرۆکەی ئەودیو گێڕانەوەی ڕوون نەکردۆتەوە.

ئەگەر دەڵێیت کە مایسی 68 ڕەتکردنەوەی ستالینیزم بوو، و بایۆلۆجی ڕەتکردنەوەی هوشیاریی پۆزیتیڤیزم بوو، ئەوا ئەمە ئەودیو گێڕانەوە نییە، بەڵکو شتێکە پەیوەندیی بە ڕابردووەوە هەیە. ئەگەر وەکو ئەودیو گێڕانەوە سەیری بکەیت، سەرەنجام دەبێ لە شێوەی ڕستەیەکی میتافیزیکیدا پێناسەی بکەیت. واتە دواجار دەڵێیت: "دەزانم کە دوای مایسی 68 ئیدی ستالینیزم نامێنێت." لێرەدا بە شێوەیەك لە میتافیزیکی توێکاری و بابەتی دەگەین کە سەبارەت بە دیاریکردنی ئەو مەسەلەیەیە کە ئێمە لە کوێوە دێین و بەرەو کوێ دەچین. ئەمە قسەیەکی ڤیتگنشتاینم بیردەهێنێتەوە کە دەڵێت: "ئەگەر بەرێوەیت کەواتە دەزانیت نیازت وایە بەرەو کوێ بچیت؟" ئەمە هەمان وێناکردنە کە من سەبارەت بە ئۆنتۆلۆجیای هەنووکەیی هەمە. ئۆنتۆلۆجیای هەنووکەیی بیرۆکەی تاوێکە لە مێژووی بوون کە تیایدا خۆمان بە شێوەیەکی هەنووکەیی والأ دەبینین. لە بنەڕەتدا مێژووی بوون مێژووی چەمکی بوون و مێژووی مانای جیهانە کە بەردەوام ئەزموونی ئێمە سەبارەت بە بوون ڕێکدەخات و ئامادە دەکات. پاش فیزیای ئەتۆمی بیرۆکەی بوون گۆڕانی زۆری بەسەردا هات. هەروەك ئەوەی کە پاش فرۆید بەسەر دەروونناسیدا هات، و ئەمانەش ناپێویست نین.

**ڕامین: ئێوە ئەندامی پەرلەمانی ئەورووپاشن. فەلسەفە و سیاسەت چۆن لەگەڵ یەکدا دەگونجێنیت؟**

ڤاتیمۆ: بڕواناکەم پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان فەلسەفە و سیاسەتدا هەبێت. بە بۆچوونی من مەسەلە سیاسیەکان کەم تا زۆر پەیوەستن بە وەستانەوە دژ بە توندوتیژی. بیخەرە بەرچاوت کە بازاڕی ئابووری دەبێتە شتێکی ڕەها. من بڕوام وانییە کە دەبێ بازاڕمان لە هەموو شێوەیەکیدا پێ قبووڵ بێت. زۆربەی ئەو یاسایانەی لە بواری ئازادییە مەدەنییەکاندان پەیوەستن بەو بیرۆکەیەوەی کە مرۆڤ سروشتێکی هەیە پێویستە لەودیو ئازادییە تاکە کەسیەکانەوە ڕێزی لێ بگیردرێ. لەوانەیە تۆ پێت سەیر بێت، بەڵام دەبێ دان بەوەدا بنێم کە من دژ بە قەدەغەکردنی مادده بێهۆشکەرەکانم. دەزانم ئەمە مەسەلەیەکی ئاڵۆزە، بەڵام ڕاستت بوێت من هەرگیز نەمدیوە لەبەردەرگای قوتابخانە سەرەتاییەکاندا خواردنەوەی ئەلکهولی بفرۆشن، لە کاتێکدا ماددەی بێهۆشکەر دەفرۆشرێ. بۆچی وایە؟ لەبەرئەوەی بازاڕی ڕەش هەیە. گومانی تیا نییە

**که دەبێ منالان بپارێزرێن، بەڵام ناپارێزرێن. من وەکو ئەندامێکی پەرلەمانی ئەوروپا بەردەوام هەوڵ دەدەم لە یەکێتی ئەوروپادا یاسای وا دابنێن کە توندوتیژی کەمبکاتەوە. بە مانا فراوانەکەی وشەی توندوتیژی بەکاردەهێنم. لە ڕوانگەی منەوە توندوتیژی شتێك نییە بە تەنها پەیوەندیی بە شەڕ و ئاشتییەوە هەبێت. پێویستە پیسبوونی هەواو نەخۆشییەکان و شتی تریش لەبەرچاو بگیردرێ. لەم ڕووەوە من بەرنامەیەکی سیاسیم نییە. بەڵام وای بۆ دەچم فەیلەسووفێکی وەکو من کە ئەندامی پەرلەمانی ئەوروپایە دەتوانێت هەندێ کار ئەنجامبدات. وێڕای ئەوەی چیدی سۆشیالیزم لە ئارادا نەماوە، بەڵام دیسانەوە دەتوانین باسی یەکسانی بکەین. دەمەوێ هەندێ بیرۆکەی نوێ بخەمە ناو پەرلەمانی ئەوروپاوە. لە ڕاستیدا پەرلەمانی ئەوروپا دەزگایەکی سەرنجڕاکێشە. بەرەنجامی هیچ جەنگێك یان زنجیرەیەك کەسی حوکمڕان و بنەماڵەیەك نییە. بونیادێکی دروستکراوە کە لە ڕێی ئیرادەی مرۆڤەوە هاتۆتە کایەوە.**

**ڕامین: ئایا لەو بڕوایەدایت ئەوروپا بتوانێت بەرامبەر بە ئەمریکا ببێت بە هێزێك؟**

**ڤاتیمۆ: لە دڵەوە حەز بەوە دەکەم. جۆرێك لە بەریەککەوتن لە نێوان ئەوروپا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەیە. ئەمە دروشمە فاشیستیەکەی سەردەمی مۆسۆلینیم بیر دەخاتەوە لە ئیتالیا: "نەفرەتی خودا لە ئینگلیز!" من حەزناکەم ئەمریکاییەکان بکەونە بەر نەفرەتی خودا، بەڵام حەزدەکەم ئەوروپا لە توانایدا بێت بەرامبەر ئەمریکا بوەستێتەوە — چ لە ڕووی سیاسی و ئابووری و چ لە ڕووی ڕۆشنبیرییشەوە.**

**ڕامین: سوپاس بەڕێز جیانی ڤاتیمۆ کە ئەم گفتوگۆیەتان قبووڵ کرد.**

ڕیۆدو ژانیرۆ، سێپتەمبەری 2002

## پەراوێز:

*تۆمیزم ***Thomism*** ڕێبازە ئایینیەکەی تۆماس ئاکۆیناس –و–.

## سەرچاوە:

جهانی بودن، رامین جهانبگلو

چاپ اول 1382 (2003) نشر مرکز – تهران – ایران.

# گۆشە گیرەکە

ئیڤان تۆرگینێڤ

لە ئینگلیزییەوە: ئەدیب نادر

ئێوارەیەکیان دوای چوونە ڕاوشکار، هەر بە تاق و تەنیا لە نێو درشکەی پێشبڕکێکەی خۆمدا بووم. هێشتا تاڕادەیەك نیو دەرزەنە میل مابوو تا بگەمەوە ماڵێ. مایینە خۆش سۆتمەکەم خۆشحاڵانە بە درێژایی ڕێگا خۆڵاوییەکەدا ملی دەنا، جاروباریش پرمە پرمی بۆ دەکرد و گوێچکەکانی ڕادەتەکاند، سەگە ماندووەکەیشم، ئەوی ڕاستی بێ وەك بڵێیت لەوێدا بەسترابێتەوە، قەت، تەنانەت بۆ ساتێکیش نەکەوتە پشت چەرخەکانی پاشەوە. زریانێکی برووسکەداریش هەڕەشەی دەدا. ڕاستەو ڕاست لەو سەرەوە هەورێکی ئەرخەوانی زەبەللاح بە هێواشییەوە لەودیو دارستانەکەوە بەرز بووەوەو چەند درێژاییەکی خۆڵەمێشینی فراوانی هەور لەسەر سەرمدا ئاوقا بوون و بەرەو لای من کشان. شۆڕە بییەکان لە وەحشەتدا کەوتبوونە نارەنار و خشەخش کردن. لە پڕێکا هەوایەکی ساردی نمدار جێگای گەرماییە شێدارەکەی گرتەوەو سێبەرەکانیش نووتەك و چڕتر بوونەوە. بە هۆی هەوسارەکەوە مایینەکەم ڕاتەکاند، بەرەو کەندرێك سەرەو خوار بووینەوە، ڕێی خۆم بەرەو ئەوبەری ڕۆخانەیەکی ووشك هەڵگەڕاو خۆشکرد کە لێرەکانی شۆڕەبی بە تەواوەتی دایانپۆشیبوو، چوومە سەر هەورازەکەو بۆ نێو دارستانەکە ئاژوام. جادەکە لە مابەینی بێشەی چڕی دارگوێزەکاندا پێچی بە ڕێگاکەی بەردەمم بەخشی و ئیدی لە نێو تاریکاییدا نقووم بوو، ئیدی بەرەو پێشچوونی منیش سەخت بوو. درشکەکەیش بەملاوبەولادا هەڵدەبەزییەوە کاتێك کە چەرخەکان بەر ڕەگە پتەوە چەندیش سەدە تەمەندارەکانی دارلیمۆو دار بەڕووەکان دەکەوتن کە بەو جێ چەرخە قووڵانەدا ڕەتدەبوون کە لەلایەن چەرخی گالیسکەکانەوە چێکرابوون و، مایینەکەیشم دەستی کردبووە ساتمە خواردن. لە ناکاو بایەکی بەهێز لە بەرزاییەکانەوە دەستی کردبوو بەژاوەژاوو، دارەکانیش کەوتبوونە پەلەقاژێ کردن و، دڵۆپە زەبەللاحەکانی بارانیش بە توند و تیژییەوە بەسەر گەڵاکاندا دەستیان کردبوو بە داکردن و

ئاوڕشـــێن کردنیـــان، بروســـکە بریقایـــەوەو تریـــشقەیش گرمانـــدی. بارانەکـــە بـــە لێزمـــە دایکرد. بە شەقاوی پیادەڕۆییانەوە ڕۆیشتم و هـــەر زوو ناچـــاری ڕاوەســـتان بـــووم چـــونکە ماییнەکەم چەقی و توانای بینینی هیچ شتێکم نەما. بە جۆرێك یاخود بە هەر جۆرێکی دیکە بووە لە پاڵ بێشەیەکی پانوپۆڕدا داڵدەم پەیدا کـــرد. بـــەرەو خـــوارێ خـــۆم کـــووڕ کـــردەوەو چڕوچاوی خۆمم داپۆشی و بە بوردەبارییەوە چاوەنۆڕی کۆتایی هاتنی بۆرانەکە بووم، ئا لەو کاتەیـــشدا لـــە ناکـــاو لـــە ســـۆنگەی ڕۆشـــنایی درەوشانەوەی برووسکەیەکەوە وام بە خەیاڵدا هـات کـە بـەژنێکی بالأبـەرزم لەسـەر ڕێگاکـەدا بەدی کرد. بە ئەبڵەقییەوە هەر بەو ئاڕاستەیەدا کەوتمـە ڕوانـین و بینـیم کـەوا فیگەرەکـە وەکـو بڵێی هەر ئالەوێدا لە تەنیشت درشکەکەمەوە ئا لەو عەرزەدا هەڵقوولاً بێت.

"ئەوە کێیە؟" دەنگێکی قەبە پرسی.

"ئەی تۆ خۆت کێیت؟"

" من جەنگەڵەوانی ئەم ناوچەیەم."

ئیدی من ناوی خۆمم درکاند.

"ئـــا، مـــن تـــۆ دەناســـم. بـــەرەو مـــاڵێ بەڕێگاوەیت، وانییە؟"

"بـەڵێ، وەلـێ وەکـو خـۆت دەبـینی، کـە چ تۆفانێکە.."

"بەڵێ، تۆفانە،" دەنگەکە بەرسڤی دایەوە.

درەوشانەوەی بروسکەیەکی سپی لە تـەوقی سـەرەوە هـەتاکو پەنجـەی پـێ جەنگەڵەوانەکـەی ڕووناك کردەوە. هەر یەکسەر دوا بە دوای ئەو درەوشانەوەیەیش تەقوهۆڕی هەورە تریشقەیەك پەیدا بوو.

بارانەکـە بـەزەبر و زەنگێکـی دوو هێنـدەوە هاڕەی کردە خوارەوە.

"بـــەم زووانـــە خـــۆش ناکاتـــەوە،" جەنگەڵەوانەکە لەسەری ڕۆیشت.

"ئەی کەواتە دەبێ چی بکرێت؟"

"لێگەڕێ با بەرەو کۆلیتەکەی خۆمت بەرم،" بە توندو تیژییەکەوە ئەمەی ووت.

"خوایشت دەکەم."

"تکایە هەر لە جێگاکەی خۆتدا ڕۆنیشە."

بـــەرەو لای ســـەرە ماییнەکـــەوە ڕۆیـــشت، لغاوەکـــەی دەســـتەبەر کـــرد و ڕاتـــەکانێکی پێبەخشی و کەوتینە ڕێ. من بە کوشنی سەر درشکەکەوە چەسپیم کە "دەتگۆ قەیاغی سەر شـەپۆلەکانە" دیلانـێ دەکـات و هـاوارم بـۆ سەگەکەم کرد. لەو دەمەدا کە جەنگەڵەوانەکە چەشنی شەبەنگێك لە بەردەم شەفتەکاندا بەلای ڕاسـت و بـەلای چـەپدا ئەمـسەر و ئەوسـەری دەکرد، ماییнە بەستەزمانەکەیش لە نێو قوڕ و لیتاوەکەدا دژوارانە بەملاوبەولادا شڵپە شڵپی دەهـات و سـاتمەی دەدا و هەڵدەخلیـسکا. بـۆ ماوەیـەکی فـرە دوور و درێـژ بـە ڕێگـاوە بـووین هـــەتاکو ســـەرەنجام ڕێنمـــایی کەرەکـــەم هاتەوێستکردن.

"ئـەوەتا گەیـشتینە مـاڵێ، جـەناب،" بـە دەنگێکـی ئارامـەوە ووتـی. دەروازەی باخـچەکە جیڕەیـــەکی کـــرد و چـــەردەیەك ســـەگ بـــە هەماهەنگییەوە دەستیان بە وەڕین کرد. سەرم هـەڵبڕی و بـە هـۆی ڕوونـاکیی درەوشـانەوەی برووسـکەیەکەوە کـۆختێکی بـچووکم بەرچـاو کەوت کە لە ناو حەسارێکی مەزندا بنیاتنرابوو کە تـەیمانی بە تـووڵ چنراو گەمارۆی دەدا. لە پەنجەرەیەکی بچکۆلانەوە ڕۆشناییەك بە سستی دەبریـسکایەوە. جەنگەڵەوانەکـە ماییнەکـەی بـەرەو هەیوانەکـە سـەر خـست و کێـشای بـە دەرگاکەدا. "وا دێم! وادێم!" دەنگێکی ناسکی بچکۆلانە ئەوەی ڕاگەیانـدو، دواتـر دەنگـی دوو پێـی پـەتی و ئینجـا جیڕەجـیڕی ڕاکێـشانی کڵـۆمێکیش بـە دوایـدا هـات و، ئەوسـا کیژۆڵەیـەکی بـچکۆڵەی لـە دەوروبـەری دوازدە

سالأن، کە کراسێکی داوێن بە پەراوێز شەتەکدراوی لەبەردا بوو فانۆسێکیشی بەدەستەوە بوو، لەسەر پایەی دەرگاکەدا بەدیار کەوت.

"ڕێ بەم جێنتلمانە نیشان بدە،" بە کیژۆڵە بچکۆلانەکەی ووت. "منیش هاوکات درشکەکەت دەخەمە ژێر کەپرۆکەکەوە."

کیژۆڵەکە نیگایەکی پیامدا هەڵڕوانی و چووە ژوورەوە و منیش دوای کەوتم.

کۆلیتی جەنگەڵەوانەکە لەیەك ژووری دووکەڵ ڕەشکردووی نزم و سادە و ساکار پێك هاتبوو، کە تەختە لەوحی بەش بەش کردن و تەختە خەوی تێدا نەبوو. پاڵتۆیەکی دڕاوی پێستە مەڕ لەسەر دیوارەکەدا هەڵواسرابوو. لەسەر سەکۆیەکدا تفەنگێکی یەکدانە لوولەیی و لە گۆشەیەکیشدا کەڵەکەسیپاڵێك دانرابوون، دوو دانە سوراحی گەورەیش لە تەنیشت کوانووەکەوە سەقامگیر بوون. مۆمێك لەسەر مێزەکەدا دەسووتا، خەمەنگێزانە دەسووتاو دواسا دەتوایەوە. ڕێك لە نێو چەقی کۆلیتەکەیشدا لانکەیەك کە بەسەری کۆڵەکەیەکی درێژەوە بەسترا بووەوە، هەڵواسرابوو. کیژۆڵە بچکۆلەکە فانۆسەکەی خامۆش کردەوە، لەسەر کورسییەکی چکۆلانەدا خۆی ڕۆنیشاند و بەدەستی ڕاستی کەوتە ڕاژەنینی لانکەکە و بەوەکەی دیکەیشی خەریکی ڕێکخستنی مۆمەکە بوو. لە دەوروبەری خۆم ووردبوومەوەو دڵم داکەوت، چونکە لە شەوا چوونە نێو کۆلیتی وەرزێرێکەوە ئەزموونێکی خۆشحاڵکەر نەبوو. مەلۆتکەی نێو بێشکەکەیش بەخێرایی و سەنگینییەوە پشووی دەدا.

"تۆ هەر خۆت بە تەنیای ئالێرەدا؟" لە کیژۆڵە بچکۆلەکەم پرسی.

"بەڵێ هەر خۆم بە تەنیام،" بە دەنگێك وورتەی کرد کە بە ئاستەم دەبیسترا.

"تۆ کچی جەنگەڵەوانەکەیت؟"

"بەڵێ،" بە چرپەوە ووتی.

دەرگاکە جیڕەی لێوەهات و جەنگەڵەوانەکە سەری نەوی کردەوەو بە کەوشکەنەکەدا ڕابورد. فانۆسەکەی لەسەر زەوییەکە هەڵگرت، بەرەو لای مێزەکە ڕۆیشت و مۆمەکەی داگیرساند.

"دەشێ تۆ هەر تەنها بە مۆمێك ڕانەهاتبیت، وانییە؟" وای ووت و قژە لوولەکەی ڕاوەشاند.

تەماشایەکم کرد. بە دەگمەن بە ژن و بالأی ئە ئاوا ڕێکوپێکی پیاوێکم بینی بوو. بالأ بەرزو ناوشان پان بوو، خاوەنی پەیکەرێکی دانسقەیش بوو. لە ژێر قوماشی زبر و شێداری کراسەکەیەوە ماسوولکە بەهێزەکانی بە ڕاشکاوی دەرپەڕیبوونە دەرەوە. ڕدێنێکی ڕەشی لوولخواردوو نیوەی سیما پیاوانە گرژ و مۆنەکەی داگرتبووەوە و لە ژێر برۆ چڕ و پانەکانیشیدا کە لە ناوەڕاستدا پەیوەست ببوون دوو چاوی بچکۆلانەی ڕەنگ فندقی دەیانڕوانییە دەرەوە. بە سووکییەکەوە دەستەکانی لەسەر سمتی داناو لە بەردەممدا ڕاوەستا.

سوپاسگوزاریم لێکرد و ناوەکەیم پرسی.

"من بە فۆما ناو دەبرێم،" وەلأمی دایەوە، "بەلأم نازناوی گۆشەگیرەکەم لێنراوە."

"کەواتە تۆ ئەو کەسەیت کەوا بە گۆشەگیرەکە ناوزەد کراویت؟"

بە تاسەیەکی دوو هێندەوە لێی ڕامام. لەلایەن پەرمۆلایەکەی[1] خۆم و خەڵکانی تریشەوە زۆر جار لە بارەی ئەم گۆشەگیرەی کە تێکڕای وەرزێرەکانی ناوچەکە وەکو ئاگر سڵیان لێدەکردەوە، کۆمەڵێك سەرهاتم بیستبوون. بە گوێرەی قسەکانی ئەوانە لە هەموو دنیادا بەهرەمەندێکی لەو چاکتر ئا لەو

ئیشەدا نەبوو: "لێت نەدەگەڕا تەنانەت هەتا تۆزقاڵە خارو خاشاکێکی زۆر ناچیزیش بەریت! گرنگ نەبوو کە لە چ کاتێکدا بێت، هەتا گەر لە دڵی شەویشدا بێت، وەکو یەك تەن بەفر بەسەرتدا دەکەوێت. باشتریش وایە کە بیر لە بەرپاکردنی شەڕێك نەکەیتەوە – چونکە ئەو وەکو شەیتانێك بەهێز و زرنگ و کارامەیە! نایشتوانی نە بە خواردنەوە، نە بە پارەو پوول، نەیش بە هیچ جۆرە فرت و فێڵێك بەرتیلی بدەیتێ. لە جارێکیش پتر کۆمەڵە مەردوومێکی خێرخوا هەوڵیان دابوو کە لەسەر ڕووی زەمین ڕاییماڵن، بەڵام ئەو هەر کۆڵی نەدابوو."

ئا بەم تەرزە جوتیارە لۆکاڵییەکان لە بارەی گۆشەگیرەکەوە دەدوان.

"کەواتە تۆ گۆشەگیرەکەیت،" قسەکەم دووپاتکردەوە. "شتم لەبارەی تۆوە ژنەفتووە، هاوڕێم. دەڵێن ناهێڵیت هیچ شتێك بەزایە بڕوات."

"من بایەخ بە کارەکەی خۆم دەدەم،" بەخەمبارییەکەوە پاکۆی دایەوە.

"هەروا لە خۆڕاییش نانی ئەربابەکەم ناخۆم."

لەبەر پشتێنەکەیەوە سیکاردێکی دەرهێنا، لەسەر عەرزەکەدا بە چیچکانەوە دانیشت و دەستی بە هەڵقاچینی پلیتەی مۆمەکە کرد.

"تۆ خانمی ماڵەوەت نییە؟" لێم پرسی.

"نەخێر،" وەڵامی دایەوەو بە سیکاردەکە پیاکێشانێکی قورس و توندی وەشاند.

"ژنەکەت مردووە، وا نییە؟"

"نەخێر. بەڵێ.. مرد،" ئەوەی ووت و ڕووی وەرچەرخاند. من هیچم نەووت. چاوەکانی هەڵێناو سەیری کردم.

"بە دووی ڕێبوارێك کەوت، پیاوێکی خەڵکی شارۆچکەکە،"

بە زەردەخەنەیەکی بێبەزەییانەوە ئەوەی ڕاگەیاند. کیژۆڵە بچکۆلانەکە سەری داهێنایە خوارەوە و مەلۆتکەکەیش، بەخەبەرهات و دەستی بە گریان کرد. کیژۆڵە بچکۆلەکە ڕووەو بێشکەکە ڕۆیشت. "هانێ، ئەمەی بدەرێ،" گۆشەگیرەکە لەگەڵ ووتنی ئەمەدا، شووشە شیرێکی پیس و چڵکنی ئاخنییە نێو دەستییەوە.

"ئەو هەتاکو ئەمیشی بەجێهێشت،" بە دەنگێکی نزمەوە لەسەر قسەکە ڕۆیشت و ئیشارەی بۆ مەلۆتکەکە کرد. بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشت، ڕاوەستا و ئاوڕی دایەوە. "جەناب، دەشێت،" دەستی پێکرد، "تۆ نەتەوێت نانی ئێمە بخۆیت، بەڵام بێجگە لە نان شك بە..."

"من برسیم نییە."

"باشە، خۆ دەزانیت کە حاڵ چۆن چۆنییە. سەماوەرەکە پێدەکەم، بەڵام چای شك نابەم.. وا دەچمە دەرێ تا بزانم ماییەنەکەت چۆنە."

چووە دەرەوەو دەرگاکەی بە قایمی پێوەدا. من دیسانەوە سەیری دەوروبەرەکەم کرد. کۆلیتەکە هەتا لە جارانیش مەینەتبارانەتر هاتە بەر دیدەم. بۆنی ناخۆشی دووکەڵی تەختەی کۆنینە هەناسەدانی لێ تەنگ کردم. کیژۆڵە بچکۆلەکە لەو شوێنەی خۆی نەبزواو چاوەکانیشی هەڵنەبڕی. جار ناجارێکیش پاڵێکی بە بێشکەکەوە دەناو بە شەرمێکەوە کراسەکەی دەدایەوە بەسەر شانەکانیا. پێیە خاوسەکانیشی بەبێ جووڵەکردن شۆڕ ببوونە خوارەوە.

"ناوت چییە؟" لێم پرسی.

"ئۆلیتا،" گووتی و، چرۆچاوە بچکۆلانە خەمگینەی خۆی هێندەی تر گرژ و مۆن کرد.

جەنگەڵەوانەکە هاتە ژوورەوە و لەسەر سەکۆکەدا دانیشت.

"بۆرانەکە خەریکە بەسەر دەچێت،". پاش بێدەنگییەکی کورتیلەیش ووتی: "ئەگەر ڕای تۆ وا بێت، ئەوا من بەرەو دەرەوەی جەنگەڵەکە ڕێنماییت دەکەم." هەستامە سەر پێ. گۆشەگیرەکە تفەنگەکەی خۆی دەستدایێ و دەمەوانەی قۆناغەکەی تاقیکردەوە.

"ئەی ئەوە بۆچییە؟" پرسیم.

"لە نێو جەنگەڵەکەدا شتێك بەرپایە.. یەکێك وا لە بەرزاییەکە خەریکی داربڕینەوەیە،" ئەمەی لە وەڵامدانەوەی تێڕوانینە پرسیارئامێزەکەی مندا، ووت.

"ئا ئەلێرەوە گوێبیستی دەبیت؟"

"لە دەرەوە گوێبیستی دەبم."

بە دوو قۆڵیی چووینە دەرەوە. بارانەکە خۆشی کردبووەوە. لە مەودایەکی دوورەوە هێشتاکە کۆمەڵە هەورێکی چڕو سەنگین بەیەکەوە ئاپۆرەیان بەستبوو و چەندین زنجیرەی دوور و درێژی هەورە تریشقەیش دەبریقانەوە، بەڵام لە سەر سەریشمانەوە پەڵە پەڵەی شینی – تۆخی ئاسمان لێرەو لەوێدا دەبینران و تاکوتەرایش لەو مابەینانەوە ئەستێرە زۆر بچکۆلەکان دەبریسکانەوەو، گەواڵەکان بە خێراییەکی توندەوە ڕەتدەبوون. شەقڵ نەمای دارو درەختەکان کە بە باران تەڕ ببوون و بە بایش کەوتبوونە هەڵلەرزینەوە، لە شەوەزەنگەکەوە کەوتنە دەرکەوتن. ئێمەیش کەوتینە گوێ هەڵخستن. جەنگەڵەوانەکە شەپقەکەی خۆی داکەند و سەری دانەواند.

"ئەها ئەلەوێ!... ئەها ئەلەوێ!" لە ناکاوڕا ئەمەی ووت و ئیشارەتی کرد.

"ئای لە من، تەماشا چ شەوێکی نووتەکی بۆ ئەمە هەڵبژاردووە!"

من بێجگە لە غەڵبە غەڵبی گەڵاکان هیچی دیکەم نەبیست.

گۆشەگیرەکە لە ژێر ساباتەکەوە ماینەکەی هێنایە دەرەوە.

"ڕەنگە،" بە دەنگێکی بەرزەوە ووتی، "لە کاتی خۆیدا نەگەمە ئەوێندەر."

"مــن لەگەڵتــدا دێــم.. ئایــە بەجێیــە لەگەڵتدا بێم؟"

"زۆر چاکە،" وەڵامی دایەوەو ماینەکەی بردەوە جێگاکەی خۆی. "وەگیری دەهێنین و دوایی من خۆم ئاودیووی دەرەوەت دەکەم. دەی با بڕۆین."

کەوتینەڕێ. گۆشەگیرەکە لە نـاوە دەڕۆیشت و منیش لە پاش ئەوەوە دەڕۆیشتم. هەر خوا دەیزانێ کە چۆن ڕێگاکەی دەناسی، لەگەڵ ئەوەیشدا هەر تەنها تاونا تاوێك هەڵوەستەی بۆ دەکرد و هەندێ جاری تریش هەر بۆ ئەوەی کە گوێ لە دەنگی تەورەکە ڕادێرێت.

"ئاگات لێیە،" لە میانی ددانەکانییەوە سرپە سرپێکی دەرپەڕاند،" گوێت لێیە؟ گوێت لێیە؟"

"ئاخر لە کوێوەیە؟"

گۆشەگیرەکە شانەکانی هەڵتەکاند. بەنێو کەندالەکەدا شۆڕبووینەوە، بایەکە بۆ ساتەوەختێك لێیکەوت و ئیدی سەدای ڕێك و پێکی تەورێك بە ئاشکرایی دەهاتە بەر بیستنم. گۆشەگیرەکە تەماشایەکی کردم و سەری لەقاندەوە. زیاتر بە مابەینی سەرخەسە تەڕەکان و گەزنە گیاکاندا ڕۆیشتین. دەنگی شکانێکی سەرکوتکراوو درێژدادڕ کەوتە بەرگوێ.

"ئەوە درەختەکەی بڕییەوە،" گۆشەگیرەکە ووتی.

هاوکاتیش ئاسمانەکە هەر بەردەوام بوو لە ساف بوونەوەو نێو جەنگەڵەکەیش نەختێك ڕۆشنتر بووەوە. سەرەنجام لە

کەندالەکەوە ڕێگای هاتنە دەرەوەی خۆمانمان گرتەبەر.

"تۆ ئالێرەدا چاوەڕێ بە،" جەنگەڵەوانەکە بە چرپەوە پێی وتم، ئینجا چەمایەوە، تفەنگەکەی بەرز هەڵبڕی و لە نێو بێشەڵانەکاندا بزر بوو. بە جۆش و خرۆشەوە کەوتمە گوێ ڕادێران. وای بۆچووم کە لە میانەی جاڕو جەنجاڵی سەر و مڕی بایەکەوە گوێبیستی کۆمەڵە دەنگێکی نووزەوار بووم کە مانەندی دەنگی تەورێك بوون کە بە ووردی و لەسەرخۆ لقوچڵەکان ببڕێتەوە، یان بە جیڕە جیڕی کۆمەڵە چەرخێك و پرمە پرمی ئەسپێك دەچوون.

"بەرەو کوێ دەچیت؟ ڕاوەستە!" دەنگی ئاسنینی گۆشەگیرەکە ناگەهان قیژاندی.

دەنگێکی تریش کە بە دەنگی کەروێشکە کێویلەیەکی نێو تەڵە دەچوو بە سکالاو غەمگینییەوە هاواری لێ هەستا. ئینجا کێشمە کێشێك هاتە کایەوە.

"هەی درۆزن! هەی درۆزن!" گۆشەگیرەکە کە بە سەختییەوە هەناسەی دەدا وای ڕاگەیاند. "تۆ دەربازت نابێت.."

بە ئاڕاستەی دەنگو هەراو زەناکەوە تێم تەقاند و، لە گشت هەنگاوێکیشدا سەرەنگرێم کرد و بەرەو شوێنی گێروگازەکە غارم دا. جەنگەڵەوانەکە بە شتێکەوە سەرقاڵ بوو کە لە سەر عەرزەکەدا لە تەنیشت دارێکی براودا بوو:

دزەکەی لە ژێر خۆیدا بەرزەفت کردبوو بە پشتێنێکیش باسکی بادراوی لە دەوری پشتیدا دەبەستەوە. لەوێ نزیك کەوتمەوە. گۆشەگیرەکە خۆی ڕاست کردەوە و ئەویشی هەستانەوەو خستییە سەر پێیەکانی. جوتیارێکم بینی کە سەرهەتا پای تەڕ و جلوبەرگی شڕو وڕ بوو، ڕیشێکی درێژی شاش و پەڕاگەندەیشی هەبوو. ئەسپێکی داهێزراوی بچکۆلانەیش، کە نیوەی بە پارچە حەسیرێکی خراپ و نالەبار داپۆشرا بوو، ئالەوێ لە پاڵ گالیسکە تەختەکەدا ڕاوەستابوو.

جەنگەڵەوانەکە هیچ شتێکی گۆ نەکرد، جوتیارەکەیش بە هەمان شێوە هیچی نەووت. هەر بە تەنها سەری خۆی ڕاوەشاند و هیچی تر.

"بەرەڵای کە با بڕوات،" بە گوێچکەی گۆشەگیرەکەدا چرپاندم.

"من پارەی دارەکە دەدەم."

گۆشەگیرەکە بە بێدەنگییەوە بە دەستی چەپی خۆی ئەسپەکەی بەهۆی یاڵەکەیەوە دەستەبەر کردبوو، هاوکات بە دەستی ڕاستیشی دزەکەی بە هۆی پشتێنەکەیەوە گرتبوو.

"دەی، بکەوە جووڵەکردن، هەی بێکەڵك،" بە سەختی و ڕەقییەکەوە ئەمەی ووت.

"ئا ئەوە تەورەکەمە، ئەها ئالەوێ، هەڵیگرە." دزەکە بە منگە منگێکەوە ووتی.

"ڕاستە، کەڵکی نییە ئەگەر وون بێت!" جەنگەڵەوانەکە هاواری کرد و تەورەکەی قۆزتەوە.

کەوتینە ڕێگا و منیش بە دووی ئەوانەوە ملم نا. بارانەکە دیسانەوە سەری هەڵدایەوەو دەستبەجێ کەوتەوە شۆڕە شۆڕکردن. بە ناهەموارییەکەوە بەرەو کۆلیتەکە ڕێمان دەربردو گەڕاینەوە.

گۆشەگیرەکە ئەسپە بچکۆلانەکەی لە ناوەندی حەوشەوبانەکەدا بەجێهێشت و جوتیارەکەی بەرەو نێو ژوورەکە برد، پشتێنە گرێدراوەکەی شلکردەوەو لە سووچێکدا داینیشاند. کیژۆڵە بچکۆلەکە، کە لە تەنیشت کوانووەکەدا خەو بردبوویەوە، ڕاچڵەکا و بە سەڵەمینەوەیەکی بێدەنگ کەوتە تەماشاکردنمان. من لەوێ لەسەر کورسییە بچکۆلەکەدا دانیشتم.

"شەســـــتە بـــــارانێکی ئەوتۆیـــــە،" جەنگەڵەوانەکــە ووتــی، "دەبــێ تــۆزێکی تــر چاوەڕوان بین. ئارەزووی ڕاکشان دەکەیت؟"

"نا سوپاست دەکەم."

"لەبەر خاتری تۆ، دەکرا ئا لەو کەنتۆرەدا دەستبەســەری بکــەم،" لەســەر قــسە هــەر بــەردەوامبوو، ئیــشارەی بــۆ جوتیارەکــەیش دەکــرد، "بــەڵام هــەروەکو دەکــرێ ببــینی کــە ئەڵقەڕێزی نییە.."

"وازی لــێ بێنــە، دەســتی پێــوە مــەدە،" مــن خــۆم تــێ هەڵقورتانــد. جوتیارەکــە لــە ژێــر برۆکانییەوە پیامدا هەڵیڕوانی. لە ناخی دڵەوە گفتم بە خۆم دا کە ئەو داماوە کلۆڵە بەرەڵا بکەم ئیدی هەرچییەکیش دەبــێ هــیچ گــرنگ نییــە. لەســـەر کورســـییەکەدا بـــێ جوولـــە و مـــات دانیـــشتبوو. بـــەهۆی ڕوونـــاکی فانۆســـەکەوە ڕووخـــسارە چـــرچ و لۆچـــاوییەکەی، چـــاوە بـــە قوولـــدا چـــووەکانی، بـــرۆ دەرپـــەڕیووە بێزاریـــی دەربڕەکـانی، چـاوە بـێ ئۆقرەکـانی و دەسـت و پێیـە باریکەلـەکانیم دەبـینی. کیژۆڵـە بـچکۆلەکە هـەر لـەوێ لەبـەر پێیـەکانی لەسـەر زەوییەکـەدا هەلاژاو دووبارە خەوی لێکەوتەوە. گۆشەگیرەکە لەلای مێزەکـەوە ڕۆنیشت، سـەری خـۆی بەسـەر دەســتەکانیدا شــۆڕ کــردەوە. سیــسارکێك لــە سووچێکدا دەستی بە سیڕە سیڕ کرد. بارانەکە بەســـەر ســـەربانەکەدا هـــاڕەی دەکـــرد و بـــە پەنجەرەکانیـشدا دەخزایـە خـوارەوە. ئێمـەیش هەر هەموو کپ و خامۆش بووین.

"فۆمـا کـۆزمیچ،" جووتیارەکـە ناگـەهان بـە دەنگێکـی تاسـاوو وردو خاشـەوە تێیهەڵـچوو، "فۆما کۆزمیچ..."

"ئەوە چیت لێقەوماوە؟"

"بەڕەڵام کە."

گۆشەگیرەکە پەرسڤی نەدایەوە.

"بەرەڵام کە.. برسێتییە کەوا.. بەڕەڵام کە."

"مــن ئــەم بابەتــەی تــۆ ئاســا زۆر چــاك شــارەزام،" جەنگەڵەوانەکــە بــە دڵگیرییەکــەوە ووتــی. "هــەر هــەمووتان لــەو شــوێنەوەی کــە لێوەی دێن هاوچەشنن، کۆمەڵێك دزن!"

"بـــەڕەڵام کـــە،" جوتیارەکـــە دووپاتـــەی کـــــردەوە. "بـــــەهۆی بەیلیفەوەیـــــە[2]، تـــــۆ ئاگاداریــت.. نوغرۆبــووین، ئــا ئــەوەین ئێمــە.. بەڕەڵام کە!"

"نـوغرۆ بـوون!.. بـەڵام هـیچ کەسـێك هـەقی دزی کردنی نییە."

"بـــەڕەڵام کـــە، فۆمـــا کـــۆزمیچ! مەمـــدەرە دەســـتەوە! ئەربابەکـــەت، تـــۆ خـــۆت دەزانیـــت، دەرحاڵ بە بەرچاوی خۆتەوە هەڵمدەلووشێت!"

گۆشـەگیرەکە ڕووی وەرگێـڕا. جووتیارەکـە وەکو ئەوەی لـەرزوتای هـەبێت هەڵدەلەرزییـەوە. سەرومڕ سەری دەلەقاندەوەو بە پچڕ پچڕییەوە هەناسەی دەدا. "بەڕەڵام کە،" بە دڵساردییەکی مەینەتبارانەوە دووپاتەی کردەوە، "بۆ خاتری خوا! پارەکەی دەبژێرم، هەر دەیبینی، بە خوا دەیبـژێرم! بـە خـوا برسـێتییە و.. منداڵـەکانیش زارییانـە، تۆ خـۆت دەزانیـت کـە چـۆن چـۆنییە. جارو باریش گەلێك سەخت و ناهـەموار دەبێت، هەروەك دەیبینیت."

"بـەڵام لەگـەڵ ئەوەیـشدا نـابێ پـەنا بـۆ دزی کردن بەریت."

"ئەسـپە بـچکۆلەکەم،" جوتیارەکـە لەسـەر قـسەکەی ڕۆیـشت، "ئـەویش بەڕەڵاکـە، ئـەو هەموو شتێکمە.. ئەویش بەڕەڵاکە!"

"پێـت دەڵـێم ناکرێـت. منـیش هـەروەها یـەکێکی فەرمان وەرگرم و پێویستە بەرپرسیار بم. هـیچ هۆیـەکیش شـك نابـەم کـە بەرامبـەر بـە کەسانێکی وەکو تۆ میهرەبان بم."

"بەڕەڵامکە! هەژاری، فۆما کۆزمیچ، هەمیشە هەژاری بوو، ئا ئەوە بوو.. بەڕەڵام کە!"

"من ئەم بابەتەی تۆگەل زۆر چاك دەناسم!"

"ده بەرەلأم كە ئیتر!"

"جـا ئاخـاوتن لەگـەڵ تـۆدا چ سـوودێكی هەیە، ها؟" تۆ ئا لەوێدا بێدەنگ دانیشە، ئەگینا ئەوە دەزانیت كە لە لایەن منەوە چیت بە دەست دێت، نازانیت؟ ئایا ئەوە نابینی كە جێنتلمانێك ئا لێرەدایە؟"

كـابرا هەژارەكـە چاوەكانی وێـك هێنایـەوە. گۆشـەگیرەكەیش وێـژینگێكی داو سـەری خستە سەر مێزەكە. بارانەكە هێشتا هـەر بـەردەوامبوو. منـیش چـاوەڕوانی ئـەوەم دەكـرد تـا بـزانم چـی ڕوودەدات.

لەناكاودا جوتیارەكە خۆی ڕەپوڕاست كرد و چـــاوەكانی گەشـــبوونەوە و ڕووخساریـــشی سوورهەڵگەڕا.

"دە كەواتـە هـانیٚ تـۆ بمخـۆ، دەیـاڵڵاٚ، خـۆتم لیٚ سیخناخ بكە!"

ئـــە ئـــاوا دەســـتی پێكـــرد، چـــاوەكانی هەڵـــدەگلۆفت و لالێوەكانیـــشی شـــۆڕ ببوونـــە خوارەوە.

"دەیـاڵڵاٚ دەی، هـەی حـەرامزادەی نـەفرەتی، دەی خوێنە كریستییەنەكەیشم بخۆرەوە، یاڵڵاٚ دەی، بیخۆرەوە!"

جەنگەڵەوانەكە ڕووی خۆی وەرگێڕا.

"لەگـــەڵ تۆمـــە، تـــۆ هـــەی ئاســـیاییە نەفرەتییەكە، تۆ هەی خوێن مژ!"

"سەرخۆشـــی، هـــا، هـــەر لەبـــەر ئەوەشـــە كەوتوویتەتـە جنێـودان بـە مـن، هـا؟ وا نییـە؟" جەنگەڵەوانەكـــە بـــە سەرســـامییەكەوە ووتـــی. "هەســـتەكانت لـــە كـــیس چـــووە، وا نییـــە؟"

"ســـەرخۆش، هـــا! خـــۆ بـــە پـــارەی تـــۆ خـــۆم سـەرخۆش ناكـەم، تۆ هـەی حەرامزادەی خوێن ڕێــژ، هــەی ئــاژەڵی خــوێن ڕێــژ، هــەی ئــاژەڵ، ئاژەڵ!"

"هێیـی، بەسـە ئیـدی بیـبڕەوە! بزانـە چیت بەسەر دێنم!"

جا ئەوە بۆ من چی دەگەیەنێت! فەرق ناكات – ئیدی كۆتاییم پێهاتووە! ئەی بەبیٚ ئەسپێك چیم پێدەكرێت؟ بمكوژە – كۆتایی، هـەر هـەمان شتە، یەكە، چ لەلایـەن برسیێتییەوە بێت یـاخود لەلایەن تۆوە بێت، بۆ من هەروەكو یەكە! هـەموو شـتێك تـازە كۆتـایی پێهـات، ژن، منـداڵ – هـەر هەموو ئیدی كۆتاییان پێهات. لەگەڵ ئەوەیشدا هـەر بـە تـەنها چاوەڕوان بـە، لـە ئاكامـدا هـەر وەگیرت دەهێنین!"

گۆشەگیرەكە هەستایە سەر پیٚ.

"دەلـــێم دە! دەلـــێم دە!" جوتیارەكـــە بـــە دەنگێكـی خـەشمگین و قیناوییـەوە شـیتاندی. "دەیاڵڵاٚ، لێم دە! لێم دە!" (كیژۆڵە بچكۆلەكە بە خێرایی پەلەقاژێیـەكی لەسـەر عەرزەكەدا كرد و چاوی تێبڕی.)

"دە لێم دە! دە لێم دە!"

"دەمـت داخـە!" جەنگەڵەوانەكـە نەڕانـدی و دوو هەنگاوی بەرەو ڕووی ئەو نا.

"بەسە، فۆما، بەسە!" من هاوارم كرد.

"وازی لیٚ بێنە! خوای لەگەڵ!"

"دەمـــم داناخـــەم!" پیـــاوە خاكەســـارەكە بـەردەوامبوو. "بـۆ مـن هـەر هـەمووی هـەروەكو یەكـــە – ئیـــدی كۆتـــاییم پـــیٚ هـــاتووە! تـــۆ هـــەی حـــەرامزادەی نـــەفرەتی، تـــۆ هـــەی ئـــاژەڵ، تـــۆ، ئـــەوەی كـــە تـــۆ دەیكـــەیت تـــەواو بـــوونی نییـــە، وەلـــیٚ بـــەس چـــاوەڕوان بـــەو دەبیـــنی، چـــیدی پـــتر لـــەم دەورو زێـــوارەدا زۆرداری ناكـــەیت! ئـــیتر گرێـــی گوریـــسێكی ســـفت و تونـــد لـــە دەوری گەردنتـــدا دەبێـــت، بەس چاوەڕوان بە!"

گۆشـــە گیرەكـــە شـــەپیلكی دەســـتەبەركرد. منـــیش خـــۆم بـــۆ كۆمـــەك كردنـــی جوتیارەكـــە هەڵقورتاندە پێشیٚ.

"جـــەناب، دەســـتی پێـــوە مـــەدە!" جەنگەڵەوانەكە بەسەرما قیژاندی.

هـیچ گوێیـەکم بـە هەڕەشـەکەی ئـەو نـەداو خەریکبوو دەستم درێژ بکەم بەڵام ئا لەو ئانەدا، لــە سەرســامییە بێرادەکــەی منــدا، بەیــەك پێــچوبادانەوە پــشتێنەکەی لـــە ئانیـــشکی جوتیارەکـەوە ڕاکێـشا، بـە پـشتەمل بـەرزەفتی کرد، شەپقەکەی بە زۆر هەڵکێشایە سەری، بە پرتـاو دەرگاکـەی ئاواڵـە کـردەوەو پـاڵی نایـە دەرێ.

"لەگەڵ ئەسپەکەتدا بۆ جەهەننەم بڕۆن!" بە دوویدا هاواری کرد.

ئاگادار بە بۆئەوەی جارێکی تر نەیەیتە سەر ڕێگام."

بۆ کۆلیتەکە گەڕایەوەو لە قوژبنێکدا کەوتە جاڕو جەنجاڵ کردن.

"زۆر باشـە، گۆشـەگیر،" سـەرەنجام گـووتم. "تـۆ سەرسـامت کـردم! پـەییم بـەوە بـرد کـە زەلامێکی دانسقە و نایابیت."

"جەناب، با لەو بارەیەوە بەس بێ ئیتر،" بە بێتاقەتییەکەوە قسەکەی پێ بڕیم.

"تکایە هـەر هێنـد چاکی بکە کە لەبارەیـەوە نـەدوێیت. چـاکتر وایـە کـە مـن بـەرەو دەرەوەی جەنگەڵەکـە ڕێنماییـت بکـەم،" ئینجـا لەسـەری ڕۆیـشت و ووتـی، "چـونکە دەزانیـت کـە بـاران چاوەڕوانی تۆ ناکات..."

پێچکەکانی گالیسکەی جوتیارەکە بە خڕە خـــــڕەوە بـــــەرەو دەرەوەی حەوشـــــەکە دوورکەوتەوە.

"تەماشــا، ئـەوەتا وا ڕۆیـشت!" گــووتی. "بـەلاَم بزانـە چـی بەسـەر دێـنم!" نیـو کاتـژمێر پـاش ئـەوە لـە ڕۆخـی جەنگەڵەکـەدا ماڵئـاواییم لێکرد.

## پەراوێزەکان:

1–*Yermolay*: ناوی خزمەتکارەکەی.

2–*Bailiff*: مـەئموور و بریکـاری مـەزرا، سـەرکار و بەرپرسـیاری مڵکـو مـاڵی دەرەبـەگان، بەرپرسـیارە لـە ڕاگـــرتنی حیـــسابی پـــارەو پـــوول و ڕێکخـــستنی ئیـــــشوکارەکانی ماڵـــــەوەو بـــــەڕێوەبردنی زەوی و زارەکانیان.

## سەرچاوە:

*Ivan Turgenev*
*Three sketches From A Hunters Album*
*Translated by: Richard Freeman*
*Penguin 60s classics*
*London 1995.*

# مشکە کوێرە زەبەلاحەکە

فرانز کافکا

لە ئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف

ئەو کەسانەی مشکە کوێرەیەکی قەبارە ئاسایی بەلایانەوە زۆر پیس و قێزەونە، منیش یەکێکم لەو کەسانە، هەر لەبەر قێزکردنەوە دەمردن ئەگەر ئەو مشکە کوێرە زەبەلاحەیان ببینیایە کە چەند ساڵێك لەمەوبەر لە دەوروبەری یەکێك لە دێهاتەکانماندا بینراو بەهۆیەوە دێیەکە جۆرە ناوبانگێکی کاتیی پەیدا کرد. ئەمڕۆ دووبارە نوقمی بیرچوونەوە بووەتەوە و تەنها سەیری و نادیاریی رووداوەکەی بۆ ماوەتەوە، کە هێشتا روونەکراوەتەوە، هەرچەند، دەبێت دان بەوەدا بنرێت، خەڵکەکە تووشی دەردەسەرییەکی زۆر بوون بۆ روونکردنەوەی. لەبەرئەوە، لە ئەنجامی ئەو گوێنەدانە سەیرەی ئەو کەسانەی خۆیان بە شتی زۆر بێبایەخەوە خەریکدەکەن کەچی ئەمیان فەرامۆشکرد، مەسەلەکە بێ ئەوەی لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەلی لەسەر بکرێت بە تەواوی لە بیر چووەوە.

بەهەر حاڵ، بەهانەی ئەوەی کە دێیەکە دوورە و خەتی شەمەندەفەر نایگاتێ، ڕاست نەبوو. زۆر کەس هەبوو لە شوێنی دوورەوە هاتبوون، تەنانەت هەندێك خەڵکی بیانیشیان تێدا بوو. تەنها ئەوانە نەهاتبوون کە دەبوایە شتێکی زیاتریان تێدابوایە لە حەزی بینین.

بەڕاستی، ئەگەر ئەو چەند کەسە سادەیەی کە سەرقاڵی ئیشی رۆژانەی خۆیانن و بە ئاستەم بواری کاری تریان هەیە، مەسەلەکەیان زۆر بێبایەخانە نەگرتایەتە ئەستۆی خۆیان بەندوباوی ئەم دیاردە سروشتییە لەوانە بوو بۆ شوێنی دوورتر لە ناوچەکە بڕۆشتایە. بەند و باوەکەش، کە زۆر جار رێ لە بڵاوبوونەوەی ناگیرێت، لەم حاڵەتەدا زۆر سست بوو و پێویستی بە پاڵنانێك هەبوو ئەگینا بڵاو نەدەبووەوە. بەڵام، تەنانەت ئەوەش هۆکارێکی رەوا نەبوەو بۆ پەسەند نەکردنی لێکۆڵینەوەی مەسەلەکە، بە پێچەوانەوە، ئەم دیاردەیەی

دووەمیش دەبوایە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرایە. لەبەر ئەوە، کارەکەیان دایە دەست مامۆستا پیرەکەی لادێیەکە بۆئەوەی روونکردنەوەیەک بە رەش و سپی لەم بارەیەوە بنووسێت. ئەویش، هەرچەند لە پیشەکەی خۆیدا پیاوێکی نایاب بوو، بەڵام ئەو توانایەی لەم بارەیەوە هەیبوو و ئەو کەرەستانەی لە بەردەستیدا بوون یارمەتیی نەدەدان کە وەسفێکی ورد لەم بارەیەوە پێشکەش بکات، وەسفێک کە دواتر وەکو سەرچاوەیەک لەلایەن خەڵکانی ترەوە بەکار بێت. نامیلکە بچووکەکەی چاپکراو ژمارەیەکی باشی لێفرۆشرا بەو کەسانەی کە لەو کاتەدا سەردانی لادێکەیان کرد، لەلایەن رای گشتییەوە پشتگیری لێکرا. بەڵام مامۆستاکە ئەوەندە زانایی هەبوو کە هەست بکات ئەو کارە پچڕپچڕەی ، کە کەس پشتگیریی نەکرد، لە ناخەوە هیچ بەهایەکی نییە. ئەگەر سەرەڕای ئەوە خاو نەبوایەتەوە لە کارەکەی و وەکو مەسەلەی سەرەکیی ژیانی سەیری بکردایە، دەیتوانی مەزنی دەرکەوتنی ئەو مشکە کوێرەیەی دەربخستایە، هەرچەند ساڵ دوای ساڵ لەم بارەیەوە بێ هیواتر دەبوو، لەلایەکی ترەوە ئەمە دڵسۆزیی ئەو مامۆستا پیرە نەناسراوە دەردەخات لە ئەنجامدانی کارەکەیدا. نامیلکە کورتەکەی دووەمی، کە پاش چەند ساڵێک لە نووسینی نامیلکەی یەکەمی نووسیبووی غەمباری و دڵگرانییەکی زۆر دەردەبرێت بەرامبەر ئەو هەڵوێستە ساردەی لێپرسراوە ناسراوەکان، ئەوسا خەڵکەکە بە تەواوی لە بیریان چووبووەوە مەسەلەکە باسی چی دەکات. لە نامیلکەی دووەمدا گلەیی لەو تێنەگەیشتنەی خەڵکی دەکرد کە بەلایەوە چاوەڕواننەکراو بوو. ئەو گلەییانەی کە زیاتر دڵسۆزیان دەردەبڕی نەک کارامەیی. بەرامبەر بەو کەسانە وتەیەکی ماقووڵی هەبوو کە دەیگوت: "ئەوە من نیم، ئەوانن کە وەکو مامۆستا پیرەکانی لادێ قسە دەکەن". نموونەی زانایەکی هێنابووەوە کە لەبارەی ئەم مەسەلەیە بەتایبەتی چوو بوو بۆ لای. ناوی زاناکەی نەبردبوو، بەڵام بارودۆخەکە وامان لێدەکات بتوانین ناوەکەی هەڵبهێنین. دوای ئەوەی بەزەحمەتێکی زۆرەوە رێگەی پێدەدرێت، هەر لە شێوازی پێشوازییەکەیەوە بۆی دەردەکەوێت کە زاناکە کوێرانە بڕیاریداوە لە دژی مەسەلەکە بوەستێت! ئەمەش لەو تێبینییەوە دەردەکەوێت کە پاش خوێندنەوەی ڕاپۆرتە دوور و درێژەکەی لە نامیلکەکەوە، سەر زارەکی وتی: "خاکی دەوروبەری دێکەتان بەتایبەتی رەش و بەپیتەو خۆراکێکی باش بە مشکە کوێرەکە دەبەخشێت و سەرئەنجام مشکەکان هەتا قەبارەیەکی نائاسایی گەشە دەکەن".

"بەڵام هەتا ئەو قەبارەیە نا". مامۆستاکە وای وت و دوو دیاردەی لەسەر دیوارەکە دەستنیشان کرد کە، بە هەندێک زیادەڕۆییەوە، قەبارەی مشکە کوێرەکەی نیشاندەدا. وا دیار بوو زاناکە هەموو مەسەلەکەی بە سووکی وەرگرتبوو و وەکو نوکتەیەک سەیری دەکرد. وتی "ئینجا، قەیچێکە!"

ئەوە دەگێڕێتەوە کە لە دوای بیستنی ئەم بڕیارە دەبوایە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و چۆن ژنو منداڵەکانی لە ناو بەفردا چاوەڕوانیان دەکرد و چۆن ناچار بوو دان بەوەدا بنێت بۆیان کە هیوای لەم بارەیەوە براوە. کاتێک کە هەڵوێستی زاناکەم دەربارەی مامۆستا پیرەکەم

خوێنـــــــدەوە، هێـــــشتا ناميلكەكـــــــەيم نەخوێندبووەوە، بەڵام يەكسەر بڕياری ئەوەم دا كە خۆم بۆ كۆكردنـەوەو ڕێكخستنی هـەر زانياريـەك كە بەدەستم بكەوێت سەبارەت بەم مەسەلە تەرخان بكەم. خۆ ئەگەر نەتوانم زەبر لە دژی ئـەو زانايـە بـەكار بهێـنم، هـەر نـەبێت دەتوانم شتێك بۆ بـەرگريكردن لـە مامۆستاكە بنووسم، ئـەو زەلامـە پـاك و بێدەسـەڵاتە. دان بەوەدا دەنێم كە دوايی زۆر پەشيمان بوومەوە لەم بڕيارەم چونكە هەر زوو بۆم دەركەوت كە جێبـەجێكردنی تووشـی گێروگـرفتی سـەيرم دەكات. لەلايەكەوە، خۆم دەسەڵاتێكی ئەوتۆم نـەبوو گۆڕانێك لـە نێـو خوێندەوارانـدا يـان لـە ڕای گشتيدا دروستبكەم كـە لـە بەرژەوەنـديی مامۆستاكەدا بێت. لەلايـەكی تـرەوە، لەوانەيـە مامۆستاكە تێبينی ئـەوە بكـات كـە مـن كـەمتر بايـــەخ بـــە بابەتـــە ســـەرەكييەكە دەدەم، كـــە سـەلماندنی ئەوەيـە مـشكە كوێرەكـە بەڕاسـتی بينـراوە نـەك سـەلماندنی ئـەوەی مامۆسـتاكە پيـاوێكی پاكـە، كـە بـەڕای ئـەو، مەسـەلەيەكی ئاشـكرايە و پێويـستی بـە بـەرگريكردن نييـە. بـەو پێيـە، ئـەوەی چاوەڕوانم دەكـرد ڕووبـدات ئەمـە بـوو: لەوانەيـە مامۆسـتاكە لـە مەبەسـتم تێنـەگات، هەرچـەند مـن دەمويـست هاوكـاريی بكەم و يارمەتی بدەم، لەوانەيە خۆم پێويستيم بـــە يارمـــەتی هـــەبێت، هەرچـــەند ئەمـــە چاوەڕواننەكراوە. سەرەڕای ئەمەش، ئـەم كـارە ئـــەركێكی زۆرم دەخاتـــە سەرشـــان. ئەگـــەر بمـەوێت خەڵكەكـە قايـل بكـەم نـاتوانم تكـای يارمەتی لێبكەم لەم بارەيەوە چونكە ئەو خۆی نـەيتوانی قايليـان بكـات. ئەگـەر ناميلكەكـەی بخوێنمـەوە، بەهەڵـەدا دەمبـات. لەبـەر ئـەوە بڕيارمـــدا هـــەتا كارەكـــانم تـــەواو دەكـــەم نەيخوێنمـەوە. ڕاسـتە لـە ڕێـی كەسـانی تـرەوە جـۆرە پرسـێكم پێـدەكرد، بـەڵام نەيـدەزانی بـۆ بەرژەوەنديی ئەو ئيش دەكەم يان لە دژی.

ڕاستە لەوانەيە لەو باوەڕەدا بوو بێت كە لە دژی كار دەكەم، هەرچەند دوايی نكووڵی لەوە كـرد، چـونكە بەڵگـەم هـەبوو كـە جۆرەهـا تەگەرەی دەنايە ڕێگەم. زۆر ئاسانيش بوو ئەو كارە بكات چونكە، بێگومان، ناچار بووم ئەو لێكۆڵينەوانـەی كـە پێـشتر ئـەنجامی دابـوو، دووبـارە بكەمـەوە. لەبەرئـەوە هەميـشە ئـەو هـــەنگاوێك لـــە پـــێش منـــەوە بـــوو، ئەمـــەش تـــەنها ڕەخنـــەی ڕەوا بـــوو كـــە لـــە شـــێوازی ئەنجامـــدانی كارەكـــەم بگيرێـــت، ناشـــتوانم نكووڵی لەو ڕەخنانە بكەم.

سەرەڕای ئەوەش، ئەو گوێنەدانەم بەخۆم و ئـــەو تـــرس و ورياييـــەم لـــە دەربـــڕينی ئەنجامەكاندا ئەوەندەی تر كارەكەی سڕ كردم. بێجگـــە لەمانـــە، كاريگـــەريی مامۆســـتاكە بەسـەرمەوە ديـار بـوو. لەوانەشـە بـەهۆی ئـەم خاڵـــەوە بێـــت ئەوەنـــدە بـــەزەقی ڕارايـــيم پيشاندابێت پاشان ناميلكەكەی مامۆستاكەم خوێنـدەوە كـە ناونيـشانێكی دوورو درێـژی هەيە بەم شێوەيە: (مشكە كوێرەيەك كە هەتا ئێستا هی وا گەورە نەبينراوە). بۆم دەركەوت كە خاڵی زۆر گرنگی تێدايە كە قايلم ناكات، هەرچەند هەردوكمان لەو باوەڕەداين كە خاڵە سەرەكييەكەی سەلماندووە، كە ئەويش بوونی مـــشكە كوێرەكەيـــە. ئـــەم جياوازييـــە لـــە بۆچـــوونەكانماندا نەيهێـــشت پەيوەندييـــەكی بـــاش و هاوڕێيانـــە لەگـــەڵ مامۆســـتاكەدا دابمـەزرێنم، هـەر، سـەرەڕای هـەموو شـتێك، حەزم دەكرد. ئەو لای خۆيەوە جۆرە هەستێكی دوژمنانەی بەرامبەرم گەشەپێدابوو. ڕاستە لە

بەرامبەرمـــدا زۆر خـــاکی و ســـادە خـــۆی پیشاندەدا، بەڵام ئەوەش هەستی راستەقینەی باشتر دەردەخست. ئەو ڕای وابوو کە بڕوای خەڵکم لە بەرامبەریدا کەمکردۆتەوەو باوەڕ کردنم بەوەی کە یارمەتی دەدەم لە سادەیی بەولاوە هیچی تر نییە، لەوانەشە جۆرێك بێت لە چاو قایمی یان زیرەکی پیشاندان. زۆر حەزی دەکرد ئەوە دووبارە بکاتەوە کە دوژمنەکانی پێشووی هیچ دوژمنایەتییەکیان دەرنەبڕی، ئەگەر دەریشیان بڕایە بەشێوەیەکی نهێنی و سەرزاری بوو، کەچی من بە پێویستم زانیوە لۆمەکانم یەکسەر چاپ بکەم. سەرەڕای ئەوەش ئەو چەند بەرهەڵستکارە کەمەی کە هەیبوو بەدەگمەن خۆیان بۆ بابەتەکە تەرخاندەکرد، ئەگەر بەشێوەیەکی زۆر رواڵەتی گوێیان لە بۆچوونەکانی مامۆستا بگرتایە، لە پێشدا رای خۆیان دەردەبڕی. بەڵام من، لەسەر بنەمای ئەو بەڵگانەی کە بە ناڕێکی کۆکرابوونەوەو، ئەو ئەنجامانەی کە پێیانگەیشتبووم و یەکسەر چاپم کردبوون، ئەگەر لە بارەی خاڵە سەرەکییەکانەوە ڕاستیش بوونایە، دەبوونە مایەی کەمکردنەوەی بڕوا، نەك لای خەڵکی بەگشتی بەڵکو لای خوێندەوارانیش. بەڵام، لاوازترین ئاماژە بەوەی کە تەنانەت بوونی مشکە کوێرەکە زۆر جێی باوەڕ نییە، خراپترین شت بوو کە روویدات.

دەمتوانی بە ئاسانی وەڵامی گلەییەکانی، کە ناڕاستەوخۆ بوون، بدەمەوە. بۆ نموونە، بڵێم نامیلکەی خۆی لەوپەڕی باوەڕ پێنەکراویدایە، بەڵام ئاسان نەبوو سەربکەوم بەسەر گومانە بەردەوامەکانیدا، هەر ئەوەش وایلێکردم کە زۆر بەوریاییەوە لەگەڵیدا رەفتار بکەم چونکە ئەو لە دڵەوە ئەو باوەڕەی هەبوو کە من هەوڵدەدەم ناوبانگەکەی بدزم، ناوبانگی ئەوەی کە یەکەم کەس بووە بەڵگەی بۆ بوونی مشکە کوێرەکە هێناوەتەوە. ئێستاش، بێگومان، هیچ جۆرە ناوبانگێکی بۆ نەماوەتەوە تەنها جۆرە ناو زڕانێکی بێمانا کە رۆژ دوای رۆژ کەمدەبووەوەو هیچ مەبەستم نەبوو لەوەدا پێشبڕکێی لەگەڵدا بکەم. جگە لەوەش، لە پێشەکی نامیلکەکەمدا ئەوەم روونکردبووەوە کە دەبێت بزانرێت کە مامۆستا یەکەم کەس بووە کە مشکە کوێرەکەی دۆزیوەتەوە – لە ڕاستیدا ئەو ئەوەش نەبوو. ئەوەشم نووسیبوو کە مەبەستم تەنها دەربڕینی هاوسۆزییە بۆ ئەو چارەنووسە ناخۆشەی کە تووشیبووە.

بە شێوەیەکی میلۆدرامایی و وروژێنەر، بەڵام گونجاو لەگەڵ هەستی ئەو کاتەمدا، بەم رستەیە کۆتاییم بە نامیلکەکەم هێنا: (مەبەستم لەم نامیلکەیەدا ئەوەیە کە کتێبی مامۆستاکە ئەو ناوە دەربکات کە شایانیەتی. ئەگەر لەم کارەمدا سەرکەوتوو بووم، ئیتر با ناوم، کە بەشێوەیەکی کاتی و ناڕاستەوخۆ پەیوەندیی بەم مەسەلەیەوە هەیە، یەکسەر بکوژێنرێتەوە). بەمشێوەیە حاشام لەهەر بەشدارییەکی سەرەکیم لەم مەسەلەیەدا کرد، وەك ئەوەی پێشەکی چاوەڕوانی گلەییە باوەڕ پێنەکراوەکانی مامۆستام کردبێت. بەهەرحاڵ، ئەو هەر هەمان بڕگەی نامیلکەکەمی وەکو مشتۆیەك لە دژم بەکاردەهێنا، نکوڵیش لەوە ناکەم کە جۆرە رەواییەك هەبوو لەو شتانەی کە وتبوونی یان ئاماژەی بۆ کردبوون. لە ڕاستیدا، زۆرم لا سەیر بوو کە ئەو بەشێوەیەکی قووڵتر لەو مەسەلانەی

دەکۆڵییەوە کە پەیوەندییان بە منەوە هەبوو، بەڵام ئەم قووڵییەی لە نامیلکەی خۆیدا پیشاننادا، ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە پێشەکیی نامیلکەکەم دوورروانەیە. ئەگەر بە ڕاستی مەبەستم ناوبانگ پەیدا کردنە بۆ نامیلکەکەی، بۆچی خەریکی خۆی و نامیلکەکەی نەبووم و چاکەکانیم پیشاننەداوە، بۆچی حاشا هەڵنەگری نووسینەکانیم دەرنەخستووە؟ بۆچی خۆم تەرخانکردووە بۆ خودی دۆزینەوەکەو نامیلکەی ئەوم بە تەواوی فەرامۆش کردووە؟ ئایا کاری دۆزینەوەکە تەواو نەبووە؟ ئایا شتێك ماوە لەو ئاراستەیەدا باس بکرێت؟ ئەگەر من مەبەستم وایە دەبێت لە نووکەوە بە دۆزینەوەکەدا بچینەوە، بۆچی لە پێشەکییەکەمدا بە سەنگینی باسی دۆزینەوە سەرەتاکەم کردبوو؟

مرۆڤ دەتوانێت ئەوە بە بێفیزییەکی درۆ دابنێت. لەوەش خراپتر من سەرنجی خەڵکم بۆ لای مەسەلەکە ڕادەکێشا تەنها بە مەبەستی کەمکردنەوەی بایەخەکە، بەڵام ئەو، لە لایەکی ترەوە، هەوڵی لێکۆڵینەوەکەی داوەو لە ئاکامدا توانیویەتی بیچەسپێنێت. لەوانەیە مەسەلەکە نوقمی جۆرە بیرچوونەوەیەك بووبێت، بەڵام ئێستا کە جۆرە دەنگە دەنگێکم ناوەتەوە دەربارەی مەسەلەکە، هەڵوێستی مامۆستاکەم لە جاران خراپتر کردووە. کەس بەلایەوە گرنگ بووە پشتگیری لە دەستپاکییەی بکرێت یان نا؟ ئەوەی ئەو بەلایەوە گرنگە شتەکە خۆیەتی و بەس. من تەنها زیانم پێگەیاندووە چونکە لێی نەگەیشتووم. من خەڵاتی بەها ڕاستییەکەیم نەکردووە، من هیچ هەستێکی ڕاستەقینەم لە بەرامبەری نییە چونکە لە سەرووی توانای ڕۆشنبیریی منەوەیە. لەبەردەمم دانیشتبوو و سەیری دەکردم روخسارە چرچەکەی زۆر هێمن بوو، بەڵام بیری لەو شتانە دەکردەوە. کە دەیگوت تەنها مەبەستی شتەکەیە ڕاستی نەدەکرد چونکە زۆر حەزی لە ناوبانگ دەرکردن بوو و حەزی دەکرد لەم مەسەلەیە هەندێك پارەی دەستبکەوێت، هەقیشی بوو چونکە خێزانێکی گەورەی هەبوو. بەڵام، ئەگەر زۆر لە ڕاستی دوور نەکەوینەوە، بایەخدانەکەی من بەم مەسەلەیە زۆر لاوەکی و بێبایەخ بوو بەراورد لەگەڵ ئەودا. بەڕاستی، گومانەکانم بەوە هێور نەدەبوونەوە کە بە خۆم بڵێم: هۆی گلەییەکانی ئەم زەلامە ئەوەیە کە، وەکو دەڵێن، بە هەردوو دەست مەسەلەی مشکە کوێرەکەی گرتووەو هەرکەسێك پەنجەیەکی لێبدات بە خاینی دەزانێت. ئەوەش ڕاست نەبوو. هەڵوێستەکەی لە چاوبرسێتییەوە نەبوو، یان تەنها چاو برسێتی نەبوو، بەڵکوو بەهۆی ئەو سەرنەکەوتنەی بوو سەرەڕای ئەو هەموو ئەرکەی کە کێشابوی. لەوانە بایەخدانی من بەم مەسەلەیە هەروا بێبایەخ نەبووبێت. مامۆستاکە حەزی لە کەسی بێگانە نەدەکرد و بە نیشانەی بەدی دادەنا، بەڵام نیشانەی ئەم بەدییەی هێشتا لە کەسدا نەدیبوو. ئێستاش وا زەلامێك پەیدا بووەو مەسەلەکەی گرتۆتە ئەستۆ و تەنانەت لێیشی ناگات. لەملایەنەوە ڕاستدەکات و ناتوانم بەرگری لەخۆم بکەم و گیانەوەرزانینم ئەگەر من دۆزەرەوەی مشکە کوێرەکە بوومایە هەقم بوو بەمجۆرە خۆم بهاوێژمە ناو ئەم مەسەلەیە، بەڵام من دۆزەرەوەی مشکەکە نیم.

ڕاستە مشکە کوێرەیەکی ئەوەندە زەبەلاح شتێکی نائاساییە، بەڵام خۆنابێت هەموو

جیهان پێوەی خەریك بێت لە كاتێكدا هێشتا بە تەواوی بوونی نەسەلمێنراوەو ناسەلمێنرێت. دان بەوەشدا دەنێم ئەگەر من خۆم دۆزەرەوەی مشكەكە بوومایە نەدەهاتم وەك مامۆستا ئەوەندە خۆبەخشانە و بە دڵگەرمییەوە پشتگیری لە مشكە كوێرەكە بكەم.

ئەو ناكۆكی و لەیەك نەگەیشتنەی نێوانمان دەرەوییەوە ئەگەر نامیلكەكەم سەركەوتنی بەدەستبهێنایە، بەڵام سەركەوتن دیار نەبوو. لەوانەیە بە باشی نەمنووسیبێت و سەلمێنەر نەبێت. من زەلامێكی كاسبكارم. لەوانەیە داڕشتنی نامیلكەكە لە سەرووی تواناكانی منەوە بێت و لە داڕشتندا وەكو مامۆستاكە نەبم، هەرچەند لە رووی ئەو زانیارییانەوە كە بەدەستم كەوتبوون من لەو باشتر بووم. جگە لەوە، هۆی تر هەیە بۆ لێكدانەوەی سەرنەكەوتنەكەم. ئەو ساڵەی كە نامیلكەكەمی تێدا بڵاوكرایەوە ساڵێكی شووم و نەهات بوو. خەڵكێكی زۆر هەر لە كاتی دۆزینەوەی مشكە كوێرەكەدا بایەخیان پێنەدا. كاتێكی زۆری بەسەردا تێنەپەڕیبوو كە بە تەواوی لەبیر بچێتەوەو بەهۆی نامیلكەكەی منەوە زیندوو بكرێتەوە. لە لایەكی تریشەوە، كاتێكی باشیش تێپەڕیبوو بۆ ئەوەی ئەو تۆزە بایەخەی كە لە سەرەتادا پێیدرابوو نەمێنێت.

ئەوانەی نامیلكەكەمیان تۆزێك بە هەند وەرگرتبوو، بە بێزارییەوە بە خۆیان دەووت: ئەم كارە بێبایەخە وەرسكەرە دیسان سەریهەڵداوەتەوە. لە سەرەتاشدا هەر وایاندەووت. لەوەش خراپتر، هەندێك كەس لێیان شێواو بوو و نامیلكەكەی من و مامۆستاكەیان تێكەڵ و پێكەڵ كردبوو. لە گۆڤارێكی سەرەكیی كشتوكاڵیدا ئەم تێبینییەی لەسەر نووسرابوو: (جارێكی تر ئەو نامیلكەیەی لەسەر مشكە كوێرە زەبەلاحەكە نووسرابو بۆمان نێردراوەتەوە. هەموو لە بیرمانە چەند ساڵێك لەمەوبەر لە دڵەوە پێی پێكەنین. لەوساوە هەتا ئێستا نامیلكەكە روونتر نەبۆتەوە، نەك لەبەرئەوەی تێگەیشتنی قورسە بۆمان، بەڵكو، زۆر بە سادەیی، نامانەوێت جارێكی دیكە پێی پێبكەنین، ئێمە لە هاوڕێ مامۆستاكانمان دەپرسین: ئایا ناتوانن كارێكی بەسوودتر بدۆزنەوە بۆ مامۆستا لادێییەكانمان لەبری راوكردنی مشكە كوێرەی زەبەلاح؟).

ئەم تێكەڵكردنەی ناسنامەكان زۆر ناخۆشەو نابەخشرێت. دەزانم كە نە نامیلكەی یەكەمیان خوێندۆتەوە، نە دووەم. ئەم بەڕێزانەی كە نوێنەری دەزگایەكی بەڕێزن، دوو زاراوەی "مشكە كوێرەی زەبەلاح" و "مامۆستا لادێی" كە بێباكانە دایاننابوو، بەس بوو بۆیان بۆ ئەوەی بڕیاری خۆیان لەسەر ئەم مەسەلەیە بدەن. دەمتوانی لە بەرامبەر ئەم هێرشە هەنگاوی پێویست بنێم و سەركەوتووبم تیایدا، بەڵام ئەو لەیەك نەگەیشتنەی لە نێوان من و مامۆستاكەدا هەبوو نەیهێشت ئەو سەرچڵییە بكەم. لەبری ئەوە هەوڵمدا هەتا بتوانم ئەو پێداچوونەوەیەی لێ بشارمەوە. بەڵام ئەو زوو بەمەی زانیبوو. ئەوەش لە ڕستەیەكی ئەو نامەیەیدا دەردەكەوێت كە تیایدا دەڵێت نیازی وایە بە بۆنەی پشووەكانی سەری ساڵەوە سەردانم بكات. لە نامەكەیدا نووسیبووی: (دنیا پڕی لە بەدی و ناحەزییە، خەڵكیش ڕێ بۆ ئەم بەدییە خۆش دەكەن).

دەیویست پێم بڵێت کە منیش یەکێکم لەو کینەدارانـــە، بـــەڵام هـــەر بـــە ناحەزییـــە سروشتیەکەی مـن قایـل نـەبوو، بـەڵکو هیـوای ئەوەی دەخواست ڕێگە خۆشبکات بۆ کینە و ناحەزییـەکی گـشتی لـە جیهانـدا بـۆ ئـەوەی یارمەتیی سەرکەوتنی بدات. چارەسەرییەکەم بەخەیاڵدا هات و توانیم بە هێمنی چاوەڕوانیی بکەم. کاتێك کە گەیشت بە هێمنی پێشوازیم لێکـرد. ئـەمجارەیان نەزاکـەتێکی کـەمتر لـە ڕەفتاریدا دیاربوو. بە ورییاییەوە گۆڤارەکەی لە گیرفـانی پـاڵتۆ بـەردارە مۆدێـل کۆنەکەیـەوە دەرکـــرد و کردیـــەوەو پیـــشانیدام. وتم: "بینیومە." بێئەوەی بیخوێنمەوە گۆڤارەکەم بۆ گێـڕاوە "بینیوتـە" بـە هەناسـە کێـشانێکەوە وتـی. مامۆسـتا پیرەکـان ئـەو خووەیـان هەیـە وەلاَمێك بە دڵیان نەبێت دووبارەی دەکەنەوە. بە وروژاوییەوە پەلەپیتکەیەکی لە گۆڤارەکەداو وتـــی: "بێگومـــان، مـــن ئـــەم درۆیانـــە نانووسمەوە." چاوی تێبڕیم، وەکو ئەوەی من بیرکردنەوەیـــەکی دیکـــەم هـــەبێت. بێگومـــان پێـشبینیی ئـەوەی دەکـرد مـن چـی دەڵـێم، چونکە لە قسەکانی و هەندێك نیشانەی ترەوە بـۆم دەرکـەوت کـە بـە شـێوەیەکی سروشـتی دەزانێت من چیم دەوێت، هەرچەند هـەرگیز بە دڵـــی مـــنی نـــەدەکرد و نەیدەویـــست لـــە ئامانجـەکانی خـۆی لا بـدات. دەتـوانم ئـەوەی پێموت وشە بەوشە بنووسمەوە، چونکە هـەر یەکـــسەر دوای چـــاوپێکەوتنەکە چـــەند تێبینیەکەم لەو بارەیەوە نووسی. وتم: "چـی دەکەیت، بیکە، لەم چرکەساتەوە ڕێگاکانمان هەریەکە بە لایەکدا دەڕوات. لاموایە، ئەمـەش بەلای تۆوە چاوەڕواننەکراو نەبوو و حەزیشی لێدەکـەیت. هـۆی ئـەم بڕیارەشـم نووسـینەکەی ئەم گۆڤارە نییە. هۆیـە ڕاستییەکە ئەمەیـە: لـە سـەرەتادا وامـدەزانی کـە دەستخـستنە نـاوی کارەکە لەوانەیە هەندێك سوودت پێبگەیـەنێت، کەچـی ئێـستا بـۆم دەرکـەوتووە کـە لـە هـەموو لایەکـــەوە زیـــانم پێگەیانـــدوویت. نـــاتوانم پێشتبڵێم بۆچی وایلێهات. هـۆی سـەرکەوتن و نوشـستی هەمیـشە نادیـارە. بـەڵام بـۆ تاکـە هۆیـەك مەگـەڕێ بـۆ کەموکوڕییـەکانم. تـۆ بـیر بکـەرەوە: تـۆش نیـاز پاکبوویت، بەڵام، ئەگـەر بابەتییانـــە ســـەیری مەســـەلەکە بکـــەیت، سـەرکەوتوو نـەبوویت. مـن وەکـو نوکتەیـەك داینـــانێم، چـــونکە ئەگـــەر وا بڵـــێم خۆشـــم دەگرێتەوە، ئەگەر بڵێم کە پەیوەندییەکەی من و تـۆ بـە داخـەوە یەکێکـە لـە نوشـستییەکان. ئەگەر بڵێم لەمڕۆوە لە مەسەلەکە دەکشێمەوە ئـــەوە نـــە ترســـنۆکییەو نـــە خیانـــەت و پەیمانــشکێنی. لـــە ڕاســـتیدا جۆرێکـــە لـــە دەســـتهەڵگرتن لـــە مـــافی خـــۆم. نامیلکەکـــەم دەیسەلمێنێت کە من چەند وەکو کەسێك ڕێزم لێگرتـووی، بـە جۆرێـك لـە جۆرەکـان تـۆم بـە مامۆسـتای خـۆم زانیـوە، مـن خۆشـم خەریکـە حەز لە مشکە کوێرەکە بکەم. بە هـەر حاڵ، من بڕیارمــداوە ئــیتر وازبهێــنم. تــۆ دۆزەرەوەی مـشکە کوێرەکـەیت. بۆچـوونی تـۆ لـەم بارەیـە ئەوەیـە کـە بـە هـەموو توانامـەوە هەوڵمـداوە نەهێڵم ناوبانگ دەربکەیت. من خـۆم نوشـستی ڕادەکێشم و دەیـدەم بە تـۆ. بەسە ئیتر. تـەنها شـتێك کـە بـۆم دەکرێـت بـۆ سـڕینەوەی ئـەو گوناهـە ئەوەیـە کـە داوای لێبوردنـت لێبکـەم. ئەگـــەر دەتـــەوێت ئـــەم دانپێدانانـــەت لـــە گۆڤارەکەدا بە ئاشکرا بۆت بلاَو بکەمەوە".

قـسەکانم بـەمجۆرە بـوون. زۆر دڵـسۆزانە نـەبوون، بـەڵام دڵـسۆزییان پێـوە دیـار بـوو.

ڕوونکردنەوەکانم ئەو کاریگەرییەیان هەبوو کە چاوەڕوانم دەکردن. زۆربەی پیاوە پیرەکان جۆرە ساختەچێتییەکیان تێدایە، جۆرە ناپاکییەك، کاتێك کە مامەڵە لەگەڵ کەسانی گەنجتر لە خۆیان دەکەن. تۆ بە ئاشتی لەگەڵیاندا دەژیت و وا دەزانیت زۆر گونجاویت. بەردەوام برادەریت پێشاندەدەن و مەسەلەکان بە ئاسایی وەردەگرن، بەڵام کاتێك شتێکی یەکلاییکەرەوە دێتە پێش کە دەبێت ئەو پەیوەندییە ئاشتییانەیەی کە دەمێکە گەشەی کردووە کاریگەریی خۆی دەربخات، لە پڕ ئەم پیرانە لێتدەبن بە بێگانەو وا خۆیان پیشاندەدەن کە ئەوان بەڵگەی قووڵتر و بەهێزتریان هەیە.

بۆ یەکەمجار دروشمەکەیان دەکەنەوە. تۆش، بە تۆقاوییەوە، بڕیارە تازەکەیان لەسەر دەخوێنیتەوە. هۆی تۆقینەکەش بەشێوەیەکی سەرەکی، ئەو ڕاستییەیە کە ئەوەی ئێستا دەیڵێیت زۆر لە قسەکانی پێشووی ماقووڵتر و ڕەواترن، وەکو ئەوەی شتە ئاشکراکانیش پلەی جیاوازی ڕەواییان هەبێت و قسەکانی ئێستایان لە جاران دیار و ئاشکراتر بێت. بەڵام ساختەیی قسەکانی لەوەدایە کە ئەوەی ئێستا دەیڵێیت، لە ناوەڕۆکدا، هەر ئەوەیە کە پێشتر وتبووی. وا دیارە قووڵتر چووبێتمەوە ناو قسەکانییەوە، چونکە تێبینی ئەوەم کرد کە قسەکانی دوایی هیچ سەرسامم ناکات. دەستی نایە سەردەستم و بە نەرمی پێیدا مالی. وتی: "ڕۆڵە، چۆن بە مێشکتدا هات بچیتە ناو ئەم مەسەلەیەوە؟ یەکەمجار کە ئەمەم بیست لەگەڵ ژنەکەمدا لەم بارەیەوە قسەمکرد".

هەستایە سەر پێ و کورسییەکەی گێڕایەوە بۆ لای مێزەکەو سەیرێکی زەوییەکەی کرد. دەتووت ژنە بچووکەکەی لەوێ وەستاوە لەگەڵیدا قسە دەکات. "ئێمە چەند ساڵێکە بە تەنیا تێدەکۆشین. وا دیارە، ئێستا، پارێزەرێکی خانەدانمان لە شارەوە بۆ هاتووە. پیاوێکی کاسبکار، بەڕێز فلانی کوڕی فلان. ئێمە دەبێت پیرۆزبایی لە خۆمان بکەین، وا نییە؟ کاسبکارێکی شاری نابێت بۆنی پێوە بکرێت. کاتێك جوتیارێکی نەخوێندەوار باوەڕمان پێدەکات هیچ سوودێکمان پێ ناگەیەنێت، چونکە ئەوەی جوتیارە نەخوێندەوارەکە دەیڵێت یان دەیکات هیچ بایەخێکی نییە. ئەگەر بڵێت مامۆستا پیرە لادێیەکە ڕاستدەکات کاتێك تفێك هەڵدەدات بۆ دەربڕینی قێزلێکردنەوە، ئەنجامەکەی هەریەکە. ئەگەر لەبری جوتیارێك دە هەزار پشتگیریمان بکەن، دەشێت ئەنجامەکەی خراپتر بێت. بەڵام کاسبکارێکی شاری جووتە پێڵاوێکی جیاوازە. پیاوێکی وەکو ئەو پەیوەندیی هەیە. قسەکانی بە هەند وەردەگیرێت. لایەنگری تازە دێن و بایەخ بە مەسەلەکە دەدەن. لەوانەیە یەکێکیان بڵێت: مرۆڤ دەتوانێت لە مامۆستایەکی پیری لادێیشەوە فێری شت بێت. ڕۆژی دوایی خەڵکێکی زۆر کۆدەبنەوەو شتەکە بە یەکتری دەڵێن. کەسانێك کە بە خەیاڵتا نەدەهات ئەو قسانە بڵێن، یان سەیریان بکەیت. پاش ئەوە پارە کۆدەکرێتەوە بۆ مەسرەفکێشانی کارەکە. زەلامێك لەو ناوە دەسووڕێتەوە بۆ کۆکردنەوەی پارەو خەڵکی تر دنیایەك ئیمزای هاوبەشبوون بەسەریدا دەبارێنن. بڕیار دەدەن کە مامۆستا لادێیەکە دەبێت لەو نەناسراوییەی کە تیایدا دەربکرێت. خەڵکەکە

هەموو دێن و باوەشی پێدا دەکەن. گوێ نادەنە ڕواڵەتی دەرەوەی. لەبەر ئەوەی ژن و منداڵەکانی پشت بە ئەو دەبەستن، ئەوانیش پەسەند دەکەن. تۆ هەرگیز چاودێریی خەڵکی شارت کردووە؟ بێ وەستان خەریکی قسە کردنن. کاتێك کۆمەڵێکیان پێکەوە دەوەستن و گوێیان لێدەگریت، قسەکانیان لە ڕاستەوە دەچێت بۆ چەپ و بە پێچەوانەشەوە. لە سەرەوە دەچێت بۆ خوار، لەملاوە بۆ ئەولا. هەر بەدەم قسەکردنەوە پاڵمان پێوەدەنێن بواری ئەوەمان نادەن سڵاو لە خەڵکەکە بکەین. لێخوڕی گالیسکەکە چاویلکەکەی ڕاستدەکاتەوەو قامچییەکەی بەکاردەهێنێ و بۆی دەردەچین. لە ڕێگەدا بەرەو دێیەکە هەموو سڵاومان لێدەکەن، وەکو ئەوەی هێشتا لەوێ بین و لەناویاندا دانەنیشتبین. پیاوە گرنگەکان بە گالیسکەکان دێن بۆ پێشوازیمان. کە نزیك دەبینەوە لە کورسیەکانیانەوە ملیان درێژ و بەرز دەکەنەوە. ئەو زەلامەی پارەکەی کۆکردەوە هەموو شتەکان ڕێکدەخات. کاتێك کە دەگەینە شار دەبنە ریزێکی دوور و درێژی گالیسکە. وا دەزانین کە پێشوازییەکە کۆتایی هاتووە، بەڵام لە ڕاستیدا کە دەگەینە شار تازە دەستپێدەکات. هەرکە دەنگوباسی گەیشتنمان بڵاو دەبێتەوە خەڵکێکی زۆر کۆدەبنەوە.

ئەوەی یەك کەس بایەخی پێدەدا دەبێتە جێی بایەخدانی هەموو کەس. بۆچوونەکانیان لە یەکتری وەردەگرن و یەکسەر دەیکەنە بۆچوونی خۆیان. ئەوانەی نەیانتوانیبوو بە گالیسکە بۆ پێشوازی بێن، لەبەردەم ئوتێلەکە چاوەڕوانیان دەکرد. ئەو زەلامەی پارەکەی کۆکردبووەوە بەشێوەیەکی زۆر نائاسایی چاودێریی هەموو شتێکی دەکرد".

زۆر بە هێمنی گوێم لە قسەکانی دەگرت، چەند درێژەی پێبدایە هێمنتر دەبووم. هەموو ئەو نوسخانەی نامیلکەکەم کە لامبوون لەسەر مێزەکە کەڵەکەم کردبوون. تەنها چەند نوسخەیەکی کەم مابوو، چونکە هەفتەی ڕابوردوو جاڕنامەیەکم بڵاوکردەوەو داوای ئەو نوسخانەم کرد کە بڵاوم کردبوونەوە. لە هەندێك ناوچەوە چەند تێبینییەکم پێگەیشت کە بە نەزاکەتەوە دەڵێت فلانی کوڕی فلان لە بیری نییە نامیلکەی لەو جۆرەی بەدەستگەیشتبێت، ئەگەر بەڕاستی بە دەستیشی گەشتبێت داوای لێبوردن دەکات لەوانەیە ونی کردبێت. بەوە قایل نەبووم، بەڵام لە دڵەوە زۆرم پێ خۆش بوو. تەنها خوێنەرێك تکای لێکردم بهێڵم نامیلکەم لای بمێنێتەوە وەکو ئارەزوویەك بۆ زانینی، خۆیشی وەکو لایەنگری نامیلکەکەم دانا، بەڵێنی ئەوەشی پێدام کە هەتا بیست ساڵ بە کەسی پێشان نەدات. مامۆستا لادێیەکە هێشتا جاڕنامەکەمی نەدیبوو. پێم خۆش بوو کە قسەکانی کاری پیشاندانی جاڕنامەکەی بۆ ئاسانکردم. بە هەرحاڵ، دەمتوانی ئەم کارە بەبێ دڵەڕاوکێ بکەم، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە بەرژەوەندییەکانیم لەبەرچاوبوو. بە وریاییەوە جاڕنامەکەم دەرکرد. برگە گرنگەکانی بەمشێوەیە بوون: "بە هیچ جۆرێك داوای گێڕانەوەی نامیلکە ناکەم لەبەرئەوەی لەو بۆچوونانەی کە پشتگیریم لێدەکردن پاشگەزبوومەتەوە، یان نامیلکەکە هەڵەی تێدایەو ناسەلمێنرێت. داخوازییەکەم تەنها لەسەر بنەمایەکی بە پەلەی خۆییە. بەڵام نابێت هیچ ئەنجامێك لەبارەی هەڵوێستەکانم دەربارەی مەسەلەکە وەربگیرێت. تکاتان

لێدەکەم کە سەرنجێکی تایبەتی لەم مەسەلەیە بدەن و بەختەوەر دەبم ئەم ڕاستییە باشتر روون بکەنەوە."

بۆ ماوەیەك دەستم لەسەر جارنامەکە هێشتەوەو وتم: "تۆ لە دڵەوە گلەییم لێدەکەیت کە شتەکان وەکو ئەوەی تۆ هیواداری بوویت دەرنەچوو بۆ وادەکەیت؟ با دوا چرکەمان پێکەوە ناخۆش نەکەین. هەوڵبدە ئەوە بزانیت ئەگەر چی تۆ دۆزینەوەکەت کردووە، مەرج نییە لە هەموو دۆزینەوەکانی تر گرنگتر بێت. لەبەرئەوەی لە ئەنجامدا وا هەستدەکەیت کە ئەو ناڕەواییەی لە دژت کراوە لە هەموو ناڕەواییەکانی تر گەورەترە. بڕواناکەم لە گونجاوترین بارودۆخدا ئەو پێشوازییەت بۆ بکرێت لەو پێشوازییە بچێت کە بۆ ژنەکەت باسکرد. هەرچەند هێشتا ئەو هیوایەم ماوە کە نامیلکەکە شتێکی لێدەردەچێت، بەڵام ئەوپەڕی هیوام مەگەر ئەوە بێت کە پرۆفیسۆرێك رابکێشم بۆ لای ئەم مەسەلەیە بۆ ئەوەی داوا لە قوتابییەکی لاو بکات لەم مەسەلەیە بکۆڵێتەوە. قوتابییەکەش لەوانەیە سەردانت بکات و لە لێکۆڵینەوەکەی تۆ و من وردبێتەوەو ئەگەر بە باشی زانین و بایەخی پێدان لەوانەیە خۆیشی نامیلکەیەك بنووسێت و دۆزینەوەکەت لەسەر بنەمایەکی زانستی بنووسێتەوە. ئەوەشمان لەبیرنەچێت کە گەنجەکان بەگومانن. لەگەڵ ئەوەشدا، تەنانەت ئەگەر ئەو هیوایەشمان هاتە دی، هێشتا شتێکی ئەوتۆمان بەدەستناکەوێت. نامیلکەی قوتابییەکە ئەگەر پشتگیریی ئەم جۆرە بۆچوونانە بکات لەوانەیە ببێتە مایەی گاڵتەپێکردن. ئەگەر تۆ ئەم گۆڤارە کشتوکاڵییە وەکو نموونەیەك وەربگریت، بۆت دەردەکەوێت ئەو شتە چەند بە ئاسانی روو دەدات، پرۆفیسۆرەکان بەرپرسیارییەتێکی زۆر لەسەر شان هەڵدەگرن، چونکە خۆیان بە بەرپرسیار دەزانن بەرامبەر زانست و نەوەی داهاتوو، لەبەر ئەوە ناتوانن خێرا پێشوازی لە هەموو دۆزینەوەیەکی تازە بکەن، ئێمە لێرەدا لەوان باشترین. با واز لەمە بێنین و بێینەوە سەر نامیلکەی قوتابیەکە. گریمان نامیلکەکە بە هەند وەرگیرا، دوایی چی دەبێت؟ لەوانەیە تۆ جۆرە بایەخێك وەربگریت لەبەرئەوەی مامۆستایت. لەوانەیە خەڵکانێك هەبن بڵێن: "مامۆستا لادێیەکانمان چاویان تیژە".

ئەم گۆڤارەش، ئەگەر گۆڤار یادەوەری و ویژدانی هەبێت، ناچار دەکرێت داوای لێبوردنت لێبکات. لەوانەیە پرۆفیسۆرێك پەیدا بێت و (زەمالەیەکی) خوێندنت بۆ دەستەبەر بکات. تەنانەت لەوانەشە داوات لێبکەن بچیت بۆ شار و لە قوتابخانەیەکدا پۆستێکت بۆ بدۆزنەوە بۆ ئەوەی سوود لە سەرچاوە زانستییەکان وەربگریت بۆ پەرەپێدانی خۆت. ڕووبەڕوو پێت دەڵێم لاموایە بەوە قایلدەبن کە هەر ئەوەندەت لەگەڵدا بکەن. ئەوان بانگت دەکەن و تۆش ئامادە دەبیت، بەڵام وەکو کەسێکی ئاسایی کە سکالایەکی هەبێت، نەك وەکو کەسێکی شکۆدار. سوپاسی هەوڵە دڵسۆزانەکەت دەکەن، لە هەمان کاتدا دەزانن کە تۆ پیاوێکی پیریت و کەس لەو تەمەنەدا هیوای ئەوەی نییە زانست بخوێنێت. سەرەڕای ئەوەش دەزانن کە تەنها بە ڕێکەوت ئەو دۆزینەوەیەت ئەنجامداوەو خشتەت بۆ دانەناوەو هیچ ئاواتێکی بەرزت نییە لەم مەسەلەیە زیاتر. لەبەر ئەم هۆیانە، لەوانەیە جارێکی تر

بتگێڕنەوە بۆ لادێکەت. دۆزینەوەکەت برەوی پێدەدرێت چونکە مەسەلەیەکی ئەوەندە هیچ و پووچ نییە کە جارێکی تر بیر بچێتەوە. بەڵام تۆ ئیتر هیچی لە بارەیەوە نابیستی و ئەوەی کە دەیبیستیت ئەستەمە تێیبگەیت. هەموو دۆزینەوەیەکی تازە یەکسەر لە خوار سەرچەمی زانستەوە دادەنرێت و ئیتر بە واتایەك لە واتاکان لە جۆرەکانی دۆزینەوە دەکەوێت و لە ناو گشتدا وندەبێت و مرۆڤ دەبێت چاوێکی زانستییانەی هەبێت بۆ ئەوەی بیاندۆزێتەوە چونکە پەیوەندی هەیە لە نێوان ئەکسیەمە (راستییە بەڵگەنەویستەکان)- کە ئێمە تەنانەت بە بوونیشیان نازانین و لە مشتومڕە زانستیەکاندا ئەم ئەکسیەمانە ئەوەندە بەرز دەکرێنەوە هەتا دەگەنە هەورەکان. چۆن چاوەڕوان دەکرێت لەم شتانە بگەیت؟ زۆرجار کە گوێ لە گفتوگۆی زانایەك دەگرین وا دەزانین کە باسی دۆزینەوەکەی تۆ دەکات، کەچی شتێکی جیاواز دەردەچێت؟ جاری وەهاش هەیە وا دەزانین لە بارەی شتێکی ترەوە قسە دەکات و باسی شتێکی تر ناکات، کەچی بۆمان دەردەکەوێت کە بە تەنها ئەوەوە قسە دەکات.

تێناگەیت؟ تۆ دەبێت لە دێکەی خۆتدا بمێنیتەوە. لەوێ دەتوانیت پارەی زیاتر بۆ جل و بەرگ و ژیانێکی باشتر بۆ خێزانەکەت دابین بکەیت، بەڵام دۆزینەوەکەت لە چنگ دەردەکەن بێئەوەی بتوانیت هیچ جۆرە رەواییەك بدەیت بە مەسەلەکە: چونکە لە شاردا دوا مۆری لێدەدرێت. خەڵکیش هەمووی بەدنمەك نین لەگەڵتدا. لەوانەیە مۆزەخانەیەکی بچووك لەو شوێنەی دۆزینەوەکەی تێدا ئەنجامدرا دروستبکەن و ببێتە یەکێك لە دیمەنەکانی لادێکەو کلیلەکەشی بدەن بە تۆ بۆ ئەوەی بیپارێزی. بۆ ئەوەی بێبەش نەبیت لە هێمایەکی شانازی مەدالیایەکیشت بدەنێ، وەکو ئەو مەدالیانەی دامەزراوە زانستییەکان دەیدەن بە کارمەندەکانیان، بۆ ئەوەی بیکەیت بە بەرۆکی پاڵتۆکەتەوە. ئەمانە دەشێت هەمووی رووبدەن، بەڵام ئایا تۆ ئەمەت دەوێت؟ بێئەوەی بوەستێت بیر لە وەڵامەکەی بکاتەوە، ئاورێکی لێدامەوەو وتی:

"کەواتە ئەمە بوو کە دەتویست بۆم بەدەستبهێنیت؟"

وتم: "لەوانەیە لە کاتی خۆیدا بە باشی بیرم لێنەکردبێتەوە هەتا بتوانم بە روونی وەڵامت بدەمەوە. من دەمویست یارمەتیت بدەم بەڵام نوشستیم هێنا. خراپترین نوشستی کە هەرگیز تووشم بووبێت. لەبەر ئەوە ئێستا پاشەکشێ دەکەم و دەمەوێت، بەپێی توانا، ئەوەی کردوومە هەڵیبوەشێنمەوە".

"زۆر چاك و باشە." مامۆستاکە وتی. سەبیلەکەی دەرکرد و دەستیکرد بە پڕکردنی لەو تووتنەی کە بە بەرەڵایی لە گیرفانیدا هەڵیگرتبوو. وتی: "تۆ، بێئەوەی کەس سوپاست بکات مەسەلەکەت گرتە ئەستۆی خۆت. ئێستاش بە کەیفی خۆت دەتەوێت لێی بکشێیتەوە. کەواتە ئەمە زۆر باشە".

وتم: "من پیاوێکی کەللەرەق نیم. تۆ هیچ شتێکت پێیە لە دژی پێشنیازەکەم؟"

وتی: "نەخێر، بەهیچ جۆرێك" سەبیلەکە، کوژابووەوەو بۆنی تووتنی لێدەهات. هەستامە سەرپێ و لە ناو ژوورەکەدا کەوتمە پیاسە. لە چاوپێکەوتنەکانی پێشووەوە بە کەمدووییەکەی راهاتبووم، بەڵام سەرەڕای بێدەنگییەکەی دەمزانی هەر ئەوەندە کە هاتە

ژوورەوە ئیتر نیازی جوولآنی نابێت. ئەمە زۆر جـــار بێـــزاری دەکـــردم. لـــە کـــاتی وادا دەمزانـــی شـــتێکی تـــری دەوێـــت. زۆر جـــار پـــارەم پێـــدەداو هەمیـــشە وەریـــدەگرت. بـــەلآم بـــە هەوەســـی خـــۆی نەبوایـــە هـــەرگیز نارۆیی. زۆر جار کە سەبیلەکەی تەواو دەکرد بە رێز و نەریتێکی تایبەتییەوە کورسییەکەی دەبـــردە لای مێزەکـــەو بـــە دەوری مێزەکـــەدا دەســـووڕایەوەو داردەســـتەکەی لـــە سووچـــەکە هەڵـدەگرت و بـە گـەرمی دەسـتی دەگوشـیم و دەڕۆیـی. بـەلآم ئـەمڕۆ دانیـشتنە بێدەنگەکـەی ئەشـــکەنجەی دەدام. کاتێـــك کـــە یـــەکێك دوا ماڵئـاوایی دەشـارێتەوە، وەکـو مـن کـردم، ئـەو رەفتارە رووکەشییانە بەزوویی لـەبیر ببرێتـەوە. مرۆڤ نابێت خۆی بکات بە بارێك بەسەر خانە خوێکـەوە. کاتێـك لـە پـشتەوە سـەیری پیـاوە پیرەکەم دەکرد، دەمزانی ئەستەمە جارێکی تـر دەرگای لێبکەمەوە.

**سەرچاوە:**

*The Giant mole, Metamorphosis and other stories*

*Penguin Book, 1971*

# چەکی نهێنی

دینو بوتزاتی

لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

**دەربارەی نووسەر:**

دینو بوتزاتی (1906-1972) لە نووسەرە بەناوبانگەکانی ئیتالیایە، دوای تەواوکردنی زانکۆی میلان رووی لە ئەدەبیات کرد، زۆر بە گەنجی شیعریی نووسی، لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا بووە هەواڵ نێری رۆژنامەی کوریرە دیلاسرا، پاشان دەبێتە هەواڵ نێری جەنگ لە هێزی دەریایی ئیتالیادا. دوای جەنگ لە میلان نیشتەجێ دەبێت و دەست بە نووسین و نیگارکێشان دەکات، تابلۆکانی بە تایبەتی لە فەرەنسادا پێشوازی چاکی لێدەکرێت.

لە ساڵی 1949دا کتێبی "بیابانی تاتارەکان" بلاودەکاتەوە کە پاشان دەکرێتە فیلم. ئەلبێر کامۆ ساڵی 1956 یەکێك لە شانۆگەریەکانی ئەم نووسەرە "مەسەلەیەکی سەرنج ڕاکێش"ی ئامادەکرد و لە پاریس خستیە سەر شانۆ. بێجگە لە هەردوو کتێبی "بیابانی تاتارەکان" و "عەشقێك" گشت نووسینەکانی تری چیرۆکی کورت و نمایشنامەن.

هۆی ناوبانگە جیهانگیریەکەی ئەم نووسەرە، لە سەرەتادا بیرە تایبەتیەکانیەتی کە سێلاوێکن لە بیری زەینی تێکەڵ بە تەنزێکی تایبەتی کە تایبەتمەندیەتی ئیتالیای تێدایە، دووەمیان کورت و پوختی چیرۆکەکانیەتی کە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر مرۆڤ باوەڕ ناکات چۆن توانیویەتی بابەتێکی زۆر بایەخدار لە سەدوپەنجا دێڕدا جێ بکاتەوە. چیرۆکەکانی بوتزاتی مەگەر بە دەگمەن ئەگینا لە دەدوانزە لاپەڕە تێ ناپەڕێت.

بوتزاتی لە کاتی نووسیندا هەم نووسەرەو هەم فەیلەسووف و نیگارکێش. نیگارکێشی تایبەتمەندیە ئاکارییەکان، جەستەیی و رۆحی، لە هەمان کاتدا فەیلەسووفێکە بە قووڵی دەڕوانێت و، قەڵەمەکەی بێجگە لە "هەقیقەت، هەقیقەتی تاڵ" چی دی نانووسێت.

گـەلێك ڕەخنـەگر بـوتزاتی و كافكـا بەیـەك بـەراورد دەكـەن، لـەوەدا كـە میكانیزمـە نهـێنی ئامێزەكـان بـە جـۆرێكی هێنـد تونـد و زبـر بـەر بوونیـان دەكـەوێت و وردیـان دەكـات كـە بەرگـە گرتنیـــان زەحمەتـــەو ئەمـــەیش لـــە خـــەباتی شەخسی و زەینیانـەوە سەرچاوە دەگرێت نـەك لە دنیاكەی دەوروبەریانەوە.

*　　*　　*

جـەنگی سێیەمی جیهـان، كـە خـەڵكیی بـەو ڕادە زۆرە لێـی دەترسـان، هـەر ئەوەنـدە درێـژەی كێـشا كـە شـارەزا سـەربازیەكان پێـشبینیان كردبوو. كەمتر لە بیست و چوار سەعات. بەڵام ئـــەنجامی كێـــشەكان هـــەموو پێـــشبینیەكانی هەڵوەشاندەوە، بارودۆخەكە لە پێشدا چۆن بوو وەك خۆی مایەوە.

كاتێـــك كێـــشەی نێـــوان رووس و ئـــەمریكا لەسەر ناوچەی "ویپینگ"ی قوتبی باشوور، كە لە سـەری ناكۆك بوون، دەسـتی پێكـرد، هـەموو وایان لێكدایەوە كە ئەمەیش یەكێكە لەو بیانوە بـێ نـرخ و بـێ ئەژمارانـەی كـە تـەنیا بـۆ شـەڕە دەنووك هاتۆتە گۆڕێ. بەڵام هەرێمی ویپینگ كە ناوچـــەیەكی كـــەم تـــا زۆر نـــەدۆزراوەو لـــە ناوەڕاستی دوو زنجیرە چیای بەرزدایە، دەشێت گەنجینەی نهێنی لە خۆدا شاردبێتەوە، كە تەنیا هەوا ڵگرەكانی هەردوو زلهێزەكە پێی بزانن.

دەبێت ئەوەیش بڵێین كە لـە نێو سەرسامیی هـەموو میللـەتی دنیـادا، كتوپڕ شـەڕی سـارد لـە نێوان هەردوو زلهێزەكەدا وێنەیـەكی ترسێنەر و شـوومی لـەخۆ گـرت. لـە لایـەنی هەریـەكێك لـەو دوو زلهێـزەوە قسەی وا كـرا. كـە چـەندە بـۆنی هەڕەشەی لێ دەهات، هەر بەو ڕادەیەیش نادیار بوو، بـە جـەختێكی ساویلكانەوە، قسە لەسـەر چـەكی تـازەو نهـێنی وا دەكـرا كـە مـرۆڤ نـە "بـاوەڕی دەكـرد" نـە دەیتـوانی "دركـی بكـات" چـەكگەلێك لـە توانایـدا بـوو لـە مـاوەی چـەند سـەعاتێكدا دوژمـن بهێنێتـە سـەر چـۆك و خـۆی بەدەستەوە بدات.

كاتێك كە ڕەنگدانەوەی ئەو جۆرە پەیامانـە هێـشتا لـە نـاو رۆحـی دانیـشتوانی دنیـادا دەزرنگایـەوە، دوا ئاگـادار كردنـەوەی مۆسـكۆ وەك هەورە بروسكە بەر سەری هەموو خەڵكیی كـەوت: دەبـوو بـەرایی هێـزە چـەكدارەكانی ئـەمریكا لـە مـاوەی چـل و هەشـت سـەعاتدا ســەرزەوی ویپیــنگ چــۆڵ بكــەن. دەنگــی ئاگاداركردنەوەكە هێندە زبر و ئاشكرا بوو كە جێگــای بــۆ هــیچ ئومێــدێك نەدەهێــشتەوە. واشــنتۆن، كــە وەك هــەموو خــەڵكی دنیــا چاوەڕوانی كاردانەوەیـەكی لـەو جـۆرە بـوو، چ وەڵامێكی نەداوە. فەرمان بە هەموو ویلایەتەكان درا كـــە لەوپـــەڕی حاڵـــەتی نائاســـایی و مەترسیدارین.

ئەمـە ئـەو كاتـە بـوو كـە ترسـێكی گـەورە گـشت لایـەكی گرتـەوە، ترسـێك سـاڵانێك بـوو هـــەموو دانیـــشتوانی ســـەرزەوی لـــە یادیـــان كردبـــوو، ئـــەوەیش هەســـتی لەناوچـــوونی هەنووكـەیی گـشت گیانلەبـەرێك بـوو. بـاس و خواســـە رۆتـــین و بێزاركـــەرەكانی ژیـــانی رۆژانـــەی وەك لـــە خەوهەســـتانی بـــەیانیان، یەكـەم جگـەرە كێشان، سـواربوونی مـیترۆ یـان تراموای، چراخانی جامخانەی پیشانگاكان، كار لـە نووسـینگە و كارخانەكانـدا، پیاسـەی نـاو كۆڵانـەكان، و ڕكگـرتنی منـداڵان، سـینەمای چـوار ڕەهەنـدی، كـڕینی پـێڵاوی تـازە، بلـیتی تـاقی كردنـــەوەی بـــەخت و لـــە مـــاڵ چـــوونە دەرەوەی شـەوانی شـەممە، لـە پڕێكـدا بـوون بـە هەسـتی بـەخت چـاكی مرۆڤـەكان – هەرچـەندە ئـەم كارانـە بـەردەوام هـەبوو – لەبـەر ئـەوەی هـــەموو خەڵكەكـــە لـــەوە گەیـــشتبوون كـــە

بـەم نزیکانـە بـۆ هـەتا هەتایـە ئـەو شـتانەیان لە دەست دەچێت.

لـە سەرانسەری زەویـدا، هـەر کەسـە خـەمی خۆی و خێزانەکەی بوو، بەو هیوایەی ڕێگایـەك بۆ هەڵاتن پەیدا بکات. وەلـیٚ دەمێك بوو هـەموو پـــێش گـــۆیی ئـــەوەیان دەکـــرد و ســـوێندیان دەخـوارد کـە مەحاڵـە جـەنگی جیهـانی نـویٚ هەڵبگیرسـێت. چـونکە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی هــەموو شــتێکی ســەرزەوی لــەناو بــچێت. لــە ئەنجامـدا هـیچ کەسـێك بـە جیـدیی بـیری لـە خۆپاراســـتن نـــــەکردبوەوە، ئامۆژگـــــاریی دەســـەڵاتدارانیش بـــۆ دروســـتکردنی پـــەناگا و زەخیرەخـستن هـیچ ئـەنجامێکی تیـا دروسـت نــەکردبوون. نیگــەرانی و بــیٚ ئومێــدی ئــەو خەڵکانەی کە بیٚ بەرگری لە خۆ کردن دابوویانە بەری، بە ئەندازەی کارەساتە هەڕەشە ئامێزەکە گەورە بوو.

لەبەختاندا – ئەگەر بشێت ناوی بەختبهێنن – تەمەنی ئەوپەشێوی‌و شپرزەییەی لەئەنجامی چاوەڕوانیەوە دروست ببوو کورتی هێنا.

هێـــشتا مـــاوەی دیـــاریکراوی رووســـەکان کۆتایی نەهاتبوو – گەلێکیش کە لەسەر ژیان و مانـەوە سـوور بـوون و نائومێدانـە بـە بەڵگـەی سـەیر و بیٚ مانـا دڵـی خۆیـان خـۆش دەکـرد – کەچـی لـە پڕێکـدا بانگـەوازەکانی رادیـو کـە هەمیـشە دووبـارە دەکرانـەوە هـەموو دڵـەکانی لەترپەخست.

لـە هـەموو قەڵـەمڕەوی وڵاتـە یـەکگرتوەکانی ئـــەمریکادا حاڵـــەتی مەترســـی و ئامادەباشـــی بڵاوکرایــەوە: دەوڵــەتی شــۆڕەویی ژمارەیــەکی زۆری موشــەکی کەرتــەبڕ کــە تــۆویی مــەرگ و وێرانیــان لەگــەڵ خــۆدا هــەڵگرتبوو، بــەرەو ئەمریکا ناردبوو کە ئەوپـەڕی، تا دوو سـەعاتی تر لە خاکی ئەو وڵاتەدا دەکەوتنە خوارەوە.

لە ڕاستیدا ژمــارەی ئەو مووشـــــەکانە بیٚ ئەژمار نەبوو، چونکە دەزگاکانی دژە مووشـەك، کە لە قوتبی باکوور بە پەراگەندەیی دانرابوون، لـە هـەزاران کیلۆمـەترەوە توانیبوویـان ژمـارە و ڕادەی وێــران کردنیــان دیــاری بکــەن، یەکــەم شەپۆل – ئەگەر بتوانین ئەم وشەیە بۆ شوێنی وا بەکار بهێنین – نزیکەی سی هەزار مووشـەکی کەرتەبڕ بوو.

لە سەنتەری فەرماندەیی گشتی ئەمریکا، بە پەلە میلی چارەنووس ساز داگیرا و لە ئەنجامدا شەپۆلەکانی ئەلکتریکی لە هەموو وێستگەکانی بــەرگریی دژە مووشـــەك و ئـــەو جێگایانـــەی ئەمریکا کە مووشەکیان لێوە دەنارد بڵاوبوەوە. لەو شوێنانەدا – بەو جۆرە کە دەتوانین خۆمان تـەخمینی بکـەین – دەیـان هـەزار مووشـەکی مەرگ هەڵگر و قەڵاچۆکەر بەرەو ئاسمان ڕادرا. مووشەکەکان بە کلکە ئاگرینە شووم و هەراسان کەرەکانیانـەوە لـە تاریکیـە قووڵەکـەی شـەودا لـە چاو ون بوون. بۆ ئەو کەسانەی سەرەو دەرەی تەواویان لەسەر ئەو مەسەلانە هەبوو. ئەم چرکە ساتانە وەسف نـەدەکران. لـووت بـەرزیی مـرۆڤ بوو کە کەوتبوە جووڵە و بۆ دواجار لە قووڵایی فەزادا ون دەبوو.

ئـەم موشـەکە بـیٚ هەوسـارانە – وا دەهاتـە بەرچـاو– هـەموو خـەیاڵ و خـەونی بـچووك و گـەورەی ژیـانی نـابووت دەکـرد: عەشـق، مـاڵی ئـارام، پێـك گەیـشتنی دۆسـتانە، وێنـای سـامان بەدەسـت هێنـان و شـانازی، بارەگـای گـەرمیی خێزان و بەهار، هۆشیاری، مۆسیقا و ئەو ساڵە ئارامانــەی بەســەر دەچــن، بــەڵام ئیــدی کــەس دەرفـەتی بیرکردنـەوەی ئەم شـتانەی نـەبوو، بە ترســەوە تەماشــای ســەعات دەکــرا، بــەزویی. ڕەنگە لە دەقیقەیەکدا، یان لە چرکەیەکدا، ئیتر هیچ شتێك نەمێنێت.

دەنگێکــی ترســناك و بــەردەوام لــە دڵــی زەویــەوە دەرهـات، لـە ئاسمانـدا، لـەو سـەرە،

بروسـکەی تەقینەوەیـەک بینـرا، پاشـان تەقینەوەکە بوو بە دوان و پاشان بەسێ سەدو سێ هەزار جاریش، دوای هەر تەقینەوەیەک لە پەرچ بوونەوەی بروسکەکاندا، خەڵکیی بینیان فوارەیەکی گازی، وەک تەونی سپی چاڵجاڵۆکە دەهاتە خوارەوە، پێک دەگەیشتن و گومەزێکی گەورەی تۆڕ ئاسایان دروست دەکرد. گازەکان هێند بەسەریەکدا کەڵەکە ببوون وەک بنمیچێکی رەنـگ شـیری و گونجـاو، بـە تـەواویی ئەستێرەکانیان لەبەرچاو ون کرد.

لە نێو خەڵکیدا، جۆرە چاوەڕوانیەکی تێکەڵ بە ئومێد هاتە ئاراوە، لەبەرئەوەی هەموو چاوەڕوانیی بروسکەی ترسناکی تەقینەوەی ئەتۆمی، شەپۆلی توند و تەکاندەر، سووتانی کتوپڕ و لەناوچوونی تەواوەتی بوون، کەچی وا دەرنەچوو.

پاشان ئەوەیشیان بینی کە بەرگی تەمە سپیەکە کە ئیدی تەقینەوەکان تەکانیان پێ نەدەدا، هێدی هێدی بۆ خوارەوە دەهات، کەس سەری لێ دەرنەدەکرد کە ئەمە چیە! هەموو خەڵکەکە لە بارەی ئەو چرکە ساتەوە کە ئەم تەمتومانە خەستە دەگاتە سەر زەوی پێشبینی ترسناکیان هەبوو.

لە ڕاستیدا هەڵمە سپیەکە لەسەر رووی زەمین بڵاوبووەوەو هەموو لایەکی داگرت، ناو ژوورەکان، ژێر زەمینە قووڵ و پەناگاکان، تەنانەت درزە هەرە بچووکەکانی گرتەوە. ئەو کەسانەی پەنایان بۆ حەشارگای زۆر قایم بردبوو کە هیچ ڕێی پێ نابات، بە ترسێکی زۆرەوە بینیان کە شەپۆلی سپیی گاز کەس ناناسێت و بۆ هەموو جێگایەک دەڕوات. هەندێک کەوتنە کۆکین و هەیش بوو کەوتبووە سەر ئەژنۆ و لە خودا دەپاڕایەوە. کاتی مردن نزیک ببوەوە.

وەلێ کۆکین نەما، خەڵکیی بە بێدەنگیی و ساکاویەوە تەماشای یەکیان دەکرد، باوەڕیان نەدەکرد هێشتا زیندوو بن، هیچ کارەساتێک رووی نەدابوو، نە هەستیان بە هەناسە سواری دەکرد نە سووتان، نە هیچ جۆرە دەردو ئازارێک.

ئایا زانا ڕووسەکان هەڵەیان لە حساباتیاندا کردبوو؟ ئایا گازەکان لە کاتی هاتنە خوارەوەدا، خەسڵەتە مەرگ هێنەکەیان لە دەست دابوو؟

هەڵمە سپیەکە چوە ناو حەشارگە کون برەکانی کۆشکی سپیشەوە. هەموویان دەمامکی دژە گازیان پۆشیبوو، بەلاّم دەمامکەکان نەیانتوانیبوو بەرەنگاریی لە چوونە ژوورەوەی گازبکەن، کە وەک ئاورنگ لەسەر گۆناکان دەنیشت.

لە ناکاوێکدا سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بوێرانە دەمامکەکەی لە ڕووی خۆی کردەوە، شانی وەزیری دەرەوەی ڕاتەکاند بۆ ئەوەی ئەویش دەمامکەکەی لەسەرو چاوی بکاتەوە. وەزیری کاروباری دەرەوە، هەرچەندە بەناچاری فەرمانەکەی بەجێهێنا، هەموو ئەوانەی لەوێدا ئامادەبوون چاویان لێ کرد.

ئێستا حەشارگاکە، بە تەواویی لە هەڵمە شیر رەنگەکە پڕ ببوو، لەگەڵ ئەوەیشدا کەس نەمردبوو.

سەرۆک کۆماری وڵاتە یەکگرتوەکان وتی: ئەوەی کە ناتوانم درکی بکەم ئەوەیە کە بۆچی ئەم هەموو کاتەمان بە فیرۆدا تا پەی بە ڕاستیی ببەین!

وەزیری کاروباری دەرەوە وتی: ئاه، بەڵێ، بەڕاستیی شوێنی باوەڕ پێکردن نیە.

سەرۆک کۆمار بە دەنگێکی بن بڕ وتی: دیکتاتۆریەتی پرۆلیتار! چاکە، ڕێگا چارەی ترنیە! ئەمە تەواو روونە.

وەزیری دەرەوە مستێکی بە تەوێڵیدا کێشاو وتی:

-تا ئێستا چ گەوجێك بووین!

سەرۆك کۆمار پرسی: بەڵام ئەم دەنگانەی لە دەرەوە دێن چیان دەوێت:

یەکێك لە وەزیرەکان وەڵامی دایەوە: خەڵکن، کۆمەڵێکن لانی کەم سەد هەزار کەسێك دەبن، داوای شۆڕشی سوشیالستی دەکەن.

سەرۆك کۆمار ووتی: منداڵانی خۆشەویست، خوا پشت و پەنایان بێت، داوای لێ بووردن دەکەم، هەر وەك ڕاهاتن ناوی خوام هێنا.. بەڕاست دەربارەی وازهێنان لە دژایەتی یەکدی هیچتان بە مۆسکۆ وتوە؟

ئەوانەی لەوێ بوون بە دەنگی بەرز وتیان! چاکە، بێگومان، بێگومان، دڵنیابن.

بەڵام لە روسیادا، کەم و زۆر بارەکە بەم جۆرە بوو، تەنیا بە جیاوازیی سێ چارەك سەعات. پشێوی، ڕێکەوت، چاوەڕوانیی مەرگ، ئاخر ئەمانیش وەك ئەمریکیەکان خەڵکانێکی ئاسایی و لە گۆشت و پێست و ئێسقان دروست ببوون.

نە کەمتر و نە زیاتر، لە ئاسمانی کیشوەری ئەوانیشدا، هەمان فوارەی هەڵمە سپیەکان و هەمان هەوری خەست دروست ببوو، لە پاڵ ئەمانەیشدا، هەراو زەنایەکی گەورەی خەڵکەکە لەبارەی ئەوەوە کە هەستیان بەوە دەکرد کە هێشتا زیندوون.

لە پەناگای کۆشکی کرملیندا، سکرتێری گشتی حیزب، فەرماندەی وڵات، دەمامکە پڕ لە گازەکەی لە سەروچاوی کردەوە. مستەکۆڵەیەکی بە شانی سەرۆکی شورادا کێشا کە لە پاڵیدا دانیشتبوو پێی وت:

-بەڵێ، بەڵێ: کاتی هاتوە، تەنیا مەسەلەیەك هەیە کە من سەری لێ دەرناکەم، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە چۆن توانیومانە تا ئێستا بەرگەی ئەم کۆمۆنیستیە گەوجانەیە بگرین؟

پاشان رووی لە وەزیری کاروباری دەرەوە کرد کە هێشتا دەمامکەکەی بەدەم و چاوەوە بوو، لەسەر قسەکانی رۆشت و وتی:

-بەڕاستی هیوادارم تا ئێستا یاداشتی واز لە دوژمنایەتی هێنانی ئەمەریکای ئاشتی خوازتان ناردبێت.

-بێگومان، هاوڕێ سکرتێری گشتی.

-چیت وت؟ هاوڕێ؟ لە مەودوا بە "سەرۆك" ناوم بەرە.

بەم جۆرە چەکی نهێنی سەرنەکەوت. داناکانی هەردوو وڵات، هەریەکەو لە لای خۆیەوە و بێ ئاگاداركردنی ئەوی تر، بە یارمەتی خوێندنەوەی فراوان و ئەزموونی بێ ئەژمارەوە، ڕێگایەکیان دۆزیبۆوە، تا بێ ئەوەی دڵۆپێك خوێن بڕێژن و، بە ماوەی لە سەعاتێك کەمتر، شەڕ ببەنەوە: ئەوان وەك خۆیان ناودێریان کردبوو "گازی قەناعەت پێهێنان "یان داهێنابوو. گازێکی ئایدۆلۆژی کە گیانی مرۆڤ توانای بەرگەگرتنی نەبوو. هیچ توخمێك یان رەگەزێکی ئەتۆمی تیا نەبوو، نە قەلاچۆکردن هەبوو نە وێرانی، تەنیا یەك رەگەزی هەوای تیا بوو کە هەر بە بۆن کردنی، راستەوخۆ مێشکی مرۆڤی کۆنترۆڵ دەکرد. ئەوەی شورەویی دروستی کردبوو تیۆری مارکسیزمی بوو کە کاری لە مێشکی ئەمریکیەکاندا دەکرد، ئەوەی ئەمریکاییش تیۆری سەرمایەداری بوو لە مێشکی شورەویەکاندا، هەمووی بەرێك و پێکی کاری خۆی کردبوو.

دانیشتوانی وڵاتە یەك گرتووەکانی ئەمریکا — بێجگە لە ژمارەیەکی کەمی خەڵکیی کە لە دوورگە تەریکەکاندا دەژیان و گازەکە نەگەیشتبوە لایان — وەك هەورە بروسکە خێرا

هەموویان بوون بە کۆمۆنیست، هەموو دانیشتوانی شورەوییش، بە ئازادیی رژێمی سەرمایەداریان قبووڵ کرد.

بێگومان هەردوو ولاّتەکە، کە یاداشتی "واز لە دوژمنایەتی یەکتر"یان پێ گەیشت. لە خۆشیاندا سەریان لە پێیان جیانەدەکردەوە. هەردووکیان وایان دەزانی کە بە تەواویی سەرکەوتوون بەلاّم لە یەکەمین دانیشتندا، گفتوگۆکەرەکانی هەردوولا، لە جێگای خۆیاندا سڕ ببوون.

لەبەرئەوەی دەورەکان ئاڵوگۆڕ کرابوون، لە نووکەوە شەڕی سارد دەستی پێکرد.

**سەرچاوە:**

کۆمەڵە چیرۆکی سفر بە دوزخ (دینو بوتزاتی) ل 30-37.

# جەژنی ئێرانیەکان

د. سیمین دانیشوەر

لە فارسییەوە: حەمە رەسووڵ حەسەنپوور

کوڕەکان لەگەڵ دایکیاندا بڕیاریاندا حاجی فیرووز نوێبکەنەوە. لەبەرئەوەی هێندە حاجی فیرووزیان خۆشدەویست، سەگەکەیان "میکی" لەبەرچاویان کەوتبوو. باوکە مامۆستا بوو، گەرچی ئەمریکایی بوو، مووچەی زۆری وەرنەدەگرت. دایکیان بالآی کورتبوو و کاتێ لەگەڵ باوکیدا دەپەیڤی سەری بەرز دەکردەوە. بیانییەکان لەم وڵاتە غەریبەدا کە ئێستا لێی دەژیا، لە شێوەی بەرگەکانیان دەناسییەوە. هۆگری جلووبەرگی ناوچەیی و سەیر بوو. لە هەمەچەشنیی جلوبەرگەکانەوە دەیتوانی جیاوازیی نێوان مرۆڤەکان دابنێ. زمانەکەیانی نەدەزانی و بۆشی نەدەگونجا فێری بێت.

کورە گەورەکە، "جۆن مایکڵسۆن" فارسی لە منالآنی هاوسێوە فێر دەبوو و دایکی یاری لەگەڵ منالآنی هاوسێی لێ قەدەغە کردبوو. جۆن لە منالآنی گەڕەك، کە دەتوت بێمالن خۆشی دەهات و بەرەو لایان دەکێشرا. بە تایبەتی کیژۆڵەیەکی لە نێوان هەمووانـدا لا سەرنج راکێشتر بوو. سەروقژی زەرد و چاوشین بوو. پانتۆڵی کوڵکنی لەبەردا بوو و دەلینگی پانتۆڵەکەی دە پێلآوی لاستیق هاویشتبوو. بەنەخوێنە کێشەکەی پانتۆڵی شلبوو و کیژۆڵەکە جاری وابوو پانتۆڵەکەی هەڵدەکێشاو جار جارەش کەپۆی. جۆن چکولیات و بنێشتی بە کیژۆڵەکە دەدا بەلآم دایکیان روو گرژ بوو. وتبووی ئەگەر دوای نیوەڕۆیان لە قوتابخانە هاتنەوە و لەگەڵ منالآنی گەڕەکدا گەمانبکەن هەزار جۆرە نەخۆشی دەگرن.

"جۆن مایکڵسۆن" لە خوویەکی منالآنی گەڕەك رەنجابوو. منالەکان کە "میکی"یان لەگەڵ جۆندا بەدیدەکرد، لە پێشدا خۆیان لادەدا بەلآم هەر کە جۆن و سەگەکەی پشتیان تێدەکردن، هاواریان دەکرد: "ئەمریکایی، ئەمریکایی" و بەردیان دەگرتە میکی و کلکیان دەکێشا. میکیش زۆر خەراپ رامالّی دەکردنێ و پێیان دەوەڕی.

منالەکان پاشەکشەیان دەکرد. بەلآم سەرێکی نەترسیانبوو.

"تێد"ی- برای بچووکیان- فارسی کەمتر

دەزانی، تازە کاتی قسەکردنی بە ئینگلیزیش زمانیدەگیرا. دایکیان، زیخی لەبن زمانی تێد دەخست و لە بەرامبەر ئاوێنەدا هانیدەدا و دەیوت: "ئێستا قسان بکە." و هەرچی چیرۆکی ئەو پیاوەی بۆ دەگێرایەوە کە "پێش ئەو کاتانە، بەر لە عیسای مەسیح یاخود دوای ئەو لە رۆما یان یۆنانستان وەك تێد زمانی گیراوە و بەم راهێنانانە زمانی وا کراوەتەوە کە ئیدی نەیگرتوەو یەکسەر وتاریداوە".

بەلأم تێد زمانی زۆر نەبۆوە. لە پێشدا لێوی دەهێنانە پێشەوە بۆ ئەوەی دەست بە دەربڕینی یەکەم وشە بکات، جۆن تاقەتی بەسەر دەچوو، بەلأم دایکیان سەیر بە حەوسەڵە بوو.

ئەو کوڕەی لە هەموو منالەکان بچووکتر بوو. هێشتا زمانی نەپژا بوو، لەوانەشە منالەکە گێژبوو بێت و نەزانێ بە زمانی "باجی" قسان بکات یاخود بە زمانی دایکی.

تێد و جۆن بە ماشێنی قوتابخانە دەهاتنەوە بۆ مالْ، ماشێنەکە لەسەر دووریانەکەی نەگەیشتوو بە "قولهەك" ئیستۆپی دەکرد و ئەوان دادەبەزی و تا ماڵەوەیان مەودای زۆر نەبوو. رۆژێکیان هێشتا نەگەیبوونە دووڕییانەکە پیاوێکی رەشیان بینی کە لەسەر قەدی درەختێکی بڕاوە وێستاوە، ئەگەر کاتێکی ماشێنی منالەکان بەوێدا ڕادەبرد، سلأوی سەربازی نەکردبا، قەت بە بیریاندا نەدەهات کە پەیکەر نییە. کاتێ ماشێنی قوتابخانە ئیستۆپی کرد، تید و جۆن گەڕانەوەو چوونە لای حاجی فیرووز..

لەسەر یەك هەموو شتێکی حاجی فیرووزیان خۆشویست. بەرگە سوورەکەی، کلأوە زەنگۆڵەدارەکەی، دەمووچاوە رەشەکەی، دەنگی دەفەکەی و ئاوازەکەی، پاش کونپشکنییەکی فرەیش زانییان کە حاجی فیرووز بەر لە جەژنی ئێرانییان دەردەکەوێت، بەلأم هێشتا زستانبوو و حاجی فیرووز هاتبوو. ئەی بۆ هاتبوو؟ دیسانەوە کونپشکنی – و بەم ئاکامە گەیشتن کە حاجی فیرووز جار جار ئاوی حەوزان دەگرێت، جاریش بەفر ڕادەماڵێت و بەر لە جەژنیش دەبێتە حاجی فیرووز. لەوانەیە زستانێك هەر بەفر نەبارێت، لەوانەیە کەس ئاوی حەوزەکەی دەرنەدات. بەتایبەتی زستانو سەهۆڵبەندانی ئاوی حەوزەکان. حاجی فیرووز تەمەنی بە بیست سالْ نەگەیشتبوو، دایکی نەبوو. ئەی کێ بەرگە سوورە چیندارەکەی بۆ دروو بوو؟. جلە حاجی فیرووزییەکانی وەك "بیجاما" بوو. بەلأم چیندار بوو. کلأوە بە زەنگەکەی خۆی دروستی کردبوو، ئەمەیان روونە. بەڕای جۆن میکلْسۆن، تێد کلأوی بە زەنگی لەمەش باشتری دەتوانی دروستبکات. لە مقەبا دەیتوانی رەنگی سووری لێبدات و ئەستێرەشی لەسەر وێنە بکات. تەنانەت دەیتوانی وێنەی کاریکاتێریشی لەسەر رەسم بکات. جۆن لە وێنەکێشاندا نەدەگەیشتە تێد.

ئاخرەکەی روون نەبۆوە جلی حاجی فیرووز کێ دروویەتی و لێکۆڵینەوەی "جۆن،مایکلْسۆن"نیش لە زانیاری لەمەر حاجی فیرووز کۆدەکردەوە نەگەیشتە هیچ کوێیەك، بەلأم لەجیاتی ئەوە ئەم شتە دۆزرایەوە کە حاجی فیرووز دەمووچاوی بە بۆیاغی کەوشان رەشدەکات. باوکی حاجی فیرووز، ئەو رۆژانەی هەتاو بەدەرەوە بوو لە قەراغ شەقامێدا، نەگەیشتوو بە شارییەکە، لەسەر زەوی رۆدەنیشت، قوتوویەکی داری گەورەی لە پێش خۆ رۆدەنا و پێلأوی بۆیاغدەکردن، چەند بایەکی ساردی دەهات. بەلأم بەهارو جەژنی ئێرانییان نزیکبوو و حاجی فیرووز زۆرر زووتر لە جەژن دەرکەوتبوو.

کوڕەکان لەگەلْ دایکیاندا ئەقلْیان کرد بەیەك و بڕیاریاندا دووکانێکی دارینەی بچووك

لەسەر پارچە زەوییەکی بەیاری نزیك ماڵەکەیان دروستبکەن و چەند دانە قوتووی بۆیاغ و بزمارو ناڵچە و بەنی کەوشان و فۆتە و سابوون بکڕن بۆ ئەوەی حاجی فیرووز و باوکی ببنە خاوەن دووکان.

دووکانەکەیان دروستکرد و بۆیاغیان کرد و وێنەی یاریزانو پاسکیلسوارو "ئایزینهاوێر"و "میکی ماموس"و ریکلامی پیسی کۆلایان لە رۆژنامە و گۆڤارەکان قرتاند و نێو دووکانە بچووکەکەیان پێ رازاندەوە. شۆڕ و شەوقێکی چەندە جوانبوو. وێنەی تابلۆی سەر دووکانەکەو ئامادەکردنی ئالای ئەمریکا و ئێران، گشت بەیانی رۆژی یەکشەممەکەیانی گرت. مناڵە هەرە بچووکەکەیان لە هەمووان پتر دەنێو لاقاندا دەهاتوو دەچوو. لە باوەشیان دەکرد و لەسەر کورسییە بچووکەکەی دالآنێیان رۆ دەنا، بەلآم لە پێشدا قاچێکی شۆڕ دەکردەوە بۆ خوارێ و پاشان قاچەکەی تری و چوار دەست و پێ و بە پەلە و جار جاریش وەك گەوران لەسەر دوو پێیان، دەهاتەوە لایان و بازاڕەکەی لێ تێکدەدانەوەو نەیدەهێشت بە ئیشەکەیان رابگەن. منداڵەکان سەرقاڵبوون. تەنانەت وێرانەدەگەیشتن یارییەکی باش لەگەڵ میکیدا بکەن. "میکی" لە هێلانەکەی دەهاتە دەرێ و یەکراست دەهاتە دالآنێ و قاچی جۆن "مایکڵسۆن"ی دەلستەوە. باشە، لانیکەم سەگەکەیان خۆشدەویست. "تێد" و "جۆن" دەگەڕانەوەو بە پەلە دەستیان بەسەری "میکی"دا دەهێنا و دیسانەوە سەرقاڵی کار دەبوون.

دووکانە بچووکەکە سەرو سیمایەکی گرتبوو. ئالآی ئەمریکا و ئێرانیان لێدابوو، بەلآم تێد وێنەی رۆژ و شێرەکەی ئالآی ئێرانی زۆر بە ناتەواوی رەنگکردبوو، تەنانەت نەیتوانیبوو شمشێرەکە دەدەستی شێرەکە باوێ. شمشێرەکە هەروا لە هەواو وێستابوو و دەستی شێر لە خۆوە درێژبوو، بەلآم بە شمشێرەکە نەدەگەیشت. یەکەمین کڕیاری دووکانە بچووکەکە، خانم و ئاغای مایکڵسۆن و کوڕەکانیان بوون و حاجی فیرووز ناوی مایکڵسۆنی بە خەراپی دەردەبڕی. دەیگوت "ئاقاجان" کە کاری دووکانەکە جێبەجێبوو "جۆن" و "تێد".. کەوتنە بیری جلووبەرگی حاجی فیرووز کە قوڕاوی چڵکن بوو. ساتەنی سوور – بەکرەی زەرد – کلآوێکی بە زەنگی گوڵینگەدار. بە کورتی قاتێك جلی رێکوپێك کە بە کەڵکی سەربازێکی گەرۆك بێت، بۆیان سەریەکخست، بەرگێکی سەیر و سەرنجڕاکێشبوو، بە تایبەتی گوڵینکە زەردەکەی سەر ساتەنە سوورەکە، کاتێك سەمای دەکرد لەرینەوەکەی جوان بوو و حاجی فیرووز ئەوپەڕی دەنگی لە دەفە زریزەدارەکەی دەردەهێنا.

جۆن مایکڵسۆن فێری کرد دوای تەواو بوونی سەماکەی، کلآوەکەی لە پێش بینەران رابگرێ و پارە کۆ بکاتەوە. حاجی فیرووز ئەم کارەی دەکرد. بەلآم لە بینەران تەنیا کوڕانی خاتوو مایکڵسۆن بوون پارەیان دە کلآوە بە زەنگەکە دەخست و زرینگەی دەهات. ئەوانی تر پارەکەیان دەهاویشتە سەر زەوی یان بە ئەسپایی دەیاندایە دەست خۆی. منالآنی گەرەکیش هەرپارەیان نەدەدا.

رۆژێکی یەکشەمۆ میکی گومبوو. ئیتر شتێکی ئەوتۆی بۆ جەژنی ئێرانییان نەمابوو. خاتوو مایکڵسۆن دەیگوت: جەژنی ئێرانییان رێك سەرەتای بەهارە. لەوانەیە دووسێ رۆژی بۆ سەرەتای بەهار مابوو. بۆنی بەهار لەو نمە بارانەی دەباری، لە هەوادا بلآوببۆوە. مێکی بۆ کوێ چوو بوو و نەگەڕابۆوە؟ جۆن مایکڵسۆن پێی وابوو پۆلیس یان کەنناسەکان کلکی

سەگەکەیان بڕیوە، ژار خواردوویان کردووە. جۆن مایکڵسۆن دیبووی زۆر سەگان بەم شێوەیە سەرنگوم دەکرێن. لە پێشدا سەگەکان لێی درێژ دەبوون و کەفیان بەلالغاوێدا دەهاتە خوار، پاشان خۆیان بێرەو بەوێدا دەدا. خەڵکی گەرەکێ ماشیان دەکرد و لە پێش سەگەکانیان رۆدەنا. بەڵام بێسوود بوو "تێد مایکڵسۆن" پێی وابوو مناڵی گەرەکێ بە بەرد و دار کوشتوویانە. خاتوو مایکڵسۆن لەبەر خۆیەوە پێدەکەنی و دەیگوت:

"خاتر جەم بن، هیچ پۆلیسێك ناوێرێ سەگی تەوق لە ملی ئەمریکاییەك بکوژێت. منالآنی گەڕەکیش لە خۆیان رانابینن".

منداڵەکان خەمناکبوون. دایکیان وتی: بچن سەرێکی حاجی فیرووزی بدەن بۆ ئەوەی خەمەکەتان کەمبێتەوە. لەوانەیە ئەو هەواڵێکی میکی بزانێت.

کوڕەکان بۆ سەر دووڕێیانەکە چوون. هەمیشە دەنگی دەفە و ئەو هەڵبەستانەی هیچ کاتێ فێری نەبوون، لە دوورەوە دەبیست، پاشان کە بە حاجی فیرووز دەگەیشتن کڕنۆشێکی دوور و درێژی بۆیان دەکرد و یەکسەر دەستی بە بەرنامەکەی دەکرد.

بەڵام ئەمڕۆ لەسەر دووڕێیانەکە دیار نەبوو، لە شەقامە سەرەکییەکەدا هێندێ پیاسەیان کردو نەیاندی. گەڕانەوەو بەرەو دووکانە بچووکەکە رێکەوتن. باران توندتری کردبوو و با دوایین خەوی درەختەکانی دەزڕاند. کاتێ بە دووکانی حاجی فیرووز گەیشتن ئالآکانی سەر دووکانەکەیان بەدیکرد، تەر بوو بوو، چەشنی دووپارچە قوماشی کۆن هەڵواسرابوون. دەرگای دووکانە دارەکە کرابۆوە. با گشت وێنەکانی بەردابۆوە. لێفە و دۆشەکێکی کۆن و لۆکەلێدەرهاتوو لە سووچێکی دووکانەکەدا کەوتبوو.

تێد لێوی هێنانە پێشەوە و پرسی:

"چ.. چ.. چۆن، چ.. چیبووە؟"

"جۆن" چاوی بە وێنە کەوتووەکان و و لێفەو دۆشەکە دڕاوەکەی سووچی دووکانەکە کەوت. چاوی بە کلآوە بە زەنگەکەی حاجی فیرووز کەوت کە پان ببۆوە و لەسەر زەوی کەوتبوو، کەلووپەلی بۆیاغکردنەکە تەنیا شتی رێکوپێکی دووکانەکە بوو. سەری خوراند و وتی: "لە پڕ خۆ دز نەهاتووە".

تێد وتی: "لە.. لەوانەیە هیندییە سوورەکان هێرشیان هێنابێت"

جۆن توانجی تێگرت: " کەی لێرە سوور پێست هەیە؟"

تێد وتی: "د.. د.. زی روو داپۆشراو بە دەمانچەوە.. بە سواری ئەسپ".

جۆن وتی: گوتم دز نەهاتووە.

تێد وتی: "د.. د.. زە رووداپۆشراوەکە رەشەی بردووە گومی بکات".

جۆن بێئەوەی سەرنج بە قسەکانی تێد بدات پرسی: "مردنیش رووبەندی پێوەیە؟"

تێد وتی: "ب.. ب.. بەڵێ، داسیشی هەیە، عەبایەکی رەشی لەبەرە".

جۆن رێکەوت بۆ ئەوەی بڕوات، تێد پرسی: "نایەیت وێنەکان داکوتینەوە؟"

-نا کاتمان لەبەردەستدا نییە، دەبێ بڕۆین..

تێد وتی: "ئا.. ئا.. لآی ئەمریکا رزگار ناکەین؟"

بەیەکەوە لە دووکانەکە دەرکەوتن. بە دووڕێیانەکەدا تێپەڕبوون و گەیشتنە جادە سەرەکییەکە و حاجی فیروزیان بەدیکرد بەڵام بە چ رەوشێکی سەرسووڕهێنەر.

چوار پیاو سندووقێکی تەختەیان لەسەر شاندا نابوو و بەرەو پێشەوە دەچوون. حاجی فیرووز لە پشتەوەیان دەهات. کلآوە بەزەنگۆڵەکەی لەسەر نەبوو و بە دەفەکەی لەسەری خۆی دەدا و زرینگەی دەهات. نزیکتر بوونەوەو گەینە حاجی فیرووز کە دەگریا و دوو هێڵی سپی لەسەر رەشایی دەمووچاوی دەبیندران. جلە ساتانە سوورەکەی بەم

قەشەنگییە رەش و تەڕ بووە و بە جەستەیەوە نووساوە. حاجی فیرووز کە منداڵەکانی بەدیکرد بە دەفەکەی لەسەری خۆیدا. بە سووچی قۆڵی کراسە ساتانە سوور و جوانەکەی چاوی سڕییەوەو درێژ درێژ بە دوای سندوقە دارینەکەدا بەتاقی تەنیا دەرۆیشت.

دیار بوو بە نیاز نییە بەرنامەکەی دەست پێبکات.

"جۆن" و "تێد" بە شوێن حاجی فیروززدا ڕێکەوتن. بەلاّم حاجی فیرووز وشەیەکیشی نەوت. بە پێچەوانەوە ئەو چوار زەلامە جار جار لە بنی گەروویانەوە شتێکیان بە بادا دەکرد کە بێشك فارسی نەبوو، تەنانەت وشەیەکیش بە گوێی جۆن ئاشنا نەبوو. بەم شێوەیە رۆیشتن. جۆن مایکڵسۆن هاوپێی حاجی فیرووز بوو. پرسی: "لەم سندوقە گەورەتان خستووە؟"

حاجی فیرووز هیچی نەوت، بەلاّم فرمێسکەکانی خێرا خێرا هێڵەکانی دەمووچاوی شووشتەوە.

جۆن وتی: "ئەگەر دەمزانی سندوقێکی قەشەنگم بۆی دروستدەکرد". تێد گەیشتە لایان‌و گوتی: "چ.. چ بووە؟ بۆ کوێ دەچین؟ بۆ چ جلی بەم سوور و جوانییەی پیسکردووە؟ .. ئای سەیرکە سەر ئەژنۆی دراوە.."

جۆن توورە بوو وتی: "ئێستا کاتی ئەم قسانەیە؟"

تێد پرسی: چ.. چ ما ئێستا کەنگێیە؟"

جۆن وتی: "چما نابینی؟ باوکی مردووە. لەم سندوقەدایە".

—و.. و.. وای!

پاشان لە شەقامە سەرەکییەکەوە بۆ لای دەستەچەپ بایاندایەوە و پاش چەند کۆلاّن نزیك خانوویەکی بەخشت دروستکراوی دەرگا داخراو و سەربانی جەمەلۆن وێستان. چوار زەلامەکە سندوقە دارەکەیان لە پەنا دەرگا داخراوەکە لەسەر عەرزی رۆنا. دیسان جۆن "مایکڵسۆن" وشەیەك لەم رستانەی ئەوان بەبایاندا دەکرد، تێنەگەیشت. "بەلاّم باش تەنیا دەیتوانی درەختە نوستووەکان لە خەو هەستێنێ. رابوونی مردووان خۆ بەدەست باوە نەبوو، بە دەست عیسای مەسیح بوو. نا. دەتگوت تەنیا عیسا بوو لە نێو مردووەکان رابوو. ئیتر هیچ کەسێ لە نێو تابووتەکەوە رانەبوو".

جۆن مایکڵسۆن دی کە حاجی فیرووز دەستی دەگیرفانی رۆکرد و پارەی بە زەلامەکان دا. هەر سەری دەجوولاّند و کاتێ رۆندك بەسەر هێڵەخواروخێچەکانی دەموچاویدا شۆڕ دەبۆوە، دەنگێکی لە گەرووی دەهات.. ئاخ.. خی.

پاشان رووی دە منداڵەکان کرد و وتی: "ئێوە بۆ ماڵ بچنەوە."

شتی تریشی وت کە دیسانەوە تەنانەت "جۆن مایکڵسۆن"یش نەیزانی. هەرچەند جۆن هەوڵیدا وشەیەکی ئارام بەخشی بە فارسی نەدۆزییەوە.

پرسیاری لە تێد کرد: "تۆ دەزانی بە فارسی *Sorry* دەبێتە چی؟"

تێد وتی: "ح ...ح ەیف کە نازانم."

جۆن مایکڵسۆن بە ناچاری باسکی حاجی فیرووزی گرت و گوتی: "دەزانی میکی گوم بووە پێت وایە پۆلیس میکی کوشتبێت؟"

حاجی فیرووز وتی: "میکی چووە بۆ بێناموسی، بەهارە"

دیسانەوە بە بێوازییەوە دووپاتی دەکردەوە تا جۆن توانی فێری بێت و بچێت توێژینەوە بکات "بێ ناموسی" یانی چی؟ بەهاری دەزانی.

### سەرچاوە:

"بهترین داستانهای کوتاه دنیا، علی رضا مرتضوي كروني. چاپ اول بهار 1367 – مقدمه و انتخاب: مهران بردباري چاپ شفق".

# وێستگەکانی سەردەم

# سوڵجنستین دوژمنی یەکێتی سۆڤیەت و ڕەخنەگر لە خۆراوا..

## مێژوونووسێك کە ئاراستەی کەسی لەبەرنەگرت.

لە عەرەبییەوە: سەردەم

ئەلکساندەر سوڵجنستین. نووسەری بەناوبانگی سۆڤیەت و خاوەنی خەڵاتی نۆبڵی ئەدەب، هەر لە ماڵەکەی خۆیدا لە مۆسکۆ، لە تەمەنی 89 ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.




سوڵجنستین لەو نوسەرانەیە کە بە توندی رەخنەی لە سیستمی حوکمڕانی پێشووی یەکیەتی سۆڤیەت گرت، بە تایبەتی سەردەمی ستالین، لە بەرهەمەکانیدا بە وردی باس لە ترسی ئۆردوگاکان و کاری بە زۆرە ملێی ئەوسای یەکیەتی سۆڤیەت دەکات. یەکێکە لەو دەنگە دیارانەی روسیا کە لە مەسەلەکانی چاکە و خراپە و مەتریاڵ و فریادرەسی دەدوێت.

سوڵجنستین ساڵی 1970 لەسەر ڕۆمانی "ئەرخەبیل گۆلاگ" خەلاتی نۆبڵی درایە، لەو رۆمانەدا سەرنجی دنیا بۆ لای ئەو ئۆردوگا سەربازیانەی روسیا ڕادەکێشێت کە کاری زۆرە ملێیان تێدا ئەنجام دەدرێت.

لە جەنگی دووەمی جیهانیدا لە ریزی هێزەکانی روسیادا کاری دەکرد، زۆربەی ژیانی وەك زانایەکی بیرکاریی کاری کردووە. بە تایبەتی لە ژێر سایەی ستالین و ئەو نووسینانەی کە رەخنەی پێ لێ دەگرتن.

سولجنستین ساڵی 1945 گیراو لە یەکێك لە زیندانەکانی سیبریادا بۆ ماوەی هەشت ساڵ فەرمانی کاری زۆرە ملێی بەسەردا سەپێنرا. ئەمە هەوێنی رۆمانی "ئەرخەبیلی گۆلاگ" بوو کە باس لە

وردەکاریەکانی باری ئەو
کەسانەیە کە وەك خۆی لەوێدا
ژیاون.

لە ژیاننامەکەیدا کە بۆ
لیژنەی سەرپەرشتی کاری
خەڵاتی نۆبڵی ناردبوو دەڵێت:
لەو ساڵانەدا و تا ساڵی
1961، هەرگیز ئەو قەناعەتەم
لا دروست نەبوو کە لە هەموو
ژیانمدا بتوانم دیڕێك لە
نووسینەکانم بە چاپکراوی
ببینم، وەلیٚ پڕکێشیم دەکرد
ئەوەی کە دەمنووسی بۆ
هەندێك لە نزیکەکانی خۆمی
بخوێنمەوە، تا لە دواییدا و لە
تەمەنی 42 ساڵیدا، نهێنی
ئەسڵی کتێبەکە قورسایی
لەسەر شانم دانا.

یەکەم ڕۆمانی "ڕۆژێك لە
ژیانی ئیڤان دینیسوفیتش"ی
لە ساڵی 1959دا لە
چاپخانەیەکی ئەدەبیدا چاپ
کرد، ڕووداوی ناو ڕۆمانەکە
ئەزموونی تایبەتی خۆیەتی لە
ئۆردوگا سەربازیەکانی کاری
زۆرە ملێدا لە کازاخستان کە
خۆی لە یەکێك لە کانەکانیدا
کاری کردووە. ساڵی 1961
جارێکی تر ڕۆمانەکەی بە
شێوەیەکی سەربەخۆ و
بەرفراوان چاپکردووە.

پاش چەند بەرهەمێك
ڕۆمانی "بەشی نەخۆشیی
شێرپەنجە)ی بڵاوکردەوە کە
ڕۆمانێکی خەیاڵیە دەربارەی
ئەو چارەسەریە
سەرکەوتوانەی کە لە
ئۆزبەگستان لە کلینکێکدا
کردوویەتی لە ساڵانی 1953
و 1956 کە بۆ ئەویٚ دوور
خراوەتەوە. سوڵجنستین
خەڵاتی نۆبڵی پێبەخشرا.
بەڵام ئەم نووسەر و
مێژوونوسە ئامادەی ئاهەنگی
خەڵاتەکەی نەبوو، چونکە لەوە
دەترسا کە نەهێڵن بۆ یەکیەتی
سۆڤیەت بگەڕێتەوە. دوای
سیٚ ساڵ ڕۆمانی "ئەرخەبیلی
گولاگ"ی لە پاریس
بڵاوبوەوە.. لە ساڵی 1974 دا
ڕژێمی کۆنی سۆڤیەت تۆمەتی
ناپاکیی دایە پاڵ. ڕەگەزنامەی
لیٚ سەندەوەو بۆ ئەڵمانیا دوور
خرایەوە. لەویٚ بوو بە
ڕەخنەگرێکی سەرسەختی
سیستمی سۆڤیەت و ڕوسیای
دوای بە کۆمۆنیزم بوون.

خۆراوا ڕەخنەی
سولجنستیان لەسەر یەکیەتی
سۆڤیەت زۆر بەلاوە باشبوو،
خەڵاتی نۆبڵیان دایە. بەڵام کە
ساڵی 1994 دوای ڕووخانی
یەکیەتی سۆڤیەت گەڕایەوە بۆ
ڕوسیا بە توندی ڕەخنەی لە
خۆراوا گرت، پاشان پەیمانی
ناتۆی بەوە تاوانبار کرد کە
پیلان لە دژی ڕوسیا
دەگێڕێت.

بەڵام دوای ئەوە وردە وردە
ڕووناکی لەسەر لابرا، تا
سەرۆکی پێشووی سۆڤیەت
فلادیمیر پۆتین ساڵی رابوردوو
بەرزترین خەڵاتی دەوڵەتی پیٚ
بەخشی، پۆتین لەو ڕۆژەدا
وتەیەکی خودی سولجنستنی
دووبارە کردەوە کە دەڵێت:
ڕووسیا ئێمەین.. ئێمە خوێن
و گۆشتی ئەوین، ئێمە
میللەتەکەی ئەوین. بەهۆی
خراپیی باری تەندروستیەوە
ناتالیای ژنی خەڵاتەکەی
وەرگرت.

دوا کتێبی لە مانگی
یونیۆی 2001دا لە ژێر ناوی
"200 ساڵ پێکەوە: 1775-
1995"ی بڵاوکردەوە، ئەم
کتێبە باس لە ژیانی
جوولەکەکانی ڕوسیا دەکات.

لە دوا ساڵانی تەمەنیدا
سۆلجنستین چەند
نووسینێکی دەربارەی مێژوو
شوناسی ڕوسیا بڵاوکردەوە.

سوڵجنستین ڕووناکاییەکی
خستە سەر سیستمی سۆڤیەت
و ڕسواییەکیش بوو بۆ خۆراوا
کە بەکاریان هێنا.
گەڕانەوەیشی بۆ پاڵپشتی
کردنی پۆتین ماناکانی
سوڵجنستین و هەڵوێستەکانی
ئەویان ڕووناك کردەوە.

**سەرچاوە:**

*www.addunia.tv*

# دواجار مەحمود دەروێشماڵئاوایی لە شیعرو لە فەلەستین کرد

ئامادەکردنی: هەورامان وریا قانع

ماوەیەك لەمەوبەر شاعیری گەورە "مەحمود دەرویش" کۆچی دوایی کرد، ئەو کۆچەی پێش ئەوەی ماڵئاوایی لە خزمو دۆستو برادەرانی بێت، ماڵئاوایی بوو لە وشەو شیعرو فەلەستین، پێش ئەوەی بەو کۆچەی مرۆڤەکان دڵگرانو خەمباربکات، ئەو قەڵەمو لاپەڕانەی دڵگرانو خەمبارکرد کە عەیامێکە بونەتە ئاشنای دەستوپەنجەو ڕۆحە پڕ شعرەکەی. ئەوەی لەم مەرگەدا لە هەمو کەس زیاتر خەسارەتمەند بوو، ئەوەی لە هەموان زیاتر زەرەری کرد، شیعرو کێشەی فەلەستین بوو، ئەو دوانە ئێستا پاش نەمانی "دەروێش" هەست بە تەنهایی و بێ باوکی دەکەن، هەستدەکەن دۆستە هەرە بەوەفاو دڵسۆزەکەیان


مەحمود دەروێش

لەکیسچووە، هەستدەکەن ئازیزترین کەسی خۆیان لەدەستدا، کەسێك لە ڕێگەی شیعرەوە، ببوە سمبولێکی زیندوی نەتەوەو خاکێکی داگیرکراو.

ئاشکرایە ئەم شاعیرە مەزنەی عەرەب یەکێکە لەو شاعیرانەی تاڕادەیەك لەناو کوردا ناسراوە، بەڵام پێموایە ناسینەکەی بە پلەی یەکەم بۆ جوانیو بەرزی شیعرەکانی ناگەڕێتەوە، هێندەی بۆ ئەو کێشە سیاسییە دەگەڕێتەوە کە شاعیر بەرگری لێدەکرد، کێشەی نەتەوەیەکی بێ دەوڵەتو بێ ئاڵاو بێ کەسی فەلەستینییەکان، تەواو وەك نەتەوەی کورد. لەناو ئێمەدا ناسینی "مەحمود دەروێش" بەهۆی بەرهەمو دیوانە زۆرەکانییەوە نەبوو، بەڵکو بەهۆی ئەو هەڵوێستو تێڕوانینانەوەی بوو کە شاعیر لەبەرامبەر ململانێی نێوان نەتەوەکەیو نەتەوەی جوولەکەدا دەیگرتەبەر. ئێمە پێش ئەوەی تەماشای شیعرەکانی بکەینو بیانخوێنینەوە، پێش ئەوەی تەماشای بەهای شیعرەکانی بکەین، تەماشای جۆری گوفتارو هەڵسوکەوتەکانیمان دەکرد. پێش ئەوەی لە

دەقەکانیدا بە دوای ئیستاتیکای شیعریدا بگەڕێین، بەدوای ژیانە تایبەتیو ڕۆژانەکەیدا دەگەڕاین. بۆ ئێمە گرنگ نەبوو تێکستەکانی چەند شیعریەتیان تێدایە، زمان لە چ ئاستێکدایە، ئیقاع چۆن بەکارهاتووە، بەڵکو ئەوەی گرنگ بوو بزانین ئەم شاعیرە لەبەرامبەر مەسەلەی ئاشتیو پێکەوە ژیانی دوو نەتەوەی نەیار بەیەك دەڵێ چی. بەلامانەوە گرنگ نەبوو دیوانێکی تازەی دەرکردووە، بەڵام زۆر بەلامانەوە گرنگ بوو بزانین دەربارەی ڕێکەوتنامەکانی نێوان فەلەستینو ئیسرائیلیەکان دەڵێ چی.

بەمانایەکی دیکە ئێمە بۆ ناسینی شاعیربونی "مەحمود دەروێش" کتێبو دیوانەکانی نەدەگەڕاین، بۆ دۆزینەوەی مانا لە ژیانی ئەم شاعیرەدا، نەدەچووینەوە سەر بەرهەمەکانی، بۆ ئاشنابون پێیو باسکردنی نە دەگەڕاینەوە بۆ تێکستەکانی، بەڵکو دەگەڕاینەوە بۆ ئەو لێدوانو چاوپێکەوتنانەی باسی لە گرفتی نەتەوەکەی دەکردو هەڵوێستی خۆی تێدا دەردەبڕی. ئێمە دەمانویست بزانین ئەم شاعیرە دەربارەی تەلئەبیبو قودسو شارەکانی دیکەی ئیسرائیل دەڵێ چیو چۆن تەماشای داگیرکردنی زێدی باوباپیرانی دەکات. دەمانویست بزانین پەیماننامەی (ئۆسلۆ)ی بەدڵە یاخود نا، لەگەڵ سەرۆکی ئەوکاتی فەلەستین تەبایە یان ناکۆك. گومانی تێدانییە ئەم شێوە ناسینەی شاعیر، ناسینێکە دوورە لە جیهانی شیعرو شیعریەتەوە، غەدرێکە لەو تێکستە جوانانە دەکرێت کە ئەم شاعیرە نوسیویەتی. گەڕان بەدوای زانینی هەڵوێستی شاعیر لە دەرەوەی شیعرەکانی، زیاتر گەڕانە بەشوێن زانینی ئایدۆلۆژیا و ئەو واقیعەی شاعیر تێدا ژیاوە، ئایدۆلۆژیا و واقیعێك کە تەواو جیاوازە لەوەی لەناو شیعرەکاندا هەیە. لە ڕاستیدا ئەم شێوە گەڕانە هەرگیز ناتوانێ بەهای گەورەیی ئەم پیاوەمان بۆ دەربخات، ناتوانێ لەو خەیاڵە فراوانەی ئەم شاعیرەمان نزیکبکاتەوە کە لە تێکستەکانیدا ئامادەن. ئەم جۆرە مامەڵەکردنە لەگەڵ "مەحمود دەروێش"دا تاکو دوا ئاست لە سنوری شیعرمان دووردەخاتەوەو بەڕادەیەکی ترسناك لە سنوری سیاسەتمان نزیکدەخاتەوە، ئەمەش بۆ خۆی کوشتنی بەهای شیعرو ئیستاتیکای شیعرە.

"مەحمود دەروێش" دووەم کوڕی خێزانێك بوو کە پێکهاتبوو لە دایكو باوكێكو پێنج منداڵ، دوو کوڕو سێ کچ، لە ساڵی 1941 لە گوندی (بەروە) هاتووەتەدنیاوە، ساڵی 1948 گوندەکەیان خاپوردەکرێتو لە شوێنەکەیدا گوندێکی یەهودی بەناوی (ئەحیهوّد)ی کشتوکاڵی دروستدەکرێت. لە تەمەنی حەوت ساڵیدا دەچێت بۆ لوبنانو تێدا ساڵێك دەمێننەوە، دواتر بە دزییەوە دەگەڕێتەوە فەلەستینو تەماشادەکات دێکەیان ڕوخێنراوە، ناچار لە گوندی (دیر الاسد) دەمێنێتەوە. دوای ئەوەی لە لوبنانەوە بە دزی دەگەڕێتەوە بۆ گوندی (دیر الاسد) خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی ئەو گوندەدا تەواودەکاتو زۆر لەوە ترساوە مەسەلەی بەدزی هاتنەوەکەی ئاشکرابێتو سەرلەنوێ دوریبخەنەوە. لەو ماوەیەدا بێ بەش بووە لە وەرگرتنی ڕەگەزنامە، هەرچی خوێندنی ناوەندییە، ئەوا لە گوندی (کفر یاسیف) تەواوی کردووە.

لە گەنجیدا پەیوەندی بە حیزبی شیوعی ئیسرائیلیەوە دەکات، لە گۆڤاری (الجدید)و لە ڕۆژنامەی (الاتحاد) کە هەردوکیان ئۆرگانی حیزبی شیوعی ئیسرائیلی بوون، وەك موحەررو وەرگێڕ دەستبەکار دەبێت. پاشان دەبێتە

بەڕێوەبەری گۆڤارەکەو لە دەرکردنی ڕۆژنامەی (الفجر)یش هاوکاربووە. بەهۆی چالاکیو هەڵوێستو قسە سیاسییەکانییەوە، لەلایەن دەسەڵاتی ئیسرائیلەوە زیاد لەجارێك زیندانی دەکرێت. ساڵی 1972 لەگەڵ وەفدێکی حیزبی شیوعی دەڕوات بۆ مۆسکۆ، لەوێشەوە بۆ قاهیرەو لەلایەن "جەمال عەبدولناسر"ی سەرۆکی ئەوکاتی میسرەوە پێشوازی لێدەکرێتو پاسپۆرتێکی میسری پێدەبەخشێت، لێرەوە کاروانی خەباتی ڕێڕەوێکی تازە لەخۆدەگرێت. پاشان دەچێتە لوبنان، لەوێ دەبێتە سەرۆکی ناوەندی توێژینەوەی فەلەستینیو پۆستی سەرنوسەری گۆڤاری (شؤون فلسطينية) وەردەگرێت. ساڵی 1981 لە بەیروت گۆڤاری ڕۆشنبیری (الكرمل) دادەمەزرێنێتو دەبێت بە سەرنوسەر گۆڤارەکە. ساڵی 1988 وەك ئەندام لە لیژنەی جێبەجێکاری ڕێخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی هەڵدەبژێردرێت، پاشان دەبێتە ڕاوێژکاری سەرۆك "یاسر عەرەفات". ساڵی 1994 وەك نارەزاییەك لەبەرامبەر مۆرکردنی پەیماننامەی (ئۆسلۆ)، لە لیژنەی جێبەجێکار دەست لەکار دەکێشێتەوەو حەزی نەکردووە چیتر لە ڕێکخستنێکی سیاسیدا کاربکات، بەڵکو پێی خۆش بووە وەك شاعیرێکی سەربەخۆو ئازاد بمێنێتەوە. لە هەمان ساڵدا دەگەڕێتەوە بۆ فەلەستینو لە شاری (رام الله) نیشتەجێ دەبێت.

هەر لە قۆناغی خوێندنی سەرەتایدا دەستی بە شیعر نوسین کردووەو پاشان وەك یەکێك لە شاعیرە گەورەکانی بەرگری دەناسرێت، زیاد لە سی دیوان شیعری هەیە، شیعرەکانی بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان وەرگێڕدراون. لە ڕاستیدا ئەم شاعیرە توانی کێشەی فەلەستین لە سنوری جوگرافیای خۆی دەربێنێتو ڕەهەندێکی جیهانی پێ ببەخشێت، توانی ستەمو چەوساندنەوەی میللەتی فەلەستین لەناو چوار دیواری شارەکان بێنێتە دەرەوەو بیخاتە بەردەم جیهان، لە ڕێگەی شیعرەکانییەوە توانی دۆستو لایەنگرێکی زۆر بۆ فەلەستینیەکان پەیدابکات، تەنانەت هەندێ لە ڕۆشنبیرە لیبراڵەکانی ئیسرائیل داوایان کردووە کۆمەڵێ لە شیعرەکانی لە پرۆگرامەکانی خوێندنی قوتابخانە ئیسرائیلیەکاندا بخوێندرێت. تاکو لە ژیاندابوو کۆمەڵێ خەڵاتی گەورەی بەدەستهێناوە، لەوانە خەڵاتی لۆتس ساڵی 1969، خەڵاتی دەریای ناوەڕاست ساڵی 1980، زرێی شۆڕشی فەلەستینی ساڵی 1981، تابلۆی ئەوروپا بۆ شیعر 1981، خەڵاتی ئیبن سینا لە یەکێتی سۆڤیەت ساڵی 1982، خەڵاتی لێنین لە یەکێتی سۆڤیەت ساڵی 1983، خەڵاتی شازادە "کلاوس" لە هۆڵەندە ساڵی 2004، دواجار وەزارەتی پۆستەو گەیاندنی فەلەستینی لە 27 تەموزی 2008 پولێکی پۆستەی دەرکرد کە وێنەیەکی "مەحمود دەروێش"ی لەسەرە، واتە بەر لە مردنی بە 14 ڕۆژ.

ئەم شاعیرە مەزنە ڕۆژی شەممە بەرواری 9 ئابی 2008 دوای ئەوەی نەشتەرگەری کردنەوەی دڵی بۆ ئەنجامدەدەن، لە ویلایەتی تەکساسی ئەمریکا کۆچی دوایی دەکات.

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی الشرق الاوسط، 2008/9/10، ژمارە 10848
ڕۆژنامەی البيان، 2008/9/11
ماڵپەڕی: *www.aljazeera.net*

# کۆچی دوایی دەرهێنەری بەناوبانگی میسری یوسف شاهین

لە عەرەبییەوە: ساکار ڕەووف

پاش تووشبوونی بە خوێنبەربوونی دەماغ و مانەوەی زیاد لە مانگێك بە بێهۆشیی لە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی شاری قاهیرە، دەرهێنەری گەورەی میسری (یوسف شاهین) لە تەمەنی 82 ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

شاهین جێگایەکی بەرچاوی هەبوو لە بواری دەرهێنانی سینەماییدا. ساڵی 1979 خەلاتی (ورچی زیوین)ی لە میهرەجانی بەرلین بۆ فیلمی (ئەسکەندەریە بۆ) پێبەخشرا و، ساڵی 1997 خەلاتی ریزلێنانی بۆ تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ بەسەر رەوتی هونەریدا لە میهرەجانی "کان"ی سینەمایی، پێبەخشرا.

شاهین یەکەم فیلمی لە ساڵی 1950 دا بەناوی (بابە




ئەمین)و دواتر فیلمە بەناوبانگەکەی (دەرگای ئاسنین)ی دەرهێنا. هەروەها بەوە هۆی دۆزینەوەو پێشکەشکردنی ئەکتەری بەناوبانگی میسری (عومەر شەریف) بۆ سینەما لە فیلمی ( ململانێی ناو دۆڵەکە) کە دواتر بەوە هۆی بەجیهانیبوونی شەریف لەسەر دەستی دەرهێنەری ئینگلیزی (دەیڤید لین) لە هەردوو فیلمە ناوازەکەیدا (لورانسی عەرەب) و (دکتۆر جیڤاکو).

### ئازادی رادەربڕین

فیلمەکانی شاهین مشتومڕێکی زۆری وروژاند بەهۆی ئەو روحە رەخنەئامێزە سیاسی و کۆمەلایەتییەی و بەرگری کردنی بەردەوامی لە ئازادییەکان، ئەو رووداوانەی میسر لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا بەخۆیەوە بینی کاریگەریی گەورەیان بەسەر شاهینەوە هەبوو.

لە ساڵی 1972 شاهین بەردێکی فڕیدایە ناو ئاوە پەنگخواردوەکە بە دەرهێنانی فیلمی (چۆلەکەکە) کە تیایدا هۆکاری شکستهێنانی سوپای میسری لە شەڕی حوزەیران ئەخاتە ئەستۆی گەندەڵیی دەزگای سیاسی میسری. ئەم هێڵە رەخنەئامێزە لە کارەکانی

شاهیندا بەدرێژایی ساڵەکانی حەفتا بەردەوام بوو، وەك لە فیلمی (گەڕانەوەی کوڕە ونبوەکە) ساڵی 1979 دا دەردەکەوێت.

لەو فیلمانەشی کە سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەست هێنا فیلمی (زەوی)بوو ساڵی 1969. ئەم فیلمە رۆمانێکی بەناوبانگی نووسەری میسری (عبدالرەحمان شەرقاوی)ەو تیایدا باس لە ئازاری جوتیاری میسری دەکات لە ماوەی دەرەبەگایەتیدا پێش هەڵگیرسانی شۆڕشی یۆلیو/ تەمووزی 1952 هەروەها فیلمی (کۆچەر)ە ساڵی 1994، ئەو فیلمەی داوای دادگایی لە دژ پێشکەشکراو داوای راگرتنی کرا بە بیانووی ئەوەی چیرۆکەکەی هاوشێوەی چیرۆکی پێغەمبەر (یوسفی کوڕی یەعقوب)ە.

شاهین تێڕوانینی خۆی سەبارەت بە فیکری ئیبن روشدی فەیلەسوف لە فیلمی (چارەنووسەر) دا خستەڕوو کاتێك ئەو رووداوە جیاوازانەی لە ئەنجامی سووتانی کتێبەکانی ئیبن روشدەوە دەستنیشانکرد، بەمەش پەیامێکی سینەمایی نوێی ئاراستە کرد ئەویش بەرگریکردنە لە ئازادی بیرو رادەربڕین و هێرشکردنیشە بۆ سەر پەڕگیری.

فیلمی (ئەوی تر) ساڵی 1999باس لە بابەتی (لێبوردن)دەکات لەڕێی چیرۆکی خۆشەویستی نێوان کوڕێکی گەنجی میسری کە لە خێزانێکی دەوڵەمەندەو لەگەڵ دایکیدا لە وڵاتە یەکگرتوەکان ئەگەڕێتەوە، لەگەڵ کچێکی هەژاری میسری. فیلمەکە بە کوشتنی کوڕو کچەکە کۆتایی دێت لەکاتی پێکداداان لەنێوان پۆلیسی میسری و چەند چەکدارێکی ئیسلامی پەرگیردا.

## ژیاننامە

شاهین ژیاننامەی خۆی و دەستنیشانکردنی بەرەوپێشچوونی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە میسر لە چوار فیلمدا پێشکەش کردووە، ئەوانیش (ئەسکەندەریە بۆ) (حیکایەتێکی میسری) و (ئەسکەندەریە هیترو وهیتر) و (ئەسکەندەریە نیویۆرك)ە. لە ساڵی 1991 یشدا فیلمێکی تۆمارکراوی بە ناوی (قاهیر روناکە بە خەڵکەکەی) دەرهێنا، کە کارێکی تر بوو لەو کارانەی رووبەرووی مشتومڕو رەخنەگرتنێکی زۆر بوەوە، تیایدا شاهینیان بە شێواندنی وێنەی میسرییەکان تۆمەتبار کرد. دەرهێنەر وەڵامی هەموو ئەو رەخنانەی بەوە دایەوە کە یەکێك لە هۆکارەکانی هەموو ئەو هێرشانەی دەکرێتە سەر فیلمەکەی نمایشکردنی ئەو خۆپیشاندانەیە کە خوێندکارانی زانکۆی قاهیرە سازی دەدەن دژ بە شەڕی عێراق ساڵی 1990 .

شاهین بە رەخنەگرتنە توندەکانی لە سیستمی حوکم لە میسرو سیاسەتی ئەمەریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نێوبانگی دەرکردبوو. ساڵی2007 دوا فیلمی بەناوی (ئەمە بێسەروبەرەییە) ەی بەیاریدەی خالد یوسفی خوێندکاری خۆی دەرهێنا، تیایدا رەخنەی توندی لە بارودۆخی سیاسی میسر گرت لەڕێی چیرۆکی پۆلیسێکی گەندەڵ کە ئازاری خەڵك دەدات و کچێك بەرەنگاری ئەبێتەوە و ناهێڵێ شوێنی ئەوو دەستگیرانەکەی کە داواکاری گشتییە ،بکەوێ.

شایەنی باسە شاهین ساڵی 1926 لە شاری ئەسکەندەریە لەدایك بووەو خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەیەکی فەرەنسی تەواوکردووە، دواتر چووتە کۆلیژی فیکتوریا و بڕوانامەی دواناوەندی لەوێ وەرگرتوەو پاشان چووەتە وڵاتە یەکگرتووەکان و لەوێ هونەری سینەماو شانۆی خوێندوە.

**سەرچاوە**

*www.bbcarabic.com*

# شەری ناموقەدەس، تیرۆر بەناوی ئیسلامەوە

لە ئینگلیزیەوە: عەزیز ڕەئووف

جۆن ئێسپۆسیتۆ یەکێکە لـــە نوســـەر و لێکۆڵـــەرەوە دیارەکان سەبارەت بە ئیسلام. دەنگـی ئـەم پیـاوە تـەنها لـە خۆرئـاوادا گرنگـی پێنادرێـت، بـەڵکو لـە جیهـانی ئیلامیـشدا گرنگی تایبەت بە نوسینەکانی دەدرێت. لە دنیای پڕ ململانێ و کێشمەکێشی نێوان ئیسلام و خۆرئـاوادا، ئـەم لێکۆڵـەرە کتێبێـــك لـــەبارەی یـــازدەی ســــــێپتەمبەری 2001ەوە دەنوســـێت بەناونیـــشانی( شـــەڕی ناموقـــەدەس، تـــیرۆر بەناوی ئیسلامەوە).

نـــاوەرۆکی ئـــەم کتێبـــە وەســـتانە لەســـەر دیـــوە شاراوەکانی شەڕی ڕێکخراوی ئەلقاعیـدە بـە سـەرۆکایەتی ئوســـامە بـــن لادن لەگـــەڵ خۆرئـاوا بەگـشتی و ئـەمریکا بەتایبـەتی. ئیسپۆسیتۆ هـەوڵ دەدات بگەڕێتـەوە بـۆ بوعـدە مێژووییەکـەی ململانێی نێوان ئـەمریکا و موسـوڵمانان، تـاکو بـۆی دەربکـەوێت کـە چۆن لـە جیهــانی ئیــسلامیدا ئــەنتی ئـەمریکا بـەو شـێوەیە سـەر هەڵـدەدات تـاکو ئامـادە بێـت ڕووداوێکـــی وەکـــو یـــازدەی سێپتەمبەر بخوڵقێنێت.

ئەم کتێبە لە سەرەتاوەو لە چـاپتەری یەکەمـدا بـاس لـە مێـــــژووی ســــــەرهەڵدان و گـەنجێتی بـن لادن دەکـات کـە چـۆن بـیری جیهـادی لا گەڵاڵـە دەبێـت. نوسـەر دەڵێـت ئـەم گەنجـە شـەرمنە هـەر لـە سـەرتاوە هـەوڵی ئـەوەی داوە کارەکتـەرێکی کاریزمی بێـت و بـۆ ئەمـەش ڕێگـەی جیهـادی هەڵبـژارد و بـوو بـە ئـەنتی ئەمریکیـــەکی ســـەرکێش و تـــوانی بـــە ڕووداوی 11ی سـێپتەمبەر سـەرنجی هـەموو جیهـانی ئیـسلامی بـۆ خـۆی ڕابکێشێت. سـەرباری ئـەوەش نوسـەر دێتـە سـەر باسـی ئـەو بارودۆخ و حاڵەتە جوگرافیـەی کە بن لادنی تێدا گەورە بووە.

لـــە چـــاپتەری دووەمـــدا نوسـەر هـەوڵ دەدات چـەمکی جیهادو جۆنێتی سەرهەڵدانی لـە جیهـانی ئیـسلامیدا ڕاڤـە بکـات. ئەو دەیەوێت بپرسێت کـە ئـەو سـیحرە چـیە وا لـە کارەکتـــەرێکی موســـوڵمان دەکـات بـۆ پـەنا بردنـە بـەر جیهـاد؟ یـاخود ئـەو ئاگاییـە چـــیە وا لـــە کارەکتـــەرێکی موسوڵمان دەکات کە پایەکانی خۆی لەسەر جیهاد قایم بکات؟ هـەر نوسـەر خـۆی بـاس لـەوە دەکات کە ڕاڤەکردنی چەمکی جیهـاد ڕاڤـەکردنێکی تـەواو ئـاڵۆزە و بـێ گەڕانـەوە بـۆ

سەرەتاکانی "فتوحات" لە مێژووی ئیسلامدا ناتوانین هیچمان دەست بکەوێت. هەر بۆیە نوسەر ڕای جیاوازی لێکۆڵەرە گەورەکانی جیهانی ئیسلامی وەرگرتووە، بەتایبەت بیریارانی سەدەکانی ناوەڕاست و بە پشت بەستن بەو سەرچاوانە هەوڵی ئەوەی داوە لەمەڕ چەمکی جیهاد هەڵوێستەیەك بكات.

لە چاپتەرێکی تردا نوسەر دەگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا و باس لە سەرهەڵدانی محافزکارە نوێیەکان" *neoconservatives* " دەکات و هەڵوێستی ئەوان لەمەڕ ئیسلام و جیهانی ئیسلامی بەگشتی دەکات. ئێسپۆسیتۆ پێی وایە ئیشکالی محافزکارە نوێیەکان لەوەدایە کە لە نێوان ئیسلام خۆی و ئیسلامیستی ڕادیکاڵدا جیاوازی جەوهەری نادۆزنەوە. سەرباری ئەوەی نوسەر هەوڵ دەدات ئەو بەهەڵە تێگەیشتنە دیراسە بکات کە جیاکاری لەنێوان خۆراوا و ئیسلامدا دەکات بە ئیسلام یان کاپیتالیزم، ئیسلام یان دیموکراسی، ئیسلام و مافەکانی مرۆڤ ناوزەدی دەکەن و نوسەر ئەم جیاکاریە بە ناپێویست لەقەڵەم دەدات. بەڵام سەرباری ئەوەش نوسەر ئەوە ناشارێتەوە کە گەورەترین ململانێ لە جیهانی ئیسلامدا لەئارادایە سەبارەت بە پێشێلکردنی مافەکانی ژنان.

لە چاپتەری کۆتاییدا نوسەر جەغت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پێویستە لەمەودوا چی بکرێت. ئەو پێی وایە کە ئەم ململانێیەی نێوان ئیسلام و خۆراوا ئەگەری درێژەکێشانی هەیە. ئەو باس لە ململانێی جیهادیستەکانی عێراق دژ بە ئەمریکا و حەماس و وەهابیزمی عەرەبی سعودیە دەکات و وەك دەرکەوتەیەك بۆ بوونی ململانێی خوێناوی نێوان ئەمریکا و موسوڵمانە ڕادیکاڵەکان ناوزەدی دەکات.

ڕۆڵی ئەم کتێبە بریتیە لە تێگەیشتن لە چەمکی سیاسی و مێژوویی تیرۆریزم و مۆتیڤەکانی موسوڵمانبوون لەسەر سەرهەڵدانی جیهادیست. ئەو باس لەوە دەکات وەڵامەکان بۆ ئەو پرسیارەی کە بۆ 11ی سێپتەمبەر ڕوویدا وەڵامێکی ڕۆشن نیە و پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاترە.

لەبارەی ئەم کتێبەوە پیتەر بیرگین دەڵێت"کتێبەکەی ئێسپۆسیتۆ گرنگیەکەی لەوەدایە باس لە دیاردەیەك دەکات کە ئێستا لە کۆمەڵگەی بەشەریدا بوونی هەیە. ململانێی ئیسلام و خۆرئاوا هەوڵێکی ئیسپۆسیتۆ باش توانیویەتی دەستی بۆ ببات".

کارێن ئارمسترۆنگ نوسەری کتێبی" ئیسلام: مێژوویەکی کورد لەبارەی ئەم کتێبەوە دەڵێت:" کتێبێکی یەکجار بەنرخە. ئەو بە نوسینی ئەم کتێبە ڕاماندەکێشێتە نێو خوێندنەوەیەکی یەکجار سەختەوە و بە شەڕی ناموقەدس ناوی دەبات.

جۆن ئیسپۆسیتۆ دانیشتوی واشەنگتۆنە و پرۆفیسۆری زانکۆیە لە بواری ئاین و پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان و بەڕێوەبەری سەنتەری موسلیم- کریستیانە لە زانکۆی *Georgetown* . پێشتر سەرۆکی کۆمەڵەی دیراسەکردنی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بووە و نوسەری چەندین کتێبە لەبارەی ئیسلامەوە لەوانە:"ڕێگەی ڕاست و هەڕەشەی ئسلامی" و " ئیسلام: ئەفسانە یان حەقیقەت" و چەندین کتێبی تر سەبارەت بە ناسینی ئیسلام وەك ئاینێکی گەورە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا.

**سەرچاوە:**

*book review*

# ماکس ڤیبەر و مۆدێرنە

لە عەرەبییەوە: سەردەم

*Max weber*
*Readings and commentarz on modernity stephen kalberg*
*Blackwell publisher – London, newyork.*
*2006- p.432*



ماکس ڤیبەر

نوسەری ئەم کتێبە لێکۆڵیار "ستیڤن کالبێرگ"ە. "کالبێرگ" پسپۆڕە لە کۆمەڵناسی و فیکری "ماکس ڤیبەر"یش بە تایبەتی. لەم کتێبەدا باس لە پەیوەندی نێوان "ماکس ڤیبەر" و مۆدێرنە دەکات. کتێبەکە لە پێشەکیەکی گشتی و چەند بەشێك پێکهاتووە. پێشەکیەکەی ئەمە ناونیشانەکەیەتی: (ماکس ڤیبەر، ڕوبەڕوبوونەوە لەگەڵ مۆدێرنەدا). پاشان نوسەر باس لە "ماکس ڤیبەر" ی مرۆڤ دەکات، باس لە دیدگا گشتیەکانی دەکات بۆ کۆمەڵگا و توێکاریکردنی کۆمەڵگە بە پێی میتۆدی سۆسیۆلۆگی، هەروەها باس لە بۆچونی "ڤیبەر" دەکات بۆ مۆدێرنە و کۆمەڵناسی.

لە دوای ئەم پێشەکیە گشتیە، بەشی یەکەمی کتێبەکە دێت، تیادا باس لە تایبەتمەندی خۆرئاوا ئەقلانیەتی شارستانیەتی خۆرئاوا و کۆمەڵناسی ئایین دەکرێت، کۆمەڵناسی ئایین واتە لێکۆڵینەوە لە ئایین لە ڕوانگەیەکی کۆمەڵناسانەوە، نەک تەنها لە ڕوانگەیەکی ئیمانی

تەقلیدیەوە، چونکە لە نێوان ئایین و کۆمەڵگەدا پەیوەندی هەیە و پێویستە لەو پەیوەندیە بکۆڵینەوەو تێی بگەین.

لە دووەم بەشی کتێبەکەدا باس لە تایبەتمەندی مۆراڵی مۆدێرنەی خۆرئاواو ڕەگوڕیشەکانی دەکات. هەروەها باس لە تێزە بە ناوبانگەکەی "ڤیبەر"یش دەکات کە پەیوەندیەکی کۆنکرێتی لە نێوان مۆراڵی پرۆتستانتی و دروستبونی سەرمایەداریدا دەدۆزێتەوە. وەکی دەزانرێت "ماکس ڤیبەر" پێیوایە مۆراڵی زاهیدانە و حەزی کارکردن و پاشەکەوتکردن و بەجێهێنانی ئەرکەکان، هۆکاری سەرهەڵدانی سەرمایەداری بوون وەك شێوازێك بۆ ژیانکردن و بەرهەم هێنان. ئەم مۆراڵەش بە گشتی لەو کۆمەڵگایانەدا هەیە کە پەیڕەوی ئاینزای پرۆتستانتی دەکەن، ئەم ئاینزایەش یەکێکە لە ئاینزاکانی ئایینی مەسیحی و بەزۆری لە باکوری ئەوروپا و وڵاتانی ئەڵمانیا و ئینگلتەرادا هەیە. لەبەرئەوەشە کە سەرمایەداری یەکەمجار لە ئینگلتەرادا سەری هەڵدا، بەر لەوەی لە وڵاتانی کاتۆلیك مەزهەبی وەك فەرەنسادا دروست ببێت.

لە سێیەم بەشی کتێبەکەیدا، نوسەر بە دوور و درێژی باس لە تێگەیشتنی "ماکس ڤیبەر" دەکات بۆ ئابووری و پەیوەندی ئابووری بە کۆمەڵگەوە. ئەو لێرەدا جیاوازی لە نێوان جۆری ئەو ئابوریەدا دەکات کە لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا باوە، لەگەڵ جۆری ئەو ئابوریەی لە کۆمەڵگە پیشەسازیەکاندا لە ئارەدایە. جۆری یەکەمیان ئابوریەکی مەمرەو مەژییە کە تەنها دەتوانێت مانەوەی مرۆڤ لە ژیاندا مسۆگەر بکات، بەڵام بەبێ چێژ و بەرخۆری زیاد لە پێویست. هەرچی ئابووری دووەمیانە، ئەوا زۆر بەهێزە و پشت بە بەرهەم هێنانی پیشەسازی دەبەستێت، نەك تەنها بەرهەمی کشتوکاڵی.

پاشان نوسەر لە چوارەم بەشی ئەم کتێبەدا (ماکس ڤیبەر و مۆدێرنە)، باس لە دابەشبونی کۆمەڵگا دەکات بەسەر چەند چینێکدا کە لە ڕووی سەروەت و سامانەوە جیاوازن، واتە چینی کرێکارە پرۆلیتاریکان، لەگەڵ چینی خاوەن کارە سەرمایەدارەکان و چینی ناوەڕاست. هاوکات باس لەو نایەکسانی و ناعەدالەتیە زەقەی ناو کۆمەڵگا سەرمایەداریە مۆدێرنەکانیش دەکات، بەهۆی کەڵەکەبونی سەرمایە لە دەست چەند کەس و بنەماڵەیەکدا. پێنجەم بەشی کتێبەکەش باس لە کێشەی دەسەڵات دەکات لە کۆمەڵگەی مۆدێرندا، لە شەشەم بەشیشدا دێتە سەر باسی نەتەوەو دەوڵەت و یاسای مۆدێرن.

وەکی ئاشکرایە وڵاتانی ئەوروپا، لە نێویشیاندا ئەڵمانیا، لە قۆناغی ئومەیەکی ئایینی مەسیحیەوە گواستیانەوە بۆ قۆناغی نەتەوەیی مۆدێرن، ئەم مۆدێلەش لەسەر فەلسەفەی ڕۆشنگەری و مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتیبون دامەزرابوو، نەك لەسەر ئایین. ئەمەش بە قەڵەمبازی گەورەی مۆدێرنە ناودێر دەکرێت. قەڵەمبازێك کە ئەوروپای لە قۆناغی فیودالیزمی ئسوڵی کۆنەوە، گواستەوە بۆ قۆناغی سەرمایەداری ڕۆشنگەری مۆدێرن.

حەوتەم بەش، نوسەر تەرخانیکردووە بۆ ئەم بابەتە: (فیکری ماکس ڤیبەر چۆن دەتوانێت یارمەتی دەرمانبێت بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانی ئێستامان؟). لە ڕاستیدا فیکری "ڤیبەر" لەگەڵ مەرگی خۆیدا نەمرد، بەڵکو تا ئێستاش لە باریدایە وەڵامی پرسیار و خواستەکانمان بداتەوە. لەبەشی هەشتەمدا، نوسەر باس لە بابەتی کلتوری سیاسی دیموکراسی ئەمریکی دەکات. ئەمە بە گشتی

پێرستی بابەتەکانی کتێبەکەیە، بەڵام ئاخۆ وردەکاری و جومگە سەرەکیەکانی دیکەی چین؟

یەکەمین شت کە جێی سەرنج بێت، ئەوەیە نوسەر لە ئاست یەکێك لە گەورە کۆمەڵناسەکانی جیهاندا هەڵوێستە دەکات و دەڵێت: (ماکس ڤیبەر ساڵی 1864 لە شاری ئێرڤۆرت لە ئەڵەمانیا و لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی پروتستانت مەزهەب لە دایك بووە. ڤیبەر لە بنەماڵەیەکی گەورەو قەڵەباڵغ بوو، پیشەسازی پسپۆر لە خوری و فەرمانبەری گەورە و مامۆستای زانکۆیان تێدا بوو.. باوکی یەکێك بووە لە ئەندامە گرنگەکانی پارتی ناسیۆنالستی لیبرالی کە حیزبی رۆشنبیران و چینی بۆرژوا بوو. ڤیبەر زۆرجار لە ماڵەکەوەیاندا کەسایەتیە سیاسی و فەلسەفیە گەورەکانی دەبینی، وەك: دێلتی و مۆمسین و کەسانی دیکە.. واتە لە ماڵێکدا گەورەبوو کە ماڵی زانست و فیکر و سیاسەت بوو).

هەر لە درێژەی قسەکانیدا "ستیڤن کالبێرگ" دەڵێت: (ماکس ڤیبەر لە سەرەتای تەمەنی لاویەتیەوە، دەستیکرد بە خوێندنەوەی گەورە بیریارانی وەك: مارکس و نیچە و هیگڵ و کانت. لەو قۆناغەدا حەزێکی زۆرری بە خوێندنەوە بوو، بە تایبەت بابەتەکانی مێژوو و فەلسەفە و تیۆلۆژیا و ستاتیکا و... هتد. پاشان لە کۆلێژی ماف و ئابووری درێژەی بە خوێندن داو لەوێدا خۆی ئامادەدەکرد بۆ تێزەی دکتۆراکەی دەربارەی ناوەندە بازرگانیەکان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا. دوای ئەوەی ئەم نامەیەی لەبەردەم چەندین مامۆستای بەتواناو ژمارەیەکی زۆری خوێندکاراندا تاوتوێکرا، بڕوانامەی دکتۆرایان بە پلەی شەرەف پێبەخشی و ئیتر لەو کاتەوە وەك یەکێك لە گەورە کۆمەڵناسان حسابیان بۆ دەکرد. پاشان یەکەمجار لە ساڵی 1894 وەك مامۆستا لە زانکۆی فرایبۆرگ دەست بەکاربوو، لە دوای ئەوە ساڵی 1896 چووە زانکۆی هایدلبرگ و لەوێدا زانستی ئابووری سیاسی دەوتەوە، بەڵام بەهۆی خراپی باری تەندروستیەوە، ناچار بوو لە ساڵی 1898دا بەیەکجاری واز لە وانە وتنەوەی زانکۆ بهێنێت. پێدەچێت چەند نەخۆشیەکی دەرونی دیاریکراوی هەبوو بێت کە ڕێگەی وانە وتنەوەیان نەداوە. ساڵی 1904 گۆڤارێك دەردەکات کە ڕۆڵی لە گەشەسەندنی تیۆریاکانی کۆمەڵناسیدا دەبێت، ناوی گۆڤارەکەش ئەمە بوو: دیکۆمێنتی زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان. پاشان ساڵی 1910 لە دامەزراندنی ڕێکخراوی ئەڵەمانی بۆ کۆمەڵناسی بەشداری دەکات. دواتر ماکس ڤیبەر تێکەڵ بە کاری سیاسی دەبێت و دەبێتە ئۆپۆزسیۆنی سیاسی ئیمپراتۆر گیۆمی دووەم و ئەندامێکی کارای ریزەکانی پارتی سۆسیال دیموکراتی ئەڵەمانی. دوای جەنگی جیهانی یەکەم، ئەندامی ئەو شاندەی ئەڵەمانیا دەبێت بۆ کۆنگرەی ئاشتی کە ساڵی 1919 لە ڤێرسای بەسترا. پاش ئەوە دەسەڵاتدارانی وڵات داوایان لێکرد دەستورێکی نوێ بۆ کۆماری ئەڵمانیا دابڕێژێت. هەروەها لە ساڵی 1918دا کورسی کۆمەڵناسیان لە زانکۆی میونخدا دایە، بەڵام لە ساڵی 1920 کتوپڕ گیانی لەدەست داو زوو ژیانی بە جێهێشت. واتە ماکس ڤیبەر تەنها پەنجا و هەشت ساڵێك ژیا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شوێن دەستی گەورەی لەسەر کۆمەڵناسی بەجێهێشت و بوو بە یەکێك لە ڕیزی سێ گەورە دامەزرێنەرانی کۆمەڵناسی لەگەڵ کارل مارکس و ئەمیل دۆرکهایم).

هەر لە درێژەی قسەکانیدا سەبارەت بە "ڤیبەر"، "ستیڤن

کـالبێرگ" دەڵێـت: (مـاکس ڤیبـەر بـەوە ناوبـانگی دەرکـرد کە یەکێکـە لـەو بیریارانـەی بە تــاوتوێکردنی دیـــاردەی مۆدێرنـەوە خـەریك بـووە و لـە چـۆنیەتی دروسـت بـوون و سـەرهەڵدان و کـۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگـــه پیـــشەسازیە پێشکەوتووەکانی کۆڵیوەتـەوە لەبەرئـەوە هـەر ڕۆشـنبیرێکی هاوچـەرخ بیـەوێت قـسە لـە مردێرنـە بکـات، ئـەوا ناچـارە بگەڕێتـەوە سـەر ئـەو تێـزە و تیورانـەی مـاکس ڤیبـەر لـەو بـارەوە نوسـیویەتی). ئـەو پرسـیارەی "مـاکس ڤیبـەر" دەیکـرد ئەمـە بـوو: (بۆچـی مۆدێرنـــەی زانـــستی و تـەکنۆلۆژی و بیرۆکراتـی، هـەر بـە تـەنها لـە ئـەوروپای خۆرئاواو و ئـەمریکای باکوردا پەیـدا بـوو؟ بـە واتایـەکی دی: بۆچـــی ئەقلانیـــەت لـــەم ناوچەیەی جیهانـدا سـەریهەڵدا نەك لە شوێنێکی دیکە؟).

وەکـی ئاشـکرایە مۆدێرنـە بـە مانـای بـە ئـەقلانیکردنی جیهـان دێت، واتـە لێکۆڵینـەوە لـە جیهـان بـە شـێوەیەکی زانـستی و بابـەتی و ئـەقلانی، نەك بە شێوەیەکی غـەیبانی و میتـــافیزیکی و خـــوراق. جیـاوازی نێـوان کۆمەڵگـە مـۆدێرن و تەقلیدیـەکانیش لێرەدایـە. چـونکە کۆمەڵگـە تەقلیدیـەکان ئـەو دنیـا بینیـە کۆنانـە بەسـەریاندا زاڵـە کـە پڕیەتی لە ئەفسانە و پەیچورو خورافـات، بـەڵام سـەروەختێك مۆدێرنە هات هەموو ئەمانە بە بـــادا چــــوون و ڕووە ڕاستەقینەکەی جیهان ئاشکرا بوو.

**سەرچاوە:**

بیان الکتب – 2007/9/17

# گابرییل گارسیا مارکیز:
# رۆژنامەنووسانی ئێستا لە ئامێر دەچن.

لە عەرەبییەوە: سەردەم

گابرییل گارسیا مارکیزی نووسەری گەورەی کۆڵۆمبی، کە ساڵی 1982 خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی وەرگرت. لە ئاهەنگێکی دابەش کردنی خەڵاتی رۆژنامەوانیدا کە کۆمپانیای سیمیکس لە شاری مونتیری مەکسیك سازی کردبوو. بە ناوی رۆژنامەنووسانی نوێ لە ئیبیرو ئەمریکا کە مارکیز سەرۆکایەتی دەکات و رۆژنامەنووس و بێژەری ئیسپانی ئینیاکی جابیلوندۆ خەڵاتەکەی پێ بەخشرا، لە لێدوانێکدا مارکیز وتی کە ئەو ئازار بەنووسینە خراپەکانی چاپەمەنیەکانەوە دەچێژێت، ئەمەیش لەو کاتەدایە کە چاپەمەنیەکان لە ژێر دەسەڵات و هەژموونی کۆمپانیا گەورەکاندان.



هەروەها وتی: من رۆژنامەوانیی لە خوێنمدایە، چونکە پیشەیەکی هەرە ناوازەیە، من هەموو بەیانیەك کە لە خەو هەڵدەستم، رۆژنامەکان دەخوێنمەوە بۆ ئەوەی بزانم چی باش و خراپیان تێدایە، بەڵام هەموو بەیانیەك کارەساتەکە بەردەوامە، بێجگە لە هەندێك ریپۆرتاج کە لە گەوهەرێکی دەگمەن دەچن.

مارکیزی خاوەن رۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی) و (پایزی باوك سالاری) و (خۆشەویستی لە سەردەمی کۆلێرادا) رەخنەی لەو خێراییە گرت کە لە ئێستادا رۆژنامەنووسان پەیرەویی دەکەن و وتی: لەوە دەچێت رۆژنامەنووسان

کاتیان بە دەستەوە نەبێت، ڕۆژنامەوانیی ڕاستەقینە لە ڕۆحی ڕۆژنامە نووسەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەوانی دی کاری ئامێرکارین. من وا دەزانم ڕۆژنامەوانیی لە سەردەمی پێشوودا لە ئێستا چاکتر بوو، چونکە خاوتر دەڕۆیشت و بواری بۆ ڕۆژنامەنووس دەڕەخساند کە کارەکانی بە هێوری و لەسەرخۆ و وردەکارییەوە بکات.

خەلاتی ئەم یەکەم دەورەیە بەر ڕۆژنامەنووسی ئیسپانی ئینیاکی جابیلوندۆ کەوت، جابیلوندۆ لە بواری هەواڵی ڕادیۆو تەلەفزیونی ئیسپانیادا کار دەکات.

جابیلوندۆ لە کاتی وەرگرتنی خەلاتەکەدا وتی: ئەمە بۆ من شەرەفێکی گەورەیە کە سەرۆکی خەلاتەکە گابریل گارسیا مارکیزە، ئەمە ڕووداوێکی مێژوویییە لە ڕەوتی پیشەکەمدا. هەروەها وتی: ڕۆژنامە نووسانی ئێستا تووشی خەولێکەوتنی موگناتیسی هاتوون، ئەمەیش بەهۆی سیاسەتەوەیە، هەروەها ئەوانەی لە پشت بەرنامەی مانۆڕە نمایشکاری و وەرزشییەکانەوەن. لە کاتێکدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەو بەرنامانە لە بەرچاو نامێنن کە دەربەستی ئامانجە مرۆڤایەتیەکانن.

گارسیا ماکیز لە 6ی مارسی ساڵی 1927 لە شاری ئاراکاتاکای بەڕێوەبەرایەتی ماجدالینا لە کۆڵومبیا لەدایک بووە، ڕۆمان نووس و هەڵسوڕاوی سیاسی و بڵاوکەرەوەیە. زۆربەی زۆری ژیانی لە مەکسیک و ئەوروپادا گوزەراندووە. لە ئێستادا زوربەی کاتی لە مەکسیکوستی بەسەردەبات. بێجگە لە ڕۆمان یەکێك لە بەرهەمە ناوازەکانی کتێبی – ژیام بۆ گێڕانەوە– یە کە ژیاننامەی خۆیەتی تا ساڵی 1955.

**سەرچاوە:**

تۆڕی هەواڵە عەرەبییەکان

سێپتەمبەری 2008

SARDAM No. 56 2008

# دالای لاما..مرۆڤو ڕاهیبو سۆفی

مایانك شهایا

لە عەرەبییەوە: باوکی ڕەهەند

دانەری ئەم کتێبە ڕۆژنامەنوسی ئەمریکی بەڕەگەز هیندی "مایانك شهایا"یە، ئەم ڕۆژنامەنوسە نزیکەی چارەکە سەدەیەکە لە هندستانو پاکستانو سریلانکا، وەك پەیامنێرێك بۆ ڕۆژنامە گەورەکانی ئەمریکا ئیشدەکات، لەنێوان شیکاگۆو نیویۆرکدا نیشتەجێیەو پەیوەندییەکی توندوتۆڵو متمانەپێکراوەی لەگەڵ "دالای لاما"دا هەیەو شتگەلێکی زۆر لەبارەیەوە دەزانێ. ئاخۆ دەبێ ئەم پیاوە "دالای لاما" کێ بێت کە هەنووکە لە وڵاتی تبت تەحەدای چین دەکات؟ "دالای لاما" کێیە کە لەگەڵ پاپادا بەیەکێك لە گرنگترین کەسایەتییە ئاینیەکانی جیهان دادەنرێت؟ زۆرێك پێیانوایە ئەم پیاوە ویژدانی گەردونیانەی ئەخلاقیو ڕۆحی هەموو جیهانە، بەڵام دەوڵەتی چین بە یەکەمین دوژمنی خۆی دادەنێ.

دانەری کتێبەکە ئاوا دەڵێ: پێویستە ئەوە بزانین "دالای لاما" نازناوێکە بۆ سەرکردە ڕۆحییەکانی وڵاتی تبت، ئەم نازناوە لەسەدەی حەڤدەهەمەوە تاکو ڕۆژی ئەمڕۆمان لەلایەن سەرکردە ڕۆحیەکانەوە بەکارهاتووە. لێرەوە ئەو پیاوەی ئەمڕۆ نازناوی "دالای لاما"ی وەرگرتووە، یەکەم کەس نییە

له مێژوودا ئەو نازناوەی هەیە، بەڵکو ئەو چواردەهەمین کەسە. پێش ئەو سیازدە کەسی دیکە نازناوی "دالای لاما"یان وەرگرتووە، وشەی "دالای لاما" لە زمانی ئەو وڵاتانەدا مانای (چوارچێوەیەکە لە حیکمەت) دەگەیەنێ، لێرەوە ئەو لەلایەن بوزییەکانی ناوچەی تبت وەك لووتکەی زانستو حیکمەت تەماشادەکرێ، ڕەنگە لەلایەن خەڵکانی ناوچەکانی هندو دەوروبەریشی هەروا تەماشابکرێت. بەڵام "دالای لاما" تەنها سەرکردەی ڕۆحی بوزییەکان نییە، بەڵکو سەرکردەی سیاسیشیانە. ئالێرەوەیە ئەو خاوەنی پێگەیەکی سیاسی مەترسیدارە کە لە جیهاندا پێناسراوە، ململانێی خوێناوییە کراوەکەی نێوان خۆیو چین هەر لێرەدایە، تەنها یەك وشە لە "دالای لاما" ڕەنگە ببێتە هۆی بەرپابونی ڕاپەڕینێکی سەرتاسەری بێئامان لە وڵاتدا، لەهەمانکاتدا ئاماژەیەکی بچوکی "دالای لاما" ئەو ڕاپەڕینە هێوردەکاتەوە.

ناوی ڕاستەقینەی "دالای لاما" کە لە ئێستادا هۆیەکانی ڕاگەیاندنی بەخۆیەوە سەرقاڵکردووە "تنزان گیاتسۆ"یە، بەڵام هیچ کەسێ ئەم ناوە نازانێ، چونکە نازناوی "دالای لاما" ناوە ڕاستیەکەی داپۆشیوە، ئەم پیاوە لە ساڵی 1935 لەدایکبووە، تەمەنی لە ئێستادا لەسەرو حەفتا ساڵەوەیەو هەیبەتێکی جیهانی گەورەی هەیە. جگە لەوە خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی فراوانە، نەك تەنها لە بواری زانستی ئاینی بوزی، بەڵکو لە بواری فەلسەفەی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتیشدا. هەرچی بەسەرهاتی سیاسی ئەم پیاوە هەیە، دەکرێ لەم وشانەی خوارەوەدا کورتیبکەینەوە: لەساڵی 1949 لە چین "ماوتیسۆنگ" دەسەڵاتی گرتەدەستو ڕازینەبوو دانبنێت بە سەربەخۆیی هەرێمی تبتدا کە لە ساڵی 1913 ڕاگەیەنرابوو، "ماوتیسۆنگ" لەساڵی 1950 سوپای چینی نارد داگیری بکاتو بیکاتە بەشێك لە چین، بەڵام "ماوتیسۆنگ"بە ڕووکەش وای پیشاندا ئەو سوپایە بۆیە دەنێرێت بۆ تبت تاکو لە سوپای بێگانە ڕزگاری بکات، ئەم "دالای لاما"ی ئێستا، لەو ساڵەدا کە تەمەنی تەنها پازدە ساڵ بوو، کرابوو بە سەرۆکی دەوڵەتی تبت، لەو سەروبەندەدا "دالای لاما" بەدرێژایی نۆ ساڵ هەوڵیدا ئەو کێشەیە بەڕێگای ئاشتیانە لەگەڵ چیندا چارەسەربکات، بەڵام سەرکەوتو نەبوو، ئیدی ناچار ڕایکرد بۆ هندستانو لەوێ دانیشت، هەر لەوێ حکومەتی مەنفای تبتی ڕاگەیاند، لە سەروبەندی شۆڕشی ڕۆشنبیری چیندا، چەوساندنەوەی دانیشتوانی تبت لەسەر دەستی ڕژێمی چین گەشتە لووتکە. لەبەرئەوەی "ماوتیسۆنگ" کەسێکی کۆمۆنیستی ڕادیکاڵ بوو، جەنگێکی کراوەی لەگەڵ هەمو ئاینەکاندا ڕاگەیاند، فەرمانیدا بە دارودەستەکەی چی دێری بوزیو شوێنی عیبادەتیان هەیە، هەر هەموی بڕوخێنن. هەروەها فەرمانیپێدان ڕاهیبو ڕاهیبە بوزییەکان بگرنو هەمویان لە زیندانەکاندا بخەنە ژێر ئازارو ئەشکەنجە، ئەمەش لەبەرئەوەی ئاینی بوزی وەك ئاینی مەسیحی ڕاهیبو ڕاهیبەی هەیە.

دانەری کتێبەکە بەردەوام دەبێتو دەڵێ: بەم شێوەیە دانیشتوانی تبت لە ساڵانی پەنجاکانی سەدەی ڕابردووەوە تاکو ئێستا ڕوبەڕوی سەرکوتکرنی چین دەبنەوە، جگە لەو سەرکوتکردنە، چین لە وڵاتی تبت دەستیکرد بە جێبەجێکردنی سیاسەتی پاکتاوکردنی دانیشتوانەکەی، ئەویش لەڕێگەی ناردنی هەزاران هاوڵاتی چینی بۆ وڵاتی تبت تاکو لەوێ زەویوزار بکڕن یاخود بەزۆر

دەستی بەسەردابگرن و بۆ هەتاهەتایە تێیدا نیشتەجێبن. لێرەوە هیچ دوورنییە لە ماوەیەکی نزیکدا ژمارەی چینییەکان لە ژمارەی دانیشتوانە ئەسڵییەکەی وڵاتی تبت زیاتربێت. ئەمە دوای ماوەیەکی تر دەبێتە هۆی ئەوەی تبتییە ڕەسەنەکان لەسەر زەوی و زاری خۆیان و لەناو وڵاتی خۆیاندا هەست بە غەریبی و نامۆیی بکەن. وەك ئەوەی "دالای لاما" دەڵێ لەوانەیە ئەوە لە پازدە ساڵی داهاتودا ببێتە هۆی لەناوچوونی ڕۆشنبیری و کەلتوری تایبەتی تبتییەکان، ئەمەش مانای وایە مانەوەی وڵاتەکە و شوناسەکەی لە مەترسیدایە.

لە واقیعدا ئەم سەرکردە ڕۆحی و دنیاییەی وڵاتی تبت"دالای لاما"، بەردەوام لە هەوڵی ئیدانەکردنی ئەو کارە ناشرین و نابەجێیانەدایە کە ڕژێمی چین لە تبتدا جێبەجێیان دەکات، کەچی لە بەرامبەردا ڕژێمی چین ئیدانەی "دالای لاما" دەکات و بە سەرچاوەی گێرەشێوێنی و ئاژاوەگێڕی دادەنێت، بە ئامرازێکی جەنگی دادەنێ لە دژی خۆی. بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو سەرکوتکردن و کارە دزێوانەی چین لە تبتدا ئەنجامی دەدات، کەچی "دالای لاما" ڕێڕەوی ئاشتیانەی خۆی نەگۆڕی و مەسەلەی بەکارهێنانی توندوتیژی ڕەتدەکاتەوە، وەلێ بەم دوایانە مەسەلەکە تەقیەوە. "دالای لاما" بەشێوەیەك لە ئاینی بوزی گەیشتووە کە تەواو دژی توندوتیژییە، ئاینی بوزی هیچ ئامرازێکی ناخاتە بەردەست بۆ ئەوەی لە ڕێگەیەوە مافەکان بەدەستبێنێت، گەرچی شوێنکەوتوانیشی سەرکوتبکرێن و بچەوسێنرێنەوە. بەم مانایە "دالای لاما" تەواو لە "غاندی" دەچێت و لەسەر هەمان ڕێبازی ئەو دەڕوات و هەمیشە داوا لە وڵاتی چین دەکات بۆ گەیشتن بە چارەسەرێکی گونجاو، دانوسان بکەن. "دالای لاما" لە ساڵی 1961 داوای لە نەتەوە یەکگرتووەکان کرد یارمەتی بدات تاکو سەربەخۆیی بۆ تبت بەدەستبێنێت، بەڵام لەبەر ئەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان ناوێرێ چین توڕەبکات، بۆیە تاکو ئێستا شتێکی ئەوتۆی نەکردووە. دوای "ماوتیسۆنگ" سەردەمی "دێنگ هسیاو بێنگ" هات و سیاسەتی لێکبووردەیی و کرانەوەی پەیڕەوکرد و بە "دالای لاما"ی وت: هەموو شتێ قابیلی دانوسانە تەنها مەسەلەی سەربەخۆیی نەبێت.

ئیدی لەو ساتەوەختەوە تاکو ئێستا "دالای لاما" لەناو چوارچێوەی کۆماری میللی چیندا، تەنها داوای ئۆتۆنۆمییەکی ڕاستەقینە دەکات. بەڵام لەوکاتەوە تا ئێستا هیچ دانوسانێکی ڕاستەوخۆ لەنێوان "دالای لاما"و حکومەتی چیندا نەهاتۆتە ئارا، ئەوەی هەیە بریتییە لە پرس و ڕا گۆڕینەوە لە ڕێگەی کۆمەڵێ ناوەندەوە و هەندێ یەکتربینینی نارەسمی.

دواتر دانەر باردۆخی ئێستا ئاوا ڕووندەکاتەوە: لە ئێستادا چین وەك سەردەمی "ماوتیسۆنگ" نە دژایەتی ئاینەکان دەکات و نە دەیانچەوسێنێتەوە، بۆ نمونە ئاینی بوزی بووەتە ئاینێکی ڕێگەپێدراو، تەنانەت لە پەکینی پایتەختیشدا ڕێگەی پێدراوە و بە تەواوی ئازادی سروت و ڕێوڕەسمەکانی خۆی جێبەجێ دەکات، بەڵام لەهەمانکاتدا حکومەتی چین داوا لە بوزییەکان دەکات ئیدانەی "دالای لاما"ی سەرکردەیان بکەن، ئەمەش بەلای بوزییەکانەوە سەختترین مەسەلەیە، چونکە "دالای لاما" تەنها سەرکردەی سیاسییان نییە، بەڵکو سەرکردە ئاینی و ڕۆحییە مەزنەکەشیانە، ئیدی چۆن و بە چ شێوەیەك دەکرێ خۆیان لێی بێبەری بکەن یاخود

بەبانگی ئاشکرا نەفرەتی لێبکەن؟ ئەمە مەحاڵە. لەبەر ئەم هۆیەیە کێشە کەوتووەتە نێوان هەردوو بەرەکەوە، دەبێ ئەوەش بڵێین سەرکوتکردن‌و چەوساندنەوە بە شێوەی نهێنی، لە سەرکوتکردن‌و چەوسانەوەی ئاشکرا زیاتر مەترسیدارترە. ئەوە بەکارهێنانی شێوازی نهێنی یاخود ناڕاستەوخۆی سەرکوتکردن بوو، وایکرد گەورە پیاوانی ئاینی بوزی، تبت بەجێبێڵن‌و وەك "دالای لاما" لە تاراوگە ژیان بەسەربەرن. "دالای لاما" لەپێناو تێکۆشان بۆ دەستەبەرکردنی ئازادی‌و سەرفرازی میللەتەکەیدا، ڕێکخراوە مرۆڤدۆستە جیهانییەکان پشتگری لێدەکەن، ئێمە ئەمە دەڵێین‌و دەزانین "دالای لاما" بۆ بەدەستهێنانی مافەکان، مەسەلەی بەکارهێنانی توندوتیژی حەرامکردووە. ئەو لەبەرامبەر ڕژێمی سەرکوتکەری چیندا تەنها باوەڕی بە بەرهەڵستکاری ئاشتیانە هەیە.

هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو لەساڵی 1989 پاداشتی نۆبڵ بۆ ئاشتی درا بە "دالای لاما"و پاشان لە ساڵی 2007 مەدالیای ئاڵتونی کۆنگرێسی ئەمریکی پێبەخشرا، گومانی تێدانییە "دالای لاما" کەسایەتییەکی گەورەیەو لە هەموو جیهاندا ڕێزی لێدەگیرێ، ئەمەش ڕژێمی چینی تەواو بێزارو بێتاقەت کردووە، گەر "دالای لاما" لەناو وڵاتەکەی خۆی‌و لە جیهانی دەرەوەدا خاوەنی کەسایەتیەکی بەرزو بەڕێزە، ئەوا هۆکارەکەی بۆ فیکرو پرنسیپە نمونەییەکانی دەگەڕێتەوە، ئەو بانگەشە بۆ سیاسەتی نا توندوتیژی دەکات، بانگەشە بۆ ئەوەدەکات لەڕێگەی دانوسان‌و گفتوگۆو ئامرازەکانی دیموکراسی‌و دانبەخۆدا گرتن لەبەرامبەر ناخۆشییەکان، بگەنە وەرگرتنی مافەکان. هەروەها بانگەشەی ئەوەدەکات ڕێزی خەڵکانی نا بوزی-یش بگیرێت، چونکە ئەوانیش وەك هەر بوزییەك مرۆڤن، لێرەوە ناکرێ ڕقمان لە خەڵکانێك بێت لەبەرئەوەی لەسەر ئاینەکەی ئێمە نین، هەمو کەسێك ئازادە لەوەی باوەڕ بەو ئاینە بێنێت کە خۆی حەزی پێدەکات. "دالای لاما" باوەڕی بە فرەیی ئاینی هەیە لە جیهانداو ڕێزی هەمو ئاینەکانی دیکەی مرۆڤایەتی دەگرێ، وەك ئاینی ئیسلام‌و مەسیحی‌و جولەکەو هندۆسی‌و ئەوانی دیکە، جگە لەوانە "دالای لاما" زۆر بە قووڵی شارەزایی لە فەلسەفەی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتدا هەیە، لێرەوە ئەو پیاوێکی ئاینی تابڵێی ڕۆشنبیرە.

**سەرچاوە:**

بیان الکتب 2008/4/12

# بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم

ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم لە ماوەی دوو مانگی ڕابردودا کۆمەڵێ کتێبی بایەخدارو نایابی خستە کتێبخانەی کوردییەوە، کتێبەکان هەمە چەشن‌و زیاد لە بابەتێکی مەعریفیان ڕۆشنکردۆتەوەو تیشکیان خستۆتە سەر چەندین کایەی گرنگی ڕۆشنبیری، دەکرێ کتێبەکانی ئەمجارەی دەزگای سەردەم بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلێنیان بکەین: بابەتی سیاسی (پێشەوایان‌و بەکرێگیراوان، نووسینی محەمەد ئەلباز و وەرگێڕانی ئەحمەد سەلام). بابەتی دەرونی (خۆت بناسەو باشتر بژی، نوسینی عەبدوڵڵا تۆفیق). لێکۆڵینەوەی مێژویی (ڕێگرو پاڵنەرە ئابوورییەکانی دەرکەوتنی ئیسلام، نوسینی شاکر نابلسی‌و وەرگێڕانی ئیبراهیم فەتاح)و (سەربردەی مرۆڤایەتی، نوسینی تێیا فیدلەرو پێتەر زاندمایەر، وەرگێڕانی لە ئەڵمانییەوە مامۆستا ئارام). لێکۆڵینەوەی زمانەوانی (سانسکریتی سەرچاوەیەکی دێرینی زمانی کوردی، نوسینی حەکیم مەلاساڵح). لێکۆڵینەوەی سێکسی (سێکس‌و پۆڵیتیك، نوسینی کریستۆف دلوارو کریستۆف دۆبوا، وەرگێڕانی شێرزاد هەینی). بابەتی ئەدەبی (ڕۆمانی پەردووی ئەزەلی دووەم، نوسینی سەلیم بەرەکات، وەرگێڕانی جەوهەر کرمانج)و (ئەو وتارانەی لە هونەر دەدوێن نوسینی دیاری قەرەداخی)، ئەدەبیاتی نامە (دڵدارە هەرە ئازیزەکەم، وەرگێڕانی ڕەووف بێگەرد).

## پێشەوایان‌و بەکرێگیراوان




یەکێکە لەو کتێبە دانسقانەی پێویست دەکات هەموو کەسێك بیخوێنێتەوە، ئەم کتێبە بەشێوەیەکی ڕوون‌و ئاشکراو لە ڕێگەی کۆمەڵێ بەڵگەنامەوە باس لە گەندەڵی‌و ناپاکی فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارانی جیهانی عەرەبی دەکات، لە ڕێگەی خوێندنەوەی ئەم کتێبەوە

دەچنە ناو ژیانو بەسەرهاتی ڕۆژانەی ئەو سەرکردانەی کە تەنها لە شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە دەیانبینینو وەك مرۆڤی ئەفسانەییو جوامێر دێنەبەرچاومان، کەچی لە واقیعدا بەو شێوە ئەفسانەییە نینو بۆمان دەردەکەوێت کە سەرکردەکانیش وەك هەموومان مرۆڤنو حەزیان لە گەمەو گاڵتەیە، نەخۆشدەکەونو چاکدەبنەوە.

ئەم کتێبە لەلایەن نوسەری میسری "محەمەد ئەلباز" نوسراوەو "ئەحمەد سەلام" بە زمانێکی کوردی جوان وەریگێڕاوە، تیراژەکەی 1500 دانەیەو نرخی 3500 دینارە.

## دڵدارە هەرە ئازیزەکەم

ئەم کتێبە کە ئەدیبو چیرۆکنوس "ڕەووف بێگەرد" لە زمانی فارسییەوە کردویەتی بە کوردی، یەکێکی دیکەیە لەو کتێبە دەگمەنانەی لە ماوەی دوو مانگی ڕابردودا دەزگای سەردەم خستویەتیە کتێبخانەی کوردییەوە، بایەخی گەورەی ئەم کتێبە لەوەدایە باس لە کۆمەڵێ نامەی خۆشەویستی دەکات لەنێوان چیرۆکنوسی مەزن"چیخۆف"و "ئۆلگا کنیپەر"ی هاوسەری. دیارە نوسینی نامە کارێکی ئاسان نییەو هونەرو لێزانینی تایبەت بەخۆی هەیە، بەتایبەتی گەر ئەو نامانە لەنێوان دوو دڵدار یان دوو هاوسەردا نوسرابن. لە ڕێگەی خوێندنەوەی ئەم نامانەوە لەو پەیوەندییە ڕۆحیو پڕ عەشقەی نێوان ئەم دوو مرۆڤە تێدەگەینو بۆمان دەردەکەوێت چەند یەکتریان خۆشویستووە، نامەکان دەمانگەڕێننەوە بۆ سالانی سەرەتای سەدەی بیستو ئاشنامان دەکەن بەو بارودۆخە هونەریو ڕۆشنبیرییەی لەو سالانەدا لە ڕوسیادا لەئارادابوون.

ئەم کتێبە لەلایەن وەرگێڕەوە بە زمانێکی کوردی شیرینو پاراو وەرگێڕدراوە، ئەمەش وادەکات خوێنەر چێژێکی زیاتر لە خوێندنەوەی کتێبەکە وەربگرێتو لەکاتی خوێندنەوەدا هەست بە ماندوبون نەکات. جگە لەوە وەرگێڕ لە هەندێ شوێندا بۆ ڕونکردنەوەی زیاترو دەوڵەمەندکردنی زۆرتری کتێبەکە، هەندێ پەراوێزی داناوە، هەروەها لە کۆتایی کتێبەکەدا پاشکۆیەکی وێنە هەیە کە تێدا کۆمەڵێ وێنەی جوانی چیخۆف"و هاوسەرەکەی دەبینین کە بەهای کتێبەکە زیاتر دەکەن.




تیراژی کتێبەکە 1250 دانەیەو ژمارەی لاپەرەکانی 471 لاپەرەی مام ناوەندییەو نرخەکەی 6 هەزار دینارەو بەرگێکی جوانو قەشەنگی بۆ دروستکراوە کە بریتییە لە وێنەی "چیخۆف"و "ئۆلگا کنیپەر"ی هاوسەری. بەڕێز "سەدرەدین عارف" ئەم کتێبەی لەگەڵ دەقە ئینگلیزیەکەیدا بەراورد کردووە.

## کەرکوكو بزاڤی شیعری کوردی

بۆ ئەوەی لە بزاڤی شیعری کوردی دەڤەری کەرکوك لە سەدەکانی هەژدەهەمو نۆزدەهەمو بیستەم تێبگەیتو ئاشنای ژیانو بەرهەمی ئەو شاعیرانەببیت کە لەو ڕۆژگارەدا شیعریان نوسیوە، ئەوا پێویستە ئەم کتێبە بخوێنیتەوە. گومانی تێدا نییە ئەم کتێبە هەوڵێکی جدییە بۆ دەرخستنی سیمای ئەدەبی ناوچەی کەرکوك،

ناوچەیەك وەك نوسەری كتێبەكە دەڵێ كەمتر لێكۆڵینەوەی لەسەر كراوە.
جگە لەوە كتێبەكە هەوڵیداوە كەركوك لە ڕووی جوگرافی و ئابوری و ڕۆشنبیری و كۆمەلایەتی و سیاسییەوە بە خوێنەر بناسێنێت، هەروەها باس لە تێڕوانینی ئەو گەڕیدە و مێژوونوسانە دەكات كە بە كەركوكدا تێپەڕیون و بیروڕای خۆیان لەسەر ئەو شارە تۆماركردووە. بە مانایەكی تر ئەم كتێبە تەنها باس لە ڕۆڵی بزاڤی شیعری كوردی ناكات لە دەڤەری كەركوك، بەڵكو لەپاڵ ئەوەشدا باسێكی تێروتەسەلی شارەكە دەكات و كۆمەڵێ زانیاری مێژویی ورد دەربارەی كەركوك خراوەتەڕوو.




ئەم كتێبە لە بنەڕەتدا نامەی دكتۆرایە و لەلایەن د. "محەمەد ئەحمەد سەعید" ناسراو بە "كەساس جەباری" نوسراوە. تیراژەكەی 1000 دانەیە و ژمارەی لاپەڕەكانی 369 لاپەڕەی مام ناوەندییە و نرخەكەی 4000هەزار دینارە.

# فایلەكانی ئایندەی سەردەم



-ناسیۆنالیزم

-ڕۆشنگەری

-بونیادگەری

